# سُنَنُ ابن مَاجَه

## به كوردى

لِلإمَامِ أبِي عَبْدِاللهِ مُحَمَّدِ بن يَزِيدِ ابْنِ مَاجَهْ الْقَزْوِينِيُّ



بەرگی یەکەم



وەرگێڕانی

محمد أحمد گردە شێخانی

حوکمی فەرموودەکان وەرگیراوە لە

الشيخ محمد صبحي بن حسن حلاق

پرۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرمووده





ڕێکخراوی پیت

بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی


# سُنَن ابن مَاجَه

## بەکوردی


**نووسینی: الإمام أبي عبد الله محمد بن يزيد ابن ماجه القزويني**

**وەرگێڕانـــی : محمد أحمد گردەشێخاڵی**



**دیزاینی ناوەوە : ستافی پیت**

**خـەتی بـەرگ : ستافی پیت**

**چاپـی یەکـەم : ١٤٤٤ك - ٢٠٢٢ز**

**٥٩٠ لاپــــەڕە**

**٢٤ × ١٧ ســـم**

**بابـەت : ئـایینی**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ١١٥ )ـی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە















# سُنُن ابن ماجَه

## بەكوردی




نووسینی

الإمام أبي عبد الله محمد بن يزيد ابن ماجه القزويني

(209 هـ - 273هـ)

وەرگێڕان

محمد أحمد گردەشێخاڵی




بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وآله وصحبه أجمعين.

بێگومان بۆ کردنەوەی قفڵی هەر دەرگایەک، بۆ کەسێک خواستی چوونە ژوورەوەی هەبێت لەو دەرگایە و بیەوێت بەڕێگای سەرەکیدا و بەسەلامەتی بچێتە ژوورەوە، لە هەمان کاتدا دەستەبەری کردنەوە و پاراستنی دەرگاو ڕێگا بێت، ئەو کەسە چەندە ئاتاجە و پێویستی بە کلیلە بۆ کردنەوەی ئەو دەرگایە، ئەوا بابای هۆشیار و هەستیار و ڕاستویست و ژیریار بۆ تێگەیشتن لە دوا پەیامی ئیلاهی کە قورئانە زۆر زیاتر و حەتمیتر ئاتاجە و پێویستی بە کلیلە بۆ کردنەوەی دەرگای وەحی، بێگومان ئەو کلیلەش کە دەستەبەری ڕاستەڕێ کردن و بەرەو ڕاستی بردنی ئەو کەسەیە تەنها و تەنها فەرموودە گەوهەرییەکانی سەروەر و ئازیزمانە ﷺ.

چۆن وا نەبێت؟! لە کاتێکدا خوای گەورە و کارلەجێ لە هەقیدا دەفەرموێت:
﴿ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ ﴾ آل عمران.

ئاخر چۆن وا نەبێت؟! لە کاتێکدا تەواوی گوفتار و کردار و هەڵسوکەوت و ژیانی بریتییە لە تەفسیری قورئان بە کردەیی، دەی بۆیە هەر خۆی ئەو ڕاستییەمان تێدەگەیەنێت کە بیرکردنەوە لە تێگەیشتنی قورئان بەبێ زانین و شارەزابوون و ئاگاداربوون لە سوننەتی ئەو، لە خەیاڵێک زیاتر هیچی دیکە نییە، خاوەنی ئەو خەیاڵەش لە کۆتاییدا تەنها شوێن و شتێک کە سەری لێوە دەردەچێت نەزانین و لادان و خۆونکردن و هەڵدێرانە.

هەر لێرەوەش گەورەیی و گرنگی هەبوون و ناردنی پێغەمبەرانمان ﷺ بۆ دەردەکەوێت، بەجۆرێک کە دابەزینی وەحی و پێویستی بوونی پێغەمبەران ﷺ




دوو شتی لێک دانەبڕاون، نەک هەر ئەوەندە بەڵکو بە بێ بوون و ڕێنوێنی ئەوان ژیان پارچەیەکە لە تاریکی، هەڵدێرێکە لە کەناری دۆزەخی ستەمی ستەمکاران و خۆبەخوازانان، بۆ پشتگیری ئەو ڕاستییە بەسە کە خوا ﷻ دەرهەقی پێغەمبەران ﷺ دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ... ﴿٢٥﴾﴾ الحديد.

چەندە جوانە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: «أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ، أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْقُرْآنَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ...»[1].

جەنابی نالی دەڵێی لێکدانەوەی بۆ ئەم فەرموودەیە کردوە کە دەڵێ:

موحەممەد، ئەحمەدی مورسەل، مونیری مینبەر و مەحفەل

بەشیری ئاخیر و ئەووەل، نەزیری خوێش و بێگانە

لە سایەی ئەمر و نەهی، حەق و باتیل بوو بە دوو فیرقە

بە میسلی فەرقی ڕۆژ و شەو کە فاریق نووری ئیمانە

لەسەر بنەمای ئەو ڕاستییانەی سەرەوە، پڕکردنەوەی کەلێنی خاڵی کتێبخانەی کوردی لە فەرموودەکانی سەروەرمان ﷺ بە زمانی پاراوی کوردی ئەوپەڕی شانازییە، بۆیە جێی خۆیەتی کە ڕێکخراوی پیت هەست بەو شانازییە بکات کە خوای گەورە لوتفی لەگەڵ نواندوون و ئەو شانازییەی پێ بەخشیون، پێویستە ئەو هەوڵەیان بەرز بنرخێنرێ و دوعای بەرەکەتییان بۆ بکرێ لە کاری پڕ خێریاندا.

**شێوازی کار کردنم لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە موبارەکەدا بریتییە لە:**

١- وەرگێڕانی دەقی فەرموودەکان.

٢- ڕوونکردنەوەی هەندێک وشە و زاراوە، کە پێویستییان بە ڕوونکردنەوە بووبێت.

٣- پاراستنی ئەوپەڕی هاوسەنگی لەو شوێنانەی کە جێگەی ڕاجیایین.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٦٠٤، وأحمد: ١٧٣٠٦.




## سوپاس و پێزانین

به پێویستی دەزانم لە ناخی دڵمەوە سوپاس و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی برایانی دڵسۆز و ماندوونەناسم بکەم لە ڕێکخراوی (پیت)، کە بەو کارە پیرۆزە هەڵسان، ئەم ستافە ماندوونەناسە لێبڕاوانە دەستییان داوەتە پرۆژەیەک کە لە مێژووی نووسین و وەرگێڕانی کوردیدا وێنەی نەبووە، کۆششی ئەوان لە پێداچوونەوەو هەڵەچنین و بە چاپگەیاندنی ئەم پەرتووکە زۆر بەرز دەنرخێنم بە تایبەت برایانی بەڕێزم: ئەندازیار بڕیار حسین هێرۆیی و مامۆستا ئاکۆ جەلیل، داواکارم لە خوای پەروەردگار کە پیت و بەرەکەتی زیاتر بخاتە کار و پرۆژەکانی ستافی (پیت)ـەوە.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای بەبەزەیی کە بۆمان بکاتە توێشووی دواڕۆژ و بە گەورەیی خۆی لێمان قبوڵ بفەرموێ، لە ژێر ئاڵای پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ کۆمان بکاتەوە، لە دوعای خێری خوێنەرانی ئازیز بۆ خۆمان و دایک و باوکمان بێبەشمان نەکات.

محمد أحمد گردەشێخاڵی

قـەڵادزێ

٢٠٢٢-٧-٢٧ز، چوارشەممە

## ژیاننامەی پێشەوا ئیبن ماجە

### ناسنامەی تەواوی ئیمامی ئیبن ماجە:

ناوی تەواوی: ناوی تەواوی ئەو شاخە بەرزەی زانست بریتییە لە موحەممەدی کوڕی یەزیدی قەزوینی ئیبنو ماجەی ڕبیعی.

کونیەکەی: «ئەبو عەبدوڵڵا»یە.

بەناوبانگە بە: ئیبن ماجە.

ئیمامی فەیرۆز ئابادی گوتویەتی: «ماجە» نازناوی باوکی موحەممەدی کوڕی یەزیدی قەزوینییە کە خاوەنی سونەنە، نەک ناوی باپیری بێت.

ڕافیعیش بە هەمان شێوە دەڵێ: «ماجە» نازناوی یەزیدە، ناوێکی فارسییە، هەندێکیش دەڵێن: موحەممەدی کوڕی یەزیدی کوڕی ماجە، (واتە: ماجە دەکەن بە ناوی باپیری نەک نازناو بۆ باوکی)، بەڵام یەکەمیان ڕاسترە.

وە بۆچوونێکی دیکەش هەیە دەڵێ: ماجە ناوی دایکیەتی.

نیسبەتەکەی: «قەزوینی»یە، کە ناوچەیەکی بەناوبانگە لە ئەصفەهان.

ساڵی لەدایکبوونی: ئیمامی ئیبن ماجە لە ساڵی (٢٠٩)ـی کۆچی لەدایکبووە.

گەشتە زانستییەکانی: ئیمامی ئیبن ماجە وەک هەر زانایێکی باڵا، خۆر ئاسا بەدەوری جیهاندا سوڕاوەتەوە، بۆ ئەوەی تیشکی زانستەکەی گشت سنورێک ببڕێت، بۆ ئەو مەبەستەش چۆتە عێراق و بەصرا و کوفە و بەغدا و مەککە و شام و میصر و حیجاز و ڕەی، بۆ فێربوون و نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

## مامۆستاکانی:

بەدڵنیایی هیچ کەسێک نییە زانستی ڕەسەن و تۆکمە بەدەست بێنێت حەتمەن دەبێ لە خزمەت زانایانی دەریا ئاسا چۆک دا بدات و کەشتی زانستەکەی لەنگەر نەدات تا گشت ئەو مروارییانەی بوونیان هەیە لەو دەریایە بێبنانە دەری دەکات و دەیخاتە بەر چاوی کڕیارانی ئەو زانستە، جا ئیمامی ئیبن ماجەش یەکێک لەو زانایانە بووە کە لە خزمەتی چەندەها زانای شارەزا و عاریف خوێندوویەتی، وەک ئەمانەی خوارەوە:

١- علي بن محمد الطنافسي.
٢- جبارة بن المغلس.
٣- مصعب بن عبد الله الزبيري.
٤- سويد بن سعيد.
٥- عبد الله بن معاوية الجمحي.
٦- محمد بن رمح.
٧- إبراهيم بن المنذر الحزامي.
٨- محمد بن عبد الله بن نمير.
٩- أبو بكر بن أبي شيبة.
١٠- هشام بن عمار.
١١- يزيد بن عبد الله اليمامي.
١٢- أبو مصعب الزهري.
١٣- بشر بن معاذ العقدي.
١٤- حميد بن مسعدة.
١٥- أبو حذافه السهمي.
١٦- داود بن رشيد.
١٧- أبو خيثمة.
١٨- عبد الله بن ذكوان المقرئ.
١٩- عبد الله بن عامر بن برّاد.
٢٠- أبو سعيد الأشج.
٢١- عبد الرحمن بن إبراهيم دحيم.
٢٢- عبد السلام بن عاصم الهسنجاني.
٢٣- عثمان بن أبي شيبة.



## قوتابییەکانی:

ئیمامی ئیبن ماجە دوای ئەوەی ئەو هەموو دەریایەی زانستی ڕژاندە نێو دەریاکەی خۆی، بوو بە زەریایەک هەموو فێرخوازێک خەونی بوو بگات بە دیداری، چ جای ئەوەی ببێتە قوتابی و چۆک دا بدات لە خزمەتی، بۆیە لە گشت لایێک فێرخوازان و قوتابیانی فەرموودە دەشت و کێویان دەبڕی بۆ گەیشتن بە زانستەکەی، کە ئەمانە بەشێکن لە قوتابییەکانی:

١- إبراهيم بن دينار الحوشبي الهمذاني.

٢- أحمد بن إبراهيم القزويني.

٣- أبو الطيب أحمد بن روح البغدادي الشعراني.

٤- أبو عمرو أحمد بن محمد بن حكيم المدينى الأصبهاني.

٥- إسحاق بن محمد القزويني.

٦- جعفر بن إدريس.

٧- الحسين بن علي بن يزدانيار.

٨- سليمان بن يزيد القزويني.

٩- أبو الحسن علي بن إبراهيم بن سلمة القزوينى القطان.

١٠- على بن سعيد بن عبد الله العسكري.

١١- محمد بن عيسى الصفار.

زۆرێکی دیکەش ...

## پەرتووکەکانی:

١- سنن ابن ماجه.

٢- التفسير، کە زۆر گەورە بووە، بەڵام بەداخەوە نەماوە.

٣- التأريخ، کە پەرتووکێکی مێژوویی زۆر چاک بووە مێژووی نووسیوەتەوە لە سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ تا سەردەمی خۆی، بەڵام بەداخەوە نەماوە.

## دەربارەی پەرتووکەکەی «سونەنی ئیبن ماجە»:

سونەنی ئیبن ماجە لە پلەی شەشەم دێت دوای: صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیم و سونەنی نسائی و سونەنی تیرمزی و سونەنی ئەبو داود، ئەوەش لەبەر بەهێزی و چاکی و ڕێکی و جوان داڕشتنی پەرتووکەکەیە، بە بەراورد لەگەڵ پەرتووکەکانی دیکەی فەرمووده، کە ژمارەیان ئێجگار زۆرە، ئەوەش فەزڵێکی گەورەی خوای پەروەردگارە کە پەرتووکەکەی بە یەکێک لە پەرتووکە هەرە گرینگەکانی ئیسلام ئەژمارکراوە، بۆیە پێویستە موسوڵمانان زۆر گرنگی پێ بدەن.

## کۆچی دوایی کردنی:

ئەو خۆرە مەزنە دوای جێهێشتنی پەرتووکە مانگ ئاساکەی لە ساڵی (**٢٧٣**)ـی کۆچی لە ڕەمەزاندا کە هەشت ڕۆژی مابوو تەواو ببێ لە ڕۆژی دوو شەممە کۆچی دوایی کرد و ڕۆژی سێ شەممە نێژرا.

جا موحەممەدی کوڕی ئەسوەدی قەزوینی لە تاوان بەم شیعرە پیایدا هەڵگوت:

لقد أوهى دعائم عرش علم وضعضع ركنه فقد ابن ماجه

واتە: کورسی زانست پێچکەکانی لاواز بوون و پایەکانی کەوتن بە لەدەستدانی ئیبن ماجە.

هەزاران هەزار ڕەحمەت لەو زانایە خواناس و لێوان لێو لە زانستە کە پرشنگی ڕوناکییەکەی ئەوەتا دەکەوێتە هەموو ماڵێکی شەرع دۆست، خوای پەروەردگار پاداشتی بێ بڕانەوەی پێ ببەخشێ - آمين يا مجيب السائلين -.

## وتەی زانایان دەربارەی:

ئیمامی ئیبن کەثیر دەفەرمووێ: «موحەممەدی کوڕی یەزیدی کوڕی ماجە خاوەنی پەرتووکی سونەنی بەناوبانگە، کە بەڵگەیە لەسەر کردار و زانست و ڕۆچوون لە دەریای زانست و ئاگاداربوونی لە زانست و شوێنکەوتەیی بۆ سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئوصوڵ و فڕوعدا، کە سی و دوو پەرتووکی لەخۆگرتووە، وە هەروەها هەزار و پێنج سەد بابەت و چوار هەزار فەرموودە لەخۆی دەگرێ، هەمووی فەرموودەی چاکن تەنها کەمێکیان نەبێت».

ئیمامی ئیبن خەلەکان دەفەرموێت: «ئیمامە لە فەرموودە و شارەزایە بە زانستەکانی و گشت ئەوەی پەیوەستە پێیەوە».

ئیمامی زەهەبی دەفەرمووێت: «ئیبن ماجە حافیز و ڕەخنەگر و ڕاستگۆ بوو، زانست فراوان بوو ...».

ئیبن ناصر الدين دەفەرموێت: «موحەممەدی کوڕی یەزیدی کوڕی ماجە یەکێکە لە پێشەوایە بەناوبانگ و دیارەکان، وە خاوەنی سونەنە، کە یەکێکە لە پەرتووکەکانی ئیسلام، حافیزێکی جێی متمانەی گەورەیە».

وە ئەبو یەعلا خەلیلی کوڕی عەبدوڵڵای خەلیلی قەزوینی دەفەرموێت: «ئیبن ماجە زانایێکی جێی متمانەی گەورەیە، کۆدەنگی لەسەرە، بەڵگەی پێ دەهێندرێتەوە، خاوەنی شارەزایی و حیفزە، زانایە لە بواری فەرموودە، خاوەنی چەندین پەرتووکە».

## بابەت: هاندان لەسەر شوێن کەوتنی پێغەمبەر ﷺ

**١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَخُذُوهُ، وَمَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا»[(١)].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم بە هەر شتێک پێکردن (بە پێی توانا) جێبەجێی بکەن، وە هەر شتێکیشم لێ قەدەغە کردن، وازی لێبێنن.

**٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِسُؤَالِهِمْ وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَخُذُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَانْتَهُوا»[(٢)].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وازم لێ بێنن لەوەی وازم لێهێناوە بۆتان، چونکە بێگومان ئەوانەی پێش ئێوە بە هۆی زۆر پرسیار کردن و جیاوازبوون لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان لەناوچوون (بە گوێیان نەدەکردن و لە فەرمانەکانیان دەردەچوون)، جا فەرمانم بە هەر شتێک پێکردن، بە پێی تواناتان جێبەجێی بکەن، وە هەر شتێکیشم لێ قەدەغە کردن، وازی لێبێنن.

**٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ»[(٣)].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک گوێڕایەڵی (فەرمانەکانم) بکات، ئەوە فەرمان بەرداریی خوای کردوە، وە هەر کەسێکیش سەرپێچی (فەرمانەکانم) بکات، ئەوە سەرپێچی خوای کردوە.

---

(١) صحيح. انظر البخاري: ٧٢٨٨، ومسلم: ١٣٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٢٨٨، ومسلم: ١٣٣٧ وبإثر ٢٣٥٧، والترمذي: ٢٦٧٩، والنسائي: ١١٠/٥ و ١١١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٥٧، ومسلم: ١٨٣٥، والنسائي: ١٥٤/٧ و ٢٧٦/٨.

**سەرنج:** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەروەک چۆن قورئان واجبە کاری پێبکەین و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەین، بە هەمان شێوە فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ وەربگرین و واجبە فەرمانەکانی جێبەجێ بکەین.

ئەوەش ڕێکە لەگەڵ ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۝٨٠﴾ النساء. واتە: هەر کەسێک گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکات ئەوە بەڕاستی گوێڕایەڵی خوای کردوە، وە هەروەها لەگەڵ ئایەتی: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣﴾ النجم. وە لە هەواو هەوەسەوە قسە ناکات (کە قورئان دەخوێنێت).

٤- عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ «إِذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا لَمْ يَعْدُهُ، وَلَمْ يُقَصِّرْ دُونَهُ»[١].

واتە: ئەبو جەعفەر ﷺ دەڵێ: کاتێک ئیبنو عومەر ﷺ، فەرموودەیەکی دەبیست لە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ زیادو کەمەی بە فەرموودەکە نەدەکرد (وەک خۆی دەیگێڕایەوەو کاری پێدەکرد).

**سەرنج:** ئەوەمان پێدەڵێ کە هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێ بە ئەوپەڕی ئەمانەتەوە فەرموودەکانیان بە ئێمە گەیاندووە، وە فێری ئەدەبی فەرموودە گێڕانەوەمان دەکات.

٥- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ نَذْكُرُ الْفَقْرَ وَنَتَخَوَّفُهُ، فَقَالَ: «آلْفَقْرَ تَخَافُونَ؟ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَتُصَبَّنَّ عَلَيْكُمُ الدُّنْيَا صَبًّا، حَتَّى لَا يُزِيغَ قَلْبَ أَحَدِكُمْ إِزَاغَةً إِلَّا هِيهْ، وَايْمُ اللَّهِ، لَقَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى مِثْلِ الْبَيْضَاءِ، لَيْلُهَا وَنَهَارُهَا سَوَاءٌ» لح قَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: صَدَقَ وَاللَّهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَرَكَنَا وَاللَّهِ عَلَى مِثْلِ الْبَيْضَاءِ، لَيْلُهَا وَنَهَارُهَا سَوَاءٌ»[٢].

واتە: ئەبو دەڕداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان لەوکاتەدا باسی هەژاریمان دەکردو دەترساین (تووشمان ببێت)، ئەویش فەرمووی: لە هەژاری دەترسێن؟ سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، دونیا بە سەرتاندا دەڕژێ، بە جۆرێک کە دڵتان لای دونیا بێ، تەنها داوای زیاترو زیاتر بکات، وە سوێند بە خوا لەسەر ڕۆشنایی و ڕووناکییەک جێم هێشتوون، کە شەو و ڕۆژی وەک یەکە

---

(١) صحيح.

(٢) حسن.





(هیچ شتێک نەماوە ڕوون و ئاشکرا نەبێ بۆتان). ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستی فەرموو، وە سوێند بە خوا لەسەر ڕۆشنایی و ڕووناکییەک جێی هێشتین، کە شەو و ڕۆژی وەک یەک وایە.

٦- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي مَنْصُورِينَ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ»[١].

واتە: موعاویەی کوڕی قوڕڕە لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام (تا کۆتایی دونیا) کۆمەڵە کەسانێک لە ئوممەتی من بەسەرکوتوویی دەمێننەوە (لەسەر هەق)، ئەوانەی کە یارمەتییان نادەن (یان دژایەتییان دەکەن) ناتوانن هیچ زەرەرێکیان پێ بگەیەنن، تا هاتنی ڕۆژی دوایی.

٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: قَالَ: «لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي قَوَّامَةً عَلَى أَمْرِ اللَّهِ، لَا يَضُرُّهَا مَنْ خَالَفَهَا»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بەردەوامی کۆمەڵێک دەبن لە ئوممەتی من کە فەرمانەکانی خوا ڕادەگرن (وەک خۆیان دەیانپارێزن و جێبەجێیان دەکەن و بەرگرییان لێدەکەن)، هەر کەسێک دژایەتیشیان بکات، ناتوانێ زیانیان لێ بدات.

**سەرنجێک:** لەسەر فەرموودەی (٦ و ٧)، ئەو دوو فەرموودەیە لەلایەک موژدەبەبەخشن بۆ ئێمەی مسوڵمان، لەلایەکی تریش بە ئاماژە ئەوەمان پێدەڵێن: کە هەردەم بە دوای گەڕاندابین تاکو ئەو کۆمەڵەیە دەبینینەوە کە نزیکترینن لە شەریعەتی خوای میهرەبان، وە زانایان ئەو فەرموودەیە و هاوشێوەکانی بە بەڵگە دێننەوە لەسەر ئەوەی کە هەمیشە تا کۆتایی دونیا ئەهلی ئیجتیهاد و موجتەهید هەر دەمێنن.

٨- عَنْ بَكْرُ بْنُ زُرْعَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عِنَبَةَ الْخَوْلَانِيَّ ﷺ، وَكَانَ قَدْ صَلَّى الْقِبْلَتَيْنِ، مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَزَالُ اللَّهُ يَغْرِسُ فِي هَذَا الدِّينِ غَرْسًا يَسْتَعْمِلُهُمْ فِي طَاعَتِهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٩٢.

(٢) حسن صحيح.

(٣) حسن.

واتە: بەکری کوڕی زورعە دەڵێ: گوێم لە ئەبو عینەبەی خەولانیی ﷺ بوو، کە ڕووەو هەردوو قیبلە نوێژی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە، (جا ئەبو عینەب) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەردەوام خوا کەساتێک دامەزراوو جێگیر دەکات لەو دینەدا (هۆکارەکانی فەرمانبەرداریيان بۆ ئاسان و فەراهەم دەکات)، کە بەکاریان دەهێنێت لە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریی خۆیدا.

٩- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَامَ مُعَاوِيَةُ ﷺ، خَطِيبًا فَقَالَ: أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا وَطَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى النَّاسِ، لَا يُبَالُونَ مَنْ خَذَلَهُمْ وَلَا مَنْ نَصَرَهُمْ»[1].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: موعاویە ﷺ وتارێکدا هەستا و گوتی: کوا زاناکانتان؟ کوا زاناکانتان؟ (بۆ ئەوەی پشتگیری قسەکەی بکەن)، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: قیامە بەرپا نابێ (تا ئەو ڕۆژەی) کۆمەڵێک لە ئوممەتی من هەر بەسەربەرزی (لەسەر هەق و ڕاستە ڕێ) دەمێنن لە ناو خەڵکدا، گوێ نادەن بە نەیارەکانیان و ئەوانەی دژایەتییان دەکەن، وە ئەوانەی کە هاوکاری و یارمەتیشیان دەدەن (لەبەر بەهێزی و دامەزراویان لەسەر ئەو ڕاستە ڕێیە).

١٠- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يزالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الْحَقِّ مَنْصُورِينَ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ ﷻ»[2].

واتە: سەوبان ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام و هەمیشە کۆمەڵێک لە ئوممەتی من لەسەر هەق و ڕاستی بەسەرکەوتوویی دەمێنن، هەر کەسێکیش دژایەتییان بکات ناتوانێ زیانیان پێ بگەیەنێ، تا (ئەو ڕۆژەی) فەرمانی خوا ﷻ جێبەجێ دەبێ (کە کۆتایی دونیایە).

---

(١) صحيح. انظر البخاري: ٧١ و ٣١١٦ و ٣٦٤١ و ٧٤٦٠، ومسلم: ١٠٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٢٠، وأبو داود: ٤٢٥٢، والترمذي: ٢٢٢٩.

١١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَخَطَّ خَطًّا، وَخَطَّ خَطَّيْنِ عَنْ يَمِينِهِ، وَخَطَّ خَطَّيْنِ عَنْ يَسَارِهِ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ فِي الْخَطِّ الْأَوْسَطِ، فَقَالَ: «هَذَا سَبِيلُ اللَّهِ» ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ﴿١٥٣﴾﴾ الأنعام[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووین، ڕاستە هێڵێکی کێشا، وە دوو ڕاستە هێڵی تری کێشا لەلای ڕاستی (ڕاستە هێڵەکە)، وە دوو ڕاستە هێڵی دیکەی کێشا لەلای چەپی (ڕاستە هێڵەکە)، پاشان دەستی لەسەر ڕاستە هێڵەکەی ناوەڕاست داناو فەرمووی: ئەوە ڕاستەڕێی خوایە، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ﴿١٥٣﴾﴾ الأنعام، واتە: (فەرمانی داوە کە) بێگومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کەڕاست و دروستە کەواتە شوێنی بکەون و شوێنی کوێرە ڕێگا وڕێچکەکانی تر مەکەون چونکە دوورتان دەخەنەوە و لاتان دەدەن لەڕێگەی خوا.

**سەرنج:** ئەم فەرموودەیە جگە لە مانا و مەبەستەکەی، ئەوەشمان فێر دەکات کە دەکرێ شێوازی جۆراوجۆر بەکاربێنین بۆ فێرکردن و فێربوون، هەروەک چۆن پێغەمبەر ﷺ لە ڕێی وێنە و نەخشەکێشانەوە، هاوەڵەکانی فێرکردوە و شتی بۆ ڕوون کردونەوە.

## بابەت: بە گەورە دانانی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و، هەڕەشەی توند لەسەر ئەوانەی کە ڕووبەڕووی فەرموودەکان دەوەستنەوە

١٢- عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ معْدِ يكَرِبَ الْكِنْدِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: « يُوشِكُ الرَّجُلُ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ، يُحَدَّثُ بِحَدِيثٍ مِنْ حَدِيثِي، فَيَقُولُ: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابُ اللَّهِ ﷻ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهِ مِنْ حَلَالٍ اسْتَحْلَلْنَاهُ، وَمَا وَجَدْنَا فِيهِ مِنْ حَرَامٍ حَرَّمْنَاهُ، أَلَا وَإِنَّ مَا حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِثْلُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٦٦٤، وانظر أبو داود: ٤٦٠٤.





واته: میقدامی کوڕی مەعدی یەکریبی کیندیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نزیکه (ڕۆژێک بێ) کە پیاوێک پاڵ بکەوێ لەسەر جێگەکەی خۆی، وە فەرموودەیەکی بۆ باس بکرێ لە فەرموودەکانی من، پاشان (وەک ڕەتکردنەوەی فەرموودەکە) بڵێ: لە نێوان ئێمەو ئێوەدا قورئانی خوا ﷻ هەیە، هەر شتێکمان بینی لە قورئاندا حەڵاڵ کرابوو، ئێمەش بە حەڵاڵی دەزانین، وە هەر شتێکمان بینی لە قورئاندا حەرام و قەدەغە کرابوو، بە حەرامی دادەنێین، (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:) ئاگاداربن! هەر شتێک پێغەمبەری خوا ﷺ حەرامی کردبێ، وەک ئەوە وایە کە خوا حەرامی کردبێ.

**سەرنج:** لەو فەرموودەیەدا هەواڵی ئەوانەمان پێدەدات کە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ڕەت دەکەنەوە، کە ئەو کۆمەڵەش لە دوای پێغەمبەر ﷺ پەیدابوون و، ئێستاش لە ڕۆژگاری ئێمەدا هەن، هەر لەو فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ بە توندی وەڵامیان دەداتەوەو، ئەوەمان پێ دەفەرموێ کە هیچ جیاوازییەک نیە لەنێوان قورئان و فەرموودەی صەحیحدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانەکانی خوای گەیاندووەو لەخۆیەوە هیچی نەفەرمووە.

**١٣-** عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ، يَأْتِيهِ الْأَمْرُ مِمَّا أَمَرْتُ بِهِ، أَوْ نَهَيْتُ عَنْهُ، فَيَقُولُ: لَا أَدْرِي، مَا وَجَدْنَا فِي كِتَابِ اللَّهِ اتَّبَعْنَاهُ»[1].

واته: عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕافیع لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە ئێوە نەبینم لەسەر جێگاکەی خۆی پاڵ بکەوێت و فەرمانێک لە فەرمانەکانی منی پێ بگات، یان قەدەغە کراوێک لەو شتانەی کە من لێم قەدەغە کردوە، پاشان بڵێ: نازانم و ئاگام لێ نیە (بۆ نکوولی کردنی فەرموودەکەو بڵێ: تەنها) ئەوەی کە بینیومانە لە قورئانی خوا هەیە شوێنی دەکەوین.

**١٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٦٠٥، والترمذي: ٢٦٦٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٩٧، ومسلم: ١٧١٨، وأبو داود: ٤٦٠٦.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شتێکی نەبوو زیاد بکات لەو دینەداو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەبێ، ئەوە ڕەت دەکرێتەوە (بە ڕووی خاوەنەکەی دادەدرێتەوەو، پێویستە لەسەر هەر تاکێک کە نکوولی بکات و بەرگری لە سوننەت بکات).

سەرنج: لەو فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ناکرێ و نابێ هیچ شتێک لە دیندا زیاد بکرێ ئەگەر بنچینەیەکی شەرعی نەبێت، بەڵام ئەگەر لە شەرعدا بنچینەیەک هەبێ ئەوە بەر ئەو فەرموودەیە ناکەوێ.

وە بە ئاماژە ئەوەمان پێ دەڵێ: کە بەپێی توانا ڕووبەڕووی ئەو کەسانە ببینەوە کە شت گەلێ زیاد دەکەن کە لە شەرعدا جێگایان نابێتەوە، ئەوەش بەوە دەکرێ کە شارەزاییەکی تەواومان هەبێ بە زانستە شەرعییەکان و بەڵگەکانی، ئەگەر نا ناکرێ بە هەوا و ئارەزوو شت زیاد بکەین یان ڕەتی بکەینەوە.

**١٥-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﵁، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، حَدَّثَهُ: أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ خَاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فِي شِرَاجِ الْحَرَّةِ الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا النَّخْلَ، فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الْمَاءَ يَمُرُّ، فَأَبَى عَلَيْهِ، فَاخْتَصَمَا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْقِ يَا زُبَيْرُ، ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ» فَغَضِبَ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ؟ فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «يَا زُبَيْرُ، اسْقِ، ثُمَّ احْبِسِ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ» قَالَ: فَقَالَ الزُّبَيْرُ: وَاللَّهِ، إِنِّي لَأَحْسِبُ هَذِهِ الْآيَةَ، نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ النساء[1].

واتە: عورِوەی کوڕی زوبەیر ﵁ دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﵁ بۆی گێڕاوەتەوە کە پیاوێک لە ئەنصارِ لەگەڵ زوبەیر لێیان بوو بە کێشە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئاوەڕۆ (جۆگا)ی ئاو داشتنی باغی خورما، ئەنصارییەکە گوتی: (لێ گەڕێ) با ئاوەکە بڕوات، (زوبەیریش) ڕازی نەبوو، بۆیە کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی زوبەیر ئاو داشتنەکەت تەواو بکەو، دواتر ئاوەکە بەردەوە بۆ دراوسێیەکەت (لێی گەڕێ و ڕایبەستەو

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٦٠، ومسلم: ٢٣٥٧، وأبو داود: ٣٦٣٧، والترمذي: ١٣٦٣ و ٣٠٢٧، والنسائي: ٥٤٠٧ و ٥٤١٦.



بەری پێ مەگرە)، ئەنصارییەکە (بەو بڕیارە) تووڕە بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە کوڕی پورتە ئاوا بڕیارتدا؟ (پێی وابووە دژی بەرژەوەندی ئەو بڕیاری داوە!! نەیزانی کە بڕیارەکەی پێغەمبەر ﷺ زیاتر لە بەرژەوەندی ئەو دایە، نەوەک زوبەیر)، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی گۆڕا (لە توڕەیی دا) پاشان فەرمووی: ئەی زوبەیر ئاو داشتنەکەت بکەو، پاشان ئاوەکە گل بدەوە، تاوەکو بگەڕێتەوە بۆ ڕەگی درەختەکان (یان تاوەکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوورە و بەربەستەی کە لە باغەکەدایە، چونکە ئەوە هەقی زوبەیر بوو، بڕیاری یەکەمجار بە چاو پۆشی و لێ بوردەیی بوو، بەڵام ئەنصارییەکە ڕازی نەبوو!) (ڕاوی) دەڵێ: زوبەیر گوتی: سوێند بە خوا من وا دەزانم کە ئەو ئایەتە لە بەر ئەو هۆکارە دابەزی: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء، واتە: نەخێر (وانیە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن) سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوەو دووبەرەکیەکی نێوانیان دا لە پاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بەهیچ بێزارییەک لەو بڕیارەی تۆ داوتەو مل کەچ نەبن بەملکەچیەکی تەواو

**شراج:** جۆگا، ئەو شوێنەی ئاوی پێدا دەڕوات بۆ ناو زەوی و باغ.

**حرة:** زەوی بەردەڵان.

**١٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ أَنْ يُصَلِّينَ فِي الْمَسْجِدِ» فَقَالَ ابْنٌ لَهُ: إِنَّا لَنَمْنَعُهُنَّ، فَقَالَ: فَغَضِبَ غَضَبًا شَدِيدًا، وَقَالَ: أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وتقولُ: إِنَّا لَنَمْنَعُهُنَّ؟**[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕێ بە ئافرەتان مەگرن بۆ ئەوەی نوێژ لە مزگەوت بکەن، (لەو کاتەدا) یەکێ لە کوڕەکانی (ئیبن عومەر ﵄) گوتی: ئێمە ڕێیان لێ دەگرین (بۆ مزگەوت)، عەبدوڵڵا زۆر بەتوندی توڕە بوو (بەو قسەیە)و گوتی: من لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەت بۆ دەگێڕمەوە، کەچی تۆ دەڵێی: ئێمە ڕێگایان پێ نادەین؟

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٦٥، ومسلم: ٤٤٢، وأبو داود: ٥٦٨، والترمذي: ٥٧٠، والنسائي: ٤٢/٢.

**سەرنج:** ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێ ئەوپەڕی ئەدەبمان هەبێ لە بەرانبەر حوکمێک کە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ دەرچووە، واتە: نابێ مشت و مڕو دەمەدەمێی نەشیاو بکەین.

**١٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا إِلَى جَنْبِهِ ابْنُ أَخٍ لَهُ، فَخَذَفَ، فَنَهَاهُ، وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْهَا وَقَالَ: «إِنَّهَا لَا تَصِيدُ صَيْدًا، وَلَا تَنْكِي عَدُوًّا، وَإِنَّهَا تَكْسِرُ السِّنَّ، وَتَفْقَأُ الْعَيْنَ» قَالَ: فَعَادَ ابْنُ أَخِيهِ يخذفَ فَقَالَ: أُحَدِّثُكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْهَا، ثُمَّ عُدْتَ تَخْذِفُ، لَا أُكَلِّمُكَ أَبَدًا[١].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەگێڕێتەوە: کە برازاکەی لە تەنیشتی دانیشتبوو، وە بە پەنجەکانی (پەنجەی شایەتمان لە دەستی ڕاست و هەمان پەنجەی بەرانبەری لە دەستی چەپی) بەردی دەخستە ناویان و بەردەکەی دەهاویشت، عەبدوڵڵا ڕێگری لێکردو گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوەو فەرموویەتی: (ئەو جۆرە بەرد هاویشتنە) هیچ نێچیرێک ڕاو ناکات، وە ئازار بە دوژمن ناگەیەنێ، (بەڵکو) ئەو کارە دەبێتە هۆی ددان شکاندن و کوێر کردنی چاو، سەعید دەڵێ: دوای ئەوە جارێکیتر برازاکەی هەمان ڕەفتاری ئەنجام دایەوە! عەبدوڵڵاش پێی گوت: من دەڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارەی قەدەغە کردوە، کەچی تۆ دووبارەت کردەوە؟ کەواتە هەرگیز قسەت لەگەڵدا ناکەمەوە.

**١٨- عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ قَبِيصَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ الْأَنْصَارِيَّ النَّقِيبَ ﷺ، صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: غَزَا مَعَ مُعَاوِيَةَ ﷺ أَرْضَ الرُّومِ، فَنَظَرَ إِلَى النَّاسِ وَهُمْ يَتَبَايَعُونَ كِسَرَ الذَّهَبِ بِالدَّنَانِيرِ، وَكِسَرَ الْفِضَّةِ بِالدَّرَاهِمِ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ تَأْكُلُونَ الرِّبَا، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا تَبْتَاعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ، إِلَّا مِثْلًا بِمِثْلٍ، لَا زِيَادَةَ بَيْنَهُمَا وَلَا نَظِرَةً» فَقَالَ: لَهُ مُعَاوِيَةُ يَا أَبَا الْوَلِيدِ، لَا أَرَى الرِّبَا فِي هَذَا، إِلَّا مَا كَانَ مِنْ نَظِرَةٍ، فَقَالَ عُبَادَةُ: أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَتُحَدِّثُنِي عَنْ رَأْيِكَ لَئِنْ أَخْرَجَنِي اللَّهُ لَا أُسَاكِنُكَ بِأَرْضٍ لَكَ عَلَيَّ فِيهَا إِمْرَةٌ، فَلَمَّا قَفَلَ لَحِقَ بِالْمَدِينَةِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: مَا أَقْدَمَكَ يَا أَبَا الْوَلِيدِ؟ فَقَصَّ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ، وَمَا قَالَ مِنْ مُسَاكَنَتِهِ، فَقَالَ: ارْجِعْ يَا أَبَا الْوَلِيدِ إِلَى أَرْضِكَ، فَقَبَحَ اللَّهُ أَرْضًا لَسْتَ فِيهَا وَأَمْثَالُكَ، وَكَتَبَ إِلَى مُعَاوِيَةَ: لَا إِمْرَةَ لَكَ عَلَيْهِ، وَاحْمِلِ النَّاسَ عَلَى مَا قَالَ، فَإِنَّهُ هُوَ الْأَمْرُ[٢].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨٤١ و ٥٤٧٩ و ٦٢٢٠، ومسلم: ١٩٥٤ وانظر: ٣٢٢٧، وأبو داود: ٥٢٧٠، والنسائي: ٤٧/٨.

(٢) صحيح. انظر مسلم: ١٥٨٧.

واتە: ئیسحاقی کوڕی قەبیصە لە باوکی دەگێڕێتەوە کە عوبادەی کوڕی صامیتی ئەنصاڕی نەقیب ﷺ هاوڕێی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ موعاویە ﷺ لە جەنگدا بوو لە خاکی ڕۆم، تەماشای کرد خەڵکی زێڕی شکاوو نوقسان دەگۆڕنەوە بە دینار، وە زیوی شکاوو نوقسانیش بە درهەم (واتە: بە زیادە دەیان گۆڕییەوە)، عوبادەش گوتی: ئەی خەڵکینە ئێوە (بەو کارەتان) ڕیبا دەخۆن، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن (مەگۆڕنەوە)، مەگەر وەک یەک بن، نابێ زیادەیان لە بەیندا هەبێ و، نابێ بە قەرزیش بێ (واتە: دەست بە دەست و بێ زیادو کەم)، موعاویەش پێی گوت: ئەی باوکی وەلید پێم وانیە ئەو کارە ڕیبا بێت، مەگەر قەرزی تێبکەوێ، عوبادەش گوتی: من فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ تۆ باس دەکەم، تۆش ڕای خۆتم پێ دەڵێی؟ ئەگەر خوا کردی لێرە دەرچووین، هەرگیز لە خاکێکدا دانانیشم فەرمانی تۆ بە سەرمەوە بێ، جا کاتێک گەڕانەوە (عوبادە) ڕۆیشت بۆ مەدینە، عومەری کوڕی خەتتاب پێی گوت: چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە ئەی باوکی وەلید؟ ئەویش چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە و باسی ئەوەشی بۆ کرد، کە (گوتوویەتی بە موعاویە) لەگەڵ تۆ لە خاکێکدا دانانیشم، عومەریش گوتی: بگەڕێوە بۆ نیشتیمانەکەت، خوا بەرەکەت لە خاکێک هەڵگرێ، کە تۆو وێنەی تۆی تێدا نەبێ (بۆ بەرگری لە سوننەت)، وە (عومەر) نوسراوێکی نوسی بۆ موعاویە: هیچ فەرمان و ویلایەتێکت نیە بەسەر عوبادەدا، وە خەڵکی هەڵبنێ لەسەر ئەو (حوکم) بڕیارەی کە عوبادە گوتوویەتی، (چونکە) ئەوە بڕیارە ڕاستەکەیە.

١٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَظُنُّوا بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، الَّذِي هُوَ أَهْنَاهُ، وَأَهْدَاهُ، وَأَتْقَاهُ[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ گوتوویەتی: هەر کاتێک لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەم بۆتان گێڕایەوە، بە جۆرێک وەری بگرن و ڕاڤەی بکەن کە شایستەی پێغەمبەری خوایە ﷺ (واتە: ئەگەر فەرموودەکە چەند مانایەکی هەڵدەگرت) ئەو مانایەی لێوەربگرن کە لە دڵدا قبووڵترەو لە بەڵگەدا بەهێزترەو لە هەق نزیکترە.

---

(١) ضعيف.

**سەرنج:** لەو فەرمایشتە ئەوە فێردەبین کە هەردەم ئاسانکار و مژدەبەخش بین و، ئەوپەڕی هەوڵبدەین بە شێوازێک ئەو دینە بگەیەنین کە هەموو کەسێک بتوانێ خۆی بە خاوەنی بزانێ و لەسەری قورس و گران نەکەین.

٢٠- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁، قَالَ: إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا، فَظُنُّوا بِهِ الَّذِي هُوَ أَهْنَاهُ، وَأَهْدَاهُ، وَأَتْقَاهُ[١].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﵁ گوتوویەتی: هەر کاتێک لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەیەکم بۆتان گێڕاوە، بە جۆرێک وەری بگرن کە شایستەی پێغەمبەرە ﷺ (واتە: ئەگەر فەرموودەکە چەند مانایەکی هەڵدەگرت)، ئەو مانایەی لێوەربگرن کە لە دڵدا قبووڵترەو لە بەڵگەدا بەهێزترەو لە هەق نزیکترە.

٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لَا أَعْرِفَنَّ مَا يُحَدَّثُ أَحَدُكُمْ عَنِّي الْحَدِيثَ وَهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَى أَرِيكَتِهِ، فَيَقُولُ: اقْرَأْ قُرْآنًا، مَا قِيلَ مِنْ قَوْلٍ حَسَنٍ فَأَنَا قُلْتُهُ[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نەبینم و نەزانم کەسێک لە ئێوە فەرموودەی منی پێبگات و، ئەویش (بە خۆ بەزل زانینەوە) لەسەر جێگاکەی پاڵ بکەوێ و، (بە نکوولیکردنەوە) بڵێ: قورئان بخوێنەوە، (واتە: فەرموودەکە ڕەت دەکاتەوەو دەڵێ: ئەوەی لە قورئاندایە بەسمانەو فەرموودەکە وەرناگرێ، جا یان لە نەزانینە، یان بە ئەنقەست و مەبەستە)، پێغەمبەر ﷺ (بۆ ڕەدی ئەوانە) دەفەرموێ: ئەوەی قسەو وتەی جوان بێ (وە لە من بگێڕدرێتەوە)، ئەوە من گوتومە.

(لا أعرفن): وەک (لا ألفين) وایە، بۆ ئەوە بەکاردێ وەک ئەوەی لە لای خۆمان بڵێی: شتی ئاواتان لێ نەبینم، یان کارێکی ئاوا نەکەن.

**سەرنج:** واتە بە هیچ شێوەیەک و بە هیچ بەهانەیەکی ناڕەوا دروست نیە فەرموودە ڕەت بکەینەوە، لە فەرموودەکەدا ئاماژە بەوە دەکات کە پشت کردن لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر ﷺ پشت کردنە لە قورئان، وە بە ناڕاستەوخۆ هەڕەشە لەوانە دەکات کە بەرانبەر بە فەرموودە لووت بەرزی دەنوێنن.

---

(١) صحيح.

(٢) منكر.




٢٢- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ ، قَالَ لِرَجُلٍ: يَا ابْنَ أَخِي، إِذَا حَدَّثْتُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا، فَلَا تَضْرِبْ لَهُ الْأَمْثَالَ[1].

واتە: ئەبو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ بە پیاوێکی گوت: ئەی برازاکەم کاتێک فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕمەوە بۆت، نموونەو وێنەی (نابەجێی) بۆ مەهێنەوە.

## بابەت: پارێزکردن لە گێڕانەوەی فەرموودە لە پێغەمبەری خوا ﷺ

٢٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ ﷺ، قَالَ: مَا أَخْطَأَنِي ابْنُ مَسْعُودٍ عَشِيَّةَ خَمِيسٍ إِلَّا أَتَيْتُهُ فِيهِ، قَالَ: فَمَا سَمِعْتُهُ يَقُولُ لِشَيْءٍ قَطُّ، قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ عَشِيَّةٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَنَكَسَ، قَالَ: «فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ، فَهُوَ قَائِمٌ مُحَلَّلَةً، أَزْرَارُ قَمِيصِهِ، قَدْ اغْرَوْرَقَتْ عَيْنَاهُ، وَانْتَفَخَتْ أَوْدَاجُهُ» قَالَ: أَوْ دُونَ ذَلِكَ، أَوْ فَوْقَ ذَلِكَ، أَوْ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ، أَوْ شَبِيهًا بِذَلِكَ[2].

واتە: عەمری کوڕی مەیمونە ﷺ دەڵێ: هیچ ئێوارەیەکی پێنج شەممە نەبووە (بەسەرمدا تێنەپەڕیوە)، کە نەچووبمە لای ئیبنو مەسعوود، دەڵێ: هەرگیز گوێم لێی نەبووە بۆ شتێک (کە باسی کردبێ) بڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وای فەرمووە، بەڵام ئێوارەیەک گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (واتە: فەرموودەیەکی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە)، عەمر دەڵێ: (ئیبنو مەسعوود) سەری داخستبوو، دەڵێ: تەماشام کرد بە پێوە بوو، قردێلە (قۆپچە)ـی کراسەکەی کرابویەوە، چاوەکانی پڕ ببوون لە فرمێسک، وە دەمارەکانی ملی گرژ بوو بوون، (بۆ ئەوەی پارێز بکات لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ)، ئیبنو مسعوود گوتی: پێغەمبەر ﷺ (ئاوای فەرموو) یان غەیری ئەوە، یان لەسەرووی ئەوە، یان نزیک لەوە، یان لە وێنەی ئەوە. (واتە: ڕاستەوخۆ فەرموودەکەی نەدایە پاڵ پێغەمبەر ﷺ نەبادا وشەیەکی لەبیر کردبێ، یان هەڵەی کردبێ، ئەوەش ئەوپەڕی ڕێزگرتنە لە پێغەمبەر ﷺ وە لە فەرمایشتەکانی).

---

(١) حسن.

(٢) صحيح.





**سەرنج:** لە کاتی گێڕانەوەی فەرموودەدا، دەبێ زۆر ئاگاداربین و وریابین هەڵە نەکەین، چونکە فەرموودە گێڕانەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەقڵ کردنی وەحییە، هەڵەکردنیش لە گێڕانەوەی وەحییدا باجەکەی قورسە و هەڕەشەی توندی لەسەرە.

**٢٤- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ ﷺ، قَالَ: كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، إِذَا حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا فَفَرَغَ مِنْهُ قَالَ: أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ**[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی سیرین ﷺ دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ هەر کاتێک فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕایەوەو تەواو دەبوو، دەیگوت: (ئاوای فەرموو) یان بەو جۆرەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی. (ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دەگونجێ فەرموودەکەی بە مانا گێڕابێتەوە، واتە: نەوەک وەکو دەق).

**٢٥- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ﷺ، قَالَ: قُلْنَا لِزَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ: حَدِّثْنَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «كَبِرْنَا وَنَسِينَا، وَالْحَدِيثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَدِيدٌ»**[2].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا ﷺ دەڵێ: بە زەیدی کوڕی ئەرقەمان گوت: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەمان بۆ بگێڕەوە، ئەویش گوتی: بە تەمەندا چووین و شتمان بیر دەچێتەوە، فەرموودە گێڕانەوەش لە پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکی قورس و گرانە.

**سەرنج:** هەندێ لە زانایان دەڵێن: کە مرۆڤ گەیشتە ئەو تەمەنەی کە شتی بیردەچێتەوە نابێ فەرموودە بگێڕێتەوە و ئەگەر گێڕاشیەوە لێی وەرناگیرێ، نەبادا هەڵە بکات.

**٢٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي السَّفَرِ، قَالَ: سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ يَقُولُ: «جَالَسْتُ ابْنَ عُمَرَ سَنَةً، فَمَا سَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْئًا»**[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەفەر دەڵێ: گوێم لە شەعبی بوو دەیگوت: ساڵێک هاونشینی ئیبنو عومەر بووم، لێم نەبیست هیچ شتێک لە پێغەمبەری خوا ﷺ بگێڕێتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. انظر البخاري: ٧٢٦٧، ومسلم: ١٩٤٤.




**٢٧- عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّا كُنَّا نَحْفَظُ الْحَدِيثَ، وَالْحَدِيثُ يُحْفَظُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَّا إِذَا رَكِبْتُمُ الصَّعْبَ وَالذَّلُولَ، فَهَيْهَاتَ»[1].**

**واتە: ئیبنو تاوس لە باوکی دەگێڕێتەوە گوتوویەتی: گوێم لە ئیبنو عەبباس ﷺ بوو دەیگوت: ئێمە کاتی خۆی فەرموودەمان وەردەگرت و لەبەرمان دەکرد (لە کەسانێک کە ڕاستگۆ بوون)، وە فەرموودەش لە خودی پێغەمبەری خوا ﷺ وەردەگیرێ (بۆیە جێی خۆیەتی کە زۆر گرنگی پێ بدرێت)، بەڵام ئێوە کە لە هەرکەس وەردەگرن (گوێ نادەن بەوەی کە ئەو کەسە شایەنی لێوەرگرتنە یان نا!)، ئەوە زۆر دوورە ئێمە لێتان وەرگرین، (یان واتە: ئەوانە دوورن لەوەی کە فەرموودەیان لێوەربگیرێ).**

**سەرنج: لەو فەرمایشتەوە ئەوە دەزانین کە هەر لەسەرەتاوە پارێزگاری لە فەرموودە کراوەو لە کەسێک وەرنەگیراوە کە جێی متمانە نەبووبێت.**

**٢٨- عَنْ قَرَظَةَ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِلَى الْكُوفَةِ وَشَيَّعَنَا، فَمَشَى مَعَنَا إِلَى مَوْضِعٍ يُقَالُ لَهُ صِرَارٌ، فَقَالَ: «أَتَدْرُونَ لِمَ مَشَيْتُ مَعَكُمْ؟» قَالَ: قُلْنَا: لِحَقِّ صُحْبَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلِحَقِّ الْأَنْصَارِ، قَالَ: لَكِنِّي مَشَيْتُ مَعَكُمْ لِحَدِيثٍ أَرَدْتُ أَنْ أُحَدِّثَكُمْ بِهِ، فَأَرَدْتُ أَنْ تَحْفَظُوهُ لِمَمْشَايَ مَعَكُمْ، إِنَّكُمْ تَقْدَمُونَ عَلَى قَوْمٍ لِلْقُرْآنِ فِي صُدُورِهِمْ هَزِيزٌ كَهَزِيزِ الْمِرْجَلِ، فَإِذَا رَأَوْكُمْ مَدُّوا إِلَيْكُمْ أَعْنَاقَهُمْ، وَقَالُوا: أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ، فَأَقِلُّوا الرِّوَايَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ أَنَا شَرِيكُكُمْ»[2].**

**واتە: قەڕەزەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب ئێمەی نارد بۆ کوفەو هات لەگەڵمان تاوەکو بەڕێمان بکات، لەگەڵمان هات تاوەکو شوێنێک پێی دەڵێن: صیرار (شوێنێکە لە نزیک مەدینە)، جا گوتی: ئایا دەزانن بۆچی لەگەڵتان هاتووم؟ دەڵێ گوتمان: لە بەر خاتری ئەو هاوڕێیەتییەی هەمان بووە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وە لە بەر خاتری ئەنصار، عومەر گوتی: بەڵام بۆ ئەوە لەگەڵتان هاتووم کە دەمەوێ قسەیەکتان بۆ باسبکەم، وە ویستم کە لەبەری بکەن و لە بیرتان بێ بە هۆی ئەو هاتنەی من لەگەڵتان، ئێوە دەچنە ناو قەومێک کە سنگیان وەک مەنجەڵی سەر**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: المقدمة ١٣/١.

(٢) صحيح.

ئاگر دەکوڵێ و دەنگی گزە گزی (کوڵینی) دێ بۆ قورئان (زۆر دڵیان لای قورئانە)، وە کاتێکیش ئێوە دەبینن گەردنیان درێژ دەکەن بۆ لاتان (بۆ ئەوەی فەرموودەتان لێ ببیستن)، وە دەڵێن ئەوانە هاوەڵەکانی موحەممەدن ﷺ، بۆیە کەمترین فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگێڕنەوە، (چونکە فەرموودە گێڕانەوە لە پێغەمبەر ﷺ کارێکی گەورەو گرانە سادە نیە، یان لەبەر ئەوەی لەڕاددە بەدەر سەرقاڵیان نەکەن بە فەرموودە، بە شێوەیەک لە قورئان بێ ئاگابن)، پاشان منیش هاوبەشتانم (لە چاکەو پاداشت).

**سەرنج:** ئەوەی لەو فەرمایشتە وەردەگیرێ ئەوەیە کە زۆر سەرقاڵ بوونمان بە فەرموودەوە قوڕئانمان بیر نەباتەوە، وە هەروەها بە ئەندازەی پێویست فەرموودە بگێڕینەوە نەک لە هەموو شوێن و بۆ هەموو کەس وەک یەک فەرموودە بگێڕینەوە.

**٢٩-** عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ، قَالَ: «صَحِبْتُ سَعْدَ بْنَ مَالِكٍ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَمَا سَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِحَدِيثٍ وَاحِدٍ»[١].

واتە: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: هاوڕێیەتی سەعدی کوڕی مالیکم کرد لە مەدینەوە بۆ مەککە، تەنانەت فەرموودەیەکم لێ نەبیست کە لە پێغەمبەر ﷺ بیگێڕێتەوە.

**سەرنج:** کۆی ئەو هەواڵانەی کە لە هاوەڵان و زانایان هاتووە لەسەر توندگیری بۆ گێڕانەوەی فەرموودە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زۆر پێویست نەبووبێ، وە یاخود بۆ کەسی متمانە پێکراو نەبووبێ، فەرموودەیان نەگێڕاوەتەوە، نەک ئەوەی بڵێی هەر فەرموودەیان نەگێڕاوەتەوە!! ئەی ئەگەر وابێ، ئەو فەرموودانەی گەیشتوون بەدەستی ئێمە لە کوێوە هاتوون!!

## بابەت: هەڕەشەی توند لەسەر ئەوانەی کە بە ئەنقەست درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵدەبەستن

**٣٠-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[٢].

---

(١) صحيح. انظر البخاري: ٢٨٢٤.

(٢) صحيح متواتر. أخرجه الترمذي: ٢٢٥٧ مطولًا ٣٦٥٩.





واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە ئەنقەست (بە هەر مەبەستێک) بە زمانی منەوە درۆ هەڵبەستێ، با شوێن و جێگای خۆی دیاری بکات لە ئاگردا.

**سەرنج:** زانایان دەفەرموون کە ئەم فەرموودەیە بە وشە و واتاوە موتەواتیرە.

**٣١- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَكْذِبُوا عَلَيَّ، فَإِنَّ الْكَذِبَ عَلَيَّ يُولِجُ النَّارَ»**[1].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: درۆ بە زمانی منەوە مەکەن، (چونکە) درۆ کردن بە زمانی منەوە (دەبێتە هۆی ئەوەی خاوەنەکەی) بچێتە ناو ئاگر.

**٣٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ - حَسِبْتُهُ قَالَ مُتَعَمِّدًا - فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»**[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک (بە هەر مەبەستێک) بە زمانی منەوە درۆ هەڵبەستێ -وا گومان دەبەم فەرمووی بە ئەنقەست-، با شوێن و جێگای خۆی دیاری بکات لە ئاگردا.

**٣٣- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»**[3].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە ئەنقەست (بە هەر مەبەستێک) بە زمانی منەوە درۆ هەڵبەستێ، با شوێن و جێگای خۆی دیاری بکات لە ئاگردا.

**٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَقَوَّلَ عَلَيَّ مَا لَمْ أَقُلْ، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»**[4].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٦، ومسلم: المقدمة ١، والترمذي: ٢٦٦٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٨، ومسلم: المقدمة ١/١٠، والترمذي: ٢٦٦١.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٠، ومسلم: المقدمة ١/١٠.

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە زمانی منەوە قسە هەڵبەستێ (بە ئەنقەست)، وە منیش ئەو قسەیەم نەکردبێ، با شوێن و جێگای خۆی دیاری بکات لە ئاگردا.

٣٥- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ عَلَى هَذَا الْمِنْبَرِ: «إِيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الْحَدِيثِ عَنِّي، فَمَنْ قَالَ عَلَيَّ، فَلْيَقُلْ حَقًّا أَوْ صِدْقًا، وَمَنْ تَقَوَّلَ عَلَيَّ مَا لَمْ أَقُلْ، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[1].

واته: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەو مینبەرە دەیفەرموو: ئاگادار بن! لەوەی کە زۆر فەرموودەم لێ دەگێڕنەوە، هەر کەسێ بە زمانی منەوە قسە دەکات (لە من دەگێڕێتەوە)، با تەنها قسەی دروست و هەق، یان قسەی ڕاست بڵێ (جگە لەوە دوورە لەو زاتە بەرزە ﷺ)، وە هەرکەسێ بە زمان منەوە قسە هەڵبەستێ (بە ئەنقەست)، وە منیش ئەو قسەیەم نەکردبێ، با شوێن و جێگای خۆی دیاری بکات لە ئاگردا.

٣٦- عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: لِلزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، مَا لِيَ لَا أَسْمَعُكَ تُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَمَا أَسْمَعُ ابْنَ مَسْعُودٍ، وَفُلَانًا وَفُلَانًا؟ قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أُفَارِقْهُ مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلَكِنِّي سَمِعْتُ مِنْهُ كَلِمَةً، يَقُولُ: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[2].

واته: عامیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بە زوبەیری کوڕی عەوامم گوت: بۆ فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تۆ نابیستم وەک لە ئیبنو مەسعوودو فڵان و فڵان دەیبیستم؟ (ئەویش) گوتی: من هەرگیز لە پێغەمبەری خوا ﷺ جیا نەبوومەوە لەو کاتەوە کە مسوڵمان بووم، بەڵام فەرموودەیەکم لێ بیستووە (بۆیە فەرموودە ناگێڕمەوە) دەیفەرموو: هەر کەسێک بە ئەنقەست (بە هەر مەبەستێک) بە زمانی منەوە درۆ هەڵبەستێ، با شوێنی خۆی دیاری بکات لە ئاگر.

٣٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[3].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٧، وأبو داود: ٣٦٥١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٠٠٤.




واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە ئەنقەست (بە هەر مەبەستێک) بە زمانی منەوە درۆ هەڵبەستێ، با شوێنی خۆی دیاری بکات لە ئاگردا.

## بابەت: حوکمی ئەو کەسەی کە لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەشزانێ کە ئەوەی دەیگێڕێتەوە درۆیەو هەڵبەستراوە

٣٨- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَدَّثَ عَنِّي حَدِيثًا وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ كَذِبٌ، فَهُوَ أَحَدُ الْكَاذِبَيْنِ»(١).

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ فەرموودەیەک لە منەوە بگێڕێتەوەو، بزانێ کە درۆیە (من نەموتوە)، ئەوە ئەو کەسەش یەکێکە لە دوو درۆزنەکە (واتە: ئەو کەسەی قسەکە دەگێڕێتەوە هاوبەشە و وەک ئەو کەسە تاوانبارە وایە، کە یەکەم جار قسەکەی بە زمان پێغەمبەری خواوە ﷺ هەڵبەستووە).

٣٩- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَدَّثَ عَنِّي حَدِيثًا وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ كَذِبٌ، فَهُوَ أَحَدُ الْكَاذِبَيْنِ»(٢).

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک فەرموودەیەک لە منەوە بگێڕێتەوە، وە بزانێ کە درۆیە (من نەموتوە)، ئەوە ئەو کەسەش یەکێکە لە دوو درۆزنەکە.

٤٠- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَوَى عَنِّي حَدِيثًا وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ كَذِبٌ، فَهُوَ أَحَدُ الْكَاذِبَيْنِ»(٣).

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ فەرموودەیەک لە منەوە بگێڕێتەوە، وە بزانێ کە درۆیە (من نەموتوە)، ئەوە ئەو کەسەش یەکێکە لە دوو درۆزنەکە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٦، ومسلم: المقدمة ١، والترمذي: ٢٦٦٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: المقدمة ٩/١، الترمذي: بإثر ٢٦٦٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٦، ومسلم: المقدمة ١، والترمذي: ٢٦٦٠.





**سەرنج:** ئەو فەرموودە لەگەڵ فەرموودەی ژمارە (٣٨) مەتنەکەی دووبارەیە، بەڵام ئیسنادەکەیان جیاوازی تێدایە، بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ سەرچاوەی پەرتووکەکە.

**٤١- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَدَّثَ عَنِّي بِحَدِيثٍ وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ كَذِبٌ، فَهُوَ أَحَدُ الْكَاذِبَيْنِ»[١].**

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک فەرموودەیەک لە منەوە بگێڕێتەوە، وە بزانێ کە درۆیە (من نەموتوە)، ئەوە ئەو کەسەش یەکێکە لە دوو درۆزنەکە.

**سەرنجێک:** لەسەر ئەو دوو باسەی سەرەوە: کۆی فەرموودەکانی ئەو دوو باسە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە درۆکردن بە زمانی پێغەمبەرەوە ﷺ لە گوناهە هەرە گەورەکانە و، خاوەنەکەی دەچێتە دۆزەخ، جگە لەو کەسەی کە درۆکە هەڵدەبەستێ، ئەو کەسەش کە دەیگێڕێتەوە و دەزانێ هەڵبەستراوە، هەمان حوکمی کەسی یەکەمی هەیە، مەگەر گێڕانەوەکە بۆ ئەوە بێ کە خەڵکی لێ ئاگادار بکرێتەوە کە هەڵبەستراو و درۆیە، ئەوکاتە دروستە بۆ ئەوەی خەڵکی لێی بە ئاگابێ و بیناسێتەوە.

## بابەت: شوێن کە وتنی جێنشینە سەر ڕاست و شارەزاکان

**٤٢- عَنْ الْعِرْبَاضَ بْنَ سَارِيَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، فَوَعَظَنَا مَوْعِظَةً بَلِيغَةً، وَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ، وَذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ، فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَعَظْتَنَا مَوْعِظَةَ مُوَدِّعٍ، فَاعْهَدْ إِلَيْنَا بِعَهْدٍ، فَقَالَ: «عَلَيْكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، وَإِنْ عَبْدًا حَبَشِيًّا، وَسَتَرَوْنَ مِنْ بَعْدِي اخْتِلَافًا شَدِيدًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي، وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْأُمُورَ الْمُحْدَثَاتِ، فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»[٢].**

واتە: عیربازی کوڕی ساریە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوماندا هەستاو ئامۆژگاری کردین بە ئامۆژگارییەکی بەهێزو لەجێ، کە دڵەکانی ئەلەرزاندو چاوەکان فرمێسکیان لێ دەهات، پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە جۆرێک ئامۆژگاریت

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٩١، ومسلم: في المقدمة ٤، الترمذي: ٢٦٦٢.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٦٠٧، والترمذي: ٢٦٧٦.




کردین، وەک ئەوەی شتێکمان پێ بسپێری بۆ دوای خۆت، (فەرموو) وەسیەتەکەتمان پێ بگەیەنە، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: تەقوای خوا بکەن و، لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریی بن، با ئەو کەسەی فەرمانتان پێدەکات بەندەیەکی حەبەشیش بێ (مادام هەڵبژێردراوی خۆتانە)، وە لە دوای من ڕاجیایەکی زۆر دەبینن (جیاوازی لە تێگەشتن بۆ دین و لێکدانەوەی دەقەکان)، بۆیە لەوکاتەدا دەست بگرن بە سوننەت و ڕێگا (ڕاستەکەی) من و، جێنشینە سەر ڕاستەکانم، (ئەو ڕێبازو سوننەتە) بە ددانەکانتان بگرن، وە خۆتان دوور بگرن لە شتی داهێنراوو بێ بنەما، چونکە بێگومان هەموو داهێنراوێکی (بێ بنەما) لە دیندا گومڕاییە.

**٤٣-** عَنْ الْعِرْبَاضَ بْنَ سَارِيَةَ ﷺ، يَقُولُ: وَعَظَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَوْعِظَةً ذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ، وَوَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هَذِهِ لَمَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ، فَمَاذَا تَعْهَدُ إِلَيْنَا؟ قَالَ: «قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا، لَا يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلَّا هَالِكٌ، مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِمَا عَرَفْتُمْ مِنْ سُنَّتِي، وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَعَلَيْكُمْ بِالطَّاعَةِ، وَإِنْ عَبْدًا حَبَشِيًّا، فَإِنَّمَا الْمُؤْمِنُ كَالْجَمَلِ الْأَنِفِ، حَيْثُمَا قِيدَ انْقَادَ»[1].

واتە: عیربازی کوڕی ساریە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری کردین بە ئامۆژگارییەک کە فرمێسکی لە چاوەکان دەهێناو دڵەکانی ئەلەرزاند، ئێمەش گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو ئامۆژگارییەت بە ئامۆژگارییەک دەچێ، کە بتەوێ ڕاسپاردەیەکمان پێ ڕاسپێری بۆ دوای خۆت، کەواتە چیمان پێ ڕادەسپێری؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی لەسەر ڕۆشنایی و ڕووناکییەک جێم هێشتوون کە شەو و ڕۆژی وەکو یەکە (هەموو شتێک ڕوون و ئاشکرایە)، وە هیچ کەس لێی لانادا تووشی گومان و دوودڵی نابێ لە دوای من، تەنها ئەوانە نەبن کە بە هیلاک چوون و دەچن، هەر یەکێک لە ئێوە بژیێت (لەمەودوا) ڕاجیایی زۆر دەبینێ، جا (بۆیە لەوکاتەدا) پابەندی ئەو ڕێبازە بن کە دەیزانن لە سوننەت و ڕێبازی من و، جێنشینە سەر ڕاستەکانم، (ئەو ڕێبازە) بە ددانەکانتان بگرن (واتە: زۆر سووربن لەسەر سوننەتی من و ئەوان)، وە پابەندبن بە فەرمانبەرداریی (برا گەورەتان)، ئەگەر بەندەیەکی حەبەشیش بێ، (چونکە) بێگومان ئیماندار گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارە.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٦٠٧، والترمذي: ٢٦٧٦.





٤٤- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَمْرٍو السُّلَمِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ الْعِرْبَاضَ بْنَ سَارِيَةَ يَقُولُ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الصُّبْحِ ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَوَعَظَنَا مَوْعِظَةً بَلِيغَةً فَذَكَرَ نَحْوَهُ(١).

واتە: عەبدورەحمانی کوڕی عەمری سولەمی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوێی لە عیربازی کوڕی ساریە بووە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین، پاشان ڕووی تێکردین و ئامۆژگارییەکی کاریگەر و لە جێی کردین، ئەوجار وەک فەرموودەی پێشوو بۆمان دەگێڕێتەوە.

## بابەت: دووركەتنەوە لە داهێنانی شتی بێ بنەما لە دیندا و دووركەوتنەوە لە دەمەدەمێ (دەمەقاڵێ)

٤٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ، وَعَلَا صَوْتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ، كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ يَقُولُ: «صَبَّحَكُمْ مَسَّاكُمْ» وَيَقُولُ: «بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ، وَيَقْرِنُ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى» ثُمَّ يَقُولُ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ الْأُمُورِ كِتَابُ اللَّهِ، وَخَيْرُ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» وَكَانَ يَقُولُ: «مَنْ تَرَكَ مَالًا فَلِأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا، فَعَلَيَّ وَإِلَيَّ»(٢).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: کاتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا چاوەکانی سوور دەبوونەوەو، دەنگی بەرز دەکردوە، توڕەییەکەی توند دەبوو، وەک ئەوەی کە سوپایەک ئاگادار بکات و بڵێ: بەیانی یان ئێوارە (دوژمن بەسەرتاندا دەدات)، وە دەیفەرموو: هاتنی من و ڕۆژی دوایی وەک ئەو دووانە وایە، پەنجەی شایەتمان و نێوەڕاستی هێنانە لای یەکتر، پاشان فەرمووی: لە دوای ئەوە باشترین شتێک (کە لەناوتاندایە و باشترینە بۆ کار پێکردن) کتێبەکەی خوایە (قوڕئان)، وە باشترین ڕێگاش ڕێگا ڕاست و دروستەکەی موحەممەدە (پێغەمبەری خوا ﷺ)، وە خراپترین شتیش شتە زیادکراوەکانن، وە هەموو داهێنراوێک گومڕاییە، وە دەیفەرموو: هەر کەسێک ماڵ و سامانێکی بەجێهێشت، ئەوە (لە دوای خۆی) بۆ ماڵ و منداڵەکەیەتی، وە هەر کەس قەرزی لە دوا بە جێها، یان ماڵ و مناڵی نەدار بوون، ئەوە قەرزەکەی لەسەر منە (بۆی دەدەمەوە)، وە بژێوی ماڵ و منداڵیشی لەسەر منە.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٦٠٧، والترمذي: ٢٦٧٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٦٧، وأبو داود: ٢٩٥٤ و ٢٩٥٦، والنسائي: ١٥٧٨.




**٤٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا هُمَا اثْنَتَانِ، الْكَلَامُ وَالْهَدْيُ، فَأَحْسَنُ الْكَلَامِ كَلَامُ اللَّهِ، وَأَحْسَنُ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، أَلَا وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدِثَاتِ الْأُمُورِ، فَإِنَّ شَرَّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، أَلَا لَا يَطُولَنَّ عَلَيْكُمُ الْأَمَدُ، فَتَقْسُوَ قُلُوبُكُمْ، أَلَا إِنَّ مَا هُوَ آتٍ قَرِيبٌ، وَإِنَّمَا الْبَعِيدُ مَا لَيْسَ بِآتٍ، أَلَا إِنَّمَا الشَّقِيُّ مَنْ شَقِيَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ، وَالسَّعِيدُ مَنْ وُعِظَ بِغَيْرِهِ، أَلَا إِنَّ قِتَالَ الْمُؤْمِنِ كُفْرٌ وَسِبَابُهُ فُسُوقٌ، وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثٍ، أَلَا وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّ الْكَذِبَ لَا يَصْلُحُ بِالْجِدِّ وَلَا بِالْهَزْلِ، وَلَا يَعِدُ الرَّجُلُ صَبِيَّهُ ثُمَّ لَا يَفِي لَهُ، فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِنَّهُ يُقَالُ لِلصَّادِقِ: صَدَقَ وَبَرَّ، وَيُقَالُ لِلْكَاذِبِ: كَذَبَ وَفَجَرَ، أَلَا وَإِنَّ الْعَبْدَ يَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا»[1].

واته: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بناغەی کارەکان دوو شتن، قورئان و سوننەت، باشترین فەرمایشت فەرمایشتی خوایە (بۆ ئەوەی کە شایەن بێت بۆ کارپێکردن)، وە باشترین و شایەنترین ڕێگاش (کە شایەنی شوێن کەوتن بێ) ڕێبازی موحەممەدە (پێغەمبەری خوایە ﷺ)، ئاگاداربن و خۆتان بپارێزن و (دوور بکەونەوە) لە شتە داهێنراوەکان (لە دیندا)، چونکە خراپترینی شتەکان ئەو شتانەن کە (بە بێ هیچ بەڵگەیەک) لە دیندا زیاد دەکرێن، وە هەموو زیادکردنێک (کە بنەمایەکی نەبێ لە دیندا) داهێنراوە، وە هەموو داهێنراوێکیش سەر دەکێشێ بۆ گومڕایی، ئاگاداربن، خۆزگە خواستن بە زۆر مانەوەو ژیان لە دونیا لە دڵتاندا جێگیر نەبێ، کە بە هۆیەوە دڵ ڕەق و بێبەزەیی بن (و دڵتان ڕەق بێ لە بەرانبەر هەق)، وە بزانن ئەوەی هاتووە نزیکە لێتانەوەو ئەوەشی کە نەهاتووە دوورە لێتان (کەواتە: هیوابوون بە زۆر ژیان فریوتان نەدات)، وە بزانن ئەوەی کە بەدبەخت بێت ئەوە هەر لە سکی دایکیەوە بەدبەختە (مادام خوا لە چارەی نوسیبێ)، وە بەختەوەریش ئەو کەسەیە کە پەند لە غەیری خۆی وەردەگرێت، وە ئاگاداربن کوشتنی مسوڵمان کوفرە و جنێو پێدانی فاسیق بوون و سنوری خوا بەزاندنە، وە بۆ ئیماندار دروست نیە زیاد لە سێ ڕۆژ دەنگی دابڕێ لە برای مسوڵمانی، وە ئاگادارو وریابن لە درۆکردن، چونکە درۆ نە بە ڕاست و نە بە گاڵتە دروست نیە (گونجاو نیە بۆ مسوڵمان)، (وەکو

---

(١) ضعيف. انظر البخاري: ٦٠٩٤، ومسلم: ٢٦٠٦ و ٢٦٠٧، وأبو داود: ٤٩٨٩، والترمذي: ١٩١٧.

نمونه) با پیاو پەیمان نەدات بە منداڵەکەی مادام جێبەجێی ناکات (واتە: با درۆی لەگەڵ نەکات)، چونکە بەڕاستی درۆ مرۆڤ بەرەو خراپەکاری پەلکێش دەکات، وە لە ڕاستیدا خراپەکاریش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ پەلکێش دەکات، بێگومان ڕاستگۆیی مرۆڤ بەرەو چاکەکاری ڕێنمایی دەکات، وە چاکەکاریش مرۆڤ بەرەو بەهەشت ڕێنمایی دەکات، وە هەمیشە بە ڕاستگۆ دەگوترێ: ڕاستی گوت و چاکی ویست، وە بە درۆزن دەگوترێ: درۆی کردو خراپەی کرد، وە ئاگاداربن بەندەی درۆزن ئەوەندە درۆ دەکات تاکو لەلای خوای باڵادەست بە درۆزن دەنووسرێ (كـذّاب: واتە: زۆر درۆزن).

٤٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: تَلَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ مِنْهُ ءَايَـٰتٌ مُّحْكَمَـٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَـٰبِهَـٰتٌ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٧﴾ ﴾ آل عمران، فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِيهِ، فَهُمُ الَّذِينَ عَنَاهُمُ اللَّهُ، فَاحْذَرُوهُمْ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ مِنْهُ ءَايَـٰتٌ مُّحْكَمَـٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَـٰبِهَـٰتٌ ﴾، واتە: ئەو خوایە ناردوویەتی یە خوارەوە بۆت قورئان هەندێکی لەئایەتەکانی (مەبەستەکانیان) ڕۆشنن ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن وە ئەوانی تر (کۆمەڵە ئایەتێکن کە مەبەستەکانیان) ڕۆشن نین، هەتا گەیشتە: ﴿ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٧﴾ ﴾ آل عمران. واتە: تەنها خاوەنانی ژیریی و بیرو هۆش نەبێت، پاشان فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەگەر لەو جۆرە کەسانەت بینی کە دەمەدەمێ و موناقەشە دەکەن دەربارەی ئەم ئایەتانەوە، ئەوە بزانە کە مەبەست پێی ئەو جۆرە کەسانەن، بۆیە وریابە لێیان.

٤٨- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلَّا أُوتُوا الْجَدَلَ» ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ الزخرف[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٤٧، ومسلم: ٢٦٦٥، وأبو داود: ٤٥٩٨، والترمذي: ٢٩٩٣ و ٢٩٩٤.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٢٥٣.

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کۆمەڵێک گومڕا نەبوونە لە دوای ئەوەی کە لەسەر هیدایەت و ڕاستە ڕێ بوون، جگە لەوانەی موناقەشەیان بووە، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾﴾ الزخرف، واتە: بەڵکو ئەوانە گەلێکی زۆر دەمەقاڵێ کارن.

**٤٩- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ لِصَاحِبِ بِدْعَةٍ صَوْمًا، وَلَا صَلَاةً، وَلَا صَدَقَةً، وَلَا حَجًّا، وَلَا عُمْرَةً، وَلَا جِهَادًا، وَلَا صَرْفًا، وَلَا عَدْلًا، يَخْرُجُ مِنَ الْإِسْلَامِ كَمَا تَخْرُجُ الشَّعَرَةُ مِنَ الْعَجِينِ»**[١].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: خوا ڕۆژوو و نوێژو چاکەو خێرو حەج و عومرەو جیهادو تەوبەو فیدیە قەبوڵ ناکات لە کەسێ کە بیدعەچی بێ و شتی زیاد لە دیندا دابێنێ (کە بنچینەیەکی شەرعی نەبێت، تاوەکو تەوبە لە بیدعەکەی نەکاو وازی لێ نەهێنێ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی دواتر)، وە لە ئیسلام دەردەچێ هەروەکو چۆن موویەک لە هەویر دەردەهێنرێ.

**٥٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبَى اللَّهُ أَنْ يَقْبَلَ عَمَلَ صَاحِبِ بِدْعَةٍ حَتَّى يَدَعَ بِدْعَتَهُ»**[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا قەدەغەی کردوە لە خۆی کە کردەوەی خاوەن بیدعە وەربگرێ هەتا واز لە بیدعەکەی دێنێ.

**سەرنج:** بەپێی زاراوەی زانایان بێ مەبەست لەو بیدعەیەی لەم فەرموودەیەدا باسکراوە بریتیە لە داهێنانێک کە لە بیروبڕوا (عەقیدە) دابێ، چونکە ئەو کەسەی کە داهێنان دەکات لە عەقیدەدا پێی دەگوترێ: «المبتدع»، بەڵام ئەوەی داهێنان لە کردەوەکاندا (العمل) بکات پێی دەگوترێ: «الفاسق».

---

(١) موضوع.

(٢) ضعيف.

٥١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ وَهُوَ بَاطِلٌ، بُنِيَ لَهُ قَصْرٌ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ، وَمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَهُوَ مُحِقٌّ، بُنِيَ لَهُ فِي وَسَطِهَا، وَمَنْ حَسَّنَ خُلُقَهُ، بُنِيَ لَهُ فِي أَعْلَاهَا»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک واز لە درۆ بێنێ کە بنەماکەی پووچە، ئەوە کۆشکێکی بۆ دروست دەکرێ لە کەناری بەهەشت (واتە: لە نێو بەهەشت بەڵام کەنارەکانی، نەک دەرەوەی بەهەشت)، وە هەر کەسێک واز لە موناقەشە بێنێ ئەگەر لەسەر هەقیش بێ، ئەوە کۆشکێکی بۆ دروست دەکرێ لە ناوەڕاستی بەهەشت، وە هەر کەس ڕەوشتی جوان بێ، ئەوە کۆشکێکی بۆ دروست دەکرێ لە سەرووی سەرەوەی بەهەشت.

**سەرنج:** ئەم فەرموودەیە ئەوە ناگەیەنێ کە مرۆڤی مسوڵمان هیچ کات موناقەشە نەکات و، داوای هەقی خۆی نەکات، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە بزانێ موناقەشەکە سوودی نیەو، سەردەکێشێ بۆ شتی خراپتر، ئەوکات وازلێهێنانی باشترە.

## بابەت: دوورکەوتنەوە لە فەتوادان
## بە ڕەئی و قیاس و پێوانەی بێبنەما و بە ئارەزوو

٥٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ النَّاسِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمُ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ، فَإِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا، فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا»(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِی کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا زانست داناڕنێ بە جۆرێک کە لە نێو (دڵ و عەقڵی) خەڵک دەری بێنێتەوە، بەڵکو بە جۆرێک زانست ناهێڵێ و هەڵیدەگرێتەوە کە کەسە زاناکان نامێنن و کاتێکیش هیچ زانایەک نەما (خەڵک شوێنی بکەوێ)، ئەوە خەڵکی شوێنی کەسانێک دەکەون و دەیانکەن بە سەرکردە کە هیچ لە دین نازانن و نەزانن، ئەو

---

(١) ضعيف بهذا اللفظ. أخرجه الترمذي: ١٩٩٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٠، ومسلم: ٢٦٧٣، والترمذي: ٢٦٥٢.

کاتیش ئەو سەرکردە نەزانانە پرسیاریان لێدەکرێ ئەوانیش بە نەزانی فەتوا دەدەن، ئەو کاتیش خۆیان و خەڵکیش گومڕا دەکەن.

**سەرنج:** ئەو فەرموودەیە ئاماژەیە بۆ ئەوانەی کە بەبێ هیچ بنەمایەکی زانستی فەتوا دەدەن، وە بە ئاماژە پێمان دەڵێ کە هەمیشە بۆ فەتوا بە دوای خاوەن زانست و شایستەکان بگەڕێین، ئەگەرنا لە ئەنجامی فەتوای نەزانەکان سەرمان لە گومڕایی دەردەچێ.

**٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أُفْتِيَ بِفُتْيَا غَيْرَ ثَبَتٍ، فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى مَنْ أَفْتَاهُ»**(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک فەتوا بدات لە کاتێکدا کە هیچ زانستێکی نیەو، دڵنیا نیە لەوەی کە دەیڵێ، ئەوە بەڕاستی تاوانی ئەو فەتوایە لەسەر ئەو کەسەیە کە فەتواکەی داوە.

**سەرنج:** لەو فەرموودەیە ئەوە وەردەگیرێ کە ئەگەر داوا لە کەسێک بکەی و بزانی کە ئەو کەسە ئەهلی فەتوا نیە، ئەوە گوناهی فەتوا دانەکە بۆ پرسیارکارەکە دەگەڕێتەوە، چونکە بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەو فەتوا هەڵەیەی پێ بدات، هەروەک بە پێچەوانەوە کەسێک بزانێ کە خۆی ئەهلی فەتوا نیە بەڵام فەتوا بدات، ئەوە گوناهی ئەو کەسەشی کە کار بە فەتواکەی دەکات لە ئەستۆی ئەوە. هەر لەبەر ئەوە پێویست و واجبە بابای پرسیارکار کە بە ئەوپەڕی تواناوە بگەڕێ بەدوای کەسی شیاو بۆ پرسیارەکە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ۝٧﴾ الأنبياء، واتە: دەی پرسیار بکەن لە خاوەنی کتێبەکانی (پێشوو لە زانایانی گاورو جولەکە) ئەگەر ئێوە نازانن.

**٥٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعِلْمُ ثَلَاثَةٌ، فَمَا وَرَاءَ ذَلِكَ فَهُوَ فَضْلٌ: آيَةٌ مُحْكَمَةٌ، أَوْ سُنَّةٌ قَائِمَةٌ، أَوْ فَرِيضَةٌ عَادِلَةٌ»**(٢).

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: 3657.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٨٨٥.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ زانست بنچینەن، جگە لەو سێیە زیادە زانستن و زەرور نین، (ئەو سێیانە بریتین لە زانینی) ئایەتە مانا ڕۆشنەکان، سوننەتە ڕاست و کارپێکراوەکان، زانستی میرات و دابەشکردن بە دادگەری.

**فريضة عادلة:** هەندێک لە زانایان دەڵێن: مەبەست پێی هەر شتێکە کە ئیش پێکردنی واجب بێ.

**سەرنج:** واتە: ئەم سێ زانستەی کە ئاماژەی پێکردوە پێویستن و دەبێ بزانرێن، بەڵام ئەوانی تر وەک ئەو سێیە پێویست نین، نەک مەبەستی ئەوە بێت کە ئەوانیتر زیادەن و ئیشیان پێناکرێ و پێویست نیە بزانرێن.

**٥٥- عَنْ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ قَالَ: «لَا تَقْضِيَنَّ وَلَا تَفْصِلَنَّ إِلَّا بِمَا تَعْلَمُ، وإِنْ أَشْكَلَ عَلَيْكَ أَمْرٌ، فَقِفْ حَتَّى تَبَيَّنَهُ أَوْ تَكْتُبَ إِلَيَّ فِيهِ»**[1].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ یەمەن فەرمووی: هیچ بڕیار و حوکمێک مەدە مەگەر کاتێک باش لێی بزانی و دڵنیابی، خۆ ئەگەر لە کارێک گومانت بۆ دروست بوو، ئەوە بوەستە و بڕیاری لەسەر مەدە تاوەکو حوکمەکەت بۆ ڕوون دەبێتەوە، یان بە نوسراوێک بۆ منی دەنێری لە بارەی ئەو کێشەیە.

**٥٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَمْ يَزَلْ أَمْرُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مُعْتَدِلًا حَتَّى نَشَأَ فِيهِمُ الْمُوَلَّدُونَ، أَبْنَاءُ سَبَايَا الْأُمَمِ، فَقَالُوا بِالرَّأْيِ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا»**[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کارو باری بەنو ئیسرائیل بەردەوام بوو لەسەر پێی خۆی وەستابوو، تاوەکو موەللەدون و سەبایا دەستیان لە کاروبار وەردا، ئیتر ئەوانە هەواو ئارەزووی خۆیان تێکەڵی کاروبار کرد، بۆیە هەم خۆیان و هەم خەڵکیشیان گومڕا کرد.

---

(١) موضوع.

(٢) ضعيف.

**المولدون:** ئەو منداڵانەن کە لە ناو گەلێک لە دایک دەبن کە خاوەنی نەریت و باوی خۆیان نین.

**سبايا:** ئەو منداڵانەن کە لە کاتی جەنگدا وەکو دەستکەوتی جەنگ دەگیرێن، یان ئەو منداڵانەی کە لەو ژنانە لە دایک بوون کە لە کاتی جەنگ وەکو کەنیزەک دەستیان بە سەردا گیراوە.

## بابەت: بڕوا (ئیمان)

**٥٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسِتُّونَ أَوْ سَبْعُونَ بَابًا، أَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَأَرْفَعُهَا قَوْلُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیمان بریتیە لە شەست و ئەوەندە، یان حەفتا و ئەوەندە بەشە، کەمترین (پلە) بریتیە لە لابردنی هەر ئازارێک لەسەر ڕێگا، وە بەرزترین (پلە) بریتیە لە وشەی: هیچ پەرستراوێک نیە بە هەق جگە لە خوا، وە شەرم و حەیا بەشێکە لە ئیمان.

**سەرنج:** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمان پلەپلەیەو، زیاد و کەم دەکات.

**٥٧م-** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الْأَحْمَرُ، عَنِ ابْنِ عَجْلَانَ، ح وَحَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ رَافِعٍ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ سُهَيْلٍ، جَمِيعًا عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، نَحْوَهُ[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ بە هەمان شێوە لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە.

**٥٨-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يَعِظُ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ، فَقَالَ: «إِنَّ الْحَيَاءَ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩، ومسلم: ٣٥، وأبو داود: ٤٦٧٦، والترمذي: ٢٦١٤، والنسائي: ٥٠٠٤ و ٥٠٠٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩، ومسلم: ٣٥، وأبو داود: ٤٦٧٦، والترمذي: ٢٦١٤، والنسائي: ٥٠٠٤ و ٥٠٠٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤، ومسلم: ٣٦، وأبو داود: ٤٧٩٥، والترمذي: ٢٦١٥، والنسائي: ٥٠٣٣.




واتە: سالیم لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێک بوو کە باسی شەرم و حەیای بۆ برایەکەی دەکرد، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی شەرم و حەیا بەشێکە لە ئیمان.

٥٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ كِبْرٍ، وَلَا يَدْخُلُ النَّارَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ»[1].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە ئەندازەی دەنکە خەردەلێک خۆ بە گەورە زانین (كِبْر- تكَبُّر)ـی لە دڵدا هەبێ، ناچێتە بەهەشت، هەر کەسێکیش بە ئەندازەی دەنکە خەردەلێک ئیمان لە دڵیدا هەبێ، ناچێتە ئاگرەوە.

**سەرنج:** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە مرۆڤ هەرچەند گوناهی گەورەی هەبێ، (جگە لە هاوەڵدانان بۆ خوا)، ئەوە لە کۆتاییدا (یان بە ئەندازەی گوناهەکانی تۆڵەی لەسەر وەردەگرێ یان خوا لێی خۆش دەبێ) هەر دەچێتە بەهەشت مادام کەمترین ئیمانی لە دڵدا هەبێت، وە ئەوەی لێ فێردەبین کە کافرکردن و بێبەش کردنی خەڵک لە ڕەحمەتی خوا هەروا ئاسان نیە، ئەوەتا خوا دەیباتە بەهەشت مادام کەمترین ئیمانی لە دڵدا هەبێ.

٦٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا خَلَّصَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ مِنَ النَّارِ وَأَمِنُوا، فَمَا مُجَادَلَةُ أَحَدِكُمْ لِصَاحِبِهِ فِي الْحَقِّ يَكُونُ لَهُ فِي الدُّنْيَا، أَشَدَّ مُجَادَلَةً مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لِرَبِّهِمْ فِي إِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ أُدْخِلُوا النَّارَ، قَالَ: يَقُولُونَ: رَبَّنَا، إِخْوَانُنَا، كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَنَا، وَيَصُومُونَ مَعَنَا، وَيَحُجُّونَ مَعَنَا، فَأَدْخَلْتَهُمُ النَّارَ، فَيَقُولُ: اذْهَبُوا، فَأَخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ مِنْهُمْ، فَيَأْتُونَهُمْ، فَيَعْرِفُونَهُمْ بِصُوَرِهِمْ، لَا تَأْكُلُ النَّارُ صُوَرَهُمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ النَّارُ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ إِلَى كَعْبَيْهِ، فَيُخْرِجُونَهُمْ، فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا، أَخْرَجْنَا مَنْ قَدْ أَمَرْتَنَا، ثُمَّ يَقُولُ: أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ دِينَارٍ مِنَ الْإِيمَانِ، ثُمَّ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ نِصْفِ دِينَارٍ، ثُمَّ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ» قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْ هَذَا، فَلْيَقْرَأْ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ النساء[2].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩١، وأبو داود: ٤٠٩١، والترمذي: ١٩٩٨ و ١٩٩٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢، ومسلم: ١٨٣ مطولاً ١٨٤، والترمذي: ٢٥٩٨، والنسائي: ٥٠١٠.



واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک خوا بڕواداران ڕزگار دەکات لە ئاگری دۆزەخ و دڵنیا دەبن، لەوکاتەدا هیچ یەکێک لە ئێوە لە دونیا بەرگری نەکردوە لە هاوڕێکەی لەسەر هەق، بە ئەندازەی ئەو بەرگرییە توند و بەهێز بێ، کە بڕواداران دەیکەن لای پەروەردگاریان لەو برایانەیان کە چوونەتە نێو ئاگر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەڵێن: پەروەردگارا براکانمان لەگەڵ ئێمە نوێژیان دەکرد (لە دونیا) وە لەگەڵ ئێمە بە ڕۆژوو دەبوون، وە لەگەڵ ئێمە حەجیان دەکرد، بەڵام خستووتنە نێو ئاگر! جا خوا دەفەرمووێ: بڕۆن ئەوەی ئێوە دەیناسنەوە لە نێو ئاگر دەریان بێنن، جا ئەوانیش دێن بۆ لایان و بە ڕوخساریان دەیانناسنەوە، ئاگر شێوەی ڕوخساریان ناشێوێنێ (لەبەر شوێنەواری دەستنوێژ)، جا هەیانە ئاگر تاوەکو نیوەی لاق (لولاک، یان بەلەک)ـی هاتووەو گرتوویەتی، هەشیانە تاوەکو گۆزینگە پێ، ئنجا دەریان دێنن، جا دەڵێن: پەروەردگارا ئەوەی فەرمانت پێیان کردبوو هەموومان دەرکرد، پاشان خوا دەفەرمووێ: هەر کەسێک بە ئەندازەی کێشی دینارێک بڕوا لە دڵیدایە دەریبێنن، پاشان هەرچی بە ئەندازەی نیوە دینار (بڕوا) لە دڵیدایە دەریبێنن، پاشان هەرچی بە ئەندازەی کێشی دەنکە خەردەلێک (بڕوا) لە دڵیدایە دەریبێنن، ئەبو سەعید ﷺ گوتوویەتی: هەر کەس بڕوا ناکات با (بۆ دڵنیا بوون و وەک بەڵگە) ئەو ئایەتە بخوێنێتەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ٤٠ ﴾ النساء، واتە: بەڕاستی خوا بە ئەندازەی گەردیلەیەک ستەم ناکات وە ئەگەر چاکەیەک هەبێت (خودا) پاداشتەکەی چەندجارە دەکاتەوە و دەیبەخشێت لەلایەن خۆیەوە پاداشتێکی گەورە.

**سەرنج:** ئەوەی کە زۆر جێگای سەرنجە لەم فەرموودەیەدا ئەوەیە کە ئیمانداران لە قیامەتیشدا بەرگری لە برا ئیماندارەکانیان دەکەن و، هەوڵی ڕزگارکردنیان دەدەن لە دۆزەخ، وە ئەوەمان فێر دەکات کە دەبێ بەو سیفەتە بەرزە بناسرێینەوە لەم دونیایەش پێشی قیامەت.

٦١- عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ فِتْيَانٌ حَزَاوِرَةٌ، فَتَعَلَّمْنَا الْإِيمَانَ قَبْلَ أَنْ نَتَعَلَّمَ الْقُرْآنَ، ثُمَّ تَعَلَّمْنَا الْقُرْآنَ فَازْدَدْنَا بِهِ إِيمَانًا[1].

---

(١) صحيح.

واتە: جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ، گوتوویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، لەو کاتەی کە گەنجی تازە پێگەشتوو (نەوجەوان) بووین، ئێمە خۆمان فێری ئیمان و بڕوا دەکرد، پێش ئەوەی خۆمان فێری قوڕئان بکەین، لە پاشان خۆمان فێری قوڕئان دەکرد، جا (بە فێربوونی قوڕئان) بڕوامان زیادی دەکرد (دامەزراوتر دەبووین).

**٦٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صِنْفَانِ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ لَيْسَ لَهُمَا فِي الْإِسْلَامِ نَصِيبٌ: الْمُرْجِئَةُ وَالْقَدَرِيَّةُ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕنەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو دەستە لە ئوممەتی من بەشیان بە ئیسلامەوە نیە: مورجیئەکان و قەدەرییەکان.

**سەرنج:** (مورجیئەکان) کۆمەڵێکن دەڵێن: ئەگەر بڕوات تەواو بێ، ئیتر هیچ گوناهو تاوانێک زیانت پێ ناگەیەنێ، کەمی ناکات، هەروەک چۆن لەگەڵ کوفرو بێبڕوایدا هیچ کردەوەیەکی باش وەرناگیرێ.

**سەرنج:** (قەدەرییەکان) کۆمەڵێکن کە نکوولی لە قەدەر دەکەن(٢).

**٦٣-** عَنْ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ: فَجَاءَ رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ شَعَرِ الرَّأْسِ، لَا يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ سَفَرٍ، وَلَا يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ، قَالَ: فَجَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَسْنَدَ رُكْبَتَهُ إِلَى رُكْبَتِهِ، وَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: «شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَحَجُّ الْبَيْتِ» قَالَ: صَدَقْتَ، فَعَجِبْنَا مِنْهُ، يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: «أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَرُسُلِهِ، وَكُتُبِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ» قَالَ: صَدَقْتَ، فَعَجِبْنَا مِنْهُ، يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مَا الْإِحْسَانُ؟ قَالَ: «أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنَّكَ إِنْ لَا تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ» قَالَ: فَمَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: «مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ» قَالَ: فَمَا أَمَارَتُهَا؟ قَالَ: «أَنْ تَلِدَ الْأَمَةُ رَبَّتَهَا» - قَالَ: وَكِيعٌ: يَعْنِي تَلِدُ الْعَجَمُ الْعَرَبَ- «وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢١٤٩.

(٢) پێشنیار دەکەم: خوێنەری بەرێز کە ویستت هەر کۆمەڵ و گروپێک بناسی، نمونەی موڕجیئەو قەدەری کە لەم فەرموودانە ناویان هاتووە، ئەوە بگەڕێوە بۆ سەرچاوەکانی خۆیان، پێش ئەوەی سەرچاوەو بۆچوونی بەرانبەرەکانیان بزانی، تاکو بە ئینسافەوە بڕیار بدەیت و بگەیتە ڕاستییەکان وەکو خۆی.

الْبِنَاءِ» قَالَ: ثُمَّ قَالَ: فَلَقِيَنِي النَّبِيُّ ﷺ بَعْدَ ثَلَاثٍ، فَقَالَ: «أَتَدْرِي مَنِ الرَّجُلُ؟» قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «ذَاكَ جِبْرِيلُ، أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ مَعَالِمَ دِينِكُمْ»[1].

واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: ئێمە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، جا لەو کاتەدا پیاوێک هات کە پۆشاکەکانی زۆر سپی بوون، وە مووی سەری زۆر ڕەش بوون، شوێنەواری سەفەری پێوە دیار نەبوو، هیچ یەکێک لە ئێمە نەیدەناسی، دەڵێ: لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت و ئەژنۆکانی نوساند بە ئەژنۆکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، وە دەستەکانی لەسەر ڕانی خۆی دانا، پاشان گوتی: ئەی موحەممەد ئیسلام چییە؟ فەرمووی: گەواهی دانە بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا (الله)، وە (گەواهی دانە بەوەی کە) من نێردراوم لەلایەن خواوە، وە (هەروەها) نوێژ بەرپاکردن، وە زەکات دان، وە ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان، وە حەج کردن، ئەویش (پیاوە غەریبەکە) گوتی: ڕاست دەکەی! ئێمەش پێمان سەیر بوو سەرمان لێی سووڕما، پرسیار دەکات و دەشڵێ ڕاست دەکەی! پاشان گوتی: ئەی موحەممەد ئیمان چییە؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ئیمان بریتیە لەوەی کە بڕوات بە (بوونی) خوا هەبێ، وە (بڕوات هەبێ) بە فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی و کتێبەکانی و ڕۆژی دوایی و قەدەریش جا چاک بێ یان خراپ، گوتی: ڕاست دەکەی! پێمان سەیر بوو، دەپرسێ و دەشڵێ ڕاست دەکەی! پاشان گوتی: ئەی موحەممەد ئیحسان چییە؟ فەرمووی: ئیحسان ئەوەیە کە بە جۆرێک خوا بپەرستی، هەروەک ئەوەی ببینی، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینی بێگومان ئەو تۆ دەبینێ، گوتی: ئەی ڕۆژی دوایی کەی دێ؟ فەرمووی: پرسیار لێکراو (کە مەبەستی خۆیەتی) بە ئەندازەی پرسیاکار لەبارەیەوە نازانێ، گوتی: ئەی نیشانەکانی چین؟ فەرمووی: ئەوەیە کە کچ ببێتە گەورەی دایکی «وەکیع دەڵێ: مانای ئەوەیە کە لە عەجەم (غەیرە عەرەب) عەرەب لە دایک ببێ»، وە (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نیشانەیەکیتر) ئەوەیە کە ببینی خەڵکانی هەژارو شوانی مەڕ بیناو باڵەخانەی بەرزو دوورو درێژ دروست بکەن، عومەر ﷺ دەڵێ: دوای سێ شەو (لە پاش ئەم گفتوگۆیە) پێغەمبەری خوا ﷺ بە من گەیشت و فەرمووی: ئایا دەزانی ئەو پیاوە کێ بوو؟ عومەر ﷺ دەڵێ: گوتم: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، جا فەرمووی: ئەوە جیبریل ﷺ بوو، هاتبوو کە بابەتەکانی دینەکەتان فێربکات.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨، وأبو داود: ٤٦٩٥، والترمذي: ٢٦١٠، والنسائي: ٤٩٩٠.





**حُفَاة - حَافِي**: واته: پێخواس، ئەوەی کە پێڵاوی لە پێدا نیە.

**عُرَاة - عَار**: واته: ڕووت، ئەوی کە پۆشاکی لەبەردانییە.

**رِعَاْ - رَاعِي**: واته: شوان (مەبەست لەوانەیە خەڵکی هەژار و کەم دەرامەتە).

لەم فەرموودەیە چەند خاڵێکی زۆر گرنگ وەردەگیرێن:

١- ئەدەب و شێوازی پرسیارکردن و، چۆنیەتی فێرکردنی ئەوانیتر بۆ شێوازی پرسیارکردن.

٢- کاتێک پرسیار دەکەیت و وەڵامەکەش جێی دڵنیاییتە، پێویستە بڕوای پێبکەیت و دەربڕی کە قەناعەتت هاتوە.

٣- کاتێک پرسیارێکت لێدەکرێ و دڵنیایی کە نایزانی زۆر بە ئاسایی وەریبگرەو، بڵێ: لە تۆ باشتری لێ نازانم.

٤- دەگونجێ کەسێک کە زانیاریشی هەبێ لەسەر شتێک پرسیار بکات لە کەسێکیتر بە ئامانجی ئەوەی کە ئامادەبووان بە ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ تێبگەیەنێ و فێریان بکات.

٥- هەروەها پێویستە پرسیارکردن بە شێوازێک بێ کە پرسیارێکت کرد تا وەڵامەکەی وەرنەگری پرسیارێکیتر نەکەی.

٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا بَارِزًا لِلنَّاسِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: «أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَلِقَائِهِ، وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الْآخِرِ» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: «أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ، وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ، وَتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْإِحْسَانُ؟ قَالَ: «أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنَّكَ إِنْ لَا تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: «مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، وَلَكِنْ سَأُحَدِّثُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا، إِذَا وَلَدَتِ الْأَمَةُ رَبَّتَهَا، فَذَلِكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَإِذَا تَطَاوَلَ رِعَاءُ الْغَنَمِ فِي الْبُنْيَانِ، فَذَلِكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ» فَتَلَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾ ﴾ لقمان[1].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠ و ٤٧٧٧، ومسلم: ٩ و ١٠، وأبو داود: ٤٦٩٨، والنسائي: ١٠١/٨.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو خەڵک دەرکەوت، پیاوێک هات بۆ خزمەتی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمان چییە؟ ئەویش فەرمووی: ئیمان ئەوەیە کە بڕوات هەبێ بە خواو بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرەکانی، بە پێگەیشتنی بۆ لێپرسینەوەو پاداشتی، وە بڕوات هەبێ بە زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی، (پیاوەکە) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلام چییە؟ فەرمووی: (ئیسلام) ئەوەیە کە خوا بپەرستی و هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەی، وە نوێژە فەرزەکان بکەی و، ئەو زەکاتەی لە ماڵت فەرز کراوە بیدەی، وە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگری، (پیاوەکە) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحسان چییە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە بە جۆرێک خوا بپەرستی وەک ئەوەی کە تۆ ببینی، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینی ئەوە ئەو تۆ دەبینێ، (پیاوەکە) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دوایی کەی دێت؟ فەرمووی: پرسیار لێکراویش لە پرسیارکار زیاتری لێ نازانێ، بەڵام نیشانەکانت پێدەڵێم: هەر کاتێک دایک سەرپەرشتیاری خۆی لێ لە دایک بوو (کچ بوو بە گەورەی دایکی)، ئەوە لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییە، وە هەر کاتێک شوانی مەڕومالاَت بیناو باڵەخانەی بەرزیان دروست کرد، ئەوە لە نیشانەکانیەتی، (وە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی) لەو پێنج شتانەیە کە تەنها خوا دەیانزانێ، پاشان پێغەمبەر ﷺ (ئەو ئایەتەی) خوێندەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿٣٤﴾ ﴾ لقمان، واتە: بەڕاستی تەنها لای خوایە زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی وە هەر خوا باران دەبارێنێت تەنها خوا دەزانێ بەوەی لە مناڵدانی (دایکان) دایە وە هیچ کەس نازانێ سبەینێ (لە داهاتوودا) چی دەکات وە هیچ کەس نازانێت لە چ شوێن و زەویەکدا دەمرێت بەڕاستی خوا زانا و ئاگادارە.

٦٥- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْإِيمَانُ مَعْرِفَةٌ بِالْقَلْبِ، وَقَوْلٌ بِاللِّسَانِ، وَعَمَلٌ بِالْأَرْكَانِ» قَالَ: أَبُو الصَّلْتِ: لَوْ قُرِئَ هَذَا الْإِسْنَادُ عَلَى مَجْنُونٍ لَبَرَأَ[1].

---

(١) موضوع.

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیمان ناسینی خوایە بە دڵ، وە دەربڕینە بە زمان، وە کردەوەیە بە ئەندامەکان. ئەبو سەڵت (کە ڕاوی فەرموودەکەیە)، گوتوویەتی: ئەگەر ئەو (فەرموودە) بەو سەنەدە، لەسەر کەسێکی شێت بخوێنرێتەوە، لە شێتیەکەی چاک دەبێتەوە.

٦٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ - أَوْ قَالَ لِجَارِهِ - مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە ئێوە بڕوای (تەواو) نابێ تاوەکو ئەو شتەی بۆ خۆی پێخۆشە، بۆ براکەشی - یان فەرمووی: بۆ دراوسێکەی- پێی خۆش نەبێ.

**سەرنج:** ئەو فەرموودەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەخلاق و ڕەوشت بەرزی مرۆڤی بڕوادار لەوە دەردەکەوێ کە تا چەند لەگەڵ ئەوانیتر ڕەوشتە جوانەکەی ڕەنگ دەداتەوە. کەواتە: ئیسلام دینێک نیە کە تەنها پەیوەندی بە تاکەوە هەبێ، بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەو ئیمان و ڕەنگدانەوەی نەبێ لەناو کۆمەڵگەدا ئەسڵەن هەر قەبوڵیش ناکرێ لە خاوەنەکەی.

٦٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ، وَوَالِدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە ئێوە بڕوا (ئیمان)ی تەواو نابێ تاوەکو منی لەلا خۆشەویستر نەبێ لە مناڵەکانی و باوکی و دایکی و هەموو خەڵکی تر بە گشتی.

**سەرنج:** لەو فەرموودەیەوە دەردەکەوێ کە خۆشەویستیمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەوە دەبێ کە شوێن پەیامەکەی بکەوین و کاری پێبکەین و بە کردەوە بیسەلمێنین، دەنا قسە فەقیرە هەموو کەس پێیدەوێرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣، ومسلم: ٤٥، والترمذي: ٢٥١٥، والنسائي: ٥٠١٦ و ٥٠١٧ و ٥٠٣٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥، ومسلم: ٤٤، والنسائي: ٥٠١٣ و ٥٠١٤.





٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ناچنە بەهەشتەوە (واتە: لەسەرەتاوەو بێ لێ پرسینەوە) تاوەکو ئیمان نەهێنن، وە ئیمانیش ناهێنن هەتا یەکترتان خۆشدەوێ، ئایا ڕێنماییتان نەکەم بۆ شتێک کە ئەنجامی بدەن بە هۆیەوە یەکترتان خۆشدەوێ؟ لەنێو خۆتان سڵاو بڵاو بکەنەوە.

**سەرنج:** لەم فەرموودەیەدا گەورەیی و گرنگی سەلام کردنمان بۆ دەردەکەوێ، چونکە سەرەتای کرانەوەیە بەڕووی ئەوانی دیکەداو، سەرەتاکەشی بە وشەی ئاشتی و ڕێز دەست پێدەکات.

٦٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»(٢).

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێودان بە مسوڵمان دەرچوونە لە فەرمانی خواو، جەنگانی کوفرە.

٧٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ فَارَقَ الدُّنْيَا عَلَى الْإِخْلَاصِ لِلَّهِ وَحْدَهُ، وَعِبَادَتِهِ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، مَاتَ وَاللَّهُ عَنْهُ رَاضٍ» قَالَ أَنَسٌ ﷺ: وَهُوَ دِينُ اللَّهِ الَّذِي جَاءَتْ بِهِ الرُّسُلُ، وَبَلَّغُوهُ عَنْ رَبِّهِمْ قَبْلَ هَرْجِ الْأَحَادِيثِ، وَاخْتِلَافِ الْأَهْوَاءِ، وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فِي آخِرِ مَا نَزَلَ، يَقُولُ اللَّهُ: ﴿فَإِن تَابُوا۟ ﴿٥﴾﴾ التوبة، قَالَ: خَلْعُ الْأَوْثَانِ وَعِبَادَتِهَا ﴿وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ﴿٢٧٧﴾﴾ البقرة، وَقَالَ فِي آيَةٍ أُخْرَى: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴿١١﴾﴾ التوبة(٣).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دونیای بەجێ هێشت و مرد لەسەر دڵسۆزی (و یەکلابوونەوە) بۆ خوای

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٤، وأبو داود: ٥١٩٣، والترمذي: ٢٦٨٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨، ومسلم: ٦٤، والترمذي: ١٩٨٣ و ٢٦٣٤ و ٢٦٣٥، والنسائي: ٤١٠٥_٤١١٣.

(٣) ضعيف.




تاک و تەنیاو، پەرستشێکی بێ هاوبەش دانانی ئەنجامداو، نوێژی کردو زەکاتی دا، ئەوە لەسەر حاڵەتێک مردووە کە خوا لێی ڕازییە، ئەنەس ﷺ گوتی: ئەوە ئەو دینەی خوایە کە پێغەمبەران هێناویانە، بەو شێوەیەش گەیاندوویانە بە خەڵک لە پەروەردگاریانەوە پێش ئەوەی گێڕانەوەی فەرموودە تێکەڵ و پێکەڵ بکرێ و هەواو ئارەزووی جیاوازی لەگەڵ کەوێ، وە بەڵگەش لەسەر ڕاستی ئەمە ئەو ئایەتەیە، کە لە کۆتاییەکاندا دابەزی، کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَابُوا۟ ﴿٥﴾﴾ التوبة، واتە: جا ئەگەر پەشیمان بوونەوە، ئەنەس گوتی: (واتە:) واز هێنان لە بتپەرستی و عیبادەت بۆ کردنیان: ﴿وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ﴿٢٧٧﴾﴾ البقرة، واتە: وە نوێژیان بەهۆش و بیرەوە کردوە وە زەکاتیان داوە، وە لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴿١١﴾﴾ التوبة، واتە: ئەمجا ئەگەر پەشیمان بوونەوە و نوێژیان بەجێ هێنا وە زەکاتیاندا ئەوە براتانن لە ئاییندا.

**سەرنج:** لەم فەرموودەیەدا بنەڕەتی دین و پێناسەی مسوڵمانی تەواومان بۆ دەردەکەوێ، هەروەها پێمان دەڵێ: کە ڕازیکردنی خوا کارێکی ئەوەندە گران نیە کە نەتوانین ئەنجامی بدەین، بەڵکو تەکلیفەکە بە جۆرێکە کە هەموو کەسێک لە توانای دایە ئەگەر خۆی بیهەوێ، لەلایەکی تریش ئەوە دەسەلمێنێ کە دین لە خەڵکی ئەوەندە قورس و ئاڵۆز نەکەین کە سەریان لێ بشێوێ، هەروەها ئەوەمان پێدەڵێ: کە هەمیشە بە چاوی ڕەحمەت و بەزەیی تەماشای یەکتر بکەین، ئەوەتا خوا بەو کەمە کردەوەیە لێمان ڕازییە، ئێمە چین تاکو ئەرکی زیاترو قورستر بەسەر کەسێکدا بدەین کە لە توانایدا نەبێت!!

**٧١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە کە بجەنگم لەگەڵ ئەو خەڵکەدا هەتا شایەدیی دەدەن کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خواو، منیش پێغەمبەری خوام و، نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن.

---

(١) صحيح. انفرد به ابن ماجه. وانظر الحديث: ٣٩٢٧.




**٧٢-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ»(١).

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە کە بجەنگم لەگەڵ ئەو خەڵکەدا هەتا شایەدیی دەدەن کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خواو، منیش پێغەمبەری خوام و، نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن.

**سەرنج:** ئەم دوو فەرموودەیە نابێ تەنها بە ڕواڵەت لێک بدرێنەوە، مەبەست لە جەنگ کردن، لەم فەرموودەدا جەنگ کردن نیە بە ڕەهایی و بەبێ هۆکار!! بەڵکو لێرەدا مەبەست یان ئەوەیە کە شەڕ هەڵگیرسا، دەبێ بەردەوام بێ تاوەکو ئەو مەبەستە دێتە جێ، یان مەبەستی پێ لەوانەیە کە بە یاسای سەرانە ڕازی نین، یانیش دەبێ هۆکاری هاتنی ئەو فەرموودە بزانین کە ئاخۆ ئەو کەسانە کێ بوون کە پێغەمبەر ﷺ لە بەرانبەریاندا ئاوای بڕیار دەرکردوە.

بە هەرحاڵ لێکدانەوەی ئەو جۆرە فەرموودانە ئیشی هەموو کەس نیە، تایبەتە بۆ ئەو کەسانەی کە تایبەتمەندییان هەیە لە لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی فەرموودەدا، کە زیاتر پەیوەستە بە سیاسەتی شەرعییەوە.

**٧٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صِنْفَانِ مِنْ أُمَّتِي لَيْسَ لَهُمَا فِي الْإِسْلَامِ نَصِيبٌ: أَهْلُ الْإِرْجَاءِ، وَأَهْلُ الْقَدَرِ»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس و جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو کۆمەڵ هەن لە ئوممەتی من کە هیچ بەشێکیان نیە لە ئیسلامدا، ئەوانیش: مورجیئەکان و قەدەریەکانن.

**سەرنج:** لە فەرموودەی ژمارە (٦٢)ـدا ئەم دوو کۆمەڵە، ئاماژەیان پێکراوە، هەر لەوێش ڕوونکردنەوەیەکی کورتیان لەسەر نوسراوە.

---

(١) صحيح متواتر. انفرد به ابن ماجه. وانظر الحديث: ٣٩٢٧.

(٢) ضعيف.




**٧٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عبَّاسٍ ﭫ قَالَا: «الْإِيمَانُ يَزِيدُ وَيَنْقُصُ»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەبباس ﭫ گوتوویانە: ئیمان زیادو کەم دەکات.

**سەرنج:** زانایان هەموو یەک دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئیمان زیاد دەکات، کەواتە هەر شتێکیش زیاد بکات لە بارانیدایە کە کەمیش بکات، بۆیە گونجاوە لەسەر ئەو بنەمایە کە بڵێین: ئیمان زیادو کەم دەکات، بە هۆی بەڵگەی بەهێزو بەرچاوڕوونی زیاترو تێڕامانی زیاتر ئیمان زیاد دەکات.

**٧٥-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﭬ، قَالَ: «الْإِيمَانُ يَزْدَادُ وَيَنْقُصُ»[٢].

**واتە:** ئەبو دەرداء ﭬ دەڵێ: ئیمان زیادو کەم دەکات.

## بابەت: قەدەر

**٧٦-** عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ ﭬ، قَالَ: قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﭬ، حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ أَنَّهُ: «يُجْمَعُ خَلْقُ أَحَدِكُمْ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ إِلَيْهِ الْمَلَكَ، فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، فَيَقُولُ: اكْتُبْ عَمَلَهُ، وَأَجَلَهُ، وَرِزْقَهُ، وَشَقِيٌّ، أَمْ سَعِيدٌ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا»[٣].

**واتە:** زەیدی کوڕی وەهب ﭬ دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﭬ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی بۆ کردین، کە ئەو ڕاستبێژی متمانە پێکراوە، فەرمووی: پێکهاتەی دروستبوونی هەر یەکێکتان کۆدەکرێتەوە لە نێو سکی (ڕەحمی) دایکیدا لە ماوەی چل ڕۆژدا، دواتر بە ماوەی چل ڕۆژ دەگۆڕێ بۆ خوێن، دواتر بە ماوەی چل ڕۆژی تر دەگۆڕێ بۆ پارچە گۆشتێک کە قەبارەکەی بە ئەندازەی پاروویەکە،

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٠٨ و ٧٤٥٤، ومسلم: ٢٦٤٣، وأبو داود: ٤٧٠٨، والترمذي: ٢١٣٧.



(وە دوای ئەوەی شێوەیەکی بنەڕەتی مرۆڤ وەردەگرێ) خوا فریشتەیەکی بۆ دەنێرێ، وە فەرمانی پێدەکات بە چوارشت، وە دەفەرموێ: کارو کردەوەی و کاتی مردنی و ئەو بژێویەی بۆی دیاریکراوە بنوسە، وە بنوسە کە ئایا بەدبەختە، یاخود خۆشبەختە، وە سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، کەسی وا هەیە کردەوەی بەهەشتیانی لێ دەپشکوێتەوە، هەتاوەکو لە نێوان ئەو و بەهەشتدا ئەندازەی یەک باڵ دەمێنێ، لەوکاتەدا نوسراوەکە (ئەوەی کە فریشتەکە نوسیویەتی) پێشی پێدەگرێت، ئنجا کردەوەی دۆزەخیانی لێ دەپشکوێتەوەو دەچێتە ناوی، وە بەدڵنیاییەوە کەسی وا هەیە کردەوەی دۆزەخیانی لێ دەپشکوێتەوە، هەتاوەکو لە نێوان ئەو و دۆزەخدا ئەندازەی یەک باڵ ئەمێنێ، لەوکاتەدا نوسراوەکە پێشی پێدەگرێت، ئنجا کردەوەی بەهەشتیانی لێ دەپشکوێتەوەو دەچێتە ناوی.

**سەرنج:** ئەو فەرموودەیە ئاگادارمان دەکاتەوە کە هەموو کار و کردەوەیەکمان و، ژیان و مردنمان و، سەرەنجاممان لە ژێر ویستی خوای دادگەرو کاربەجێ دایە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئێمە هیچ سەرپشک بوونێکمان نەبێ لەو ژیانەدا، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئێمە خۆمان ڕێگای خۆمان دیاری دەکەین بە کردەوەکانمان کە کام ڕێگە هەڵدەبژێرین، چونکە خوای خاوەن دەسەڵات، خۆی ئەو سەرپشک بوونەی پێداوین بۆ تاقیکردنەوەمان، بەڵام ئەوەی لەم فەرموودەیە ئاماژەی پێکراوە مەبەست ئەوەیە کە خوای زانا بە هەموو شتێک زانا و ئاگادارە بە سەرەتاو کۆتایی ژیانی، هەر مرۆڤێک کە چۆن ئەو مرۆڤە ژیانی خۆی دەنەخشێنێ و کام ڕێگا هەڵدەبژێرێ، کەواتە: خوا دەزانێ کە ئەو مرۆڤە چۆن دەژی و چی دەکات، نەک بە زۆر پێی بکات.

هەروەها ئەو فەرموودەیە بە ئاگامان دێنێتەوە کە بابای بڕوادار و کردەوە باش، هەمیشە وریای خۆی بێت و لەخۆبایی نەبێ، پێی وانەبێ کە ئیتر هەموو شتی تەواوەو، بە پەرستش و چاکەکانی نەنازێ، چونکە گرنگ کۆتایی تەمەنە کە مرۆڤ لەسەر چ ڕێگایەک دەمێنێ، کەواتە: دەبێ هەمیشە مرۆڤی بڕوادار و چاکەکار لە بەینی ئومێدو ترسدا بێ، هەمیشە دوعای سەرەنجام چاکی بکات. وە لە بەرانبەریشدا نابێ زوو بڕیار لەسەر کەسێک بدرێ بەوەی کە ئەهلی دۆزەخەو، ئیتر ماڵە لەسەری،




چونکە زۆر نزیکە کارێک بکات لە کۆتای تەمەنیدا، پێی بچێتە بەهەشت و لە دۆزەخ ڕزگاری بێ. کەواتە: سەرەنجامی کۆتایی ژیانی مرۆڤ بڕیار لەسەر جێگای قیامەتی دەدات، وە ئێمە بۆمان نیە بڕیار لەسەر کەس بدەین.

٧٧- عَنِ ابْنِ الدَّيْلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: وَقَعَ فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنْ هَذَا الْقَدَرِ، خَشِيتُ أَنْ يُفْسِدَ عَلَيَّ دِينِي وَأَمْرِي، فَأَتَيْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ، فَقُلْتُ: أَبَا الْمُنْذِرِ، إِنَّهُ قَدْ وَقَعَ فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنْ هَذَا الْقَدَرِ، فَخَشِيتُ عَلَى دِينِي وَأَمْرِي، فَحَدِّثْنِي مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ، لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَنْفَعَنِي بِهِ، فَقَالَ: «لَوْ أَنَّ اللَّهَ عَذَّبَ أَهْلَ سَمَاوَاتِهِ وَأَهْلَ أَرْضِهِ، لَعَذَّبَهُمْ وَهُوَ غَيْرُ ظَالِمٍ لَهُمْ، وَلَوْ رَحِمَهُمْ لَكَانَتْ رَحْمَتُهُ خَيْرًا لَهُمْ مِنْ أَعْمَالِهِمْ، وَلَوْ كَانَ لَكَ مِثْلُ جَبَلِ أُحُدٍ ذَهَبًا، أَوْ مِثْلُ جَبَلِ أُحُدٍ تُنْفِقُهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، مَا قُبِلَ مِنْكَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، فَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَأَنَّكَ إِنْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هَذَا دَخَلْتَ النَّارَ» وَلَا عَلَيْكَ أَنْ تَأْتِيَ أَخِي عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ، فَتَسْأَلَهُ، فَأَتَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ، فَسَأَلْتُهُ، فَذَكَرَ مِثْلَ مَا قَالَ أُبَيٌّ وَقَالَ لِي: وَلَا عَلَيْكَ أَنْ تَأْتِيَ حُذَيْفَةَ، فَأَتَيْتُ حُذَيْفَةَ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالَا، وَقَالَ: ائْتِ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، فَاسْأَلْهُ، فَأَتَيْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَوْ أَنَّ اللَّهَ عَذَّبَ أَهْلَ سَمَاوَاتِهِ وَأَهْلَ أَرْضِهِ، لَعَذَّبَهُمْ وَهُوَ غَيْرُ ظَالِمٍ لَهُمْ، وَلَوْ رَحِمَهُمْ لَكَانَتْ رَحْمَتُهُ خَيْرًا لَهُمْ مِنْ أَعْمَالِهِمْ، وَلَوْ كَانَ لَكَ مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَبًا، أَوْ مِثْلُ جَبَلِ أُحُدٍ ذَهَبًا تُنْفِقُهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، مَا قَبِلَهُ مِنْكَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ كُلِّهِ، فَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَمَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَأَنَّكَ إِنْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هَذَا دَخَلْتَ النَّارَ»[1].

واتە: ئیبنو دەیلەمی ﷺ دەڵێ: شتێک لە دڵم دروست بوو دەربارەی قەدەر (مەبەست پێی بڕوابوون بە قەدەرە)، ترسام کە دین و دونیام تێکبدات، جا چووم بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ، گوتم: ئەبو مونزیر، بەڕاستی شتێک لە دڵمدا دروست بووە دەربارەی قەدەر، وە ترسام دین و دونیام تێکبدات، بۆیە دەربارەی ئەوە شتێکم پێبڵێ، بەڵکو خوا بە هۆیەوە سودم پێبگەیەنێ، ئەویش گوتی: ئەگەر خوا خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی سزا بدات، ئەوە سزایان دەدات و بە هیچ جۆرێک ستەمی لێنەکردوون، وە ئەگەر بەزەیی پێیاندا بێتەوە (سزایان لەسەر لابدات) ئەوە سۆزو بەزەییەکەی باشتر و چاکترە بۆیان لە کردەوەکانیان، وە ئەگەر بە وێنەی چیای ئوحود زێڕت هەبێت،

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٦٩٩.

یاخود بە وێنەی چیای ئوحود ببەخشی لە پێناوی خوادا، هیچیت لێوەرناگیرێ تاوەکو بڕوات بە قەدەر نەبێت، وە بزانە ئەو شتەی کە دێتەڕێت، نەدەبوو لابدرایە و نەهاتایەتە ڕێت، وە ئەو شتەش کە نایەتە ڕێت هەرگیز نابێت بێتەڕێت، وە بێگومان ئەگەر تۆ لەسەر غەیری ئەم بیروبڕوایە بمری، ئەوە دەچیە دۆزەخەوە، وە هیچ زیانیشی نیە ئەگەر بچی بۆ لای براکەم عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، وە لەویش بپرسی، منیش چووم بۆ لای عەبدوڵڵا و پرسیارم لێکرد، هەمان ئەو شتەی بۆ باسکردم کە ئوبەی بۆی باسکردبووم، وە پێی گوتم: هیچ زەرەرێک ناکەی ئەگەر بچی بۆ لای حوزەیفە، منیش چووم بۆ لای حوزەیفە و پرسیارم لێکرد، هەمان ئەو شتەی پێگوتم کە ئوبەی و عەبدوڵڵا پێیان گوتبووم، وە گوتی: بڕۆ بۆ لای زەیدی کوڕی سابیت و پرسیار لەویش بکە، منیش چووم بۆ لای زەیدی کوڕی سابیت و پرسیارم لێکرد، ئەویش گوتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر خوا خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی سزا بدات، ئەوە سزایان دەدات و بە هیچ جۆرێک ستەمی لێنەکردوون، وە ئەگەر بەزەیی پێیان دابێتەوە (سزایان لەسەر لابدات) ئەوە سۆز و بەزەییەکەی باشتر و چاکترە بۆیان لە کردەوەکانیان، وە ئەگەر بە وێنەی چیای ئوحود زێڕت هەبێت، یاخود بە وێنەی چیای ئوحود ببەخشی لە پێناوی خوادا، هیچیت لێوەرناگیرێ تاوەکو بڕوات بە قەدەر نەبێت، بزانە ئەو شتەی کە دێتەڕێت، نەدەبوو لابدرایەو نەهاتایەتە ڕێت و، ئەو شتەش کە نایەتە ڕێت هەرگیز نابێت بێتەڕێت، وە بێگومان ئەگەر تۆ لەسەر غەیری ئەم بیروبڕوایە بمری، ئەوە دەچیە ناو دۆزەخەوە.

**سەرنج:** لەو فەرموودەیەدا تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بڕوابوون بە قەدەر واجبەو بە بێبڕوابوون بە قەدەر ئیمان کامڵ و تەواو نابێت، هەروەها ئەوەمان پێدەڵێ: کە ئەوپەڕی متمانەمان هەبێ بە قەزاو قەدەر، چونکە مەگەر ویستی خوا دەنا هیچ شتێک ناتوانێ ڕەتی بکاتەوە. هەروەها تەئکید لەوە دەکاتەوە کە خاوەنی ئەم کەون و کائیناتە تەنها خوایە، بۆیە هەرچۆنێک ویستی لەسەر بێ ئاوا تەصەڕووف دەکات و کەس ناتوانێ بە ستەم لێکی بداتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا چوونە بەهەشت و لێخۆشبوونی خوا لە بەندەکانی ڕەحمەت و سۆزو بەزەیی خۆیەتی، نەک کردەوەی مرۆڤەکان بتوانێت بارتەقای ئەو لێخۆشبوونە گەورەیە بێت.

٧٨- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَبِيَدِهِ عُودٌ، فَنَكَتَ فِي الْأَرْضِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَمَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ» قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا نَتَّكِلُ؟ قَالَ: «لَا، اعْمَلُوا وَلَا تَتَّكِلُوا، فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ» ثُمَّ قَرَأَ ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ الليل[1].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: ئێمە دانیشتبووین لە لای پێغەمبەر ﷺ چیلکەدارێکی بە دەستەوەبوو، لە زەویدا چەقاندی، پاشان سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: بێگومان هەر یەکێک لە ئێوە شوێنەکەی لە بەهەشت نوسراوە (دیاریکراوە)، یان شوێنەکەی لە دۆزەخ نوسراوە، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا پشت بەوە نەبەستین؟ فەرمووی: نەخێر، کار و کردەوە بکەن و پشت بەوە مەبەستن، لەبەر ئەوەی هەر کەسێک ئاسانکاری بۆ دەکرێ بۆ ئەوەی کە بۆی دروستکراوە. پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ الليل، واتە: ئەمجا ئەو کەسەی (ماڵ) ببەخشێت و لە خوا بترسێت و پارێزکاربێت ﴿٥﴾ وە بڕوای ببێت بەوەی زۆرچاکە بە (لا إله إلا الله) یان بە (بەهەشت) ﴿٦﴾ ئەوە بێگومان یارمەتی دەدەین بۆ ڕێی ئاسان (کە چاکەیە) ﴿٧﴾ وە ئەو کەسەی ڕژدی بکات (لە ماڵ بەخشین)و خۆی بێ نیاز بزانێت (لە پاداشتی پەروەردگاری) ﴿٨﴾ وە بڕوای نەبێ بەچاکە (کە لا إله إلا الله یە یان بەهەشت) ﴿٩﴾ ئەوە بێگومان ڕێی سەختی بۆ ئاسان دەکەین ﴿١٠﴾.

**سەرنج:** ئەو فەرموودەیە تەئکید لەوە دەکاتەوە کە دەبێ مرۆڤ کردەوەی باش بکات و هەوڵی چاکەکاری بدات، نەک بەتەمای قەزا و قەدەر پشتێنی لێبکاتەوە، کەواتە: دەبێ تەرازو ڕاگرێ لەبەینی هۆکارەکان و پشت بەستن بە خوا، چونکە خوا خۆی کارئاسانی دەکات بۆ بەندەکانی بۆئەوەی بەرەو قەدەری خۆیان بچن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٦٢، ومسلم: ٢٦٥٧، وأبو داود: ٤٦٩٤، والترمذي: ٢١٣٦ و ٣٣٤٤.

٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ، احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلَا تَعْجَزْ، فَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ، فَلَا تَقُلْ: لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَّرَ اللَّهُ، وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڕواداری بەهێز باشترو خۆشەویستترە لە لای خوا لە بڕواداری بێهێز، وە هەردووکیان خێری خۆیان هەیە، سووربە لەسەر ئەوەی سودت پێدەگەیەنێ، وە داوای یارمەتی لە خوا بکەو دڵگران مەبە، وە ئەگەر شتێکی ناخۆشت توش بوو، مەڵێ: ئەگەر (خۆزگە) ئاوا و ئاوام کردبا، بەڵکو بڵێ: قەدەری خوایە، وە هەر شتێک بیەوێ دەیکات، چونکە بەڕاستی وشەی ئەگەر دەرگای کردەوەی شەیتان دەکاتەوە.

٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى، فَقَالَ لَهُ مُوسَى: يَا آدَمُ، أَنْتَ أَبُونَا خَيَّبْتَنَا وَأَخْرَجْتَنَا مِنَ الْجَنَّةِ بِذَنْبِكَ، فَقَالَ لَهُ آدَمُ: يَا مُوسَى، اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِكَلَامِهِ، وَخَطَّ لَكَ التَّوْرَاةَ بِيَدِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَهُ اللَّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، ثَلَاثًا»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: گفتوگۆ کەوتە نێوان ئادەم و موسا، موسا پێی وت: ئەی ئادەم، تۆ باوکی (یەکەمی) ئێمەی زەرەرمەندت کردین، بە هۆی گوناهەکەتەوە لە بەهەشت وەدەرتناین، جا ئادەم پێی گوت: ئەی موسا، خوا هەڵیبژاردووی (لە نێو پێغەمبەراندا) بەوەی کە (ڕاستەوخۆ) قسەی لەگەڵدا کردی، وە بە دەستی خۆی تەوڕاتی بۆ نوسیوەوە، ئایا سەرزەنشتم دەکەی لەسەر شتێک کە خوا لەسەری نوسیوم (لە لوح المحفوظ ـدا) چل ساڵ پێش ئەوەی دروستم بکا، ئنجا ئادەم زاڵ بوو بەسەر موسادا، ئنجا ئادەم زاڵ بوو بەسەر موسادا، ئنجا ئادەم زاڵ بوو بەسەر موسادا، سێ جار.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٦٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٠٩ و ٦٦١٤، ومسلم: ٢٦٥٢، وأبو داود: ٤٧٠١، والترمذي: ٢١٣٤.

**سەرنج:** ئەو فەرموودەیە بنەمایەكی گرنگی گفتوگۆ و دانوستانمان فێر دەكات كە بریتیە لە وەڵامدانەوە بە بەڵگەوە، وە تەسلیم بوون بۆ بەرانبەر كە بەڵگەكەی بەهێزو گونجاو بوو.

**٨١- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِأَرْبَعٍ: بِاللَّهِ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَبِالْبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ، وَالْقَدَرِ»[١].**

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ بەندەیەک نابێتە بڕواداری تەواو تاوەكو بڕوا بە چوار شت نەهێنێ: بە تاک و تەنیایی خوا كە هیچ هاوبەشی نیە، بە من كە نێردراوی خوام، بە زیندووبونەوەی دوای مردن، بە قەزاو قەدەر.

**٨٢- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، قَالَتْ: دُعِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى جِنَازَةِ غُلَامٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، طُوبَى لِهَذَا، عُصْفُورٌ مِنْ عَصَافِيرِ الْجَنَّةِ، لَمْ يَعْمَلِ السُّوءَ، وَلَمْ يُدْرِكْهُ، قَالَ: أَوَغَيْرُ ذَلِكَ يَا عَائِشَةُ، «إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ لِلْجَنَّةِ أَهْلًا، خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلَابِ آبَائِهِمْ، وَخَلَقَ لِلنَّارِ أَهْلًا، خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلَابِ آبَائِهِمْ»[٢].**

واتە: دایكی بڕواداران عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ كرا بۆ سەر جەنازەی كوڕێكی ئەنصاڕی، وە من وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خۆشی بۆ خۆی، چۆلەكەیەكە لە چۆلەكەكانی بەهەشت، هیچ كردەوەیەكی خراپی نەكردوە، تەنانەت نەگەیشتۆتە تەمەنی باڵغ بوونیش، فەرمووی: بەڵكو دەكرێ شتێكی تر بێت ئەی عائیشە، بێگومان خوا كەسانێكی دروست كردوە بۆ بەهەشت، لەوكاتەوە دروستی كردوون كە لە بڕبڕەی پشتی باوباپیرانیان دابوون، وە كەسانێكیشی دروست كردوە بۆ دۆزەخ، لەوكاتەوە دروستی كردوون كە لە بڕبڕەی پشتی باوباپیرانیان دابوون.

**٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ مُشْرِكُو قُرَيْشٍ يُخَاصِمُونَ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْقَدَرِ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر»[٣].**

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٦٢، وأبو داود: ٤٧١٣، والنسائي: ١٩٤٧.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٥٦، والترمذي: ٢١٥٧ و ٣٢٩٠.



واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: هاوبەشدانەرانی قورەیش هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو موناقەشەیان لەگەڵی کرد دەربارەی قەدەر، ئنجا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر، واتە: ئەو ڕۆژەی کە لە ئاگری دۆزەخدا بەسەر ڕوخساریاندا ڕادەکێشرێن (پێیان دەڵێن) بچێژن ئازاری دۆزەخ ﴿٤٨﴾ بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازە دروست کردوە ﴿٤٩﴾.

**سەرنج:** لەم فەرموودەیەدا ئەوە دەردەکەوێ کە زیاد ڕۆچوون و زۆر قوڵبوونەوە لە مەسەلەی قەزاو قەدەردا پەسند نیەو، بگرە نزیک دەبێتەوە لە حەڕام. بەڵکو بە ئەندازەی دامەزرانی ئیمان لەسەر قەزا و قەدەر دەبێ باس بکرێ و لێکۆڵینەوەی بۆ بکرێ، نەک زێدەڕۆیی تێدابکرێ. (فەرموودەی ژمارە (٨٤) و (٨٥)یش هەمان مەفهومیان لێوەردەگیرێ).

٨٤- عَنْ يَحْيَى بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ، فَذَكَرَ لَهَا شَيْئًا مِنَ الْقَدَرِ، فَقَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَكَلَّمَ فِي شَيْءٍ مِنَ الْقَدَرِ سُئِلَ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ لَمْ يَتَكَلَّمْ فِيهِ لَمْ يُسْأَلْ عَنْهُ»[١].

واتە: یەحیای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو مولەیکە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە چوو بۆ لای عائیشە ﷺ، وە شتێکی بۆ باسکرد دەربارەی قەدەر، ئەویش گوتی: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێم لێبووە فەرموویەتی: هەر کەسێک باسی شتێک بکات دەربارەی قەدەر لە ڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ لەسەری، وە هەر کەسێکیش باسی نەکات (زۆر بە دوای نەکەوێ) لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێ لەسەری.

٨٥- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى أَصْحَابِهِ، وَهُمْ يَخْتَصِمُونَ فِي الْقَدَرِ، فَكَأَنَّمَا يُفْقَأُ فِي وَجْهِهِ، حَبُّ الرُّمَّانِ مِنَ الْغَضَبِ، فَقَالَ: «بِهَذَا أُمِرْتُمْ، أَوْ لِهَذَا خُلِقْتُمْ، تَضْرِبُونَ الْقُرْآنَ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ، بِهَذَا هَلَكَتِ الْأُمَمُ قَبْلَكُمْ» قَالَ: فَقَالَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو، مَا غَبَطْتُ نَفْسِي بِمَجْلِسٍ تَخَلَّفْتُ فِيهِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مَا غَبَطْتُ نَفْسِي بِذَلِكَ الْمَجْلِسِ وَتَخَلُّفِي عَنْهُ[٢].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.




واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای هاوەڵەکانی، وە ئەوان کێشمەکێشیان بوو دەربارەی قەدەر، پێغەمبەریش ﷺ وەک ئەوەی کە هەنارێک ڕوو بە ڕوخساری بگوشرێ (ئاوا ڕوخساری سور هەڵگەڕا) لەبەر توڕەبوون، جا فەرمووی: ئا بەوە فەرمانتان پێکراوە، یاخود بۆ ئەوە دروستکراون، کتێبی خوا هەندێکی بە هەندێکی دادەن، گەلانی پێش ئێوە بەهۆی ئەوەوە لەناوچوون، (ڕاوی دەڵێ:) عەبدوڵڵای کوڕی عەمرۆ وتی: هیچ کات خۆزگەم نەخواستووە کە لە کۆڕێکی پێغەمبەری خوا ﷺ دوا بکەوم بە ئەندازەی ئەوەی کە خۆزگەم خواست لەو کۆڕەی ئامادە نەبووبام.

٨٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا عَدْوَى وَلَا طِيَرَةَ، وَلَا هَامَةَ» فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ الْبَعِيرَ يَكُونُ بِهِ الْجَرَبُ، فَيُجْرِبُ الْإِبِلَ كُلَّهَا؟ قَالَ: «ذَلِكُمُ الْقَدَرُ، فَمَنْ أَجْرَبَ الْأَوَّلَ؟!»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەنینەوەی نەخۆشی (بڵاوبونەوەی نەخۆشی لە کەسێکی توش بووەوە بۆ کەسێکی توش نەبوو) بوونی نیە، هەروەها ڕەش بینی و نوقڵانە لێدان بوونی نیە، هەروەها ڕەش بینی بە هۆی (بینینی باڵندەی) هاممەوە (کە باڵندەیەکی دیاری کراو بووە لەسەردەمی خۆیدا) بوونی نیە، پیاوێکی دەشتەکی هەڵسایەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەو حوشترانە چی کە تووشی نەخۆشی گەڕی (گولی) دەبن، پاشان حوشترەکانی دیکەش توشی هەمان نەخۆشی دەکەن؟ فەرمووی: ئا ئەوە بریتیە لە: قەدەر، ئەی کێ هی یەکەمی توشی ئەو نەخۆشییە کرد؟!

٨٧- عَنِ الشَّعْبِيِّ ﷺ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ عَدِيُّ بْنُ حَاتِمٍ الْكُوفَةَ، أَتَيْنَاهُ فِي نَفَرٍ مِنْ فُقَهَاءِ أَهْلِ الْكُوفَةِ، فَقُلْنَا لَهُ: حَدِّثْنَا مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «يَا عَدِيَّ بْنَ حَاتِمٍ، أَسْلِمْ تَسْلَمْ» قُلْتُ: وَمَا الْإِسْلَامُ؟ فَقَالَ: «تَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَتُؤْمِنُ بِالْأَقْدَارِ كُلِّهَا، خَيْرِهَا وَشَرِّهَا، حُلْوِهَا وَمُرِّهَا»[2].

---

(١) صحيح دون قوله «ذَلِكُمُ الْقَدَرُ».

(٢) ضعيف جداً.



واتە: شەعبی ﷺ دەڵێ: كاتێک عەدیی كوڕی حاتیم ﷺ هاتە كوفە، من و كۆمەڵێک لە فیقهزانانی كوفە چووینە خزمەتی، ئنجا پێیان گوت: پێمان بڵێ چیت بیستووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، وە فەرمووی: ئەی عەدیی كوڕی حاتیم، مسوڵمان بە، سەلامەت دەبی (لە مانەوە لە ئاگر بە هەمیشەیی)، منیش گوتم: ئیسلام چییە؟ ئەویش فەرمووی: شایەتی بدەی كە هیچ پەرستراوێكی بە هەق بوونی نیە جگە لە خوا، وە من نێردراوی خوام، وە بڕوابێنی بە هەموو بەشەكانی قەزاو قەدەر، بە چاک و خراپیەوە، بە شیرین و تاڵیەوە.

**٨٨- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الْقَلْبِ مَثَلُ الرِّيشَةِ تُقَلِّبُهَا الرِّيَاحُ بِفَلَاةٍ»[(١)].**

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نموونەی دڵ وەكو پەڕی باڵندەیە، با ئەمدی و ئەودیوی پێدەكات لە شوێنێكی چۆڵدا (كە ئاوەدانی نەبێ).

**٨٩- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي جَارِيَةً، أَعْزِلُ عَنْهَا؟ قَالَ: «سَيَأْتِيهَا مَا قُدِّرَ لَهَا» فَأَتَاهُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَقَالَ: قَدْ حَمَلَتِ الْجَارِيَةُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا قُدِّرَ لِنَفْسٍ شَيْءٌ إِلَّا هِيَ كَائِنَةٌ»[(٢)].**

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە ئەنصارییەكان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كەنیزەكێكم هەیە، ئایا دەكرێ ڕێگری منداڵ بوون بكەم لێی؟ فەرمووی: لە قەدەردا چ شتێكی بۆ نوسراوە هەر ئەوەی بۆ دێتە پێش، پاش ماوەیەک كابرایەكە هاتەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: كەنیزەكەكە دووگیان بووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هەر نەفسێک هەر شتێكی بۆ نوسرابێت بێگومان هەر دێتەجێ.

**سەرنج:** عەزل: واتە دەرهێنانەوەی ئەندامی نێرینە لەناو داوێنی ئافرەت لەكاتی ئاوهاتنەوەدا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. مسلم: ١٤٣٩/١٣٤ و ٢١٧٣.




**٩٠- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَزِيدُ فِي الْعُمْرِ إِلَّا الْبِرُّ، وَلَا يَرُدُّ الْقَدَرَ إِلَّا الدُّعَاءُ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُحْرَمُ الرِّزْقَ بِخَطِيئَةٍ يَعْمَلُهَا»[١].**

**واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەمەن زیاد ناکات تەنها بە چاکەکاری نەبێت، وە قەدەر تەنیا بە پاڕانەوە ڕەت دەبێتەوە، وە بەڕاستی پیاو (مرۆڤ) بە هۆی هەڵەو گوناهەوە کە دەیکات بژێوی لێ دەگیرێتەوەو تەنگ دەکرێتەوە.**

**٩١- عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ جُعْشُمٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْعَمَلُ فِيمَا جَفَّ بِهِ الْقَلَمُ، وَجَرَتْ بِهِ الْمَقَادِيرُ، أَمْ فِي أَمْرٍ مُسْتَقْبَلٍ؟ قَالَ: «بَلْ فِيمَا جَفَّ بِهِ الْقَلَمُ، وَجَرَتْ بِهِ الْمَقَادِيرُ، وَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ»[٢].**

**واتە: سوڕاقەی کوڕی جوعشوم ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، کارو کردەوەی مرۆڤ بە گوێرەی ئەوەیە کە لە قەدەردا نوسراوە و قەڵەمی خوای بەسەردا هاتووە، یان بە گوێرەی شتێکی داهاتوویە؟ فەرمووی: بەڵکو بە گوێرەی ئەوەیە کە لە قەدەردا نوسراوە و قەڵەمی خوای بەسەردا هاتووە، وە هەموو کەسێک ئاسانکاری بۆ دەکرێ بۆ ئەوەی کە بۆی دروستکراوە.**

**٩٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مَجُوسَ هَذِهِ الْأُمَّةِ الْمُكَذِّبُونَ بِأَقْدَارِ اللَّهِ، إِنْ مَرِضُوا فَلَا تَعُودُوهُمْ، وَإِنْ مَاتُوا فَلَا تَشْهَدُوهُمْ، وَإِنْ لَقِيتُمُوهُمْ فَلَا تُسَلِّمُوا عَلَيْهِمْ»[٣].**

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئاگرپەرستانی ئەم ئوممەتە ئەوانەن کە قەزاو قەدەرەکانی خوا بە درۆ دەخەنەوە، جا بۆیە ئەگەر نەخۆش کەوتن سەردانیان مەکەن، وە ئەگەر مردن بەشداری بە خاک سپاردنەکەیان مەکەن، وە ئەگەر پێیان گەیشتن سڵاویان لێ مەکەن.**

---

**(١) حسن دون قوله «وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُحْرَمُ الرِّزْقَ بِخَطِيئَةٍ يَعْمَلُهَا».**

**(٢) صحيح.**

**(٣) حسن دون جملة التسليم.**

# بابەت: ڕێز و گەورەیی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ

## ڕێز و گەورەیی ئەبو بەکری صدیق ﷺ

٩٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا إِنِّي أَبْرَأُ إِلَى كُلِّ خَلِيلٍ مِنْ خُلَّتِهِ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلًا، لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلًا، إِنَّ صَاحِبَكُمْ خَلِيلُ اللَّهِ» قَالَ وَكِيعٌ: يَعْنِي نَفْسَهُ[1].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من بەریئم لە هەر هاوڕێیەک کە پێی وابێ کردوومە بە هاوڕێی خۆم، خۆ ئەگەر ئەو کارەم بکردبا ئەوا ئەبو بەکرم دەکرد بە هاوڕێی گیانی بە گیانی، چونکە بێگومان هاوڕێکەتان (واتە: خۆی) خۆشەویستی خوایە. وەکیع دەڵێ: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە (صاحبكم) خودی خۆیەتی.

**الخليل:** بە دۆست و هاوڕێی گیانی بە گیانی دەگوترێ.

٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا نَفَعَنِي مَالٌ قَطُّ، مَا نَفَعَنِي مَالُ أَبِي بَكْرٍ» قَالَ: فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ أَنَا وَمَالِي إِلَّا لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرگیز هیچ سەروەت و سامانێک سوودی پێنەگەیاندووم، بە ئەندازەی ئەوەی کە سەروەت و سامانی ئەبو بەکر سوودی پێگەیاندووم، وتی: ئنجا ئەبو بەکر گریاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا خۆم و سەروەت و سامانەکەم هەر بە تەنیا بۆ تۆ نین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ .

٩٥- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ سَيِّدَا كُهُولِ أَهْلِ الْجَنَّةِ مِنَ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ، إِلَّا النَّبِيِّينَ وَالْمُرْسَلِينَ، لَا تُخْبِرْهُمَا يَا عَلِيُّ مَا دَامَا حَيَّيْنِ»[3].

---

(١) صحيح. مسلم: ٢٣٨٣، والترمذي: ٣٦٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٦٦١ مطولًا.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٦٦٥ و ٣٦٦٦.

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەبو بەکرو عومەر سەروەرو سەرداری بە تەمەنەکانی[1] بەهەشتن لەوانەی سەرەتاو کۆتاییش، تەنها پێغەمبەران و نێردراوان نەبێت، ئەی عەلی ئەو هەواڵەیان پێ مەدە تاوەکو ئەوان زیندووبن (واتە: هەرگیز پێیان مەڵێ، ئەگەرنا دوای مردن ناتوانرێ هەواڵیان پێبدرێ).

٩٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَهْلَ الدَّرَجَاتِ الْعُلَى يَرَاهُمْ مَنْ أَسْفَلَ مِنْهُمْ كَمَا يُرَى الْكَوْكَبُ الطَّالِعُ فِي الْأُفُقِ مِنْ آفَاقِ السَّمَاءِ، وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ مِنْهُمْ وَأَنْعَمَا»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەوانەی خاوەن پلەی بەرزن (لە بەهەشتدا) ئەوانەی خوار خۆیان بە جۆرێک تەماشایان دەکەن و دەیان بینن هەروەک چۆن (لەلایەن خەڵکی سەر زەوییەوە) ئەستێرەیەکی درەوشاوە لە بەرزاییەکانی ئاسمان دەبینرێ، وە بێگومان ئەبو بەکرو عومەر لەو خاوەن پلەو پایانەن وە زیاتریش، یان دەچنە ناو ئەو نازو نیعمەتەوە.

٩٧- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَا أَدْرِي مَا قَدْرُ بَقَائِي فِيكُمْ، فَاقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي» وَأَشَارَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ[3].

واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من نازانم تاکو کەی (زۆر یان کەم) لە نێوتاندا دەمێنمەوە، بۆیە لە دوای من شوێنی ئەو دووانە بکەون، وە ئاماژەی کرد بۆ ئەبو بەکرو عومەر.

**سەرنج:** ئەم فەرموودەیە ئاماژەیەکی تێدایە لەسەر جێنشینایەتی ئەم دوو بەڕێزە لە دوای پێغەمبەر ﷺ.

---

(١) کهول - کهل: واتە: ئەوانەی لە تەمەنی (٣٠-٤٠) ساڵیدان، لێرەدا مەبەست سەرەتا و چوونە ناو تەمەنی پیرییە، بەڵام مەبەست لە فەرموودەکەدا بە مانای ئەوەی: سەروەر و سەرداری ئەوانەن کە لە تەمەنی پیریدا مردوون، چونکە لە بەهەشتدا پیری نیە.

(٢) صحيح لغيره. البخاري: ٣٢٥٦، ومسلم: ٢٨٣١، وأبو داود: ٣٩٨٧، والترمذي: ٣٦٥٨.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٦٦٢ و ٣٦٦٣ وبإثر ٣٧٩٩.



٩٨- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، يَقُولُ: لَمَّا وُضِعَ عُمَرُ عَلَى سَرِيرِهِ، اكْتَنَفَهُ النَّاسُ يَدْعُونَ وَيُصَلُّونَ - أَوْ قَالَ يُثْنُونَ وَيُصَلُّونَ - عَلَيْهِ قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، وَأَنَا فِيهِمْ، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلَّا رَجُلٌ قَدْ زَحَمَنِي، وَأَخَذَ بِمَنْكِبِي، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، فَتَرَحَّمَ عَلَى عُمَرَ، ثُمَّ قَالَ: مَا خَلَّفْتَ أَحَدًا أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَلْقَى اللَّهَ بِمِثْلِ عَمَلِهِ مِنْكَ، وَايْمُ اللَّهِ، إِنْ كُنْتُ لَأَظُنُّ لَيَجْعَلَنَّكَ اللَّهُ ﷻ مَعَ صَاحِبَيْكَ، وَذَلِكَ أَنِّي كُنْتُ أُكَثِّرُ أَنْ أَسْمَعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «ذَهَبْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَدَخَلْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَخَرَجْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ» فَكُنْتُ أَظُنُّ لَيَجْعَلَنَّكَ اللَّهُ مَعَ صَاحِبَيْكَ[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێک کە عومەر لەسەر جێگاکەی دانرا، خەڵک دەورەیانداو، دوعایان بۆ دەکرد، یان گوتی: ستایشیان دەکردو دوعایان بۆی دەکرد پێش ئەوەی هەڵیبگرن، وە منیش لە نێویاندا بووم، لە ناکاو پیاوێک هاتە سەر سەرم شانی گرتم، منیش ئاوڕم داوە بینیم عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبە، ئنجا ڕەحمەتی بۆ عومەر نارد، پاشان گوتی: هیچ کەسێکت دوای خۆت بەجێ نەهێشتووە کە من پێم خۆش بێت بە کردەوەیەک وەک کردەوەی ئەو بە خوا بگەم، جگە لە خۆت، وە سوێند بە خوا من گومانم دەبەم کە خوا لەگەڵ دوو هاوڕێیەکەت بخات (پێغەمبەر ﷺو ئەبو بەکر)، ئەوەش بەوەی کە زۆر جار لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەمبیست کە دەیفەرموو: (لە ژیانی دونیادا) ڕۆیشتم لەگەڵ ئەبو بەکرو عومەر، وە چووین من و ئەبو بەکرو عومەر، وە دەرچووین من و ئەبو بەکرو عومەر، جا من گومان دەبەم کە خوا بتخاتە گەڵ دوو هاوڕێکەت.**

٩٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَقَالَ: «هَكَذَا نُبْعَثُ»[2].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێوان ئەبو بەکرو عومەر، ئەوجار فەرمووی: ئا بەو شێوەیە (بە یەکەوە) زیندوو دەکرێینەوە (لە قیامەتدا).**

١٠٠- عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ سَيِّدَا كُهُولِ أَهْلِ الْجَنَّةِ مِنَ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ، إِلَّا النَّبِيِّينَ وَالْمُرْسَلِينَ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٧٧، ومسلم: ٢٣٨٩.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣٦٦٩.

(٣) صحيح.

واتە: عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەبو بەکرو عومەر سەروەرو سەرداری بە تەمەنەکانی بەهەشتن لەوانەی سەرەتاو کۆتایش (لە گەلانی پێشوو)، تەنها پێغەمبەران و نێردراوان نەبێت.

١٠١- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: «عَائِشَةُ» قِيلَ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَ: «أَبُوهَا»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا، خۆشەویسترین کەس لای تۆ کێیە؟ فەرمووی: عائیشە، گوترا: ئەی لە پیاوان؟ فەرمووی: باوکی عائیشە (واتە: ئەبو بەکر ﷺ).

## ڕێز و گەورەیی عومەر ﷺ

١٠٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَيُّ أَصْحَابِهِ كَانَ أَحَبَّ إِلَيْهِ؟ قَالَتْ: «أَبُو بَكْرٍ» قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّهُمْ؟ قَالَتْ: «عُمَرُ» قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّهُمْ؟ قَالَتْ: «أَبُو عُبَيْدَةَ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق ﷺ دەڵێ: بە دایکی ئیماندارانی عائیشەم وت: کام لە هاوەڵەکانی لە لای خۆشەویستتر بوو، وتی: ئەبو بەکر، وتم: ئەی دوای ئەو؟ وتی: عومەر، وتم: ئەی دوای ئەو؟ وتی: ئەبو عوبەیدە.

١٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «لَمَّا أَسْلَمَ عُمَرُ، نَزَلَ جِبْرِيلُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، لَقَدِ اسْتَبْشَرَ أَهْلُ السَّمَاءِ بِإِسْلَامِ عُمَرَ»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێک عومەر مسوڵمان بوو، جیبریل هاتە خوارەوەو فەرمووی: ئەی موحەممەد ﷺ، بەڕاستی دانیشتوانی ئاسمان موژدەیان پێدراوە بە مسوڵمان بوونی عومەر.

١٠٤- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَّلُ مَنْ يُصَافِحُهُ الْحَقُّ عُمَرُ، وَأَوَّلُ مَنْ يُسَلِّمُ عَلَيْهِ، وَأَوَّلُ مَنْ يَأْخُذُ بِيَدِهِ فَيُدْخِلُهُ الْجَنَّةَ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٨٩٠.

(٢) صحيح. الترمذي: ٣٦٥٧.

(٣) ضعيف جداً.

(٤) منكر جداً.

واتە: ثوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم کەس کە تەوقە لەگەڵ هەقدا دەکات (هەقی بۆ ئاشکرا دەبێ پێش ئەوانیتر) عومەرە، وە هەر ئەو یەکەم کەسە کە بۆ هەق ملکەچ دەبێ، وە هەر ئەو یەکەم کەسە کە دەستی دەگرێ و دەیباتە بەهەشتەوە.

١٠٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ أَعِزَّ الْإِسْلَامَ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ خَاصَّةً»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە گیان ئایینی ئیسلام بەهێز بکە بە تایبەتی بە (مسوڵمان بوونی) عومەری کوڕی خەتتاب.

١٠٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَمَةَ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا، يَقُولُ: «خَيْرُ النَّاسِ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَبُو بَكْرٍ، وَخَيْرُ النَّاسِ بَعْدَ أَبِي بَكْرٍ عُمَرُ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلەمە ﵁ دەڵێ: گوێم لە عەلی بوو، دەیگوت: باشترین کەس لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکرە، وە باشترین کەس لە دوای ئەبو بەکر عومەرە.

١٠٧- عَنْ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ، رَأَيْتُنِي فِي الْجَنَّةِ، فَإِذَا أَنَا بِامْرَأَةٍ تَتَوَضَّأُ إِلَى جَنْبِ قَصْرٍ، فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذَا الْقَصْرُ؟ فَقَالَتْ: لِعُمَرَ، فَذَكَرْتُ غَيْرَتَهُ، فَوَلَّيْتُ مُدْبِرًا» قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَبَكَى عُمَرُ، فَقَالَ: أَعَلَيْكَ، بِأَبِي وَأُمِّي، يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغَارُ؟[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، ئەویش فەرمووی: کاتێک من خەوتبووم، خۆمم بینی لەنێو بەهەشتم، جا ئافرەتێکم بینی لە تەنیشت کۆشکێکدا دەستنوێژی دەگرت، گوتم: ئەو کۆشکە بۆ کێیە؟ (ئافرەتەکە) وتی: بۆ عومەرە، منیش غیرەی عومەرم بیرکەوتەوە، بۆیە گەڕامەوەو پشتم تێکرد، ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: ئنجا عومەر گریاو وتی: بە دایک و باوکمەوە فیداتبم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا من غیرە لە تۆ دەکەم؟

---

(١) صحيح دون قوله «خَاصَّةً». أخرجه الترمذي: ٣٦٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٧١، بنحوه أبو داود: ٤٦٢٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٤٢، ومسلم: ٢٣٩٥، والترمذي معلقاً بإثر: ٣٦٨٩.

١٠٨- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ الْحَقَّ عَلَى لِسَانِ عُمَرَ يَقُولُ بِهِ»[١].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بێگومان خوا هەقی خستۆتە سەر زمانی عومەر، ئەویش دەری دەبڕێ.

## ڕێز و گەورەیی عوسمان ﷺ

١٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لِكُلِّ نَبِيٍّ رَفِيقٌ فِي الْجَنَّةِ، وَرَفِيقِي فِيهَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو پێغەمبەرێک هاوڕێیەکی هەیە لە بەهەشتدا، وە هاوڕێی من لە بەهەشتدا عوسمانی کوڕی عەففانە.

١١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَقِيَ عُثْمَانَ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: «يَا عُثْمَانُ، هَذَا جِبْرِيلُ أَخْبَرَنِي أَنَّ اللَّهَ قَدْ زَوَّجَكَ أُمَّ كُلْثُومٍ بِمِثْلِ صَدَاقِ رُقَيَّةَ، عَلَى مِثْلِ صُحْبَتِهَا»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەرگای مزگەوت گەیشت بە عوسمان، جا فەرمووی: ئەی عوسمان، ئەوە جیبریل بوو هەواڵی پێدام، کە خوا ئوممو کولسومی لێ مارەکردووی بە هەمان مارەیی ڕوقیە، وە بە هەمان شێوەی ئەو هەڵسوکەوت و مامەڵەیەی کە لەگەڵ ڕوقیە هەتبوو.

١١١- عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِتْنَةً فَقَرَّبَهَا، فَمَرَّ رَجُلٌ مُقَنَّعٌ رَأْسُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَذَا يَوْمَئِذٍ عَلَى الْهُدَى» فَوَثَبْتُ، فَأَخَذْتُ بِضَبْعَيْ عُثْمَانَ، ثُمَّ اسْتَقْبَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: هَذَا؟ قَالَ: «هَذَا»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٩٦٢.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح.



واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی فیتنەی کردوو زۆر نزیکی کردەوە، لەو کاتەدا پیاوێک ڕابرد کە سەری داپۆشرابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەو ڕۆژەدا ئەو پیاوە لەسەر هەقەو لەسەر ڕاستە ڕێیە، منیش هەڵسام، قۆڵی عوسمانم گرت، پاشان ڕووم کردە پێغەمبەری خوا ﷺ جا گوتم: ئا ئەوە؟ فەرمووی: ئا ئەوە.

**١١٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عُثْمَانُ، إِنْ وَلَّاكَ اللَّهُ هَذَا الْأَمْرَ يَوْمًا، فَأَرَادَكَ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تَخْلَعَ قَمِيصَكَ الَّذِي قَمَّصَكَ اللَّهُ، فَلَا تَخْلَعْهُ» يَقُولُ: ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَ النُّعْمَانُ: فَقُلْتُ لِعَائِشَةَ: مَا مَنَعَكِ أَنْ تُعْلِمِي النَّاسَ بِهَذَا؟ قَالَتْ: أُنْسِيتُهُ**[1].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی عوسمان، ئەگەر ڕۆژێک خوا کاروباری خستە ژێر دەستی تۆ، وە دوو ڕووەکانیش ویستیان ئەو کراسە (ی خەلافەتت) لەبەر دابڕنن کە خوا بە بەریدا کردووی، ئەوە دایمەڕنە، سێ جار ئەوەی فەرموو، نوعمان دەڵێ: بە عائیشەم گوت: چ شتێک ڕێگری لێکردی کە ئەو هەواڵە بە خەڵکی بڵێی؟ گوتی: لەبیرم چووبۆوە.

**١١٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ: «وَدِدْتُ أَنَّ عِنْدِي بَعْضَ أَصْحَابِي» قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا نَدْعُو لَكَ أَبَا بَكْرٍ؟ فَسَكَتَ، قُلْنَا: أَلَا نَدْعُو لَكَ عُمَرَ؟ فَسَكَتَ قُلْنَا: أَلَا نَدْعُو لَكَ عُثْمَانَ؟ قَالَ: «نَعَمْ» فَجَاءَ، فَخَلَا بِهِ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يُكَلِّمُهُ، وَوَجْهُ عُثْمَانَ يَتَغَيَّرُ قَالَ: قَيْسٌ، فَحَدَّثَنِي أَبُو سَهْلَةَ مَوْلَى عُثْمَانَ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، قَالَ يَوْمَ الدَّارِ: «إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَهِدَ إِلَيَّ عَهْدًا، فَأَنَا صَائِرٌ إِلَيْهِ» وَقَالَ عَلِيٌّ فِي حَدِيثِهِ: «وَأَنَا صَابِرٌ عَلَيْهِ» قَالَ قَيْسٌ: فَكَانُوا يُرَوْنَهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ**[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشییەکەیدا فەرمووی: پێم خۆش بوو هەندێک لە هاوڕێکانم لەلا بوایە، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆت بانگی ئەبو بەکر نەکەین؟ ئەویش بێدەنگ بوو، گوتمان: ئەی بۆت بانگی عومەر نەکەین؟ ئەویش بێدەنگ بوو، گوتمان: ئەی بۆت بانگی عوسمان نەکەین؟ فەرمووی: بەڵێ،

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٧٠٥.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٧١١.



جا عوسمان هات و بە تەنیا بەیەکەوە مانەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵدا کردو، ڕووخساری عوسمان دەگۆڕا، قەیس دەڵێ: ئەبو سەهلە مەولای عوسمان بۆی گێڕامەوە کە عوسمانی کوڕی عەففان لە ڕۆژی گەمارۆدانەکەی لە ماڵەکەیدا گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمان و هەواڵی پێداوم، منیش خۆڕاگر دەبم لەسەر ئەو پەیمانە، عەلی لە گێڕانەوەکەیدا دەڵێ: عوسمان گوتی: منیش ئارام دەگرم لەسەر ئەو پەیمانە، قەیس دەڵێ: جا هاوەڵان زانیان کە ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێکردوە.

## ڕێز و گەورەیی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب رضي الله عنه

**١١٤-** عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه، قَالَ: عَهِدَ إِلَيَّ النَّبِيُّ الْأُمِّيُّ ﷺ: «أَنَّهُ لَا يُحِبُّنِي إِلَّا مُؤْمِنٌ، وَلَا يُبْغِضُنِي إِلَّا مُنَافِقٌ»[١].

واتە: عەلی رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری نەخوێندەوار ﷺ پەیمانی پێمداو فەرمووی: منی خۆشناوێ جگە لە بڕوادار، وە هیچ کەس ڕقی لێم نابێتەوە جگە لە کەسی دووڕوو.

**١١٥-** عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنَ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ لِعَلِيٍّ: «أَلَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى»[٢].

واتە: ئیبراهیمی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لە باوکی رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە بە عەلی فەرمووە: ئایا ڕازی نیت بەوەی کە تۆ بۆ من لە جێگەو پێگەی هاڕوون بیت بۆ موسا.

**١١٦-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنه، قَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّتِهِ الَّتِي حَجَّ، فَنَزَلَ فِي بَعْضِ الطَّرِيقِ، فَأَمَرَ الصَّلَاةَ جَامِعَةً، فَأَخَذَ بِيَدِ عَلِيٍّ، فَقَالَ: «أَلَسْتُ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ؟» قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «أَلَسْتُ أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ؟» قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «فَهَذَا وَلِيُّ مَنْ أَنَا مَوْلَاهُ، اللَّهُمَّ وَالِ مَنْ وَالَاهُ، اللَّهُمَّ عَادِ مَنْ عَادَاهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٨، والترمذي: ٣٧٣٦، والنسائي: ٥٠١٨ و ٥٠٢٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٠٦، ومسلم: ٢٤٠٤، والترمذي: ٣٧٢٤ و ٣٧٣١.

(٣) صحيح.

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتین لەو حەجەی کە کردی، جا لە هەندێک شوێن لە ڕێگا دابەزی و فەرمانی کرد بە نوێژی جەماعەت، ئنجا دەستی عەلی گرت و فەرمووی: ئایا من لە پێشترنیم بۆ بڕواداران لە نەفسی خۆیان؟ گوتیان: بەڵێ وایە، فەرمووی: ئایا من لە پێشترنیم بۆ هەر بڕوادارێک لە نەفسی خۆی؟ گوتیان: بەڵێ وایە، فەرمووی: کەواتە ئا ئەوە (عەلی) خۆشەویستی ئەو کەسەیە کە منی خۆشدەوێت، خودایە ئەو کەسەی عەلی خۆشدەوێ تۆش خۆشت بوێ، خودایە ئەو کەسەشی ڕقی لێیەتی و دژایەتی دەکات بیبوغزێنەو ڕقت لێی بێ.

١١٧- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ﷺ، قَالَ: كَانَ أَبُو لَيْلَى يَسْمُرُ مَعَ عَلِيٍّ ﷺ، فَكَانَ يَلْبَسُ ثِيَابَ الصَّيْفِ فِي الشِّتَاءِ، وَثِيَابَ الشِّتَاءِ فِي الصَّيْفِ، فَقُلْنَا: لَوْ سَأَلْتَهُ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ إِلَيَّ وَأَنَا أَرْمَدُ الْعَيْنِ يَوْمَ خَيْبَرَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَرْمَدُ الْعَيْنِ، فَتَفَلَ فِي عَيْنِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَذْهِبْ عَنْهُ الْحَرَّ وَالْبَرْدَ» قَالَ: فَمَا وَجَدْتُ حَرًّا وَلَا بَرْدًا بَعْدَ يَوْمِئِذٍ، وَقَالَ: «لَأَبْعَثَنَّ رَجُلًا يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، لَيْسَ بِفَرَّارٍ» فَتَشَرَّفَ لَهُ النَّاسُ، فَبَعَثَ إِلَى عَلِيٍّ، فَأَعْطَاهَا إِيَّاهُ[1].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا ﷺ دەڵێ: ئەبو لەیلا شەوان لەگەڵ عەلی ﷺ دەمایەوە (دوای نوێژی خەوتنان)، وە (عەلی) پۆشاکی هاوینانی بە زستانان دەپۆشی و هی زستانانی بە هاوینان دەپۆشی، ئێمەش گوتمان (بە ئەبو لەیلا): ئەگەر لێت پرسیبا هۆکارەکەی چییە؟ ئەویش (عەلی) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دووی ناردم لە ڕۆژی خەیبەردا لە کاتێکدا کە چاوەکانم لێڵ ببوون (کز ببون)، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەکانم لێڵ بوون، ئەویش (پێغەمبەر ﷺ) تفی کردە چاوەکانم و فەرمووی: خوایە کاریگەری سەرماو گەرما لێ دووربخەوە، دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: لەو ڕۆژەوە هەستم بە گەرما و سەرما نەکردوە، وە (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بە بێگومان کەسێک دەنێرم (بۆ خەیبەر) کە ئەو کەسە خواو پێغەمبەری خوای ﷺ خۆشدەوێ، وە خوا و پێغەمبەری خواش ﷺ ئەویان خۆشدەوێ، وە ئەو کەسە (لە جەنگدا) هەڵنایەت، جا هەموو خەڵک چاوەڕێی ئەو کەسەیان دەکردو، هەمووان حەزیان دەکرد ئەو کەسە بۆ خۆی بێت، (پاشان) پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوای عەلیدا ناردو ئاڵاکەی دایە دەستی ئەو.

---

(١) حسن.

**١١٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ سَيِّدَا شَبَابِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَأَبُوهُمَا خَيْرٌ مِنْهُمَا»[١].**

**واتە: ئیبنو عومەر ﵄، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حەسەن و حوسەین گەورەو سەرداری گەنجانی خەڵکی بەهەشتن، وە باوکیشیان لە خۆیان باشترە.**

**١١٩- عَنْ حُبْشِيِّ بْنِ جُنَادَةَ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «عَلِيٌّ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، وَلَا يُؤَدِّي عَنِّي إِلَّا عَلِيٌّ»[٢].**

**واتە: حوبشی کوڕی جونادە ﵁، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: عەلی لە منەو، منیش لە ئەوم (واتە: نزیکیهان هەیە)، وە تەنها عەلی لە جیاتی من کاروبار ڕایی دەکات.**

**١٢٠- عَنْ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁، قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ: «أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَأَخُو رَسُولِهِ ﷺ، وَأَنَا الصِّدِّيقُ الْأَكْبَرُ، لَا يَقُولُهَا بَعْدِي إِلَّا كَذَّابٌ، صَلَّيْتُ قَبْلَ النَّاسِ لِسَبْعِ سِنِينَ»[٣].**

**واتە: عەببادی کوڕی عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێ: عەلی گوتوویەتی: من بەندەی خوام و برای پێغەمبەرەکەیم ﷺ، وە من (صديق الأكبر)م، (واتە: لە پێش ئەبو بەکریش بڕوام هێناوە، وە یەکەم کەس بووم)، وە هیچ کەسێک ئەو قسەیە ناکات لە دوای من تەنها ئەو کەسە نەبێ کە زۆر درۆزنە، حەوت ساڵ پێش خەڵک (مەبەستی هاوتەمەنەکانی خۆیەتی) نوێژم کردوە.**

**١٢١- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁، قَالَ: قَدِمَ مُعَاوِيَةُ فِي بَعْضِ حَجَّاتِهِ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ سَعْدٌ، فَذَكَرُوا عَلِيًّا، فَنَالَ مِنْهُ، فَغَضِبَ سَعْدٌ، وَقَالَ: تَقُولُ هَذَا لِرَجُلٍ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ كُنْتُ مَوْلَاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلَاهُ» وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «أَنْتَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى، إِلَّا أَنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي» وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «لَأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ الْيَوْمَ رَجُلًا يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ»[٤].**

---

(١) صحيح.

(٢) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٧١٩.

(٣) باطل.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٠٦، ومسلم: ٢٤٠٤، والترمذي: ٣٧٢٤ و ٣٧٣١.

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەڵێ: موعاویە ﷺ هات لە یەکێک لە حەجەکان و سەعد چوو بۆ لای، جا باسی عەلی ﷺ کرا، موعاویەش بە خراپی باسی عەلی کرد، سەعدیش تووڕەبو و، گوتی: ئاوا بە پیاوێک دەڵێی کە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس من بە خۆشەویست و پشتیوانی خۆی بزانێ عەلی بە هەمان شێوە خۆشەویستیەتی، وە گوێم لێی بوو دەیفەرموو: تۆ (عەلی) بۆ من لەشوێن هاڕوون وای بۆ موسا، تەنها ئەوە هەیە کە لە دوای من پێغەمبەرێکی تر نایەت، وە گوێم لێبوو دەیفەرموو: ئەمڕۆ (لە فەتحی خەیبەردا) ئاڵاکە دەدەمە دەست پیاوێک کە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) خۆشدەوێ.

## ڕێز و گەورەیی زوبەیر ﷺ

**١٢٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ قُرَيْظَةَ «مَنْ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ؟» فَقَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا، فَقَالَ: «مَنْ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ؟» قَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا ثَلَاثًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيٌّ، وَإِنَّ حَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی قورەیزەدا فەرمووی: کێ هەواڵی ئەو کۆمەڵەمان بۆ دێنێ؟ جا زوبەیر گوتی: من، (دووبارە پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: کێ هەواڵی ئەو کۆمەڵەمان بۆ دێنێ؟ زوبەیریش سێ جار گوتی: من، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێک دڵسۆزو پشتیوان و خەڵکی تایبەتی خۆی هەبووە، وە بێگومان دڵسۆزو پشتیوانی منیش زوبەیرە.

**١٢٣-** عَنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، قَالَ: «لَقَدْ جَمَعَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبَوَيْهِ يَوْمَ أُحُدٍ»[٢].

واتە: زوبەیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئوحوددا ناوی دایک و باوکی کۆکردەوە بۆ من. (واتە: فەرمووی: بە دایک و باوکەوە، ئەوەش بۆ ڕێزو بە گەورە زانینە، وە ئەوەشی لێ دەخوێنرێتەوە کە مەدحی بەرەو ڕوو دروستە بۆ کەسێک کە شایستە بێت).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٤٦، ومسلم: ٢٤١٥، والترمذي: ٣٧٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٢٠، ومسلم: ٢٤١٦، والترمذي: ٣٧٤٣.

١٢٤- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَتْ لِي عَائِشَةُ، «يَا عُرْوَةُ كَانَ أَبَوَاكَ مِنَ: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ﴾ آل عمران: أَبُو بَكْرٍ، وَالزُّبَيْرُ»[1].

واتە: هیشامی کوڕی عوڕوە لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: عائیشە پێی گوتم: ئەی عوڕوە باوانت ئەبو بەکر و زوبەیر لەوانەن کە ئەو ئایەتەیان لەسەر دابەزی: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ﴾ آل عمران، واتە: ئەوانەی کە وەڵامی خواو پێغەمبەریان ﷺ دایەوە لەپاش ئەوەی کە (لە ئوحوددا) تووشی برینداری بوون.

**أبواك:** مەبەست پێی باپیرانی بووە لە دایک و باوکییەوە کە ئەبو بەکرو زوبەیر بوون ﷺ.

## ڕێز و گەورەیی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ﷺ

١٢٥ عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ طَلْحَةَ مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «شَهِيدٌ يَمْشِي عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ»[2].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە تەڵحە بە لای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: (تەڵحە) شەهیدێکە بەسەر زەویدا دەڕوات.

١٢٦- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ، قَالَ: نَظَرَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى طَلْحَةَ، فَقَالَ: «هَذَا مِمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ»[3].

واتە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تەماشای تەڵحەی کردو، فەرمووی: ئا ئەوە لەوانەیە کە: (قَضَى نَحْبَهُ)، واتە: ئەوانەی کە وەفاداربوون بە بەڵێن و پەیمانەکەیان و، جەنگان لە پێناو خوادا تاکو شەهید بوون.

١٢٧- عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ ﷺ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ: أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «طَلْحَةُ مِمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٧٧، ومسلم: ٢٤١٨.

(٢) صحيح بطريقه وشواهده. أخرجه الترمذي: ٣٧٣٩ و ٣٧٤٨.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٢٠٢ و ٣٧٤٠.

(٤) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٢٠٢ و ٣٧٤٠.




واتە: موسای کوڕی تەڵحە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەلای موعاویە ﷺ بووین، (موعاویە ﷺ) گوتی: شایەدیی دەدەم کە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: تەڵحە لەوانەیە کە وەفاداربوون بە بەڵێنەکەیان تاکو مردن.

**١٢٨-** عَنْ قَيْسٍ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ يَدَ طَلْحَةَ شَلَّاءَ، وَقَى بِهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ»[١].

واتە: قەیس ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا بینیم دەستی تەڵحە وشک (ڕەق) ببوو، پێغەمبەری خوای ﷺ پێ دەپاراست.

## ڕێز و گەورەیی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ

**١٢٩-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَمَعَ أَبَوَيْهِ لِأَحَدٍ غَيْرَ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ، فَإِنَّهُ قَالَ لَهُ يَوْمَ أُحُدٍ: «ارْمِ سَعْدُ، فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي»[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ (ناوی) دایک و باوکی کۆبکاتەوە بۆ هیچ کەس تەنها بۆ سەعدی کوڕی مالیک نەبێ، لە ڕۆژی ئوحوددا پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: (تیر) بهاوێژە ئەی سەعد دایک و باوکم فیدات بن.

**١٣٠-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، يَقُولُ: لَقَدْ جَمَعَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ أَبَوَيْهِ، فَقَالَ: «ارْمِ سَعْدُ، فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي»[٣].

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئوحوددا ناوی دایک و باوکی بۆ من کۆکردنەوەو، فەرمووی: (تیر) بهاوێژە ئەی سەعد، باوک و دایکم فیدات بن.

**١٣١-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، يَقُولُ: «إِنِّي لَأَوَّلُ الْعَرَبِ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٠٥، ومسلم: ٢٤١١، والترمذي: ٢٨٢٨ و ٣٧٥٣ و ٣٧٥٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٢٥، ومسلم: ٢٤١٢، والترمذي بإثر: ٢٨٢٩ و ٢٨٣٠ و ٣٧٥٤.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٢٨، ومسلم: ٢٩٦٦، والترمذي: ٢٣٦٥.

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ گوتوویەتی: من یەکەم کەس بووم لە عەڕەب کە تیری لە پێناو خوادا هاویشتبێ.

١٣٢- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ: «مَا أَسْلَمَ أَحَدٌ فِي الْيَوْمِ الَّذِي أَسْلَمْتُ فِيهِ، وَلَقَدْ مَكَثْتُ سَبْعَةَ أَيَّامٍ وَإِنِّي لَثُلُثُ الْإِسْلَامِ»[١].

واتە: لە سەعدی کوڕی وەقاصەوە ﷺ دەگێڕنەوە (کە گوتوویەتی:) لەو ڕۆژەی کە من تیایدا مسوڵمان بووم کەسی تر مسوڵمان نەبوو، وە حەوت ڕۆژ مامەوەو سێ یەکی (یەک لەسەر سێی) ئەهلی ئیسلام بووم.

سەرنج: دیارە بە پێی زانیاری خۆی قسەی کردوە، کە دیارە نەیزانیوە پێش خۆی خەڵکی دیکە مسوڵمان بووە، وەک: خاتوو خەدیجە، ئەبو بەکر، عەلی...، چونکە ئەو کاتە مسوڵمانان ئیسلامەتییەکەیان دەشاردەوە لەبەر دوژمن.

## ڕێز و گەورەیی دە (مژدە پێدراوەکان) ﷺ

١٣٣- عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ ﷺ، يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَاشِرَ عَشَرَةٍ، فَقَالَ: «أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ، وَالزُّبَيْرُ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعْدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ فِي الْجَنَّةِ» فَقِيلَ لَهُ: مَنِ التَّاسِعُ؟ قَالَ: «أَنَا»[٢].

واتە: سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمڕی کوڕی نوفەیل ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەمی یەکەمەکان بوو، فەرمووی: ئەبو بەکر لە بەهەشتەو، عومەر لە بەهەشتەو، عوسمان لە بەهەشتەو، عەلی لە بەهەشتەو، تەڵحە لە بەهەشتەو، زوبەیر لە بەهەشتەو، سەعد لە بەهەشتەو، عەبدوڕڕەحمان لە بەهەشتە، بە سەعیدیان گوت: کێ نۆیەم بوو؟ گوتی: من.

١٣٤- عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «اثْبُتْ حِرَاءُ، فَمَا عَلَيْكَ إِلَّا نَبِيٌّ، أَوْ صِدِّيقٌ، أَوْ شَهِيدٌ» وَعَدَّهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، وَعَلِيٌّ، وَطَلْحَةُ، وَالزُّبَيْرُ، وَسَعْدٌ، وَابْنُ عَوْفٍ، وَسَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٢٦ و ٣٧٢٧ و ٣٨٥٨.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٦٤٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٦٤٨ و ٤٦٥٠، والترمذي: ٣٧٥٧.

واتە: سەعیدی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: شایەدیی دەدەم لەسەر ئەوەی کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێم لێبوو دەیفەرموو: ئەی (حراء) (کێوێکە سێ میل لە مەکەوە دوورە) هێمن بە، هیچ کەس لە سەرت نیە، جگە لە پێغەمبەرێک و ڕاستگۆیەک و شەهیدێک نەبێ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ژماردنی: ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی و تەڵحەو زوبەیرو سەعدو ئیبنو عەوف و سەعیدی کوڕی زەید.

## ڕێز و گەورەیی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح ﷺ

**١٣٥- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِأَهْلِ نَجْرَانَ: «سَأَبْعَثُ مَعَكُمْ رَجُلًا أَمِينًا حَقَّ أَمِينٍ» قَالَ: فَتَشَرَّفَ لَهُ النَّاسُ، فَبَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ[1].**

واتە: حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەهلی نەجرانی فەرموو: پیاوێکی ئەمینتان لەگەڵدا دەنێرم کە لە ئەوپەڕی دەست پاکی و ئەمینداریدایە، گوتی: خەڵکی ئامادەبوو هەموو چاوەڕێی ئەوە بوون بزانن ئەو کەسە کێیە خاوەنی ئەو سیفەتە بەرزەیە (واتە: هەمووان چاوەڕێ بوون پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوو لەو بکات لەبەر خاتری ئەو سیفەتە کە باسی کرد)، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی لەگەڵدا ناردن.

**١٣٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِأَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ: «هَذَا أَمِينُ هَذِهِ الْأُمَّةِ»[2].**

واتە: عەبدوڵڵاوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی فەرمووە: ئەوە ئەمینداری ئەو ئوممەتەیە.

## ڕێز و گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ

**١٣٧-.عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كُنْتُ مُسْتَخْلِفاً أَحَداً عَنْ غَيْرِ مَشُورَةٍ، لَاسْتَخْلَفْتُ ابْنَ أُمِّ عَبْدٍ»[3].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٤٥، ومسلم: ٢٤٢٠، والترمذي: ٣٧٩٦.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣٨٠٨ و ٣٨٠٩.

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێکم لە جێگای خۆم دانابا بەبێ ڕاوێژ، ئەوە کوڕی ئوممو عەبدم دادەنا (واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود).

**١٣٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، بَشَّرَاهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَقْرَأَ الْقُرْآنَ غَضًّا كَمَا أُنْزِلَ، فَلْيَقْرَأْهُ عَلَى قِرَاءَةِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەبو بەکرو عومەر ﷺ مژدەیان پێداوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پێی خۆشە قورئان بە جوانترین شێوەو وەک ئەوەی دابەزیوە بیخوێنێ، با بە خوێندنەوەی کوڕی ئوممو عەبد بیخوێنێتەوە.

**١٣٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذْنُكَ عَلَيَّ أَنْ تَرْفَعَ الْحِجَابَ، وَأَنْ تَسْمَعَ سِوَادِي، حَتَّى أَنْهَاكَ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: تۆ لەلایەن منەوە ڕێگا پێدراوی کە پەردە لابدەی و، گوێت لە نهێنیەکانم بێ، هەتا ئەوکاتەی لێت قەدەغە دەکەم.

## ڕێز و گەورەیی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب ﷺ

**١٤٠-** عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نَلْقَى النَّفَرَ مِنْ قُرَيْشٍ وَهُمْ يَتَحَدَّثُونَ فَيَقْطَعُونَ حَدِيثَهُمْ، فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَتَحَدَّثُونَ، فَإِذَا رَأَوُا الرَّجُلَ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي قَطَعُوا حَدِيثَهُمْ، وَاللَّهِ لَا يَدْخُلُ قَلْبَ رَجُلٍ الْإِيمَانُ حَتَّى يُحِبَّهُمْ لِلَّهِ وَلِقَرَابَتِهِمْ مِنِّي»[٣].

واتە: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب ﷺ دەڵێ: ئێمە کاتێک دەگەیشتین بە خەڵکانێک لە قوڕەیش و خۆبەخۆ قسەیان دەکردو قسەکانیان دەبڕی (بۆ ئەوەی قسەکانیان نەبیستین نەک لەبەر ئەوەی کە نهێنی بێ، چونکە ئەگەر نهێنی بووایە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٦٩.

(٣) ضعيف.

کێشه نەدەبوو)، جا ئێمەش ئەوەمان لای پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، ئەویش فەرمووی: هۆی چییە خەڵکانێک قسەی خۆبەخۆ دەکەن، کاتێکیش پیاوێ لە ئال و بەیتی من دەبینن قسەکانیان دەبڕن؟ سوێند بە خوا ئیمان ناچێتە دڵی هیچ پیاوێک (کەسێک) تاکو ئال و بەیتی منیان لەبەر خواو لەبەر نزیکیان لە من خۆش نەوێت.

**١٤١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ اتَّخَذَنِي خَلِيلًا كَمَا اتَّخَذَ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا، فَمَنْزِلِي وَمَنْزِلُ إِبْرَاهِيمَ فِي الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُجَاهَيْنِ، وَالْعَبَّاسُ بَيْنَنَا مُؤْمِنٌ بَيْنَ خَلِيلَيْنِ»[1].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا منی بە خۆشەویستی خۆی داناوە، هەر وەک چۆن ئیبراهیمی بە خۆشەویستی خۆی داناوە، جێگاو پێگەیی من و ئیبراهیم لە بەهەشتدا لە ڕۆژی قیامەتدا ڕووبەڕووی یەکن، وە عەبباسیش لە بەینمان دایە، بڕوادارێک لە نێوان دوو خۆشەویستدا.

## ڕێز و گەورەیی حەسەن و حوسەین
## کوڕەکانی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب رضي الله عنهم

**١٤٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِلْحَسَنِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُ فَأَحِبَّهُ، وَأَحِبَّ مَنْ يُحِبُّهُ» قَالَ: وَضَمَّهُ إِلَى صَدْرِهِ[2].

**واتە:** ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە حەسەنی رضي الله عنه فەرمووە: خودایە من حەسەنم خۆشدەوێ تۆش خۆشت بوێ، وە ئەوەی ئەویشی خۆشدەوێ خۆشت بوێ، (ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه) دەڵێ: وە پێغەمبەر ﷺ حەسەنی گوشی بە سنگییەوە.

**١٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ فَقَدْ أَحَبَّنِي، وَمَنْ أَبْغَضَهُمَا فَقَدْ أَبْغَضَنِي»[3].

---

(١) موضوع.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٢٢ و ٥٨٨٤، ومسلم: ٢٤٢١.

(٣) حسن.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس حەسەن و حوسەینی خۆش بوێت، ئەوە منی خۆشویستووە، وە هەر کەس ڕقی لێیان بێ، ئەوە ڕقی لە منیشە.

١٤٤- عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي رَاشِدٍ ﷺ، أَنَّ يَعْلَى بْنَ مُرَّةَ، حَدَّثَهُمْ أَنَّهُمْ خَرَجُوا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى طَعَامٍ دُعُوا لَهُ، فَإِذَا حُسَيْنٌ يَلْعَبُ فِي السِّكَّةِ، قَالَ: فَتَقَدَّمَ النَّبِيُّ ﷺ أَمَامَ الْقَوْمِ، وَبَسَطَ يَدَيْهِ، فَجَعَلَ الْغُلَامُ يَفِرُّ هَاهُنَا وَهَاهُنَا، وَيُضَاحِكُهُ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى أَخَذَهُ، فَجَعَلَ إِحْدَى يَدَيْهِ تَحْتَ ذَقْنِهِ، وَالْأُخْرَى فِي فَأْسِ رَأْسِهِ فَقَبَّلَهُ وَقَالَ: «حُسَيْنٌ مِنِّي، وَأَنَا مِنْ حُسَيْنٍ، أَحَبَّ اللَّهُ مَنْ أَحَبَّ حُسَيْنًا، حُسَيْنٌ سِبْطٌ مِنَ الْأَسْبَاطِ»[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی ئەبو ڕاشیدەوە ﷺ دەگێڕنەوە، کە یەعلای کوڕی موڕڕە بۆی گێڕاونەوە کە ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچوون کە بۆ دەعوەتێ بانگ کرابوون، لەوکاتەدا حوسەین لەسەر ڕێگاکە یاری دەکرد، دەڵێ: جا پێغەمبەر ﷺ هاتە پێشی خەڵکەکەو دەستەکانی کردەوە (بۆ ئەوەی یاری لەگەڵ بکات و بیگرێت)، ئنجا منداڵەکە (حوسەین) لەوێ بۆ ئەوێ ڕایدەکرد (وەکو عادەتی منداڵان کاتێک کە دەتهەوێ بیگری)، وە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیدا پێدەکەنی، تاکو گرتی، ئنجا دەستێکی خستە ژێر چەناگەیی و دەستێکی خستە پشتەسەری و ماچی کرد، وە فەرمووی: حوسەین لە منەو منیش لە حوسەینم، خوا ئەو کەسەی خۆشدەوێ و خۆشەویستی دەکات کە حوسەینی خۆشدەوێ، حوسەین یەکێکە لە نەوەکان (بۆ دڵنیا کردنەوەو تەئکید کردنەوە لەوەی کە فەرمووی: حوسەین لە منە).

١٤٥- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِعَلِيٍّ، وَفَاطِمَةَ، وَالْحَسَنِ، وَالْحُسَيْنِ: «أَنَا سِلْمٌ لِمَنْ سَالَمْتُمْ، وَحَرْبٌ لِمَنْ حَارَبْتُمْ»[2].

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەینی فەرموو: من ئاشتی و سەلامەتی و چاکەم بۆ ئەوانەی ئاشتی و سەلامەتی ئێوەیان دەوێ، وە شەڕدەکەم و دژی ئەوانەم کە دژتانن و شەڕتان لەگەڵ دەکەن.

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٧٧٥.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣٨٧٠.

## ڕێز و گەورەیی عەممارِی کوڕی یاسر رضي الله عنهما

**١٤٦-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه، قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ: فَاسْتَأْذَنَ عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ائْذَنُوا لَهُ، مَرْحَبًا بِالطَّيِّبِ الْمُطَيَّبِ»[1].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب رضي الله عنه دەڵێ: لە لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووم لەوکاتەدا عەمارِی کوڕی یاسر مۆڵەتی هاتنی خواست، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ڕێگای پێبدەن، بەخێربێی ئەی پاکی پاکەوەبوو (مەبەست لەم ستایش کردنە ئەوەیە: کە لە زاتی خۆیدا پاکە و بە کردەوە و خۆڕاگریش پاکتر و باشتر بووە).**

**١٤٧-** عَنْ هَانِئِ بْنِ هَانِئٍ رضي الله عنه، قَالَ: دَخَلَ عَمَّارٌ رضي الله عنه عَلَى عَلِيٍّ رضي الله عنه، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالطَّيِّبِ الْمُطَيَّبِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مُلِئَ عَمَّارٌ إِيمَانًا إِلَى مُشَاشِهِ»[2].

**واتە: هانیئی کوڕی هانیئ رضي الله عنه دەڵێ: عەمارِ رضي الله عنه هاتە لای عەلی رضي الله عنه، ئەویش گوتی: بەخێر بێی پاکی پاکەوەبوو، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: عەمارِ تا سەر ئێسقانی پڕبووە لە ئیمان.**

**مشاش: واتە: سەری ئێسقان، وەکو ئانیشک و شان.**

**١٤٨-** عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَمَّارٌ مَا عُرِضَ عَلَيْهِ أَمْرَانِ إِلَّا اخْتَارَ الْأَرْشَدَ مِنْهُمَا»[3].

**واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کات نەبووە دوو فەرمان (یان دوو شت) خرابێتە بەردەم عەمارِ، ئەوە تەنها ڕاسترینەکەیانی هەڵبژاردووە.**

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٧٩٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٧٩٩..

## ڕێز و گەورەیی سەلمان، وە ئەبو زەڕ، وە میقداد رضي الله عنهم

**١٤٩-** عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي بِحُبِّ أَرْبَعَةٍ، وَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ يُحِبُّهُمْ» قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ هُمْ؟ قَالَ: «عَلِيٌّ، مِنْهُمْ» يَقُولُ ذَلِكَ ثَلَاثًا: «وَأَبُو ذَرٍّ، وَسَلْمَانُ، وَالْمِقْدَادُ»[١].

**واتە:** ئیبنو بوڕەیدە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا فەرمانی پێکردووم چوار کەسم خۆشبوێن و، پێشی ڕاگەیاندووم کە بۆ خۆشی خۆشیدەوێن، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە کێن؟ فەرمووی: عەلی لەوانە، سێ جار ئەوەی فەرموو، وە ئەبو زەڕ، وە سەلمان، وە میقداد.

**١٥٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁، قَالَ: «كَانَ أَوَّلَ مَنْ أَظْهَرَ إِسْلَامَهُ سَبْعَةٌ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعَمَّارٌ، وَأُمُّهُ سُمَيَّةُ، وَصُهَيْبٌ، وَبِلَالٌ، وَالْمِقْدَادُ، فَأَمَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَمَنَعَهُ اللَّهُ بِعَمِّهِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَمَّا أَبُو بَكْرٍ فَمَنَعَهُ اللَّهُ بِقَوْمِهِ، وَأَمَّا سَائِرُهُمْ فَأَخَذَهُمُ الْمُشْرِكُونَ، وَأَلْبَسُوهُمْ أَدْرَاعَ الْحَدِيدِ، وَصَهَرُوهُمْ فِي الشَّمْسِ، فَمَا مِنْهُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَقَدْ وَاتَاهُمْ عَلَى مَا أَرَادُوا، إِلَّا بِلَالًا، فَإِنَّهُ هَانَتْ عَلَيْهِ نَفْسُهُ فِي اللَّهِ، وَهَانَ عَلَى قَوْمِهِ، فَأَخَذُوهُ فَأَعْطَوْهُ الْوِلْدَانَ، فَجَعَلُوا يَطُوفُونَ بِهِ فِي شِعَابِ مَكَّةَ، وَهُوَ يَقُولُ: أَحَدٌ أَحَدٌ»[٢].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ دەڵێ: ئەوانەی کە یەکەم کەس بوون ئیسلامەتی خۆیان ئاشکرا کرد حەوت کەس بوون: پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ئەبو بەکرو، عەممارو سومەییەی دایکی عەممارو، سوهەیب و بیلال و میقداد بوون، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی مامیەوە (ئەبو تاڵیب) پارێزراو بوو (لە دەستی قوڕەیش)، وە ئەبو بەکریش بە هۆی هۆزەکەی خۆی پارێزراو بوو، بەڵام ئەوانیتر هاوبەشدانەران گرتیانن و پۆشاکی ئاسنینیان لەبەرکردن و لەبەر خۆر ڕایان دەگرتن، هیچ یەکێک لەوانە نەبوو (کە ئەزیەتیان دەدان) کە هەرچی هاوبەشدانەران بیانویستبایە ئەوان دەیانکرد و دەیانگوت (تا ڕزگاریان ببێ)، جگە لە بیلال، بەڕاستی بیلال خۆی زۆر بە بچووک دەزانی لە چاو دینی خوادا (خۆی دەکردە قوربانی)، وە هۆزەکەشی بە کەم دەزانی،

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣٧١٨.

(٢) حسن.

بۆیە دەیانگرت و دەیاندایە دەست منداڵان و ئەوانیش بە کۆڵانەکانی مەککەدا دەیانگێڕاو (ئەزیەتیان دەدا) ئەویش (بیلال) هەر دەیگوت: (أَحَدٌ أَحَدٌ)، واتە: خودا تاکەو هاوبەشی نیە.

**١٥١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ أُوذِيتُ فِي اللَّهِ وَمَا يُؤْذَى أَحَدٌ، وَلَقَدْ أُخِفْتُ فِي اللَّهِ وَمَا يُخَافُ أَحَدٌ، وَلَقَدْ أَتَتْ عَلَيَّ ثَالِثَةٌ وَمَا لِي وَلِبِلَالٍ طَعَامٌ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ، إِلَّا مَا وَارَى إِبْطُ بِلَالٍ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی لە پێناو دینی خوادا ئەوەندە ئازار دراوم کە هیچ کەسێک ئەوەندە ئازار نەدراوە، وە بەڕاستی ئەوەندە ترسێنراوم لە پێناو دینی خوادا کە هیچ کەس هێندە نەترسێنراوەو، جار هەبووە سێ شەو بە سەرمدا تێپەڕیوە من و بیلال هیچ خواردنێکمان نەبووە کە ڕووح لەبەر بیخوات، تەنها ئەوەندە نەبێ کە لە ژێر باڵی بیلالدا جێی دەبۆوە.

## ڕێز و گەورەیی بیلال

**١٥٢-** عَنْ سَالِمٍ ﷺ، أَنَّ شَاعِرًا مَدَحَ بِلَالَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، فَقَالَ: بِلَالُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ خَيْرُ بِلَالٍ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: «كَذَبْتَ، لَا، بَلْ بِلَالُ رَسُولِ اللَّهِ خَيْرُ بِلَالٍ»[٢].

واتە: سالیم ﷺ دەگێڕێتەوە کە شاعیرێک بە بیلالی کوڕی عەبدوڵڵادا هەڵیدەداو دەیگوت: بیلالی کوڕی عەبدوڵڵا باشترین بیلالە، ئنجا ئیبنو عومەر گوتی: درۆت کرد، نەخێر، بەڵکو بیلالی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین بیلالە.

## ڕێز و گەورەیی خەبباب

**١٥٣-** عَنْ أَبِي لَيْلَى الْكِنْدِيِّ ﷺ، قَالَ: جَاءَ خَبَابٌ: إِلَى عُمَرَ فَقَالَ: «ادْنُ، فَمَا أَحَدٌ أَحَقَّ بِهَذَا الْمَجْلِسِ مِنْكَ إِلَّا عَمَّارٌ، فَجَعَلَ خَبَابٌ: يُرِيهِ آثَارًا بِظَهْرِهِ مِمَّا عَذَّبَهُ الْمُشْرِكُونَ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٤٧٢.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.




واتە: ئەبو لەیلای کیندی ﷺ دەڵێ: خەبباب هات بۆ لای عومەر، عومەریش گوتی: نزیک بەرەوە، هیچ کەسێک لە تۆ شایستەتر نیە بەو کۆڕ و مەجلیسە جگە لە عەممار، خەببابیش شوێنەواری ئەشکەنجەدانی هاوبەشدانەرانی نیشان دەدا کە بە پشتییەوە بوون.

## ڕێز و گەورەیی زەیدی کوڕی سابیت

**١٥٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ، وَأَشَدُّهُمْ فِي دِينِ اللَّهِ عُمَرُ، وَأَصْدَقُهُمْ حَيَاءً عُثْمَانُ، وَأَقْضَاهُمْ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَأَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَأَعْلَمُهُمْ بِالْحَلَالِ وَالْحَرَامِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأَفْرَضُهُمْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِينًا، وَأَمِينُ هَذِهِ الْأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بەزەییترین کەس لە ئوممەتەکەم بۆ ئوممەتەکەم ئەبو بەکرە، وە توندترین کەس بۆ دینی خوا (بۆ پاراستنی و دەست پێوەگرتنی) عومەرە، وە ڕاستگۆترینیان لە حەیاو شەرمدا عوسمانە، وە سەرڕاسترینیان لە حوکم و قەزادا عەلی کوڕی ئەبو تالیبە، وە شارەزاترینیان لە خوێندنەوەی قورئان ئوبەی کوڕی کەعبە، وە زاناترینیان لە حەڵاڵ و حەرامدا موعازی کوڕی جەبەلە، وە شارەزاترینیان لە میراتدا زەیدی کوڕی سابیتە، ئاگاداربن بەڕاستی هەموو ئوممەتێک ئەمیندارێکی هەیە، وە ئەمینداری ئەو ئوممەتە ئەبو عوبەیدەی جەڕاحە.

**١٥٥-** عَنْ ابْنِ قُدَامَةَ، غَيْرَ أَنَّهُ يَقُولُ: فِي حَقِّ زَيْدٍ «وَأَعْلَمُهُمْ بِالْفَرَائِضِ»(٢).

واتە: لە ئیبن قودامەوە (گێڕدراوەتەوە، بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشتر) جگە لەوەی کە دەربارەی زەید فەرموویەتی: زاناترینیان بە میرات (یان بە فەڕز و واجباتەکان).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٤٤، ومسلم: ٢٤١٩ فضل أبي عبيدة فقط، والترمذي: ٣٧٩٠ و ٣٧٩١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٤٤، ومسلم: ٢٤١٩ فضل أبي عبيدة فقط، والترمذي: ٣٧٩٠ و ٣٧٩١.

## ڕێز و گەورەیی ئەبو زەڕ

**١٥٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا أَقَلَّتِ الْغَبْرَاءُ، وَلَا أَظَلَّتِ الْخَضْرَاءُ، مِنْ رَجُلٍ أَصْدَقَ لَهْجَةً مِنْ أَبِي ذَرٍّ»(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﵄ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لەسەر زەوی و لە ژێر ئاسماندا، هیچ پیاوێک نیە کە لە ئەبو زەڕ زمانی ڕاستگۆتر بێ.

## ڕێز و گەورەیی سەعدی کوڕی مەعاز

**١٥٧-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁، قَالَ: أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَرَقَةٌ مِنْ حَرِيرٍ، فَجَعَلَ الْقَوْمُ يَتَدَاوَلُونَهَا بَيْنَهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذَا؟» فَقَالُوا لَهُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْ هَذَا»(٢).

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﵁ دەڵێ: پارچە قوماشێکی ئاوریشم بە دیاری هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، خەڵکیش لە نێوان خۆیاندا دەستا و دەستیان پێدەکردو (تەماشایان دەکرد)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا سەرسام بوون (لە جوانی ئەو پارچەیە)؟ ئەوانیش گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە، ئەو مەندیلەی سەعدی کوڕی مەعاز لە بەهەشتدا باشترە لەو پارچە قوماشە.

**١٥٨-** عَنْ جَابِرٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اهْتَزَّ عَرْشُ الرَّحْمَنِ ﷻ لِمَوْتِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ»(٣).

واتە: جابیر ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عەڕشی خوای بە بەزەیی ﷻ بۆ مردنی سەعدی کوڕی موعاز هەژاو لەرزی.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٨٠١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٤٩، ومسلم: ٢٤٦٨، والترمذي: ٣٨٤٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٠٣، ومسلم: ٢٤٦٦، والترمذي: ٣٨٤٨.

## ڕێز و گەورەیی جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی

**١٥٩-** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ ﷺ، قَالَ: مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلَا رَآنِي إِلَّا تَبَسَّمَ فِي وَجْهِي، وَلَقَدْ شَكَوْتُ إِلَيْهِ أَنِّي لَا أَثْبُتُ عَلَى الْخَيْلِ، فَضَرَبَ بِيَدِهِ فِي صَدْرِي، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا»[١].

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی ﷺ دەڵێ: لەو کاتەوەی مسوڵمان بووم، هیچ کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بەڕووەوە نەناوم (هیچ داواکارییەکی ڕەت نەکردوومەوە)، وە هیچ جارێک منی نەبینیوە، مەگەر بە ڕوومدا زەردەخەنەی کردوە، وە من سکاڵای ئەوەم لەلا کرد کە ناتوانم لەسەر ئەسپ خۆم ڕابگرم، ئەویش بە دەستی خۆی دەستی لە سنگمداو فەرمووی: خوایە خۆڕاگری بکە و، بیگێڕە لەوانەی کە هیدایتیان وەرگرتووەو، بیکە بە هیدایەتدەر.

## ڕێز و گەورەیی ئەهلی بەدر

**١٦٠-** عَنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ جِبْرِيلُ أَوْ مَلَكٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «مَا تَعُدُّونَ مَنْ شَهِدَ بَدْرًا فِيكُمْ؟» قَالُوا: خِيَارَنَا، قَالَ: «كَذَلِكَ هُمْ عِنْدَنَا خِيَارُ الْمَلَائِكَةِ»[٢].

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: جیبریل، یان فریشتەیەک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەوانەی لە بەدر ئامادەبوون چۆن حیسابیان بۆ دەکەن لە نێو خۆتاندا؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: باشترینمانن، (واتە: ئەوان باشترینی ئەوانە بوون کە ئامادە نەبوون لەوکاتەدا)، گوتی: بە هەمان شێوە لای ئێمەش (ئەو فریشتانەی کە ئامادەبوون ئەوکات) باشترینی فریشتەکانمانن.

**١٦١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ، وَلَا نَصِيفَهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٣٥، ومسلم: ٢٤٧٥، والترمذي: ٣٨٢٠ و ٣٨٢١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٩٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٧٣، ومسلم: ٢٥٤١، وأبو داود: ٤٦٥٨، والترمذي: ٣٨٦١.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێو بە هاوەڵانم مەدەن، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر یەکێک لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێتەوە، ناکاتە مستێکی (مشتێکی) یەکێک لە هاوەڵانم، وە ناکاتە نیوەی مشتێکی ئەوانیش.

١٦٢- عَنْ ابْنُ عُمَرَ ﷺ، يَقُولُ: «لَا تَسُبُّوا أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ ﷺ، فَلَمُقَامُ أَحَدِهِمْ سَاعَةً، خَيْرٌ مِنْ عَمَلِ أَحَدِكُمْ عُمُرَهُ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ گووتویەتی: جنێو بە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ مەدەن، بەڕاستی پلەو پێگەی سەعاتێکی ئەوان، باشترە لە کردەوەی تەواوی تەمەنی هەر یەکێک لە ئێوە.

## ڕێز و گەورەیی پشتیوانان

١٦٣- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ الْأَنْصَارَ أَحَبَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ أَبْغَضَ الْأَنْصَارَ أَبْغَضَهُ اللَّهُ» قَالَ شُعْبَةُ: قُلْتُ لِعَدِيٍّ: أَسَمِعْتَهُ مِنَ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ؟ قَالَ: إِيَّايَ حَدَّثَ[٢].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ئەنصاڕی خۆشبوێ، ئەوە خوا خۆشیدەوێ، وە هەر کەسیش ڕقی لە ئەنصاڕ بێ، ئەوە خوا ڕقی لێیەتی، شوعبە دەڵێ: بە عەدیم گوت: تۆ لە بەڕائی کوڕی عازیبت بیستووە؟ گوتی: بۆ خودی منی گێڕایەوە.

١٦٤- عَنْ عَبْدِ الْمُهَيْمِنِ بْنِ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْأَنْصَارُ شِعَارٌ، وَالنَّاسُ دِثَارٌ، وَلَوْ أَنَّ النَّاسَ اسْتَقْبَلُوا وَادِيًا أَوْ شِعْبًا، وَاسْتَقْبَلَتِ الْأَنْصَارُ وَادِيًا، لَسَلَكْتُ وَادِيَ الْأَنْصَارِ، وَلَوْلَا الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الْأَنْصَارِ»[٣].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٨٣، ومسلم: ٧٥، والترمذي: ٣٩٠٠.

(٣) صحيح. تخريجه انفرد به ابن ماجه. (البخاري: ٤٣٣٠ و ٧٢٤٥، ومسلم: ١٠٦١ من حديث عبد الله بن زيد).

واتە: عەبدولموهەیمینی کوڕی عەبباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعد لە باوکیەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەنصارەکان تایبەتمەندی خۆیان هەیەو، لە خەڵکی تر بە گشتی لە پێشترن، خۆ ئەگەر هەموو خەڵکی ڕوو لە شیوێک، یان دۆڵێک بکەن و ئەنصاڕیش بە تەنیا ڕوو لە شوێنێکی تر بکەن، ئەوە منیش شوێن ڕێی ئەنصاڕ دەکەوم، وە خۆ ئەگەر کۆچ (هیجرەت) نەبووایە، ئەوە من یەکێک دەبووم لە ئەنصاڕ.

**تێبینی:** (واتە: ئەگەر هیجرەت و کۆچکردن ئەو پلەوپایەی نەبووایە کە هەیەتی، ئەوە خۆم لەگەڵ ئەنصاڕ هەژمار دەکرد، مەبەستی لەوەیە کە بفەرموێ: پلەو پێگەی ئەنصاڕ لە دوای ئەوانەی کۆچیان کردوە لە مەککەوە بۆ مەدینە، ئەوە پلەی ئەوان لە هی هەموو کەسێکی تر گەورەترە، نەک مەبەستی گۆڕینی نەسەب و ڕەچەڵەک بێ، چونکە ئەوە حەڕامە لە شەرعدا، وە ئەنصاڕ تایبەتمەندی زیاتریان هەیە لە چاو خەڵک بە گشتی، لەبەر ئەو ڕێز و قەدرەی کە لێیان گیراوە، ئەوان لەدوای کۆچبەران (موهاجیرەکان) لە هەموو کەس لەپێشترن لە پاداشت، بۆیەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ئەگەر گەورەیی کۆچ (هیجرەت) نەبوایە ئەوا خۆم بە ئەنصاڕ حیساب دەکرد).

**شعار:** ئەو پۆشاکەیە کە لەسەر لاشەوە لەبەر دەکرێ.

**دیثار:** ئەو پۆشاکەیە کە لە دوای پۆشاکی یەکەم لەبەر دەکرێ.

**١٦٥-** عَنْ كَثِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَحِمَ اللَّهُ الْأَنْصَارَ، وَأَبْنَاءَ الْأَنْصَارِ، وَأَبْنَاءَ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ»[1].

واتە: کەسیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عەوف لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەحمەت و سۆزو بەزەیی خوا لە ئەنصاڕو منداڵی ئەنصاڕو منداڵی منداڵی ئەنصاڕ بێت.

---

(١) ضعيف بهذا اللفظ، صحيح بلفظ: اللهم اغفر للأنصار. تخريجه انفرد به ابن ماجه. (البخاري: ٤٩٠٦، ومسلم: ٢٥٠٦ من حديث زيد بن أرقم).

## ڕێز و گەورەیی ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما

١٦٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: ضَمَّنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَيْهِ وَقَالَ: «اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْحِكْمَةَ، وَتَأْوِيلَ الْكِتَابِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆیەوە گوشیم و فەرمووی: ئەی پەروەردگار فێری دانایی و لێکدانەوەی تەفسیری قورئانی بکە.

## باسێک دەربارەی خەواریج

١٦٧- عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه، قَالَ: وَذَكَرَ الْخَوَارِجَ، فَقَالَ: «فِيهِمْ رَجُلٌ مُخْدَجُ الْيَدِ، أَوْ مُودَنُ الْيَدِ، أَوْ مَثْدُونُ الْيَدِ، وَلَوْلَا أَنْ تَبْطَرُوا لَحَدَّثْتُكُمْ بِمَا وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ يَقْتُلُونَهُمْ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ ﷺ»: قُلْتُ: أَنْتَ سَمِعْتَهُ مِنْ مُحَمَّدٍ ﷺ؟ قَالَ: «إِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ[٢].

واتە: عەبیدە دەگێڕێتەوە، لە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب رضي الله عنه کە باسی خەواریجی کرد، ئەویش گوتی: پیاوێکیان تێدایە کە دەستی نوقسانەو دەستی بچووکە، خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ توشی غروری و سەرکەشی ببن، ئەوە هەواڵی ئەو پەیمان و بەڵێن و پاداشتەم پێدەدان کە خوا داویەتی بەوانەی شەڕیان لەگەڵدا دەکەن لەسەر زمانی موحەممەد ﷺ، دەڵێ منیش گوتم: ئایا تۆ ئەوەت لە (پێغەمبەر) موحەممەد ﷺ بیستووە؟ سێ جار گوتی: بەڵێ، سوێند بە پەروەردگاری کەعبە.

١٦٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ أَحْدَاثُ الْأَسْنَانِ، سُفَهَاءُ الْأَحْلَامِ، يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ النَّاسِ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، فَمَنْ لَقِيَهُمْ فَلْيَقْتُلْهُمْ، فَإِنَّ قَتْلَهُمْ أَجْرٌ عِنْدَ اللَّهِ لِمَنْ قَتَلَهُمْ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٥٦، ومسلم: ٢٤٧٧، والترمذي: ٣٨٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٦٦، وأبو داود: ٤٧٦٣.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٢١٨٨.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کۆتایی زەماندا کۆمەڵێک پەیدادەبن لە تەمەندا منداڵن، لە عەقڵدا لاوازن (عەقڵ سوکن)، قسەکانیان قسەی باشن وەک هی خەڵک، (بەڵام پێچەوانەی ڕەفتاریانە)، قورئان دەخوێنن، بەڵام لە گەروویان تێناپەڕێ (واتە: لێیان قبووڵ ناکرێ، یان لە گەروویان ناچێتە خوارەوە بۆ نێو دڵیان)، لە ئیسلام دەردەچن وەکە چۆن تیر (لە نێچیر) دەردەچێ، هەر کەس پێیان گەیشت با بیانکوژێ، چونکە کوشتنیان پاداشتی لەسەرە لەلایەن خواوە.

**١٦٩- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، هَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُ فِي الْحَرُورِيَّةِ شَيْئًا؟ فَقَالَ: سَمِعْتُهُ يَذْكُرُ «قَوْمًا يَتَعَبَّدُونَ، يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلَاتَهُ مَعَ صَلَاتِهِمْ، وَصَوْمَهُ مَعَ صَوْمِهِمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، أَخَذَ سَهْمَهُ فَنَظَرَ فِي نَصْلِهِ، فَلَمْ يَرَ شَيْئًا، فَنَظَرَ فِي رِصَافِهِ فَلَمْ يَرَ شَيْئًا، فَنَظَرَ فِي قِدْحِهِ فَلَمْ يَرَ شَيْئًا، فَنَظَرَ فِي الْقُذَذِ فَتَمَارَى، هَلْ يَرَى شَيْئًا أَمْ لَا»**[1].

واتە: ئەبو سەلەمە ﷺ دەڵێ: بە ئەبو سەعیدی خودریم گوت: ئایا هیچ شتێکت دەربارەی حەڕوڕییە (واتە: خەواریج) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووە؟ ئەویش گوتی: لێم بیستووە کە باسی کۆمەڵێکی دەکرد کە پەرستش و عیبادەت دەکەن، هەر یەکێک لە ئێوە نوێژەکەی خۆی لە چاو ئەو نوێژەی کە ئەوان دەیکەن بە کەم دەزانێ، وە ڕۆژووەکەی لە چاو ڕۆژووەکانی ئەوان هەروا، ئەوان لە دین دەردەچن هەروەکو چۆن تیر (لە نێچیر) دەردەچێ، جا کاتێ (ڕاوچی) تیرەکە هەڵدەگرێتەوەو تەماشای سەری تیرەکە دەکات هیچ شتێکی پێوە نابینێ، تەماشای دوای ئەوە دەکات هیچ نابینێ، تەماشای کلکی تیرەکە دەکات هەر هیچی پێوە نابینێ (لە شوێنەواری نێچیرەکە) ئنجا تەماشای پەڕەکەی دەکات ئاخۆ شتێک (لە شوێنەواری نێچیرەکە) دەبینێ، یان نا (لەبەر خێرایی دەرچوونی تیرەکە لە نێچیرەکە).

کەواتە: چۆن تیرەکە بە تیژی و خێرایی لە نێچیرەکە دەردەچێ و هیچ شتێک لە نێچیرەکە نابات و پێیەوە نانوسێ، بە هەمان شێوەش ئەو کۆمەڵەی کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردوون، دەفەرموێ: هیچ شوێنەواری عیبادەتەکەیان لەسەر ڕەنگ ناداتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٤٤، ومسلم: ١٠٦٤، وأبو داود بنحوه: ٤٧٦٤، والنسائي: ٢٥٧٨ و ٤١٠١.




**١٧٠-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ بَعْدِي مِنْ أُمَّتِي، أَوْ سَيَكُونُ بَعْدِي مِنْ أُمَّتِي قَوْمٌ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حُلُوقَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، ثُمَّ لَا يَعُودُونَ فِيهِ، هُمْ شِرَارُ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ» قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الصَّامِتِ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَافِعِ بْنِ عَمْرٍو، أَخِي الْحَكَمِ بْنِ عَمْرٍو الْغِفَارِيِّ، فَقَالَ: وَأَنَا أَيْضًا قَدْ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[١].

**واتە:** ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە دوای من هەندێک لە ئوممەتەکەم یان (فەرمووی:) لە دوای من خەڵکانێک لە ئوممەتەکەم پەیدادەبن قورئان دەخوێنن، بەڵام لە گەروویان ناچێتە خوار، لە دین دەردەچن وەکو چۆن تیر (لە نێچیر) دەردەچێ، وە دوای ئەوەش نایێنەوە نێو ئیسلام، ئەوانە خراپترینی دروستکراوەکانن، عەبدوڵڵای کوڕی صامیت دەڵێ: ئەوەم بۆ ڕافیعی کوڕی عەمرِ باسکرد، ئەویش گوتی: منیش بە هەمان شێوە بیستوومە لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

**١٧١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَقْرَأَنَّ الْقُرْآنَ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي، يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ»[٢].

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکانێک لە ئوممەتی من قورئان دەخوێنن، (لە حاڵێکدا) کە لە ئیسلام دەردەچن هەروەک چۆن تیر (لە نێچیر) دەردەچێ.

**١٧٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْجِعْرَانَةِ وَهُوَ يَقْسِمُ التِّبْرَ وَالْغَنَائِمَ، وَهُوَ فِي حِجْرِ بِلَالٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: اعْدِلْ يَا مُحَمَّدُ فَإِنَّكَ لَمْ تَعْدِلْ، فَقَالَ: «وَيْلَكَ، وَمَنْ يَعْدِلُ بَعْدِي إِذَا لَمْ أَعْدِلْ؟» فَقَالَ عُمَرُ: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ حَتَّى أَضْرِبَ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ هَذَا فِي أَصْحَابٍ، أَوْ أُصَيْحَابٍ لَهُ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٦٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٣٨، ومسلم: ١٠٦٣.




واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جیعرانە بوو، ئەویش زێڕو زیوو دەستکەوتی جەنگی دابەش دەکرد، کە لە ژێر چاودێری و پارێزگاری بیلالدا بوو، ئنجا پیاوێک، گوتی: ئەی موحەممەد، دادگەربە، تۆ دادگەریت نەکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هاوار بۆ تۆ، ئەگەر من دادگەر نەبم ئەی کێ لە دوای من دادگەر دەبێ؟ ئنجا عومەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێمگەڕێ (مۆڵەتم بدە) با لە گەردنی ئەو دووڕووە بدەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بێگومان (ئەوە تەنها نیە) هاوڕێی دیکەی هەن، یان چەند هاوڕێیەکی کەمن، کە قورئان دەخوێنن لە گەروویان تێناپەڕێ (بۆ نێو دڵیان)، لە دین دەردەچن وەکو چۆن تیر (لە نێچیر) دەردەچێ.

١٧٣- عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْخَوَارِجُ كِلَابُ النَّارِ»[١].

واتە: ئیبنو ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەواریج سەگەکانی ئاگرن (دۆزەخن).

١٧٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَنْشَأُ نَشْءٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، كُلَّمَا خَرَجَ قَرْنٌ قُطِعَ» قَالَ ابْنُ عُمَرَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلَّمَا خَرَجَ قَرْنٌ قُطِعَ، أَكْثَرَ مِنْ عِشْرِينَ مَرَّةً، حَتَّى يَخْرُجَ فِي عِرَاضِهِمُ الدَّجَّالُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کۆمەڵێک لاو پەیدادەبن (کە پێشتر نەبوون) قورئان دەخوێنن و لە گەروویان ئاوا نابێ، جا هەرچەند جارێک کۆمەڵێک لەوان سەرهەڵێنن دەبڕدرێنەوە (کۆتاییان پێدێ)، ئیبنو عومەر دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەیفەرموو: هەر چەند جارێک سەرهەڵێنن دەبڕدرێنەوە زیاتر لە بیست جار (واتە: بیست جار سەرهەڵدەدەن، یان بیست جار ئەهلی هەق لەگەڵیان دەجەنگن، یان بیست جار لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە)، هەتا لە کۆتاییدا لەوەچەی ئەوان دەجال پەیدادەبێت.

---

(١) صحيح.

(٢) حسن.





**١٧٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَخْرُجُ قَوْمٌ فِي آخِرِ الزَّمَانِ، أَوْ فِي هَذِهِ الْأُمَّةِ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، أَوْ حُلُوقَهُمْ، سِيمَاهُمُ التَّحْلِيقُ، إِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ، أَوْ إِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ»[1].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کۆتایی ڕۆژگاردا کۆمەڵێک دەردەکەون، یان (فەرمووی): لە ناو ئەو ئوممەتەدا، کە قورئان دەخوێنن (بەڵام) لە گەروویان تێپەڕناکات، نیشانەیان ئەوەیە کە سەریان دەتاشن، کاتێ بینیتانن، یان پێیان گەیشتن بیانکوژن.

**١٧٦- عَنْ أَبِي غَالِبٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، يَقُولُ: «شَرُّ قَتْلَى قُتِلُوا تَحْتَ أَدِيمِ السَّمَاءِ، وَخَيْرُ قَتِيلٍ مَنْ قَتَلُوا، كِلَابُ أَهْلِ النَّارِ، قَدْ كَانَ هَؤُلَاءِ مُسْلِمِينَ فَصَارُوا كُفَّارًا» قُلْتُ: يَا أَبَا أُمَامَةَ، هَذَا شَيْءٌ تَقُولُهُ؟ قَالَ: بَلْ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[2].**

واتە: ئەبو غالیب، لە ئەبو ئومامەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە (کاتێک سەرانی خەواریجی بینیوە) گوتوویەتی: خراپترین کوژراو ئەوانەن لە ژێر ئەو ئاسمانە، وە باشترین کوژراو ئەوانەن کە ئەوان (واتە: خەواریج) دەیانکوژن، سەگ گەلی دۆزەخن، ئەوانە جاران مسوڵمان بوون دواتر بێبڕوابوونەوە، (ئەبو غالیب) دەڵێ: گوتم: ئەی ئەبو ئومامە، ئەوە قسەی خۆتە دەیڵێی؟ ئەویش گوتی: بەڵکو من لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە.

## بابەت: ئەو شتانەی کە جەهمییەکان نکوڵی لێدەکەن

**١٧٧- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، قَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ، لَا تَضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لَا تُغْلَبُوا عَلَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا» ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾﴾ ق[3].**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٧٦٦ شطره الأخير..

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٠٠٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٤، ومسلم: ٦٣٣، وأبو داود: ٤٧٢٩، والترمذي: ٢٥٥١.

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، ئەویش تەماشای مانگی کرد (مانگی چواردە)، فەرمووی: ئێوە پەروەردگارتان دەبینن هەروەکو چۆن ئەم مانگە دەبینن، هیچتان بێبەش نابن لە بینیی لەبەر پاڵەپەستۆو قەرەباڵغی، تا دەتوانن ئاگاداری نوێژی بەیانی و عەصر بن (ئەو هۆکارانەی کە بێئاگاتان دەکات لەو دوو نوێژە مەیانهێڵن)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾﴾ ق، واتە: بەستایشی پەروەردگارت تەسبیحات بکە پێش هەڵهاتنی خۆرو پێش ئاوا بوونیشی.

**١٧٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تُضَامُونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ؟» قَالُوا: لَا، قَالَ: «فَكَذَلِكَ لَا تُضَامُونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا لە بینینی مانگی چواردە توشی پاڵەپەستۆ و ناڕەحەتی دەبن؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: بە هەمان شێوە توشی ناڕەحەتی نابن، بە هۆی پاڵەپەستۆ و قەرەباڵغی لە ڕۆژی دوایدا بۆی بینینی پەروەردگارتان.

**١٧٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَرَى رَبَّنَا؟ قَالَ: «تُضَامُونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ فِي الظَّهِيرَةِ فِي غَيْرِ سَحَابٍ؟» قُلْنَا: لَا، قَالَ: «فَتَضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ فِي غَيْرِ سَحَابٍ؟» قَالُوا: لَا، قَالَ: «إِنَّكُمْ لَا تَضَارُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ، إِلَّا كَمَا تَضَارُّونَ فِي رُؤْيَتِهِمَا»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئێمە پەروەردگارمان دەبینین؟ فەرمووی: ئایا کاتی نیوەڕۆ کە هەور لە ئاسماندا نەبێ توشی هیچ ناڕەحەتییەک دەبن لە بینینی خۆردا؟ وتمان: نەخێر، فەرمووی: ئایا توشی هیچ ناڕەحەتییەک دەبن لە بینینی مانگی شەوی چواردە کاتێ هەور نەبێ؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: بێگومان ئێوە دەیبینن و توشی هیچ ناڕەحەتییەکیش نابن، هەروەک چۆن بە هۆی بینینی مانگ و خۆر توشی ناڕەحەتی نابن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٠٦، ومسلم: ١٨٢ و ٢٩٦٨ كليهما بنحوه مطولًا، وأبو داود: ٤٧٣٠، والترمذي: ٢٥٥٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٨١ و ٧٤٣٩، ومسلم: ١٨٣ في أول حديثهما.

١٨٠- عَنْ أَبِي رَزِينٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَرَى اللَّهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ وَمَا آيَةُ ذَلِكَ فِي خَلْقِهِ؟ قَالَ: «يَا أَبَا رَزِينٍ، أَلَيْسَ كُلُّكُمْ يَرَى الْقَمَرَ مُخْلِيًا بِهِ» قَالَ، قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: «فَاللَّهُ أَعْظَمُ، وَذَلِكَ آيَةٌ فِي خَلْقِهِ»[١].

واتە: ئەبو ڕەزین ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئێمە خوا دەبینین لە ڕۆژی دوایدا؟ نیشانەی ئەوە چییە لە دروستکراوەکانیدا؟ فەرمووی: ئەی ئەبو ڕەزین، ئایا هەر یەکێک لە ئێوە سەربەخۆ و (بێ کێشە) مانگ نابینێ؟ دەڵێ: گوتم: بـا، فەرمووی: خوا زۆر لەوە گەورەترە (کە لە بینینی هیچ ناڕەحەتییەک توشی بڕوادار بێ)، وە ئەوەش نیشانەیەکە لە دروستکراوەکانی (کە مانگە).

١٨١- عَنْ أَبِي رَزِينٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ضَحِكَ رَبُّنَا مِنْ قُنُوطِ عِبَادِهِ، وَقُرْبِ غِيَرِهِ» قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَوَ يَضْحَكُ الرَّبُّ، قَالَ: «نَعَمْ» قُلْتُ: لَنْ نَعْدَمَ مِنْ رَبٍّ يَضْحَكُ خَيْرًا[٢].

واتە: ئەبو ڕەزین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارمان پێکەنی بە نائومێدبوونی بەندەکانی (لە کاتێکدا کەمترین ناڕەحەتی توشیان دێت)، لەگەڵ ئەوەی کە بەو نزیکانە خوا ئەو حاڵەیان بۆ دەگۆڕێ بە چاکە، (ئەبو ڕەزین) دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا پەروەردگار پێدەکەنێ؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵێ، منیش گوتم: کەواتە: هیچ کات چاکە و ڕەحمەتی ئەو خوایەمان لێ بزر نابێ کە یەکێک لە سیفەتەکانی پێکەنینە (چونکە پێکەنین نیشانەی ڕەزامەندییە).

١٨٢- عَنْ أَبِي رَزِينٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيْنَ كَانَ رَبُّنَا قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ خَلْقَهُ؟ قَالَ: «كَانَ فِي عَمَاءٍ، مَا تَحْتَهُ هَوَاءٌ، وَمَا فَوْقَهُ هَوَاءٌ، وَمَا ثَمَّ خَلْقٌ، عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ»[٣].

واتە: ئەبو ڕەزین ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، پێش ئەوەی کە خوا ئەم دروستکراوانە دروست بکات لە کوێ بوو؟ ئەویش فەرمووی: لە (عماء) بوو، (واتە: ئەو کاتە هیچ شتێک نەبوو لەگەڵ خوا)، لە خوار و سەرووی هەوا نەبوو (ئەوە جەختکردنەوەیە بۆ ئەوەی کە هیچ شتێک نەبووە)، وە هیچ دروستکراوێک نەبوو، وە عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٧٣١.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣١٠٩.

**١٨٣-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ الْمَازِنِيِّ ﷺ، قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، إِذْ عَرَضَ لَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا ابْنَ عُمَرَ، كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: يَذْكُرُ فِي النَّجْوَى؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «يُدْنَى الْمُؤْمِنُ مِنْ رَبِّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، حَتَّى يَضَعَ عَلَيْهِ كَنَفَهُ، ثُمَّ يُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِهِ، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُ؟ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ، أَعْرِفُ، حَتَّى إِذَا بَلَغَ مِنْهُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَبْلُغَ، قَالَ: إِنِّي سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا، وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ، قَالَ: ثُمَّ يُعْطَى صَحِيفَةَ حَسَنَاتِهِ أَوْ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ، قَالَ: وَأَمَّا الْكَافِرُ أَوِ الْمُنَافِقُ، فَيُنَادَى عَلَى رُءُوسِ الْأَشْهَادِ، قَالَ خَالِدٌ: فِي «الْأَشْهَادِ» شَيْءٌ مِن انْقِطَاعٍ: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ هود»[1].

واتە: صەفوانی کوڕی موحریزی مازینی ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا کە ئێمە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بووین، کە ئەو تەوافی دەکرد بە دەوری کەعبەدا، پیاوێکی لێ پەیدابوو و پێی گوت: ئەی کوڕی عومەر چۆن چۆنی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوتە کە باسی ئایەتی «النجوى»ی دەکرد؟ (عەبدوڵڵا) گوتی: لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستومە کە دەیفەرموو: ئیماندار لە پەروەردگاری نزیک دەبێتەوە لە ڕۆژی دوایدا بە جۆرێک هەتا خوا پەردەیەک دەدا بەسەر گفتوگۆی نێوانیان بۆ ئەوەی کەس گوێی لێ نەبێ، پاشان خوا گوناهەکانی بۆ دەردەخاو دەفەرموێ: ئایا دەزانی (کە ئەوەت کردوە)؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگارم دەزانم، تاکو ئەو شوێنەی کە خوا بیەوێ پێی بڵێ پێی دەڵێ، (خوا) دەفەرموێ: من لە دونیادا داملپۆشیوە، وە ئەمڕۆش لێت دەبوورم، (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەفەرموێ: پاشان پەڕاوی، یان کتێبی چاکەکانی بە دەستی ڕاست پێدەدرێتەوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بەڵام بێبڕوا و دووڕوو بە بەرچاوی ئامادەبووانەوە بانگ دەکرێ. خالید دەڵێ: لە «في الأشهاد»وە پچڕانێک (انقطاع) هەیە (کە ئەو ئایەتەیە): ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ هود، ئا ئەوانە ئەو کەسانەن (لە دونیادا) درۆیان هەڵدەبەست بەدەم پەروەردگاریانەوە بێداربن نەفرەتی خوا بۆ ستەمکارانە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٤١، ومسلم: ٢٧٦٨.

١٨٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بَيْنَا أَهْلُ الْجَنَّةِ فِي نَعِيمِهِمْ، إِذْ سَطَعَ لَهُمْ نُورٌ، فَرَفَعُوا رُءُوسَهُمْ، فَإِذَا الرَّبُّ قَدْ أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ مِنْ فَوْقِهِمْ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ قَالَ: وَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ: ﴿ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾ ﴾ يس، قَالَ فَيَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَيَنْظُرُونَ إِلَيْهِ، فَلَا يَلْتَفِتُونَ إِلَى شَيْءٍ مِنَ النَّعِيمِ، مَا دَامُوا يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ، حَتَّى يَحْتَجِبَ عَنْهُمْ، وَيَبْقَى نُورُهُ وَبَرَكَتُهُ عَلَيْهِمْ فِي دِيَارِهِمْ[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کاتێکدا کە ئەهلی بەهەشت لە ناو نازو نیعمەتەکانی بەهەشتن، نوورێک لە سەروویانەوە دەردەکەوێ، ئەوانیش سەریان بەرزدەکەنەوە، جا کاتێک دەبینن ئەوە خوای پەروەردگار لەسەرووی خۆیان خۆی نیشان داوون، جا (خوای گەورە) دەفەرمووێ: سەلامتان لەسەر بێ ئەی ئەهلی بەهەشت، فەرمووی: ئەوەیە فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێ: ﴿ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾ ﴾ یس، واتە: سەلام (یان لێ دەکرێت) بەووتەیەک لە لایەن پەروەردگاری میهرەبانەوە. فەرمووی: خوا تەماشای ئەوان دەکات وە ئەوانیش تەماشای خوا دەکەن، ئاوڕ نادەنەوە بۆ هیچ یەکێک لە ناز و نیعمەتەکانی تری بەهەشت، تا ئەو کاتەی کە تەماشای خوا دەکەن، تا ئەو کاتەی کە خوا خۆی لێیان نادیار (غەیب) دەکات، بەڵام نور و بەرەکەتەکەی خوا لەسەریان دەمێنێ لەماڵەکانیاندا.

١٨٥- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تَرْجُمَانٌ، فَيَنْظُرُ مِنْ عَنْ أَيْمَنَ مِنْهُ فَلَا يَرَى إِلَّا شَيْئًا قَدَّمَهُ، ثُمَّ يَنْظُرُ مِنْ عَنْ أَيْسَرَ مِنْهُ فَلَا يَرَى إِلَّا شَيْئًا قَدَّمَهُ، ثُمَّ يَنْظُرُ أَمَامَهُ فَتَسْتَقْبِلُهُ النَّارُ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَّقِيَ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَلْيَفْعَلْ»[2].

واتە: عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە ئێوە نەبووەو نابێت کە پەروەردگاری ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ نەکات، لەوکاتەدا لە نێوان خواو بەندەدا هیچ وەرگێڕێک نیە، جا (بەندە) تەماشای لای ڕاست و چەپی

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥١٢، ومسلم: ١٠١٦/٦٧، والترمذي: ٢٤١٥، والنسائي: ٢٥٥٢ مختصراً.



خۆی دەکات، بەڵام هیچ شتێک نابینێ (کە فریادڕەسی بێ لەوکاتەدا) تەنها ئەو کردەوانە نەبێ کە پێش خۆی ناردوونی، پاشان تەماشای پێش خۆی دەکات دەبینێ کەوا ئاگری دۆزەخ لە پێشیەوەیەتی، بۆیە هەر یەکێک لە ئێوە تا دەتوانێ با خۆی لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێ، ئەگەر بە بەخشینی نیو دەنکە خورماش بێ با بیکات.

١٨٦- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «جَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ، آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَجَنَّتَانِ مِنْ ذَهَبٍ، آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَّا رِدَاءُ الْكِبْرِيَاءِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ»[١].

واتە: ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی قەیسی ئەشعەری ﷺ لە باوکی دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو خوا پێداوێ لە ناو بەهەشتدا دوو بەهەشتی هەیە، کە قاپ و قاچاخ و شتومەکی ناویان هەمووی لە زیون، وە دوو بەهەشتیشیان هەیە کە قاپ و قاچاخ و شتومەکی ناویان لە زێڕن، بەهەشتییەکان لە ناو بەهەشتی عەدن دان، کە لە نێوان ئەوان و بینینی خوای بەرز و مەزندا تەنها پەردەی گەورەیی و شکۆمەندی هەیە.

١٨٧- عَنْ صُهَيْبٍ ﷺ، قَالَ: تَلَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴿٢٦﴾ ﴾ يونس، وَقَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، نَادَى مُنَادٍ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ مَوْعِدًا يُرِيدُ أَنْ يُنْجِزَكُمُوهُ، فَيَقُولُونَ: وَمَا هُوَ؟ أَلَمْ يُثَقِّلِ اللَّهُ مَوَازِينَنَا، وَيُبَيِّضْ وُجُوهَنَا، وَيُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ، وَيُنْجِنَا مِنَ النَّارِ؟ قَالَ: فَيَكْشِفُ الْحِجَابَ، فَيَنْظُرُونَ إِلَيْهِ، فَوَاللَّهِ مَا أَعْطَاهُمُ اللَّهُ شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ -يَعْنِي إِلَيْهِ- وَلَا أَقَرَّ لِأَعْيُنِهِمْ»[٢].

واتە: سوهەیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴿٢٦﴾ ﴾ یونس، واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردوە پاداشتی چاکتر (بەهەشت) و زیاتریان هەیە (کەبینینی خوایە)، وە فەرمووی: هەر کاتێک ئەهلی بەهەشت چوونە بەهەشت و ئەهلی دۆزەخ چوونە ناو دۆزەخ، ئەوە بانگەوازکارێک بانگەواز دەکات: ئەی ئەهلی بەهەشت ئێوە لەلای خوا مەوعید و پەیمانێکتان هەبوو

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨٧٨، ومسلم: ١٨٠، والترمذي: ٢٥٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨١، والترمذي: ٢٥٥٢ و ٣١٠٥.




ئێستاش خوا دەیەوێ کە ئەو بەڵێنە جێبەجێ بکات، ئەوانیش دەڵێن: ئەو بەڵێنە چیە؟ ئایا خوا تەرازووی چاکەکانمانی قورس نەکرد، وە ڕووخساری سپی نەکردینەوە؟ وە نەیبردینە بەهەشت؟ وە لە ئاگری دۆزەخ ئێمەی ڕزگار نەکرد؟ فەرمووی: جا پەردەکە لادەدرێ (پەردەی نێوان خوا لەگەڵ بەندەکانی) ئنجا تەماشای (خوای پەروەردگاریان دەکەن)، سوێند بە خوا هیچ شتێک هێندەی ئەو تەماشاکردنە لەلایان خۆشەویست و جێگای ئۆقرەیی و ڕووناکی چاوەکانیان نیە.

١٨٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ الْأَصْوَاتَ، لَقَدْ جَاءَتِ الْمُجَادِلَةُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَأَنَا فِي نَاحِيَةِ الْبَيْتِ، تَشْكُو زَوْجَهَا، وَمَا أَسْمَعُ مَا تَقُولُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا ۝١﴾ المجادلة»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە دەنگی هەموو شتێک دەبیستێ، بێگومان ئەو ئافرەتەی کە گفتوگۆی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد (کە خەولەی کچی سەعلەبەی ئەنصاڕی بوو) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ منیش لە گۆشەیەکی ماڵەکە بووم، سکاڵای لە مێردەکەی دەکرد لە لای پێغەمبەر ﷺ، وە گوێم لە ئەوە نەبوو کە چی دەیگوت، خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا ۝١﴾ المجادلة، واتە: بەڕاستی خوا بیستی ووتەی ئەو ژنەی کە لەبارەی مێردەکەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ ئەکردی.

١٨٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ بِيَدِهِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ الْخَلْقَ: رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارتان بۆ خۆی لەسەر زاتی خۆی نوسیوە پێش ئەوەی هیچ دروستکراوێک دروست بکات کە: بەزەییم پێش توڕەییم کەوتووە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري تعليقاً باب (٩) قول الله تعالى: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ۝١٣٤﴾ يس، والنسائي: ٣٤٦٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٩٤، ومسلم: ٢٧٥١، والترمذي: ٣٥٤٣.

١٩٠- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﵁، يَقُولُ: لَمَّا قُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ حَرَامٍ يَوْمَ أُحُدٍ، لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «يَا جَابِرُ، أَلَا أُخْبِرُكَ مَا قَالَ اللَّهُ لِأَبِيكَ؟» وَقَالَ: يَحْيَى فِي حَدِيثِهِ، فَقَالَ: «يَا جَابِرُ، مَا لِي أَرَاكَ مُنْكَسِرًا؟» قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اسْتُشْهِدَ أَبِي، وَتَرَكَ عِيَالًا وَدَيْنًا، قَالَ: «أَفَلَا أُبَشِّرُكَ، بِمَا لَقِيَ اللَّهُ بِهِ أَبَاكَ؟» قَالَ: بَلَى: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: مَا كَلَّمَ اللَّهُ أَحَدًا قَطُّ إِلَّا مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ، وَكَلَّمَ أَبَاكَ كِفَاحًا، فَقَالَ: يَا عَبْدِي، تَمَنَّ عَلَيَّ أُعْطِكَ، قَالَ: يَا رَبِّ تُحْيِينِي، فَأُقْتَلُ فِيكَ ثَانِيَةً، فَقَالَ الرَّبُّ سُبْحَانَهُ: إِنَّهُ سَبَقَ مِنِّي أَنَّهُمْ إِلَيْهَا لَا يَرْجِعُونَ، قَالَ: يَا رَبِّ، فَأَبْلِغْ مَنْ وَرَائِي، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵁ دەیگوت: کاتێک عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی حەڕام (باوکی عەبدوڵڵا) کوژرا لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا، پێغەمبەری خوا ﷺ پێمگەیشت و فەرمووی: ئەی جابیر ئایا هەواڵت پێبدەم خوا چی فەرموو بە باوکت؟ یەحیا لە فەرموودەکەیدا دەڵێ: جا فەرمووی: ئەی جابیر بۆ ئاوا بە شکاوی و شپرزەیی دەتبینم؟ دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم شەهید بووەو، خێزانێکی بەجێ هێشتووە لەگەڵ قەرزدا، ئەویش فەرمووی: مژدەت پێنەدەم کە باوکت چۆن بە دیداری خوا گەیشت؟ ئەویش (واتە: جابیر) وتی: بەڵێ پێم بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: خوا هەرگیز لەگەڵ هیچ کەسێک قسەی نەکردوە تەنها لەپشت پەردەوە نەبێ، بەڵام قسەی لەگەڵ باوکت کرد ڕووبەڕو بەبێ پەردە، وە خوا فەرمووی: ئەی بەندەکەم چ خۆزگەیەکت هەیە بیخوازە تا پێت ببەخشم، (عەبدوڵڵا) گوتی: ئەی پەروەردگارم زیندووم بکەیتەوە، ئنجا جارێکی تر لە پێناو تۆدا بکوژرێمەوە، خوای پەروەردگاریش فەرمووی: بڕیارم داوە کە هیچ نەفسێک ناگەڕێتەوە دونیا، (عەبدوڵڵا) گوتی: ئەی پەروەردگارا هەواڵم بە ئەوانەی دوای خۆم ڕابگەیەنە، ئنجا خوای بەرز ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران، واتە: هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی کە کوژران لەڕێی خوادا مردوون (نەخێر وانیە) بەڵکو ئەوانە زیندوون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن.

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٠١٠.

١٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يَضْحَكُ إِلَى رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ، كِلَاهُمَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُسْتَشْهَدُ، ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى قَاتِلِهِ فَيُسْلِمُ، فَيُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُسْتَشْهَدُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا بە ڕووی دوو پیاودا پێدەکەنێ، یەکێکیان ئەویتری کوشتووە، هەردووکیشیان دەچنە بەهەشت، ئەویان لە پێناو خوادا جەنگاوەو شەهید بووە، پاشان خوا تۆبە لە بکوژەکە وەردەگرێ و مسوڵمان دەبێ، ئەویش لە ڕێگای خوادا جەنگ دەکات و شەهید دەبێ.

١٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « يَقْبِضُ اللَّهُ الْأَرْضَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ مُلُوكُ الْأَرْضِ؟»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا خوا زەوی بە دەستی دەگرێ و ئاسمان دەپێچێتەوە بە دەستی ڕاستی (ئەوە تەنها بۆ شکۆ و گەورەییە دەنا هەردوو دەستی خوا ڕاستەن، وە تەفسیرکردنی ئەو سیفەتە تەنها خوا خۆی دەیزانێ و لە توانای ئەقڵی مرۆڤدانییە)، پاشان دەفەرموێ: تەنها من پادشام، کوا پادشاکانی سەر زەوی لە کوێن؟!

١٩٣- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ بِالْبَطْحَاءِ فِي عِصَابَةٍ، وَفِيهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَمَرَّتْ بِهِ سَحَابَةٌ فَنَظَرَ إِلَيْهَا، فَقَالَ: «مَا تُسَمُّونَ هَذِهِ؟» قَالُوا: السَّحَابُ، قَالَ: «وَالْمُزْنُ» قَالُوا: وَالْمُزْنُ، قَالَ: «وَالْعَنَانُ» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالُوا: وَالْعَنَانُ، قَالَ: «كَمْ تَرَوْنَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ السَّمَاءِ؟» قَالُوا: لَا نَدْرِي، قَالَ: «فَإِنَّ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهَا إِمَّا وَاحِدًا، أَوِ اثْنَيْنِ، أَوْ ثَلَاثًا وَسَبْعِينَ سَنَةً، وَالسَّمَاءُ فَوْقَهَا كَذَلِكَ» حَتَّى عَدَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ، «ثُمَّ فَوْقَ السَّمَاءِ السَّابِعَةِ بَحْرٌ، بَيْنَ أَعْلَاهُ وَأَسْفَلِهِ كَمَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ، ثُمَّ فَوْقَ ذَلِكَ ثَمَانِيَةُ أَوْعَالٍ، بَيْنَ أَظْلَافِهِنَّ وَرُكَبِهِنَّ كَمَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ، ثُمَّ عَلَى ظُهُورِهِنَّ الْعَرْشُ، بَيْنَ أَعْلَاهُ وَأَسْفَلِهِ كَمَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ، ثُمَّ اللَّهُ فَوْقَ ذَلِكَ، تَبَارَكَ وَتَعَالَى»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٢٦، ومسلم: ١٨٩٠، والنسائي: ٣١٦٥ و ٣١٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨١٢ و ٧٣٨٢ و ٧٤١٣، ومسلم: ٢٧٨٧.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٧٢٣ و ٤٧٢٥، والترمذي: ٣٣٢٠.

واتە: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب ﷺ دەڵێ: لەگەڵ کومەڵە کەسێک لە «البطحاء» بووم، وە پێغەمبەری خواش ﷺ لە نێویاندا بوو، پەڵە هەورێک تێپەڕی، ئەویش تەماشای کردو فەرمووی: چی بەو شتە دەڵێن؟ گوتیان: هەور، فەرمووی: ئەدی «المزن»؟ گوتیان: «المزن»یشی پێدەڵێین، واتە: هەوری باراناوی، فەرمووی: ئەدی «العنان»؟ ئەبو بەکر گوتی: گوتیان: «العنان»یشی پێدەڵێین، واتە: پەڵە هەور، فەرمووی: پێتان وایە نێوانی ئێوەو ئاسمان چەندە؟ گوتیان: نازانین، فەرمووی: لە ڕاستیدا نێوانی ئێوە و ئاسمان حەفتا و یەک، یان دوو، یان سێ ساڵە ڕێیە («سبعين» لێرە بۆ زۆری بەکارهاتووە، نەک بۆ سنوردار کردن، چونکە لە عادەتی عەرەب وابووە کە ئەو ژمارەیان بە گریمانەی زۆری بەکارهێناوە)، وە ئەو ئاسمانەی سەرووی ئەویش بە هەمان شێوە، هەتا حەوت ئاسمانی ژمارد، پاشان لە سەرووی ئاسمانی حەوتەمەوە دەریایەک هەیە کە نێوانی سەرو و خواروی ئەو دەریایە بە ئەندازەی نێوانی ئاسمانێک بۆ ئاسمانێکی ترە، پاشان لە سەرووی ئەوە هەشت وەعل هەیە (واتە: هەشت مەلائیکە)، کە بەینی پێیەکانیان لەگەڵ ئەژنۆکانیان بە ئەندازەی نێوانی ئاسمانێکە بۆ ئاسمانێکی تر، پاشان لەسەر پشتی ئەوان عەرش هەیە، کە نێوانی سەرو و خوارووی بە ئەندازەی نێوانی ئاسمانێکە بۆ ئاسمانێکی تر، پاشان خوای (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) لەسەرووی ئەوەشەوەیە.

١٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا قَضَى اللَّهُ أَمْرًا فِي السَّمَاءِ، ضَرَبَتِ الْمَلَائِكَةُ أَجْنِحَتَهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ، كَأَنَّهُ سِلْسِلَةٌ عَلَى صَفْوَانٍ، ﴿إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾﴾ سبأ، قَالَ: فَيَسْمَعُهَا مُسْتَرِقُو السَّمْعِ بَعْضُهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ، فَيَسْمَعُ الْكَلِمَةَ فَيُلْقِيهَا إِلَى مَنْ تَحْتَهُ، فَرُبَّمَا أَدْرَكَهُ الشِّهَابُ قَبْلَ أَنْ يُلْقِيَهَا إِلَى الَّذِي تَحْتَهُ، فَيُلْقِيهَا عَلَى لِسَانِ الْكَاهِنِ، أَوِ السَّاحِرِ، فَرُبَّمَا لَمْ يُدْرَكْ حَتَّى يُلْقِيَهَا، فَيَكْذِبُ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ، فَتَصْدُقُ تِلْكَ الْكَلِمَةُ الَّتِي سُمِعَتْ مِنَ السَّمَاءِ[1].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێک خوا لە ئاسمان بڕیارێک دەفەرموێ، فریشتەکان باڵیان لێک دەدەن، وەک ملکەچی بۆ فەرمایشتەکەی، دەنگی ئەو فەرمایشتە وەکو ئەو زنجیرە وایە کە بەسەر تاشەبەردێکدا

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٠١، وأبو داود: ٣٩٨٩، والترمذي: ٣٢٢٣.

بکەوێ، ﴿ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ﴾ سبأ، واتە: کاتێک ترس و بیم لە دڵی (تکاکاران) لادەبرێ (بەهۆی ڕێگەپێدانی شەفاعەت) (بە یەکتر) دەڵێن: پەروەردگارتان چ بڕیارێکی فەرموو دەڵێن: وتە ڕاستەکەی فەرموو (کە ڕێگە دانە بەتکاکردن) وە تەنها (خوا) بەرزو بڵندو گەورەیە، فەرمووی: ئەو (شەیتانانەی) کەوا گوێ هەڵدەخەن بۆ قسەی فریشتەکان، ئەو فەرمایشتەی ئەوان لە فریشتەکانەوە گوێیان لێبوو دەیڕفێنن، ئەوەی سەرەوە دەیگەیەنێ بە ئەوەی خوار خۆی و دەماودەم لە یەکدی وەردەگرن، جاریش هەیە کە هەر لە ئاسمان بە نەیزەکێ دەکرێتە ئامانج و ناگات بەوەی خوار خۆی، دواتر (کە گەیشتە سەر زەوی) شەیتانێک دەیدات بە گوێی کاهین و جادووگەرێکدا، ئەویش سەد درۆی بۆ زیاد دەکات، دواتر تەنها ئەو وشەیەی کە لە ئاسمانەوە بیستوویەتی ڕاست دەردەچێ.

١٩٥- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَنَامُ، وَلَا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، يَخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ، وَعَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ، حِجَابُهُ النُّورُ، لَوْ كَشَفَهُ لَأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ»[1].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوماندا هەڵساو لە وتارێکیدا پێنج وشەی بیرخستینەوەو فەرمووی: بێگومان هەرگیز خوا ناخەوێ، وە ناشگونجێ کە بخەوێ (چونکە هیچ پێویستییەکی بە خەو نیە)، تەرازووی کردەوەکان بەرز و نزم دەکات، کردەوەی شەوانە بۆ لای ئەو بەرزدەبنەوە پێش ئەوەی (بەندە) دەست بکات بە کاری ڕۆژانەی، وە کردەوەی ڕۆژانە بۆ لای ئەو بەرزدەبنەوە پێش ئەوەی (بەندە) دەست بکات بە کاری شەوانەی، پەردەی (نێوان خواو بەندەکانی) نورە، خۆ ئەگەر ئەو پەردەیە لابدات ئەوە نوری ڕووی خوا هەرچی دروستکراو هەیە خۆی بۆ ناگرێ و دەیسوتێنێ.

١٩٦- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَنَامُ، وَلَا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، يَخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ، حِجَابُهُ النُّورُ، لَوْ كَشَفَهَا لَأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ كُلَّ شَيْءٍ أَدْرَكَهُ بَصَرُهُ» ثُمَّ قَرَأَ أَبُو عُبَيْدَةَ، ﴿ أَن بُورِكَ مَن فِي النَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٨﴾ ﴾ النمل[2].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٩. وانظر ما بعده

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٩. وانظر ما قبله.

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوماندا هەڵساو لە وتارێکیدا پێنج وشەی بیرخستینەوەو فەرمووی: بێگومان هەرگیز خوا ناخەوێ، وە ناشگونجێ کە بخەوێ (چونکە هیچ پێویستییەکی بە خەو نیە)، تەرازووی کردەوەکان بەرز و نزم دەکات، پەردەی (نێوان خوا و بەندەکانی) نورە، خۆ ئەگەر ئەو پەردەیە لابدات ئەوە نوری ڕووی خوا هەرچی دروستکراو هەیە خۆی بۆ ناگرێ و دەیسوتێنێ. پاشان ئەبو عوبەیدە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨﴾ النمل، واتە: کە پیرۆز بووە ئەو کەسەی لەناو ئاگرەکە (ڕووناکیەکە) دایە و ئەوەش بەدەوریدایە وە پاک و بێگەردە خوای پەوەردگاری جیهانیان.

١٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَمِينُ اللَّهِ مَلْأَى، لَا يَغِيضُهَا شَيْءٌ، سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ، وَبِيَدِهِ الْأُخْرَى الْمِيزَانُ، يَرْفَعُ الْقِسْطَ وَيَخْفِضُ، قَالَ: أَرَأَيْتَ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ؟ فَإِنَّهُ لَمْ يَنْقُصْ مِمَّا فِي يَدَيْهِ شَيْئًا»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستی ڕاستی خوا پڕەو، هیچ شتێک نیە کەمی بکات لە بەخشینە زۆرەکانی شەوانە و ڕۆژانەی، وە بە دەستەکەی دیکەیەوە تەرازووی (دادگەریە بە حیکمەتی خۆی) بەرزی و نزمی پێدەکات (یەکێک ڕۆزی بۆ زیاد دەکات و یەکێک کەم وە هەروەها.....)، فەرمووی: ئایا بینیوتە کە لەوکاتەوە کە خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە بەردەوام ڕزق و ڕۆزی دەدات؟ وە هەرگیز ئەوەی کە لە دەستی خوادایە هیچ کەمی نەکردوە.

١٩٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: «يَأْخُذُ الْجَبَّارُ سَمَاوَاتِهِ وَأَرْضَهُ بِيَدِهِ، وَقَبَضَ بِيَدِهِ فَجَعَلَ يَقْبِضُهَا وَيَبْسُطُهَا» ثُمَّ يَقُولُ: «أَنَا الْجَبَّارُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟» قَالَ: وَيَتَمَيَّلُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى الْمِنْبَرِ يَتَحَرَّكُ مِنْ أَسْفَلِ شَيْءٍ مِنْهُ، حَتَّى إِنِّي أَقُولُ: أَسَاقِطٌ هُوَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٦٨٤ و ٧٤١١، ومسلم: ٩٩٣، والترمذي: ٣٠٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٤١٢، ومسلم: ٢٧٨٨، وانظر أبو داود: ٤٧٣٢.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە کاتێکدا لەسەر مینبەرەکەی دەیفەرموو: خوای بە دەسەڵات ئاسمانەکان و زەوی بە دەستی گرت، وە پێغەمبەریش ﷺ دەستی دەنوقاند و دەیکردەوە (بۆ ئەوەی بەرانبەرەکەی تێبگەیەنێ)، پاشان (خوا) دەفەرموێ: من خاوەن دەسەڵاتی بێ کۆتاییم، لە کوێن دەسەڵاتدارەکانی دونیا؟ لە کوێن ئەوانەی خۆیان بە زل دەزانی؟ (ئیبنو عومەر) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی قسەکردنەکەدا بە لای ڕاست و چەپدا لار دەبۆوە، بە جۆرێک کە تەماشای مینبەرەکەم کرد لە ژێرەوە دەجولا، بە جۆرێک کە دەمگوت: بە جوڵەی مینبەرەکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوێتە خوارێ.

**١٩٩-** عَنْ النَّوَّاسُ بْنُ سَمْعَانَ الْكِلَابِيُّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ قَلْبٍ إِلَّا بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ، إِنْ شَاءَ أَقَامَهُ، وَإِنْ شَاءَ أَزَاغَهُ» وَكانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «يَا مُثَبِّتَ الْقُلُوبِ، ثَبِّتْ قُلُوبَنَا عَلَى دِينِكَ. قَالَ: وَالْمِيزَانُ بِيَدِ الرَّحْمَنِ، يَرْفَعُ أَقْوَامًا وَيَخْفِضُ آخَرِينَ، إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[1].

واتە: نەواسی کوڕی سەمعانی کیلابی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەموو دڵێک لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوای بە بەزەیی دایە، ئەگەر بیەوێ لەسەر هەق دەیانهێڵێتەوەو، ئەگەریش نەیەوێ ئەوە ڕوویان پێ وەردەگێڕێ لە هەق و ڕاستی، وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەی جێگیرکاری دڵەکان، دڵەکانمان جێگیر بکە لەسەر دینەکەت، فەرمووی: وە تەرازوو (ی خێر و دادگەری) بە دەست خوای بە بەزەییە، کۆمەڵێکی پێ بەرز دەکاتەوەو، کۆمەڵێکی پێ نزم دەکاتەوە تاکو ڕۆژی دوایی.

**٢٠٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَيَضْحَكُ إِلَى ثَلَاثَةٍ: لِلصَّفِّ فِي الصَّلَاةِ، وَلِلرَّجُلِ يُصَلِّي فِي جَوْفِ اللَّيْلِ، وَلِلرَّجُلِ يُقَاتِلُ، أُرَاهُ قَالَ: خَلْفَ الْكَتِيبَةِ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا بە ڕووی سێ (جۆرە کەس) پێدەکەنێ: بۆ ڕیزی نوێژ، وە بۆ پیاوێک کە لە قوڵایی شەودا شەونوێژ دەکات، وە بۆ پیاوێک کە دەجەنگێ، (ڕاوی دەڵێ) پێموابێ فەرمووی: لە دوای کەتیبەکانی شەڕ.

٢٠١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْرِضُ نَفْسَهُ عَلَى النَّاسِ فِي الْمَوْسِمِ، فَيَقُولُ: «أَلَا رَجُلٌ يَحْمِلُنِي إِلَى قَوْمِهِ، فَإِنَّ قُرَيْشًا قَدْ مَنَعُونِي أَنْ أُبَلِّغَ كَلَامَ رَبِّي»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی مەڕاسیم و بۆنەی حەجدا خۆی نیشانی خەڵکی دەداو دەیفەرموو: ئایا پیاوێک نیە بمبات بۆ نێو هۆزەکەی (پەنام بدات)، چونکە بەڕاستی قورەیش ڕێگریان لێ کردووم لەوەی پەیامی پەروەردگارمیان پێ بگەیەنم و بڵاوی بکەمەوە.

٢٠٢- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾﴾ الرحمن، قَالَ: «مِنْ شَأْنِهِ أَنْ يَغْفِرَ ذَنْبًا، وَيُفَرِّجَ كَرْبًا، وَيَرْفَعَ قَوْمًا، وَيَخْفِضَ آخَرِينَ»[٢].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (تەفسیری) ئەو فەرمایشتەی خوا: ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾﴾ الرحمن، واتە: هەموو ڕۆژێ خوا لە (بە ئەنجام گەیاندنی) کارێکی (گشتی بوونەوەر) دایە (یەک دەمرێنێت، یەک لەدایک دەبێت، یەکێک سەردەخات ویەکێکی تر دەشکێنێت، هتد). فەرمووی: مەبەست ئەوەیە خوا گوناهێک دەسڕێتەوە و لە (خاوەنەکەی) خۆشدەبێ، وە ناخۆشییەک (لەسەر بەندەکەی) لادەبات، وە کۆمەڵێک بەرز دەکات و کۆمەڵێکیش نزم دەکات.

## بابەت: ئەو کەسەی کە ڕێچکەیەکی چاک یان خراپ دادەهێنێت

٢٠٣- عَنِ الْمُنْذِرِ بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً فَعُمِلَ بِهَا، كَانَ لَهُ أَجْرُهَا وَمِثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا، لَا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ سَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً فَعُمِلَ بِهَا، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا، لَا يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْئًا»[٣].

---

(١) صحيح. اخرجه ابو داود: ٤٧٣٤، والترمذي: ٢٩٢٥.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠١٧، والترمذي: ٢٦٧٥، والنسائي: ٢٥٥٤.




واتە: مونزیری کوڕی جەریر لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ڕێبازێکی چاک بگرێتەبەرو خەڵکیش کاری پێبکەن، ئەوە پاداشت وەردەگرێت و بە ئەندازەی ئەو کەسانەش کە شوێنی دەکەون پاداشتی هەیە، بێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بکرێتەوە، وە هەر کەسێک ڕێبازێکی خراپ بگرێتەبەر و خەڵکیش کاری پێ بکەن، ئەوە گوناهی ئەو کردەوەیەی لەسەرەو، گوناهی ئەو کەسەش کە شوێنی دەکەوێ لەو کارە خراپە، بێ ئەوەی لە گوناهی ئەوان کەم بێتەوە.

**٢٠٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ: فَحَثَّ عَلَيْهِ، فَقَالَ رَجُلٌ، عِنْدِي كَذَا وَكَذَا، قَالَ، فَمَا بَقِيَ فِي الْمَجْلِسِ رَجُلٌ إِلَّا تَصَدَّقَ عَلَيْهِ بِمَا قَلَّ أَوْ كَثُرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اسْتَنَّ خَيْرًا فَاسْتُنَّ بِهِ، كَانَ لَهُ أَجْرُهُ كَامِلًا، وَمِنْ أُجُورِ مَنِ اسْتَنَّ بِهِ، وَلَا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنِ اسْتَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً فَاسْتُنَّ بِهِ، فَعَلَيْهِ وِزْرُهُ كَامِلًا، وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِي اسْتَنَّ بِهِ، وَلَا يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْئًا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێکی هەژار هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەریش ﷺ) ئامادەبووانی هاندا بۆ یارمەتیدانی، جا پیاوێک لەوانەی ئامادەبوون، گوتی: من ئەوە و ئەوەم هەیە (واتە: هەڵسا بە یارمەتی دانی ئەو هەژارە)، ئنجا دوای ئەوە هەر یەکێک لەوانەی لە کۆڕەکەدا ئامادەبوون یارمەتی کابرایاندا، بە کەم یان بە زۆر (بەپێی توانا)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک یەکەم جار ڕێگایەک بگرێتەبەر کە جێی ڕەزامەندی خوا بێ و کاری پێبکرێ، ئەوە پاداشتی ئەو کردەوەیەی بە تەواوی بۆ هەیە، وە (بە ئەندازەی) ئەو کەسەش کە دوای ئەو کاری پێدەکات پاداشتی بۆ هەیە، بێ ئەوەی لە پاداشتی هیچیان کەم بێتەوە، وە هەر کەسێکیش ڕێگایەکی خراپ دابێنێ و کاری پێبکرێ، ئەوە گوناهی ئەو کارەی بۆ هەیە بە تەواوی، وە بە ئەندازەی گوناهی ئەو کەسەش کە بە هۆی ئەوەوە ئەو ڕێگایە دەگرێتەبەر گوناهی بۆ هەیە، بێ ئەوەی لە گوناهی هیچیان کەم بێتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٧٤، وأبو داود: ٤٦٠٩، والترمذي: ٢٦٧٤.

**٢٠٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ قَالَ: «أَيُّمَا دَاعٍ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ فَاتُّبِعَ، فَإِنَّ لَهُ مِثْلَ أَوْزَارِ مَنِ اتَّبَعَهُ، وَلَا يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْئًا، وَأَيُّمَا دَاعٍ دَعَا إِلَى هُدًى فَاتُّبِعَ، فَإِنَّ لَهُ مِثْلَ أُجُورِ مَنِ اتَّبَعَهُ، وَلَا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا»[1].**

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لەوانەی کە بانگەشە بۆ گومڕایی دەکەن، پاشان خەڵکی شوێنیان دەکەون، ئەوە ئەو کەسە بە ئەندازەی شوێنکەوتووانی گوناهی بۆ هەیە، بێ ئەوەی لە گوناهی هیچیان کەم بکرێتەوە، وە هەر بانگخوازێک بانگەشە بکات بۆ ڕێگای ڕاست و ڕێگای هیدایەت، پاشان خەڵکی بە شوێنی بانگەوازەکەیەوە بچن، ئەوە بە ئەندازەی شوێنکەوتەکانی پاداشتی بۆ هەیە، بێ ئەوەی لە پاداشتی هیچیان کەم بکرێتەوە.**

**٢٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى، كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنِ اتَّبَعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ، فَعَلَيْهِ مِنَ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنِ اتَّبَعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا»[2].**

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بانگەشە بکات بۆ ڕێگایەک کە جێی ڕەزامەندی خوا بێت، ئەوە بە ئەندازەی پاداشتی ئەوانەی کە شوێنی دەکەون پاداشتی بۆ هەیە، بێ ئەوەی لە پاداشتی هیچیان کەم بکرێتەوە، وە هەر کەسێک بانگەشەی گومڕایی بکات بە ئەندازەی گوناهی ئەوانەی کە شوێنی دەکەون گوناهی بۆ دەنوسرێ، بێ ئەوەی لە گوناهی هیچیان کەم بکرێتەوە.**

**٢٠٧- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، كَانَ لَهُ أَجْرُهُ وَمِثْلُ أُجُورِهِمْ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ سَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهُ وَمِثْلُ أَوْزَارِهِمْ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْئًا»[3].**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٧٤، وأبو داود: ٤٦٠٩، والترمذي: ٢٦٧٤.

(٣) صحيح لغيره. وانظر حديث جرير مسلم: ١٠١٧.

واتە: ئەبو جوحەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ڕێبازێکی چاک بگرێتەبەر و خەڵکی شوێنی بکەون، ئەوە لەسەر گرتنەبەری ئەو ڕێبازە باشە پاداشت وەردەگرێت و، بە ئەندازەی ئەو کەسەش کە شوێنی دەکەوێ پاداشت وەردەگرێت، بێ ئەوەی کە لە پاداشتی هیچیان کەم بکرێتەوە، وە هەر کەسێک ڕێبازێکی خراپ (و ناشەرعی) بگرێتەبەر و خەڵکیش شوێنی بکەون لەسەر ئەو ڕێبازەی کە دایهێناوە، ئەوە گوناهی ئەو کردەوەیەی لەسەرە وە بە ئەندازەی گوناهی ئەو کەسەش کە شوێنی دەکەوێ لەو کارە خراپە گوناهی لەسەرە، بێ ئەوەی لە تاوانی هیچیان کەم بێتەوە.

٢٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ دَاعٍ يَدْعُو إِلَى شَيْءٍ إِلَّا وُقِفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَازِمًا لِدَعْوَتِهِ، مَا دَعَا إِلَيْهِ، وَإِنْ دَعَا رَجُلٌ رَجُلًا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو بانگخوازێک کە بانگەشەی کردبێ بۆ شتێک لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ بانگەشە و کردەوەکەی بەیەکەوە دەبن، وە ئەوانەشی کە لەگەڵی بوون لە دونیا، ئەگەر تەنها پیاوێک پیاوێکیشی بانگهێشت کردبێ بۆ هەر کارێک (واتە: دەبێ ڕووبەڕووی بانگەشەکەی بکرێتەوە).

## بابەت: ئەو کەسەی کە سوننەتێکی مردوو زیندوو بکاتەوە

٢٠٩- عَنْ كَثِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيُّ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ جَدِّي، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَحْيَا سُنَّةً مِنْ سُنَّتِي، فَعَمِلَ بِهَا النَّاسُ، كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا، لَا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنِ ابْتَدَعَ بِدْعَةً، فَعُمِلَ بِهَا، كَانَ عَلَيْهِ أَوْزَارُ مَنْ عَمِلَ بِهَا، لَا يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِ مَنْ عَمِلَ بِهَا شَيْئًا»[٢].

واتە: کەسیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عەوفی موزەنیی ﷺ دەڵێ: باوکم لە باپیرمەوە بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سوننەتێکی من زیندوو بکاتەوە و خەڵکیش کاری پێبکات و جێبەجێی بکات، ئەوا

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣٢٢٨.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٦٧٧.

ئەو کەسەی کە سوننەتەکەی زیندوو کردۆتەوە بە ئەندازەی هەموو ئەوانەی کە ئیش بەو سوننەتە دەکەن پاداشت و چاکەی بۆ دەنوسرێ بێ ئەوەی لە پاداشتی هیچیان کەم بکات، وە لە بەرانبەریشدا هەر کەسێک ڕێگایەکی پێچەوانەی سوننەت دابێنێت (کە هچ ئەسڵێکی نەبێ لە دیندا) پاشان کاری پێبکرێ، ئەوا بە ئەندازەی ئەوانەی کە ئیش بەو داهێنراوە دەکەن تاوان بۆ کەسی یەکەم دەنوسرێ، بێ ئەوەی لە تاوانی ئەو کەسە کەم بکرێتەوە کە ئیشی پێکردوە.

**٢١٠-** عَنْ كَثِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَحْيَا سُنَّةً مِنْ سُنَّتِي قَدْ أُمِيتَتْ بَعْدِي، فَإِنَّ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلَ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنَ النَّاسِ، لَا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِ النَّاسِ شَيْئًا، وَمَنْ ابْتَدَعَ بِدْعَةً لَا يَرْضَاهَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ، فَإِنَّ عَلَيْهِ مِثْلَ إِثْمِ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنَ النَّاسِ، لَا يَنْقُصُ مِنْ آثَامِ النَّاسِ شَيْئًا»[1].

واتە: کەسیری کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکی، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک سوننەتێکی من زیندوو بکاتەوە کە لە دوای من ئەو سوننەتە مرێنرابێ (و کەس کاری پێ نەکات)، ئەوە بە ئەندازەی ئەو خەڵکانەی کە کاری پێدەکەن پاداشت وەردەگرێ و، هیچ لە پاداشتی خەڵکیش کەم نابێتەوە، وە هەر کەسێکیش داهێنراو و ڕێچکەیەک دابنێ کە خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەزامەندییان لەسەر نەبێ، ئەوە ئەو کەسەی دایهێناوە بە ئەندازەی ئەو خەڵکەی کار بەو داهێنراوە دەکەن گوناهی بۆ هەیەو، لەسەری گوناهبار دەبێ، بێ ئەوەی هیچ لە گوناهی خەڵکەکە کەم بێتەوە.

## بابەت: فەزڵ و گەورەیی ئەو کەسەی کە قورئان فێردەبێ و خەڵکیش فێری قورئان دەکات

**٢١١-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَالَ شُعْبَةُ «خَيْرُكُمْ» وَقَالَ سُفْيَانُ، «أَفْضَلُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ»[2].

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٦٧٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٢٧ و ٥٠٢٨، وأبو داود: ١٤٥٢، والترمذي: ٢٩٠٧ و ٢٩٠٨.

واتە: عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕیوایەتی شوعبە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشترینتان، وە لە ڕیوایەتی سوفیان دەڵێ: فەرمووی: چاکترین، یان گەورەترینتان (لە پاداشت و چاکەدا) ئەو کەسەیە کە قورئان فێرببێ (و کاری پێبکات) و، خەڵکیش فێری قورئان بکات.

**٢١٢-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْضَلُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ»[١].

واتە: عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێرببێ (و کاری پێبکات) و، خەڵکیش فێری قورئان بکات.

**٢١٣-** عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خِيَارُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ» قَالَ: «وَأَخَذَ بِيَدِي، فَأَقْعَدَنِي مَقْعَدِي هَذَا أُقْرِئُ»[٢].

واتە: موصعەبی کوڕی سەعد لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێربێ و کاری پێبکات و خەڵکیش فێر بکات. (ڕاوی) دەڵێ: مامۆستاکەم دەستی گرتم و داینیشاندم لەم شوێنە. (واتە: مامۆستاکەم وای لێکردم کە دانیشم خەڵکی فێری قورئان خوێندن بکەم).

**٢١٤-** عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْأُتْرُجَّةِ، طَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَرِيحُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ، طَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَلَا رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ، وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ، طَعْمُهَا مُرٌّ، وَلَا رِيحَ لَهَا»[٣].

واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نمونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان دەخوێنێ (کاری پێدەکات) وەکو لیمۆ وایە، کە تام و بۆنی خۆشە، وە نمونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان ناخوێنێ وەکو خورما وایە، کە تامی خۆشە، بەڵام هیچ بۆنێکی نیە، وە نمونەی ئەو دوو ڕووەی کە قورئان دەخوێنێ وەکو

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٢٧ و ٥٠٢٨، وأبو داود: ١٤٥٢، والترمذي: ٢٩٠٧ و ٢٩٠٨

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٢٠، ومسلم: ٧٩٧، وأبو داود: ٤٨٢٩ و ٤٨٣١، والترمذي: ٢٨٦٥، والنسائي: ٥٠٣٨.

ڕیحانە وایە، کە بۆنی خۆشە، بەڵام تامی تاڵە، وە نمونەی ئەو دوو ڕووەی کە قورئان ناخوێنێ وەکو گوژاڵک وایە، کە تامی تاڵە و تفتە، وە بۆنیشی نیە.

**٢١٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ هُمْ؟ قَالَ: «هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ، أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا خەڵکی تایبەتی هەن لەناو خەڵکیدا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانە ئەو کەسانەن کە هەڵگری قورئانن (بە لەبەرکردن و خوێندنەوە و کارپێکردنی)، ئەوانە کەسانی تایبەتی خوان.

**٢١٦-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ وَحَفِظَهُ، أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ، وَشَفَّعَهُ فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، كُلُّهُمْ قَدِ اسْتَوْجَبَ النَّارَ»[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک قورئان بخوێنێ و لەبەری بکات، ئەوە خوا دەیخاتە بەهەشتەوەو، (بە مۆڵەتی خوا) تکا و شەفاعەت بۆ دە کەس لە خانەوادەکەی دەکات، لەوانەی کە ئاگریان بۆ پێویست بووە (چونکە شایستەی بوون).

**٢١٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَعَلَّمُوا الْقُرْآنَ، واقْرأوهُ وَارْقُدُوا، فَإِنَّ مَثَلَ الْقُرْآنِ وَمَنْ تَعَلَّمَهُ فَقَامَ بِهِ كَمَثَلِ جِرَابٍ مَحْشُوٍّ مِسْكًا يَفُوحُ رِيحُهُ كُلَّ مَكَانٍ، وَمَثَلُ مَنْ تَعَلَّمَهُ فَرَقَدَ وَهُوَ فِي جَوْفِهِ كَمَثَلِ جِرَابٍ، أُوكِيَ عَلَى مِسْكٍ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قورئان فێرببن و بیخوێننەوەو بشخەون[٤] (پاشان نمونە دێنێتەوەو دەفەرموێ:) نمونەی قورئان و ئەوەی کە فێری دەبێ و هەڵدەستێ بە جێبەجێکردنی وەکو کیسێک وایە کە پڕبێت لە

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٩٠٥.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي المرفوع: ٢٨٧٦.

(٤) مەبەست ئەوەیە کە فێربوونی قورئان و خوێندنەوەی ڕێگر نیە لەوەی کە بخەوی و پشووبدەی مادام هەقی خۆی پێدەدەیی و کاری پێدەکەی...

(بۆنی) میسک، بۆنەکەی بەهەموو شوێنێک بڵاو دەبێتەوە، وە نمونەی ئەو کەسەی کە فێری دەبێ و بەڵام لێی پاڵدەکەوێ (کاری پێناکات) وەک کیسێک وایە کە پڕبێ لە میسک، بەڵام سەری کیسەکە داخرابێ.

**٢١٨-** عَنْ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ أَبِي الطُّفَيْلِ ﷺ، أَنَّ نَافِعَ بْنَ عَبْدِ الْحَارِثِ، لَقِيَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ بِعُسْفَانَ، وَكَانَ عُمَرُ، اسْتَعْمَلَهُ عَلَى مَكَّةَ، فَقَالَ عُمَرُ: مَنِ اسْتَخْلَفْتَ عَلَى أَهْلِ الْوَادِي؟ قَالَ: اسْتَخْلَفْتُ عَلَيْهِمْ ابْنَ أَبْزَى، قَالَ: وَمَنِ ابْنُ أَبْزَى؟ قَالَ: رَجُلٌ مِنْ مَوَالِينَا، قَالَ عُمَرُ، فَاسْتَخْلَفْتَ عَلَيْهِمْ مَوْلًى، قَالَ: إِنَّهُ قَارِئٌ لِكِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى، عَالِمٌ بِالْفَرَائِضِ، قَاضٍ، قَالَ عُمَرُ، أَمَا إِنَّ نَبِيَّكُمْ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا، وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ»[1].

واتە: عامڕی کوڕی واسیلەی ئەبو توفەیل ﷺ، دەگێڕێتەوە کە نافیعی کوڕی عەبدولحاریس لە عوسفان (شوێنێکە) گەیشت بە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، وە عومەر نافیعی ڕاسپاردبوو بۆ کار وباری مەککە و سەرپەرشتی کردنی، عومەر (کە نافیعی لەوێ بینی) گوتی: چ کەسێکت لە شوێنی خۆت داناوە بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانت؟ نافیعیش گوتی: ئیبنو ئەبزای لەجێی من کارەکان دەکات، عومەر گوتی: ئیبنو ئەبزا کێیە؟ ئەویش گوتی: یەکێکە لە مەوالییەکان (واتە: عەرەب نیە)، عومەریش گوتی: یەکێ لە مەوالییەکانت کردۆتە جێنشینی خۆت؟ نافیع گوتی: (ئاخر) ئەو شارەزایە بە خوێندنی قورئان، زانایە بە زانستی میرات، قازییە، ئەوجار عومەر گوتی: پێغەمبەرەکەتان ﷺ فەرموویەتی: بێگومان بە هۆی ئەم قورئانە و کارکردن بەو قورئانە خوا کۆمەڵێک بەرز دەکاتەوەو کۆمەڵێکیش نزم دەکاتەوە.

**٢١٩-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَبَا ذَرٍّ، لَأَنْ تَغْدُوَ فَتَعَلَّمَ آيَةً مِنْ كِتَابِ اللَّهِ، خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ تُصَلِّيَ مِائَةَ رَكْعَةٍ، وَلَأَنْ تَغْدُوَ فَتَعَلَّمَ بَابًا مِنَ الْعِلْمِ، عُمِلَ بِهِ أَوْ لَمْ يُعْمَلْ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ تُصَلِّيَ أَلْفَ رَكْعَةٍ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨١٧.

(٢) ضعيف.

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەی ئەبو زەڕ، ئەگەر بەیانیان دەربچی و تەنیا ئایەتێک لە قوڕئان فێرببی، ئەوە باشترە و خێری زیاترە بۆ تۆ لەوەی کە سەد ڕکات نوێژ (ی سوننەت) بکەی، خۆ ئەگەر لە ماڵ دەربچی و تەنها بابەتێکی زانستی فێرببی جا ئەو بابەتە کاری پێبکرێ یان نا، ئەوە زۆر باشترە لەوەی کە هەزار ڕکات نوێژ بکەی.

## بابەت: فەزڵ و گەورەیی زانایان و هەڵنان و هاندان بۆ وەرگرتن و فێربوونی زانست

**٢٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خوا چاکەو خێری بۆ هەرکەسێک بوێ، ئەوە شارەزای دەکات لە ئایین (ڕێگای فێربوون و کارپێکردنی بۆ ئاسان دەکات).

**٢٢١-** عَنْ يُونُسَ بْنِ مَيْسَرَةَ بْنِ حَلْبَسٍ ﷺ، أَنَّهُ حَدَّثَهُ، قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ، يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «الْخَيْرُ عَادَةٌ، وَالشَّرُّ لَجَاجَةٌ، وَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ»[٢].

واتە: یونوسی کوڕی مەیسەڕەی کوڕی حەلبەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: گوێم لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو، لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیگێڕایەوە کە فەرموویەتی: چاکە لە سروشت و نەریتی مرۆڤە، بەڵام خراپەکاری بێزراوو ناپەسندە، وە خوا چاکەوخێری بۆ هەرکەسێک بوێ، ئەوە شارەزای دەکات لە ئایین (ڕێگای شارەزابوونی بۆ ئاسان دەکات).

**٢٢٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَقِيهٌ وَاحِدٌ أَشَدُّ عَلَى الشَّيْطَانِ مِنْ أَلْفِ عَابِدٍ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١، ومسلم: ١٠٣٧ الشطر الأخير منه.

(٣) موضوع. أخرجه الترمذي: ٢٦٨١.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسێک کە شارەزابێ لە زانست و ئایین کاریگەری لەسەر شەیتان (و پلانەکانی) زیاترە لە هەزار خواپەرست (ی نەشارەزا لە ئایین).

**٢٢٣**- عَنْ كَثِيرِ بْنِ قَيْسٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ أَبِي الدَّرْدَاءِ فِي مَسْجِدِ دِمَشْقَ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا أَبَا الدَّرْدَاءِ، أَتَيْتُكَ مِنَ الْمَدِينَةِ، مَدِينَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؛ لِحَدِيثٍ بَلَغَنِي أَنَّكَ تُحَدِّثُ بِهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: قَالَ: فَمَا جَاءَ بِكَ تِجَارَةٌ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: وَلَا جَاءَ بِكَ غَيْرُهُ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا، سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضًا لِطَالِبِ الْعِلْمِ، وَإِنَّ طَالِبَ الْعِلْمِ يَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، حَتَّى الْحِيتَانِ فِي الْمَاءِ، وَإِنَّ فَضْلَ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ عَلَى سَائِرِ الْكَوَاكِبِ، إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ، إِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلَا دِرْهَمًا، إِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ، فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ»[1].

واتە: کەسیری کوڕی قەیس ﷺ دەڵێ: لەلای ئەبو دەڕداء ﷺ دانیشتبووم لە مزگەوتی دیمەشق، لەوکاتەدا پیاوێک هات و گوتی: ئەی ئەبو دەڕداء لە مەدینەی شاری پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتوم بۆ لات، لەبەر خاتری فەرموودەیەک کە من بیستومە گوایە تۆ لە پێغەمبەرەوە ﷺ باست کردوە، ئەبو دەڕداء گوتی: ئایا بۆ بازرگانی هاتووی؟ گوتی: نەخێر، گوتی: هیچ شتێکی تر تۆی نەهێناوە بۆ ئێرە؟ گوتی: نەخێر، ئەبو دەڕداء گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک ڕێگایەک بگرێتەبەر و مەبەستی فێربونی زانست بێ، ئەوە خوا ڕێگای چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، وە فریشتەکان بۆ گەورەیی و ڕەزامەندی ئەو باڵەکانیان ڕادەخەن، وە هەرچی لە ئاسمان و زەوی هەیە داوای لێخۆشبونی بۆ دەکەن، هەتا نەهەنگەکانی نێو دەریاش، وە گەورەیی و فەزڵی زانا بەسەر خواپەرستێکدا وەک گەورەیی و فەزڵی مانگ وایە بەسەر تەواوی ئەستێرەکانی دیکەدا، زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، وە بێگومان پێغەمبەرانیش دینارو درهەم (پول و پارە) لە دوایان بەجێ نەماوە بۆ میراتی گرتن، بەڵکو ئەوەی جێیان هێشتووە و لێیان بە میرات دەگیرێ تەنها زانستە، جا هەر کەسێک ئەو زانستەی ئەوان وەربگرێ، ئەوە باشترین و تەواوترین بەشی بەرکەوتووە.

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٦٤١ و ٣٦٤٢، والترمذي: ٢٦٨٢.

**٢٢٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، وَوَاضِعُ الْعِلْمِ عِنْدَ غَيْرِ أَهْلِهِ كَمُقَلِّدِ الْخَنَازِيرِ الْجَوْهَرَ وَاللُّؤْلُؤَ وَالذَّهَبَ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فێربوون و گرتنەبەری ڕێگای فێربوون و زانست لەسەر هەموو مسوڵمانێک پێویستە، وە ئەو کەسەی کە زانست بە کەسێ دەدات کە شایستە نیە وەکو ئەوە وایە بێ نرخترین ئاژەڵ کە بەرازە لە باشترین و گرانبەهاترین شت تەوق و زنجیری بۆ دروست بکەی کە گەوهەر و مرواری و زێڕە.**

**٢٢٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا، سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ، يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلَّا حَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ، وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ أَبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ناڕەحەتییەک لەسەر مسوڵمانێک لابدات لە دونیادا، ئەوە خوا لە قیامەتدا ناخۆشی و ناڕەحەتی لەسەر لادەدات، وە هەر کەسێک عەیبی مسوڵمانێک داپۆشێ ئەوە خوا لە دونیا و لە قیامەتدا عەیبی دادەپۆشێ، وە هەر کەسێک ئاسانکاری بکات بۆ کەسێک کە کارێکی قورس و گرانی لەسەرە، ئەوە خوا لە دونیا و لە قیامەتدا ئاسانکاری بۆ دەکات، وە بەردەوام خوا هاوکاری بەندە دەکات، مادام بەندە هاوکاری براکەی بکات، وە هەر کەسێک ڕێگایەک بگرێتەبەر بۆ وەرگرتنی زانست، ئەوە خوا ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، وە کاتێک کۆمەڵێک لە یەکێک لە ماڵەکانی خوا کۆدەبنەوەو قورئانی تێدا دەخوێنن و دەوری دەکەنەوەو بە یەکتری دەڵێنەوە، ئەوە**

---

(١) صحيح دون قوله: «وَوَاضِعُ الْعِلْمِ عِنْدَ غَيْرِ أَهْلِهِ كَمُقَلِّدِ الْخَنَازِيرِ الْجَوْهَرَ وَاللُّؤْلُؤَ وَالذَّهَبَ».

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٩٩، وأبو داود: ١٤٥٥ و ٣٦٤٣ و ٤٩٤٦، والترمذي: ١٤٢٥ و ١٩٣٠ و ٢٦٤٦ و ٢٩٤٥.

فریشتەکان دەوریان دەدەن و ئارامی دادەبارێ بەسەریاندا و خوا بە ڕەحمەتی خۆی دایاندەپۆشێ، وە خوا لەلای ئەوانەی کە لەلای خۆین باسیان دەکات، وە هەر کەس کردەوەکەی پێشی نەخات لە چاکەکاری، ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات.

**٢٢٦-** عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ صَفْوَانَ بْنَ عَسَّالٍ الْمُرَادِيَّ، فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ؟، قُلْتُ: أُنْبِطُ الْعِلْمَ، قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ خَارِجٍ خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ فِي طَلَبِ الْعِلْمِ، إِلَّا وَضَعَتْ لَهُ الْمَلَائِكَةُ أَجْنِحَتَهَا رِضًا بِمَا يَصْنَعُ»[١].

واتە: زیری کوڕی حوبەیش ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای صەفوانی کوڕی عەسسالی موڕادی، ئەویش گوتی: چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟ گوتم: دەمەوێ فێری زانست بم، ئەویش گوتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس لە ماڵ دەربچێ و مەبەستی لە دەرچوونەکە وەرگرتن و فێربونی زانست بێ، ئەوە فریشتەکان بۆ گەورەیی و ڕەزامەندی ئەوەی دەیکات باڵەکانیان ڕادەخەن.

**٢٢٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ جَاءَ مَسْجِدِي هَذَا، لَمْ يَأْتِهِ إِلَّا لِخَيْرٍ يَتَعَلَّمُهُ أَوْ يُعَلِّمُهُ، فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَمَنْ جَاءَ لِغَيْرِ ذَلِكَ، فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ الرَّجُلِ يَنْظُرُ إِلَى مَتَاعِ غَيْرِهِ»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک هات بۆ ئەو مزگەوتەی من وە هاتنەکەشی تەنها بۆ ئەوەبوو چاکەیەک فێربێ، یان فێری کەسێکی بکات، ئەوە لە شوێنی ئەو کەسەیە کە لە پێناو خوادا تێدەکۆشێ، وە هەر کەس بۆ جگە لەمە هاتبێ (بۆ مەبەستی فێربوون و فێرکردن نەهاتبێ)، ئەوە وەک ئەو کەسە وایە کە تەماشای کەل و پەلی کەسێکی دیکە بکات.

**٢٢٨-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعِلْمِ قَبْلَ أَنْ يُقْبَضَ، وَقَبْضُهُ أَنْ يُرْفَعَ» وَجَمَعَ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ الْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِي الْإِبْهَامَ، هَكَذَا. ثُمَّ قَالَ: «الْعَالِمُ وَالْمُتَعَلِّمُ شَرِيكَانِ فِي الْأَجْرِ، وَلَا خَيْرَ فِي سَائِرِ النَّاسِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٥٣٥ و ٣٥٣٦، والنسائي: ٩٨/١.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پابەندی ئەو زانستە (دینییە ببن و فێری ببن و کاری پێبکەن) پێش ئەوەی کە هەڵبگیرێتەوەو نەمێنێ، وە هەڵگیرانەوەی ئەو زانستەش ئەوەیە کە نامێنێ و بەرزدەبێتەوە (ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خوا هەڵیدەگرێتەوە و بەرزی دەکاتەوە و لەسەر زەوی نایهێڵێ) وە پەنجەی نێوەڕاست و پەنجەی دوای پەنجە گەورەی دەستی لێک نزیک کردەوە بەم شێوەیە (ئاماژەیە بۆ نزیکی کات و بەرزبوونەوە و نەمانی زانستەکە). پاشان فەرمووی: زانا و ئەوەی کە فێرخواز و قوتابی زانستیشە هاوبەشن لە پاداشت، جگە لەو دوو چینە خەڵکیتر هیچ خێرێکیان پێوە نیە.

**٢٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ مِنْ بَعْضِ حُجَرِهِ، فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا هُوَ بِحَلْقَتَيْنِ، إِحْدَاهُمَا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، وَيَدْعُونَ اللَّهَ، وَالْأُخْرَى يَتَعَلَّمُونَ وَيُعَلِّمُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «كُلٌّ عَلَى خَيْرٍ، هَؤُلَاءِ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، وَيَدْعُونَ اللَّهَ، فَإِنْ شَاءَ أَعْطَاهُمْ، وَإِنْ شَاءَ مَنَعَهُمْ، وَهَؤُلَاءِ يَتَعَلَّمُونَ وَيُعَلِّمُونَ، وَإِنَّمَا بُعِثْتُ مُعَلِّمًا» فَجَلَسَ مَعَهُمْ[١].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێک لە ژوورەکانی هاتە دەرەوە و چوو بۆناو مزگەوت، بینی خەڵکی بە دوو بازنە دانیشتوون، بازنەیەکیان قورئانیان دەخوێند و دوعایان دەکرد، بازنەکەی تریش زانستیان فێری یەکتری دەکرد و لە یەکتریان وەردەگرت، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەموویان لەسەر چاکە کۆبوونەوەو کاری چاکە دەکەن، ئەوانەی قورئان دەخوێنن و داوا لە خوا دەکەن، ئەگەر خوا بیەوێ پێیان دەبەخشێ و لێیان قبووڵ دەکات، وە ئەگەریش بیەوێ پێیان نادات، وە ئەوانەشی کە فێردەبن و خەڵکیش فێردەکەن، منیش بۆ ئەوە هاتووم خەڵکی فێر بکەم و لە دین تێیان بگەیەنم، پاشان لای ئەوان دانیشت.

---

(١) ضعيف.

## بابەت: ئەو کەسەی کە زانستێک دەگەیەنێ

**٢٣٠-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مَقَالَتِي فَبَلَّغَهَا، فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ غَيْرِ فَقِيهٍ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ» زَادَ فِيهِ عَلِيُّ بْنُ مُحَمَّدٍ، «ثَلَاثٌ لَا يُغِلُّ عَلَيْهِنَّ قَلْبُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ: إِخْلَاصُ الْعَمَلِ لِلَّهِ، وَالنُّصْحُ لِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ، وَلُزُومُ جَمَاعَتِهِمْ»[1].

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ڕووی ئەو کەسە ڕۆشن و جوان بکات کە قسەیەکی من دەبیستێ و بڵاوی دەکاتەوە، چونکە هەندێ کەس هەیە کە بەڵگە شەرعییەکانی لایە بەڵام ناتوانێ حوکمە شەرعییەکانی لێدەربێنێ (بەڵام کاتێک بۆ کەسێکی شارەزاتر دەیگێڕێتەوە، ئەوە ئەو کەسە دەتوانێ حوکمە شەرعییەکانی لێ هەڵبێنجێ)، وە هەندێ کەس هەیە شارەزایە، بەڵام دەیگەیەنێ بە کەسێک کە لە خۆی شارەزاترە، عەلی کوڕی موحەممەد ئەوەشی لێ زیادکردوە: سێ شت هەیە کە لە ناو دڵی هەر مسوڵمانێک هەبن ناپاکی ناکات: کارکردن بە دڵسۆزی تەنها لەبەر خوا، وە دڵسۆزی و چاکە ویستن بۆ پێشەوایانی مسوڵمانان، وە پابەندبوون بە کۆمەڵی مسوڵمانان.

**٢٣١-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بِالْخَيْفِ مِنْ مِنًى، فَقَالَ: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مَقَالَتِي فَبَلَّغَهَا، فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ غَيْرِ فَقِيهٍ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ»[2].

واتە: موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ لە باوکی دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیف (ناوی شوێنێکە) لە مینا هەڵسا و فەرمووی: خوا ڕووی ئەو کەسە ڕۆشن و جوان بکات کە قسەیەکی من دەبیستێ و پاشان بڵاوی دەکاتەوە، چونکە هەندێ کەس هەیە کە بەڵگە شەرعییەکانی لایە بەڵام ناتوانێ حوکمە شەرعییەکانی لێدەربێنێ (بەڵام کاتێک بۆ کەسێکی شارەزاتر ئەیگێڕێتەوە ئەوا ئەو کەسە دەتوانێ حوکمە شەرعییەکانی لێ هەڵبێنجێ)، وە هەندێ کەس هەیە شارەزایە بەڵام دەیگەیەنێ بە کەسێک کە لە خۆی شارەزاترە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٦٠، والترمذي: ٢٦٥٦.

(٢) صحيح.

**٢٣٢- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا فَبَلَّغَهُ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَحْفَظُ مِنْ سَامِعٍ»[١].**

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەبدوڵڵا لە باوكی ﷺ دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ڕووی ئەو كەسە ڕۆشن و جوان بكات كە فەرموودەیەكی من دەبیستێ و، پاشان دەیگەیەنێ بە خەڵكیتر، چونكە هەندێ كەس هەیە كە فەرموودەكەی پێدەگات شارەزاتر و پارێزگارترە لەو كەسەی كە لە منەوە بیستوویەتی.**

**٢٣٣- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، وَعَنْ رَجُلٍ آخَرَ، -هُوَ أَفْضَلُ فِي نَفْسِي مِنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَوْمَ النَّحْرِ، فَقَالَ: «لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَإِنَّهُ رُبَّ مُبَلَّغٍ يَبْلُغُهُ أَوْعَى لَهُ مِنْ سَامِعٍ»[٢].**

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبو بەكرە لە باوكی ﷺ، وە هەروەها لە پیاوێكی تر - كە لە لای من لە عەبدوڕڕەحمان باشترە- لە ئەبو بەكرەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قورباندا وتاریداو فەرمووی: ئەوانەی ئامادەی وتارەكەی منن، با بیگەیەنن بەوانەی كە ئامادەنین، چونكە هەندێ كەس هەیە كە فەرموودەكەی پێدەگات هۆشیارترو شارەزاترە لەو كەسەی (كە یەكەم جار) بیستویەتی.**

**٢٣٤- عَنْ مُعَاوِيَةَ الْقُشَيْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ»[٣].**

**واتە: موعاویەی قوشەیری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگاداربن ئەوانەی ئامادەن بیگەیەنن بەوانەی كە ئامادەنین و نەهاتوون.**

**٢٣٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لِيُبَلِّغْ شَاهِدُكُمْ غَائِبَكُمْ»[٤].**

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئامادەبووەكانتان بیگەیەنن بەوانەتان كە ئامادە نین.**

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٦٥٧ و ٢٦٥٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧ و ١٠٥ و ١٧٤١ و ٣١٩٧ و ٤٤٠٦ و ٧٤٤٧، ومسلم: ١٦٧٩.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢٧٨ بنحوه.

**٢٣٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَضَّرَ اللَّهُ عَبْدًا سَمِعَ مَقَالَتِي فَوَعَاهَا، ثُمَّ بَلَّغَهَا عَنِّي، فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ غَيْرِ فَقِيهٍ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ»(١).

**واتە:** ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ڕووی ئەو کەسە ڕۆشن و جوان بکات کە قسەکانی من دەبیستێ و تێیان دەگات، پاشان لە منەوە دەیگەیەنێ بەوانیتر، چونکە هەندێ کەس هەیە کە زانستەکەی لەلایە شارەزای سوود لێوەرگرتنی نیە، وەک ئەو کەسەی کە پێیدەگەیەنێ، وە هەندێ کەسیش کە خۆی شارەزایە دەیگەیەنێ بە کەسێ کە لە خۆی شارەزاترە.

## بابەت: ئەو کەسەی کە دەبێتە کلیلی چاکەکاری

**٢٣٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنَ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلْخَيْرِ، مَغَالِيقَ لِلشَّرِّ، وَإِنَّ مِنَ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلشَّرِّ مَغَالِيقَ لِلْخَيْرِ، فَطُوبَى لِمَنْ جَعَلَ اللَّهُ مَفَاتِيحَ الْخَيْرِ عَلَى يَدَيْهِ، وَوَيْلٌ لِمَنْ جَعَلَ اللَّهُ مَفَاتِيحَ الشَّرِّ عَلَى يَدَيْهِ»(٢).

**واتە:** ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕاستیدا هەندێ کەس کلیلی چاکەیە و قفڵی خراپەیە، وە بەڕاستی هەندێ کەسیش کلیلی خراپەیە و قوفڵی چاکەیە، جا خۆش بە حاڵی ئەوانەی کە خوا دەستی ئەوانەی کردوە بە کلیلی چاکە، وە سزای سەخت بۆ ئەوانەی کە خوا دەستی ئەوانی کردۆتە کلیلی خراپە.

**٢٣٨-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ هَذَا الْخَيْرَ خَزَائِنُ، وَلِتِلْكَ الْخَزَائِنِ مَفَاتِيحُ، فَطُوبَى لِعَبْدٍ جَعَلَهُ اللَّهُ مِفْتَاحًا لِلْخَيْرِ، مِغْلَاقًا لِلشَّرِّ، وَوَيْلٌ لِعَبْدٍ جَعَلَهُ اللَّهُ مِفْتَاحًا لَلشَّرِّ، مِغْلَاقًا لِلْخَيْرِ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) حسن.

(٣) ضعيف جداً.




واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەو خێر و چاکەیە وەکو کۆگاو گەنجینە وایە، وە ئەو کۆگاو گەنجینەیەش کلیلی هەیە، جا خۆشی بە حاڵی ئەو بەندەیەی کە خوا دەیکات بە کلیلی چاکە و قوفڵی خراپە، وە سزای سەخت بۆ ئەو بەندەیەی کە خوا دەیکات بە کلیلی خراپە و قوفڵی خێر و چاکە.

## بابەت: پاداشتی ئەو کەسەی کە خەڵکی فێری چاکە دەکات

٢٣٩- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّهُ لَيَسْتَغْفِرُ لِلْعَالِمِ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ، وَمَنْ فِي الْأَرْضِ، حَتَّى الْحِيتَانِ فِي الْبَحْرِ»(١).

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی ئەو کەسەی کە زانایەو (کار بە زانستەکەی دەکات و خەڵکی فێر دەکات)، ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن، هەتا نەهەنگەکانی ناو دەریاش.

٢٤٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ عَلَّمَ عِلْمًا فَلَهُ أَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهِ، لَا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الْعَامِلِ»(٢).

واتە: سەهلی کوڕی موعازی کوڕی ئەنەس لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ زانستێک فێری خەڵک بکات، ئەوە بە ئەندازەی ئەوەی کار بە و زانستە دەکات پاداشت و چاکەی بۆ دەنوسرێ بێ ئەوەی لە چاکەی ئەو کەسە کەم بێتەوە کە کاری پێدەکات.

٢٤١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ مَا يُخَلِّفُ الرَّجُلُ مِنْ بَعْدِهِ ثَلَاثٌ: وَلَدٌ صَالِحٌ يَدْعُو لَهُ، وَصَدَقَةٌ تَجْرِي يَبْلُغُهُ أَجْرُهَا، وَعِلْمٌ يُعْمَلُ بِهِ مِنْ بَعْدِهِ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) حسن.

(٣) صحيح.

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین شتێک کە پیاو لە دواى خۆی جێی دەهێڵێ سێ شتە: منداڵێکی چاکەکار کە دوعای بۆ بکات، چاکەیەکی بەردەوام کە بە هەمیشەیی خێرەکەی پێدەگات (وەک دروستکردنی مزگەوت و پردو نەخۆشخانەو بیری ئاوو... هتد)، زانستێک کە لە دوای خۆی کاری پێ دەکرێ.**

**٢٤٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِمَّا يَلْحَقُ الْمُؤْمِنَ مِنْ عَمَلِهِ وَحَسَنَاتِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ عِلْمًا عَلَّمَهُ وَنَشَرَهُ، وَوَلَدًا صَالِحًا تَرَكَهُ، وَمُصْحَفًا وَرَّثَهُ، أَوْ مَسْجِدًا بَنَاهُ، أَوْ بَيْتًا لِابْنِ السَّبِيلِ بَنَاهُ، أَوْ نَهْرًا أَجْرَاهُ، أَوْ صَدَقَةً أَخْرَجَهَا مِنْ مَالِهِ فِي صِحَّتِهِ وَحَيَاتِهِ، يَلْحَقُهُ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لەو چاکەو کردەوانەی کە بە ئیماندار دەگات لە دوای مردنی بریتیە لە: زانستێک کە فێری بووبێ و بڵاوی کردبێتەوە، وە منداڵێکی چاکەکاری لە دوای خۆی جێی هێشتبێ، وە قورئانێک کە لە دوای خۆی جێی هێشتبێ، یان مزگەوتێکی دروست کردبێ، یان خانویەکی دروست کردبێ بۆ ڕێبواران، یان ئاوێکی پەیدا کردبێ (بیر بێ، یان کارێز، یان کانیاو، یان ڕووبار)، یان ئەو بەخشینەی کە لە سەروەت و سامانی خۆی کردبێتی و خۆشی لە ژیاندا بووبێ و تەندروست بووبێ، ئەوانە دوای مردنیش پاداشتەکەی پێدەگات.**

**٢٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ أَنْ يَتَعَلَّمَ الْمَرْءُ الْمُسْلِمُ عِلْمًا، ثُمَّ يُعَلِّمَهُ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: باشترین کاری چاکە ئەوەیە کە مرۆڤی مسوڵمان زانستێک فێرببێ، پاشان برای مسوڵمانیشی فێری ئەو زانستە بکات.**

---

(١) حسن. تخريجه انفرد به ابن ماجه. وانظر مسلم: ١٦٣١، وأبو داود: ٢٨٨٠، والترمذي: ١٣٧٦، والنسائي: ٣٦٥١.

(٢) ضعيف.

## بابەت: ئەو کەسەی کە حەزناکات خەڵکی لەدوایەوە بڕۆن

**٢٤٤-** عَنْ شُعَيْبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: «مَا رُئِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ مُتَّكِئًا قَطُّ، وَلَا يَطَأُ عَقِبَيْهِ رَجُلَانِ»[1].

واتە: شوعەیبی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: هیچ کات پێغەمبەری خوا ﷺ نەبینراوە کە بە پاڵدانەوە خواردن بخوات، وە هیچ کاتیش نەبووە کە دوو کەس لە دوایەوە بڕۆن و بۆ خۆی لە پێشیانەوە بێت (بەڵکو لە دوایان ڕۆیشتووە، یان لە نێوانی هاوڕێکانی ڕۆیشتووە، ئەوەش گەورەیی ڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەسەلمێنێ کە هەمیشە ویستوویەتی وەک هاوڕێکانی خۆی نیشان بدات، نەک وەک پاشاو گەورەکانی ئەو کات).

**٢٤٥-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: «مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ فِي يَوْمٍ شَدِيدِ الْحَرِّ نَحْوَ بَقِيعِ الْغَرْقَدِ، وَكَانَ النَّاسُ يَمْشُونَ خَلْفَهُ، فَلَمَّا سَمِعَ صَوْتَ النِّعَالِ وَقَرَ ذَلِكَ فِي نَفْسِهِ، فَجَلَسَ حَتَّى قَدَّمَهُمْ أَمَامَهُ؛ لِئَلَّا يَقَعَ فِي نَفْسِهِ شَيْءٌ مِنَ الْكِبْرِ»[2].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا پێغەمبەر ﷺ بەرەو بەقیع ڕۆیشت، وە خەڵکیش لەدوای دەڕۆیشتن، کاتێک گوێی لە دەنگی نەعلەکانیان بوو کە لەدوایەوە دەڕۆیشتن ئەوەی لەسەر دڵ ناخۆش بوو، بۆیە دانیشت هەتاوەکو خەڵکەکە پێشی کەوتنەوە، بۆ ئەوەی لە ناو دڵی خۆیدا توشی خۆ بەگەورەزانین نەبێت.

ڕاوی فەرموودەکە دەڵێ: بۆ ئەوەی هیچ بەشێک لە خۆ بەگەورەزانین هەست پێنەکات لە ناخیدا، بۆیە دانیشت تا پێشی بکەونەوە، (دەشگونجێ ئەوە بۆ ئێمە بێ، تا فێربین حەز بەوە نەکەین، خەڵک لە دوامانەوە بڕوات).

**٢٤٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا مَشَى مَشَى أَصْحَابُهُ أَمَامَهُ وَتَرَكُوا ظَهْرَهُ لِلْمَلَائِكَةِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٩٨، وأبو داود: ٣٧٦٩، والترمذي: ١٨٣٠.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەر ﷺ بەڕێگادا دەڕۆیشت، هاوەڵەکانی لە پێشی دەڕۆیشتن (یان لە تەنیشتی)و، دواوەیان بۆ فریشتەکان جێدەهێشت.

## بابەت: وەسیەت کردن بە زانست خوازان

٢٤٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «سَيَأْتِيكُمْ أَقْوَامٌ يَطْلُبُونَ الْعِلْمَ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ فَقُولُوا لَهُمْ: مَرْحَبًا مَرْحَبًا بِوَصِيَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَاقْنُوهُمْ» قُلْتُ لِلْحَكَمِ، مَا اقْنُوهُمْ، قَالَ: عَلِّمُوهُمْ[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەمەودوا خەڵکانێک دێنە لاتان بۆ وەرگرتنی زانست، جا ئەگەر ئەوانتان بینی پێیان بڵێن: بەخێربێن بەخێربێن بۆ ڕاسپاردەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: ئەی ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردوون و ئێمەی ڕاسپاردوە کە بەخێرهاتنتان لێ بکەین)، (وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی): فێریان بکەن و زانستیان پێبڵێن و تێیان بگەیەنن، (ڕاوی فەرموودەکە) دەڵێ: لە حەکەمم پرسی: «اقنوهم» واتەی چییە؟ ئەویش گوتی: واتە: فێریان بکەن.

٢٤٨- عَنْ إِسْمَاعِيلَ ﷺ، قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى الْحَسَنِ نَعُودُهُ حَتَّى مَلَأْنَا الْبَيْتَ، فَقَبَضَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ نَعُودُهُ حَتَّى مَلَأْنَا الْبَيْتَ، فَقَبَضَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى مَلَأْنَا الْبَيْتَ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ لِجَنْبِهِ، فَلَمَّا رَآنَا قَبَضَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّهُ سَيَأْتِيكُمْ أَقْوَامٌ مِنْ بَعْدِي يَطْلُبُونَ الْعِلْمَ، فَرَحِّبُوا بِهِمْ، وَحَيُّوهُمْ، وَعَلِّمُوهُمْ» قَالَ: «فَأَدْرَكْنَا وَاللَّهِ أَقْوَامًا مَا رَحَّبُوا بِنَا، وَلَا حَيَّوْنَا، وَلَا عَلَّمُونَا، إِلَّا بَعْدَ أَنْ كُنَّا نَذْهَبُ إِلَيْهِمْ فَيَجْفُونَا»[٢].

واتە: ئیسماعیل ﷺ دەڵێ: چووینە لای حەسەن سەردانمان کرد تا ماڵەکەمان پڕ کرد، جا پێیەکانی کۆکردەوە (لەبەر ڕێز، یان لەبەر کەمی جێگا)، پاشان گوتی: چووینە بۆ لای ئەبو هوڕەیرە سەردانمان کرد تا ماڵەکەمان پڕ کرد، جا پێیەکانی کۆکردەوە،

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٦٥٠ و ٢٦٥١.

(٢) موضوع.




دواتر گوتی: چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تاکو ماڵەکەمان پڕ کرد لە کاتێکدا کە ئەو لەسەر کەلەکەی پاڵی دابۆوە، جا کاتێک ئێمەی بینی پێیەکانی کۆکردەوە، پاشان فەرمووی: بێگومان لە دوای من خەڵکانێک دێن داوای زانستتان لێدەکەن، بەخێرهاتنیان بکە، (وە سینگتان بەرانبەریان فراوان بێ)، وە ڕێزیان بگرن و فێری زانستیان بکەن، (ڕاوی) دەڵێ: جا سوێند بە خوا خەڵکانێکمان (مامۆستاکان) بینی کە بەخێرهاتنیان نەکردین، وە ڕێزیان نەگرتین، وە فێریان نەکردین، مەگەر دوای ئەوەی کە ئێمە ڕۆیشتین بۆ لایان و ئەوانیش بەرانبەرمان سارد و سڕ بوون.

**٢٤٩-** عَنْ أَبِي هَارُونَ الْعَبْدِيِّ، قَالَ: كُنَّا إِذَا أَتَيْنَا أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ، قَالَ: مَرْحَبًا بِوَصِيَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَنَا: «إِنَّ النَّاسَ لَكُمْ تَبَعٌ، وَإِنَّهُمْ سَيَأْتُونَكُمْ مِنْ أَقْطَارِ الْأَرْضِ يَتَفَقَّهُونَ فِي الدِّينِ، فَإِذَا جَاءُوكُمْ فَاسْتَوْصُوا بِهِمْ خَيْرًا»[١].

واتە: ئەبو هاڕوونی عەبدی دەڵێ: کاتێک چووین بۆ لای ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گوتی: مەرحەبا بە ڕاسپاردەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ بەئێمەی فەرمووە: بەڕاستی خەڵکی دەبنە شوێنکەوتووتان، ئەوان لە هەموو لایەکی سەرزەوییەوە دێن و دەیانەوێ لەو ئایینە شارەزابن، جا هەرکات ئەوانە هاتن بۆ لاتان ئەوە هەرچی دەیزانن و پێتان دەکرێ فێریان بکەن و پێیان بدەن لە چاکە و خێری ئەم دینە.

## بابەت: سود وەرگرتن بە زانست و کارپێکردنی

**٢٥٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ مِنْ دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: لە دوعاکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو، کە دەیفەرموو: خوایە پەنات پێدەگرم لە زانستێک کە سوودی نەبێ و، لە دوعایەک کە نەبیسترێ و وەرنەگیرێ و، دڵێک کە ترسی (خوای) تێدانەبێ، وە لە نەفسێک کە تێرنەخوات ( و هەمیشە هەر بە دوای دونیاوە بێت).

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٦٥٠ و ٢٦٥١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٤٨، والنسائي: ٥٥٣٦ و ٥٥٣٧.

٢٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ انْفَعْنِي بِمَا عَلَّمْتَنِي، وَعَلِّمْنِي مَا يَنْفَعُنِي، وَزِدْنِي عِلْمًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە سوودمەندم بکە بەو زانستەی کە فێرت کردووم، وە ئەو زانستەم فێربکە کە سوودی بۆم هەیە، وە زانستم زیاد بکە، وە سوپاس و ستایش بۆ خوا لەسەر هەموو بارودۆخێک.

٢٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَعَلَّمَ عِلْمًا مِمَّا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللَّهِ، لَا يَتَعَلَّمُهُ إِلَّا لِيُصِيبَ بِهِ عَرَضًا مِنَ الدُّنْيَا، لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ» يَعْنِي رِيحَهَا[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ زانستێک لەو زانستانە فێربێ کە دەبێ تەنها لە پێناو خوادا فێری ببی و بەکاری بێنی، بەڵام ئەو کەسەی تەنها بۆ ئەوە فێری بێ کە دونیای پێ بەدەست بهێنێ، ئەوا ئەو کەسە بۆنی بەهەشت ناکات.

٢٥٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ طَلَبَ الْعِلْمَ لِيُمَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ، أَوْ لِيُبَاهِيَ بِهِ الْعُلَمَاءَ، أَوْ لِيَصْرِفَ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيْهِ، فَهُوَ فِي النَّارِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک فێری زانست ببێ بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵکی کاڵفام مشت و مڕ بکات، یان شانازی پێوە بکات بەسەر زانایاندا، یان بیەوێ کە سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، ئەوە لە نێو ئاگردایە.

٢٥٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا تَعَلَّمُوا الْعِلْمَ لِتُبَاهُوا بِهِ الْعُلَمَاءَ، وَلَا لِتُمَارُوا بِهِ السُّفَهَاءَ، وَلَا تَخَيَّرُوا بِهِ الْمَجَالِسَ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَالنَّارُ النَّارُ»[٤].

---

(١) صحيح دون قوله: «الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَىٰ كُلِّ حَالٍ». أخرجه الترمذي: ٣٥٩٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٦٤.

(٣) حسن.

(٤) صحيح.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فێری زانست مەبن تاکو شانازی بەسەر زانایاندا بکەن، یان مشت و مڕی پێ بکەن لەگەڵ کاڵفام و نەزانان، وە هەروەها بۆ ئەوە فێرمەبن کە سەرووی مەجلیس بگرن و پلە و پایەی دونیای پێ بەدەست بێنن، هەر کەس وای کرد، شایستەی چوونە نێو ئاگرە ئاگر.

٢٥٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أُنَاسًا مِنْ أُمَّتِي سَيَتَفَقَّهُونَ فِي الدِّينِ، وَيَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، وَيَقُولُونَ: نَأْتِي الْأُمَرَاءَ فَنُصِيبُ مِنْ دُنْيَاهُمْ، وَنَعْتَزِلُهُمْ بِدِينِنَا، وَلَا يَكُونُ ذَلِكَ، كَمَا لَا يُجْتَنَى مِنَ الْقَتَادِ إِلَّا الشَّوْكُ، كَذَلِكَ لَا يُجْتَنَى مِنْ قُرْبِهِمْ إِلَّا» قَالَ: مُحَمَّدُ بْنُ الصَّبَّاحِ، كَأَنَّهُ يَعْنِي الْخَطَايَا[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: بێگومان خەڵکانێک لە ئوممەتی من بانگەشەی شارەزاییان دەکەن لە دیندا، وە قورئان دەخوێنن و (تەفسیری دەکەن)، دەشڵێن: ئێمە دەچین بۆ لای کاربەدەستان و بەشی خۆمان لە دونیا لێیان بەهرەمەند دەبین و بە دینەکەشمان و شارەزاییمان لە دین لێیان دووردەکەوینەوە (واتە: بەشدار نابین لە تاوان و کردەوە خراپەکانیان)، (وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:) ئەوەش دەستەبەر نابێ، هەروەکو چۆن لە داری قەتاد (دارێکی دڕکاوییە) تەنها دەتوانرێ دڕک بچنرێ و هیچ بەرێکی دیکە ناگرێ، بەهۆی نزیک بوونەوەیان لە کاربەدەستان تەنها ئەوەیە و هیچی تر، موحەممەدی کوڕی صەباح دەڵێ: مەبەستی پێ لە گوناهو تاوان بوو (کە فەرمووی: هیچ شتێکی تر نیە).

٢٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ جُبِّ الْحُزْنِ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا جُبُّ الْحُزْنِ؟ قَالَ: «وَادٍ فِي جَهَنَّمَ، يَتَعَوَّذُ مِنْهُ جَهَنَّمُ كُلَّ يَوْمٍ أَرْبَعَمِائَةِ مَرَّةٍ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ يَدْخُلُهُ؟ قَالَ «أُعِدَّ لِلْقُرَّاءِ الْمُرَائِينَ بِأَعْمَالِهِمْ، وَإِنَّ مِنْ أَبْغَضِ الْقُرَّاءِ إِلَى اللَّهِ الَّذِينَ يَزُورُونَ الْأُمَرَاءَ» قَالَ الْمُحَارِبِيُّ: «الْجَوَرَةَ»[٢].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٣٨٣.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەنابگرن بە خوا لە «جُبِّ الحُزْن»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا «جُبِّ الحُزْن» چییە؟ فەرمووی: شیوێکە لە دۆزەخدا، کە دۆزەخ هەموو ڕۆژێک چوار سەد جار پەنادەگرێ بە خوا لەو شیوە، گوتیان: پێغەمبەری خوا جا ئەوە کێ دەچێتە نێوی؟ فەرمووی: ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی کە قورئان دەخوێنن و زانست فێردەبن و لە کردەوەکانیاندا ڕیا (ڕووپامایی) دەکەن، وە بەدڵنیایی بێزراوترین زانا و خوێندەوار لای خوا ئەوانەن کە دەچنە دەرگای کاربەدەستان و سەردانیان دەکەن، موحاریبی دەڵێ: ئەو کاربەدەستانەی کە ستەمکارن.

**٢٥٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: لَوْ أَنَّ أَهْلَ الْعِلْمِ صَانُوا الْعِلْمَ، وَوَضَعُوهُ عِنْدَ أَهْلِهِ، لَسَادُوا بِهِ أَهْلَ زَمَانِهِمْ، وَلَكِنَّهُمْ بَذَلُوهُ لِأَهْلِ الدُّنْيَا لِيَنَالُوا بِهِ مِنْ دُنْيَاهُمْ، فَهَانُوا عَلَيْهِمْ، سَمِعْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ جَعَلَ الْهُمُومَ هَمًّا وَاحِدًا، هَمَّ آخِرَتِهِ، كَفَاهُ اللَّهُ هَمَّ دُنْيَاهُ، وَمَنْ تَشَعَّبَتْ بِهِ الْهُمُومُ فِي أَحْوَالِ الدُّنْيَا لَمْ يُبَالِ اللَّهُ فِي أَيِّ أَوْدِيَتِهَا هَلَكَ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: ئەگەر زانایان پارێزگارییان لە زانست بکردایە و لەلای ئەهلی خۆی دایاننابا و پێیان دابان، ئەوە سەروەری سەردەمی خۆیان دەبوون، بەڵام ئەوانەی بە زایەیاندا لەلای ئەهلی دونیا تەنها بۆ ئەوەی دونیای پێ بەدەست بهێنن، بۆیە خوا ڕیسوا و سووکی کردن و، دونیای بەسەردا زاڵکردن، گوێم لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس خەمەکانی بکات بە یەک خەم و ئەویش خەمی دواڕۆژی بێ، ئەوە خوا خەمی دونیای لەسەر لادەبات و خوای بەسە، وە هەر کەس خەمەکانی زۆربن و هەر خەمی دونیای بێت، ئەوە خوا بەلایەوە گرینگ نیە و لە هەر شیوێک لە شیوەکانی دونیا بە هیلاک چووبێ.

**٢٥٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ طَلَبَ الْعِلْمَ لِغَيْرِ اللَّهِ، أَوْ أَرَادَ بِهِ غَيْرَ اللَّهِ، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[2].

---

(١) ضعيف إلا المرفوع منه فهو حسن.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٦٥٥.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بۆ غەیری خوا فێری زانست ببێ، یان مەبەستی پێ غەیری خوا بێ، با شوێنی خۆی ئامادە بکات لە ئاگر.

٢٥٩- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا تَعَلَّمُوا الْعِلْمَ لِتُبَاهُوا بِهِ الْعُلَمَاءَ، أَوْ لِتُمَارُوا بِهِ السُّفَهَاءَ، أَوْ لِتَصْرِفُوا وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيْكُمْ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَهُوَ فِي النَّارِ»[١].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: زانست بۆ ئەوە فێرمەبن کە شانازی پێبکەن بەسەر زانایاندا، یان مشت و مڕی پێبکەن لەگەڵ کاڵفام و نەزانان، یان بتانەوێ بەو زانستە سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆتان ڕابکێشن، هەر کەس ئەو کارە بکات، ئەوە لە نێو ئاگردایە.

٢٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ لِيُبَاهِيَ بِهِ الْعُلَمَاءَ، وَيُجَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ، وَيَصْرِفَ بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيْهِ، أَدْخَلَهُ اللَّهُ جَهَنَّمَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس زانست بۆ ئەوە فێر بێت کە شانازی بەسەر زانایاندا بکات و موناقەشەی پێبکات لەگەڵ کاڵفام و نەزانان و، بیەوێ سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، خوا دەیخاتە دۆزەخەوە.

## بابەت: ئەو کەسەی پرسیاری زانستێکی لێدەکرێ و دەیشارێتەوە

٢٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ رَجُلٍ يَحْفَظُ عِلْمًا فَيَكْتُمُهُ، إِلَّا أُتِيَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلْجَمًا بِلِجَامٍ مِنَ النَّارِ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ پیاوێک نیە کە زانستێک بزانێ و بیشارێتەوە (بۆ ئەوەی کەس سوودی لێنەبینێ)، مسۆگەر لە ڕۆژی دواییدا دەهێنرێ لە کاتێکدا کە لغاو کراوە بە لغاوێکی ئاگرین.

---

(١) حسن.

(٢) حسن.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٦٥٨، والترمذي: ٢٦٤٩.

٢٦٢- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ الْأَعْرَجِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: وَاللَّهِ، لَوْلَا آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى مَا حَدَّثْتُ عَنْهُ، يَعْنِي عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، شَيْئًا أَبَدًا، لَوْلَا قَوْلُ اللَّهِ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴿١٧٤﴾ ﴾ البقرة، إِلَى آخِرِ الْآيَتَيْنِ[1].

واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی هورموزی ئەعرەج دەگێڕێتەوە، کە گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بووە دەیگوت: سوێند بە خوا، ئەگەر ئەو دوو ئایەتەی کتێبی خوا نەبان هەرگیز هیچ شتێکم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەدەگێڕایەوە، ئەگەر خوا نەیفەرمووبا: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴿١٧٤﴾ ﴾ البقرة، واتە: بێگومان ئەوانەی ئەو ئایەتانە دەشارنەوە کە خودا ناردونیەتە خوارەوە لە تەورات، تا کۆتایی دوو ئایەتەکە.

٢٦٣- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا لَعَنَ آخِرُ هَذِهِ الْأُمَّةِ أَوَّلَهَا، فَمَنْ كَتَمَ حَدِيثًا فَقَدْ كَتَمَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ»[2].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک کۆتایی ئەم ئوممەتە نەفرینی کرد لە سەرەتاکەی ئەم ئوممەتە (بە هۆی نەزانینەوە قەدری هاوەڵان و پێشینانی خۆیان نەگرت و جنێویان پێدان)، وە لەوکاتەشدا زانایان زانستەکەیان بشارنەوەو فەرموودەکان بە خەڵک نەگەیەنن، ئەوە ئەوانە لەو کەسانەن کە وەحی خوایان شاردۆتەوە.

٢٦٤- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ أُلْجِمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ»[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس پرسیاری زانستێکی لێبکرێ و ئەویش بیشارێتەوە و نەیڵێت ئەوا لە ڕۆژی دواییدا لغاو دەکرێ بە لغاوێکی ئاگرین.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٨ و ٢٣٥٠ و ٧٣٥٤، ومسلم: ٢٤٩٢.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح.

٢٦٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَتَمَ عِلْمًا مِمَّا يَنْفَعُ اللَّهُ بِهِ فِي أَمْرِ النَّاسِ أَمْرِ الدِّينِ، أَلْجَمَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنَ النَّارِ»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس زانستێک لەو زانستانە بشارێتەوە کە خوا بە هۆیەوە سوود بە خەڵک دەگەیەنێ لە کار و باری ئایینداریانەوە، ئەوە خوا لە ڕۆژی دوایدا لغاوی دەکات بە لغاوێکی ئاگرین.

٢٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ يَعْلَمُهُ فَكَتَمَهُ، أُلْجِمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ»[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس پرسیاری زانستێکی لێبکرێ و ئەویش بیزانێ و بشارێتەوە، لە ڕۆژی دواییدا لغاو دەکرێ بە لغاوێکی ئاگرین.

* * *

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٥٨، والترمذي: ٢٦٤٩.

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی ئەو ئەندازە ئاوەی هاتووە کە گونجاوە بۆ دەستنوێژ و خۆ شوشتن لە لەشگرانی

**٢٦٧-** عَنْ سَفِينَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ، وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ»[١].

واتە: سەفینە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە مشتێک ئاو دەستنوێژی دەگرت، وە بە ساعێک (چوار مشت ئاو) خۆی دەشوشت.

**٢٦٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ، وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە مستێک ئاو دەستنوێژی دەگرت، وە بە ساعێک (چوار مشت ئاو) خۆی دەشوشت.

**٢٦٩-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «كَانَ يَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ، وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ»[٣].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە مستێک ئاو دەستنوێژی دەگرت، وە بە ساعێک (چوار مشت ئاو) خۆی دەشوشت.

**٢٧٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُجْزِئُ مِنَ الْوُضُوءِ مُدٌّ، وَمِنَ الْغُسْلِ صَاعٌ» فَقَالَ رَجُلٌ: لَا يُجْزِئُنَا، فَقَالَ: قَدْ كَانَ يُجْزِئُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ، وَأَكْثَرُ شَعَرًا، يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ[٤].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب لە باوکی، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستنوێژ گرتن بە مستێک ئاو دروستە و بەسە، وە بۆ خۆ شوشتنیش چوار مشت، پیاوێک گوتی: ئێمە بەشمان ناکات! ئەویش گوتی: کەسێک بەشی دەکات کە لە تۆ باشترە و مووشی زیاتر و پڕترە لە تۆ، واتە: پێغەمبەر ﷺ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٢٦، والترمذي: ٥٦.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٩٢، والنسائي: ٣٤٦ و ٣٤٧.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٩٣.

(٤) صحيح.

## بابەت: نوێژێک کە بەبێ دەستنوێژی بکرێ خوای گەورە وەری ناگرێ

**٢٧١-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ عُمَيْرٍ الْهُذَلِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةً إِلَّا بِطُهُورٍ، وَلَا يَقْبَلُ صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ»[1].

واتە: ئوسامەی کوڕی عومەیری هوزەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا هیچ نوێژێک وەرناگرێ کە بەبێ دەستنوێژ کرابێ، وە هیچ بەخشینێکیش وەرناگرێ کە بە ماڵی دزیاری و حەرام کرابێ.

**٢٧١م-** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ سَعِيدٍ، وَشَبَابَةُ بْنُ سَوَّارٍ، عَنْ شُعْبَةَ نَحْوَهُ[2].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٢٧٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةً إِلَّا بِطُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ»[3].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا هیچ نوێژێک وەرناگرێ کە بەبێ دەستنوێژ کرابێ، وە هیچ بەخشینێکیش وەرناگرێ کە بە ماڵی دزیاری و حەرام کرابێ.

**٢٧٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ»[4].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا هیچ نوێژێک وەرناگرێ کە بەبێ دەستنوێژ کرابێ، وە هیچ بەخشینێکیش وەرناگرێ کە بە ماڵی دزیاری و حەرام کرابێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٩، والنسائي: ١٣٩ و ٢٥٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٩، والنسائي: ١٣٩ و ٢٥٢٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٤، والترمذي: ١.

(٤) صحيح.

**٢٧٤-** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ»[١].

واتە: ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا هیچ نوێژێک وەرناگرێ کە بەبێ دەستنوێژ کرابێ، وە هیچ بەخشینێکیش وەرناگرێ کە بە ماڵی دزیاری و حەرام کرابێ.

## بابەت: کلیلی نوێژ دەستنوێژە

**٢٧٥-** عَنْ مُحَمَّدِ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ»[٢].

واتە: موحەممەدی کوڕی حەنەفییە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کلیلی هەر نوێژێک دەستنوێژهەڵگرتنە، وە قەدەغەکردنی ئەو شتانەی کە حەرامە لە نوێژدا دەکرێ تەکبیرو نوێژ دابەستنە، وە حەڵاڵ کردنی ئەو شتانەی لە نوێژدا قەدەغەبوون بە سەلام دانەوە دەبێ.

**٢٧٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ»[٣].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کلیلی هەر نوێژێک دەستنوێژهەڵگرتنە، وە قەدەغەکردنی ئەو شتانەی کە حەرامە لە نوێژدا دەکرێ تەکبیرو نوێژ دابەستنە، وە حەڵاڵ کردنی ئەو شتانەی لە نوێژدا قەدەغەبوون بە سەلام دانەوە دەبێ.

---

(١) صحيح.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٦١ و ٦١٨، والترمذي: ٣.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٣٨.



## بابەت: پارێزگاری کردن لە دەستنوێژ بە بەردەوامی

**٢٧٧-** عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَقِيمُوا، وَلَنْ تُحْصُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ خَيْرَ أَعْمَالِكُمُ الصَّلَاةَ، وَلَا يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلَّا مُؤْمِنٌ»(١).

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (شوێنی ڕاستی بکەون)و بەردەوام بن، بێگومان ناشتوانن (دەستتان لە هەموو چاکەیەک هەبێ)، بشزانن کە نوێژ باشترینی کارەکانتانە، وە هیچ کەس پارێزگاری لە دەست بەدەستنوێژی ناکات جگە لە بڕوادار.

**٢٧٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَقِيمُوا، وَلَنْ تُحْصُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَعْمَالِكُمُ الصَّلَاةَ، وَلَا يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلَّا مُؤْمِنٌ»(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (شوێنی ڕاستی بکەون)و بەردەوام بن، بێگومان ناشتوانن (دەستتان لە هەموو چاکەیەک هەبێ)، بشزانن کە نوێژ باشترینی کارەکانتانە، وە هیچ کەس پارێزگاری لە دەست بەدەستنوێژی ناکات جگە لە بڕوادار.

**٢٧٩-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، يَرْفَعُ الْحَدِيثَ قَالَ: «اسْتَقِيمُوا، وَنِعِمَّا إِنِ اسْتَقَمْتُمْ، وَخَيْرُ أَعْمَالِكُمُ الصَّلَاةُ، وَلَا يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلَّا مُؤْمِنٌ»(٣).

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ ئەم فەرموودەیەی بەرزکردەوە (بۆ پێغەمبەر ﷺ) کە فەرموویەتی: (شوێنی ڕاستی بکەون)و بەردەوام بن، وە چەند چاک دەبوو کە بەردەوامیتان هەبووایە، وە باشترینی کارەکانتان بریتیە لە نوێژ، وە هیچ کەس پارێزگاری لە دەست بەدەستنوێژی ناکات جگە لە بڕوادار.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح بشواهده.

## بابەت: ئەوەی کە دەستنوێژ نیوەی ئیمانە (یان بەشێکە لە ئیمان)

٢٨٠- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ مِلْءُ الْمِيزَانِ، وَالتَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ مِلْءُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالزَّكَاةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَائِعٌ نَفْسَهُ، فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا»[١].

واتە: ئەبو مالیکی ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جوان دەستنوێژ شوشتن نیوەی نوێژە (لێرە مەبەست لە ئیمان نوێژە)، وە «الحمد لله» تەرازوو پڕ دەکات، وە «سبحان الله والله أكبر» خێریان بە ئەندازەی پڕی ئاسمانەکان و زەوییە، وە نوێژ ڕووناکییە، وە زەکات دان بەڵگەیە (بۆ بڕواداریی)و، خۆڕاگریی ڕۆشناییە، وە قورئان بەڵگەیە بۆت (ئەگەر کاری پێبکەی)، یان بەڵگەیە لەسەرت (ئەگەر کاری پێنەکەی) هەموو مرۆڤەکان بەیانی دەکەنەوە و تێدەکۆشن و کاردەکەن و نەفسی خۆیان ماندوو دەکەن بە تێکۆشان، جا هەیانە نەفسی خۆی (بە خوا) دەفرۆشێ، ئازادی دەکات، یان بە هیلاکی دەبات.

## بابەت: پاداشتی دەستنوێژ و دەستنوێژ گرتن

٢٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَوَضَّأَ، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ، لَا يَنْهَزُهُ إِلَّا الصَّلَاةُ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً، إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ ﷻ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً، حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دڵنیابن هەر یەکێک لە ئێوە کاتێک دەستنوێژێکی ڕێک و جوان دەشوات، پاشان دێتە مزگەوت، هیچ شتێک پاڵی نەدا تەنها هاتن بێ بۆ نوێژ، ئەوە هیچ هەنگاوێک نانێ، مەگەر بەو هەنگاوە خوا پلەیەک بەرزی دەکاتەوە، وە گوناهێکی لێدەسڕێتەوە، تاکو دەچێتە مزگەوتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٣، والترمذي: ٣٥١٧، والنسائي: ٢٤٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٧، ومسلم بإثر: ٦٦١، وأبو داود: ٥٥٩، والترمذي: ٦٠٣.

**٢٨٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ الصُّنَابِحِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ فِيهِ وَأَنْفِهِ، فَإِذَا غَسَلَ وَجْهَهُ خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ وَجْهِهِ، حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَشْفَارِ عَيْنَيْهِ، فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ يَدَيْهِ، فَإِذَا مَسَحَ بِرَأْسِهِ خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ رَأْسِهِ، حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ أُذُنَيْهِ، فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ رِجْلَيْهِ، حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِ رِجْلَيْهِ، وَكَانَتْ صَلَاتُهُ وَمَشْيُهُ إِلَى الْمَسْجِدِ نَافِلَةً»[١].

واتە: عەبدوڵڵای صونابیحی ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دەستنوێژ بشوات، ئاو لە دەمی وەربکات و ئاو لە لووتی ڕابدات، گوناهەکانی لە دەم و لووتی دەردەچن، وە کاتێک ڕوخساری دەشوات گوناهەکانی لە ڕوخساری دەردەچن، هەتا لە ژێر پێڵوە چاوەکانیشی، وە کاتێک دەستەکانی دەشوات گوناهەکانی بە دەستەکانیدا دەردەچن، وە کاتێک سەری مەسح دەکات گوناهەکانی لەسەری دەردەچن هەتا لە گوێکانیشیەوە دەردەچن، وە کاتێک پێیەکانی دەشوات گوناهەکانی لە پێیەکانییەوە دەردەچن هەتا لە ژێر نینۆکی پێیەکانیەوە دەردەچن، وە ڕۆیشتنی بۆ نوێژ لە مزگەوت بەخێر و چاکەی زیادە دەمێننەوە.

**٢٨٣-** عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا تَوَضَّأَ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ، خَرَّتْ خَطَايَاهُ مِنْ يَدَيْهِ، فَإِذَا غَسَلَ وَجْهَهُ خَرَّتْ خَطَايَاهُ مِنْ وَجْهِهِ، فَإِذَا غَسَلَ ذِرَاعَيْهِ وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، خَرَّتْ خَطَايَاهُ مِنْ ذِرَاعَيْهِ وَرَأْسِهِ، فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ، خَرَّتْ خَطَايَاهُ مِنْ رِجْلَيْهِ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی عەبەسە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک بەندە دەستنوێژی هەڵگرت و دەستەکانی شوشت، گوناهەکانی لە دەستییەوە دەکەونە خوارێ، وە ئەگەر ڕوخساری شوشت، گوناهەکانی لە ڕوخساری دەکەونە خوارێ، وە کاتێک باسک و مەچەکی دەشوات و مەسحی سەری دەکات، گوناهەکانی لە باسکی و لەسەری دەکەونە خوارێ، وەکاتێک پێیەکانی دەشوات گوناهەکانی لە پێیەکانی دەکەونە خوارێ.

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ١٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٣٢.




**٢٨٤**- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ تَعْرِفُ مَنْ لَمْ تَرَ مِنْ أُمَّتِكَ؟ قَالَ: «غُرٌّ مُحَجَّلُونَ بُلْقٌ مِنْ آثَارِ الْوُضُوءِ» قَالَ أَبُو الْحَسَنِ الْقَطَّانُ: حَدَّثَنَا أَبُو حَاتِمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، فَذَكَرَ مِثْلَهُ[١].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوانەی کە نەتبینون لە ئوممەتەکەت چۆن دەیانناسییەوە؟ فەرمووی: ناوچاوانیان سپییە (دەدرەوشێتەوە)، دەست و پێیەکانیان سپین، بە هۆی شوێنەواری دەستنوێژیانەوە.

**٢٨٥**- عَنْ حُمْرَانُ، مَوْلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ قَاعِدًا فِي الْمَقَاعِدِ، فَدَعَا بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي مَقْعَدِي هَذَا، تَوَضَّأَ مِثْلَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ مِثْلَ وُضُوئِي هَذَا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ» وَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَلَا تَغْتَرُّوا»[٢].

واتە: حومڕان، کە مەولای عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بووە دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەفانم بینی دانیشتبوو لەو شوێنە (شوێنی دەستنوێژ شوشتن) داوای ئاوی دەستنوێژی کرد و دەستنوێژی هەڵگرت، پاشان گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەو شوێنەی من دەستنوێژی هەڵگرت، وەک دەستنوێژەکەی من، پاشان فەرمووی: هەر کەس وەک دەستنوێژەکەی من دەستنوێژ هەڵبگرێ، ئەوە خوا لە گوناهی ڕابردووی خۆشدەبێ. وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بەو مژدەیەی من) مەغرور و کەمتەرخەم مەبن (واتە: گوناهو تاوان مەکەن و بڵێین: بە ئاوی دەستنوێژ دەڕوات).

**٢٨٥م**- حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عَمَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْحَمِيدِ بْنُ حَبِيبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي عِيسَى بْنُ طَلْحَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي حُمْرَانُ، عَنْ عُثْمَانَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، نَحْوَهُ[٣].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٣٣، ومسلم: ٢٢٦.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٦ و ١٠٧ و ١٠٩.

## بابەت: سیواک

٢٨٦- عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَتَهَجَّدُ، يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ»[١].

واتە: حوزەیفە ﵁ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستاوە بۆ شەونوێژ، سیواکی دەکرد و بەدەم و ددانیدا دەهێنا.

٢٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لەسەر ئوممەتەکەم گران نەبووایە، ئەوە فەرمانم پێدەکردن کە لەکاتی هەر نوێژێکدا سیواک بکەن.

٢٨٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُصَلِّي بِاللَّيْلِ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ فَيَسْتَاكُ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوانە دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی دەکرد و، لە دوای هەر دوو ڕکاتێک کە سەلامی دەدایەوەو سیواکی دەکرد.

٢٨٩- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تَسَوَّكُوا؛ فَإِنَّ السِّوَاكَ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ، مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ، مَا جَاءَنِي جِبْرِيلُ إِلَّا أَوْصَانِي بِالسِّوَاكِ، حَتَّى لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ يُفْرَضَ عَلَيَّ وَعَلَى أُمَّتِي، وَلَوْلَا أَنِّي أَخَافُ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لَفَرَضْتُهُ لَهُمْ، وَإِنِّي لَأَسْتَاكُ حَتَّى لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ أُحْفِيَ مَقَادِمَ فَمِي»[٤].

واتە: ئەبو ئەمامە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سیواک بکەن، چونکە بەڕاستی سیواک پاک کەرەوەیە بۆ دەم، جێگای ڕەزامەندی خوایە، هەر کاتێک جیبریل هاتبێ بۆ لام حەتمەن وەسیەتی بۆ کردووم کە سیواک بکەم، هەتا

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٥ و ٨٨٩ و ١١٣٦، ومسلم: ٢٥٥، وأبو داود: ٥٥، والنسائي: ٢ و ١٦٢١_١٦٢٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٨٧، ومسلم: ٢٥٢، وأبو داود: ٤٦، والترمذي: ٢٢، والنسائي: ٧ و ٥٣٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٥٦.

(٤) ضعيف.

بەجۆرێک ترسام کە پێویست بکرێ لەسەر خۆم و ئوممەتەکەم، وە ئەگەر ترسی ئەوەم نەبێ کە دەبێتە بارگرانی لەسەر ئوممەتم ئەوە لەسەرم پێویست دەکردن، وە من بەردەوام سیواک دەکەم بە جۆرێک دەترسم کە ددانەکانی پێشەوەم دەربێنم (مەبەست پێی زۆر سیواک کردنە).

**٢٩٠- عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَ: قُلْتُ: أَخْبِرِينِي بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَبْدَأُ إِذَا دَخَلَ عَلَيْكِ؟ قَالَتْ: «كَانَ إِذَا دَخَلَ يَبْدَأُ بِالسِّوَاكِ»**[١].

واتە: میقدامی کوڕی شورەیحی کوڕی هانیئ، لە باوکی دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: بە عائیشەم ﵂ وت: هەواڵم بدەرێ پێغەمبەر ﷺ کە دەهاتەوە بۆ ماڵەوە بە چ شتێک دەستی پێدەکرد؟ ئەویش گوتی: کاتێ دەهاتە ماڵەوە، بە سیواک کردن دەستی پێدەکرد.

**٢٩١- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁، قَالَ: «إِنَّ أَفْوَاهَكُمْ طُرُقٌ لِلْقُرْآنِ، فَطَيِّبُوهَا بِالسِّوَاكِ»**[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﵁ دەڵێ: بێگومان لە ڕێگای دەمتانەوە قورئان دەخوێنن، کەواتە پاکی بکەنەوەو (پاک ڕایبگرن) بە هۆی سیواک کردنەوە.

## بابەت: سروشتی پاک (فیترەت)

**٢٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « الْفِطْرَةُ خَمْسٌ، أَوْ خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: الْخِتَانُ، وَالِاسْتِحْدَادُ، وَتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ»**[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ئەو ئاکارانەی کە ڕەوشت و سوننەتی پێغەمبەرانن، یان: پێنج ئاکار هەیە کە لە سوننەتی پێغەمبەرانن: خەتەنەکردن و، لابردن و تاشینی مووی داوێن (بە موس، یان هەر شتێکی دی)و، نینۆک کردن و، هەڵکێشانی مووی بن باڵ، وە کورت کردنەوەی سمێڵ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٥٣، وأبو داود: ٥١، والنسائي: ٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٨٩، ومسلم: ٢٥٧، وأبو داود: ٤١٩٨، والترمذي: ٢٧٥٦، والنسائي: ١٠ و ١١ و ٥٢٢٥.

**٢٩٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَالِاسْتِنْشَاقُ بِالْمَاءِ، وَقَصُّ الْأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ» يَعْنِي الِاسْتِنْجَاءَ، قَالَ: زَكَرِيَّا، قَالَ: مُصْعَبٌ، وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ، «إِلَّا أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ»[1].

**واتە:** عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دە ئاکار لە سوننەتی پێغەمبەرانن: کورتکردنەوەی سمێڵ و، هێشتنەوەی ڕیش و، سیواک کردن و، ئاو لە لوت ڕادان و، کورتکردنەوەی نینۆک و، شوشتنی ئەو شوێنانەی کە چڵکیان تێدا کۆدەبێتەوە، وە هەڵکێشانی مووی بن باڵ و، تاشینی مووی داوێن و، تارەت گرتن (خۆپاککردنەوە دوای سەرئاوکردن)، زەکەریا دەڵێ: موصعەب گوتی: دەیەمم لە بیرچۆتەوە ئەگەر ئاو لەدەم ڕادان نەبێ.

**٢٩٤-** عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مِنَ الْفِطْرَةِ، الْمَضْمَضَةُ، وَالِاسْتِنْشَاقُ، وَالسِّوَاكُ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَالِاسْتِحْدَادُ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَالِانْتِضَاحُ، وَالِاخْتِتَانُ»[2].

**واتە:** عەممارِی کوڕی یاسر ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە سوننەت و ئاکاری (پێغەمبەرانن:) ئاو لەدەم وەردان و، ئاو لە لوت ڕادان و، سیواک کردن و، سمێڵ کورتکردنەوە و، نینۆک کردن و، هەڵکێشانی مووی بن باڵ و، تاشینی مووی داوێن و، شوشتنی ئەو شوێنانەی کە چڵکیان تێدا کۆدەبێتەوە و، پرژاندنی ئاو (لە دوای دەستنوێژ) بەسەر عەوڕەتدا (بۆ ئەوەی دوور بێ لە وەسوەسە)، خەتەنەکردن.

**٢٩٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: «وُقِّتَ لَنَا فِي قَصِّ الشَّارِبِ، وَحَلْقِ الْعَانَةِ، وَنَتْفِ الْإِبْطِ، وَتَقْلِيمِ الْأَظْفَارِ، أَنْ لَا نَتْرُكَ أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦١، وأبو داود: ٥٣، والترمذي: ٢٧٥٧، والنسائي: ٥٠٤٠.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٥٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٥٨، وأبو داود: ٤٢٠٠، والترمذي: ٢٧٥٩، والنسائي: ١٤.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئێمە کاتمان بۆ دیاریکراوە بۆ کورتکردنەوەی سمێڵ و، تاشینی مووی داوێن و، هەڵکێشانی مووی بن باڵ و، نینۆک کردن، کە زیاتر لە چل شەو لێیان نەگەڕێین (واتە: بییانکەین).

### بابەت: ئەوەی کە کەسێک دەچێتە سەرئاو چی دەڵێ

٢٩٦- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ هَذِهِ الْحُشُوشَ مُحْتَضَرَةٌ، فَإِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ»[1].

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەو شوێنانەی سەرئاوکردن جێگای جنۆکەکانن، بۆیە هەرکات یەکێکتان چوو بۆ سەرئاوکردن با بڵێ: خوایە پەنات پێدەگرم لە جنۆکەی نێر و مێ.

٢٩٦م- حَدَّثَنَا جَمِيلُ بْنُ الْحَسَنِ الْعَتَكِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى بْنُ عَبْدِ الْأَعْلَى قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ ﷺ، ح وَحَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ ﷺ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ عَوْفٍ الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[2].

واتە: بەم سەنەدەش هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٢٩٧- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سِتْرُ مَا بَيْنَ الْجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ إِذَا دَخَلَ الْكَنِيفَ أَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللَّهِ»[3].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەردەی نێوان جنۆکە و داوێنی نەوەی ئادەم کاتێک دەچێتە سەرئاو ئەوەیە کە بڵێ: «بسم الله»، واتە: بە ناوی خوا.

٢٩٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ، قَالَ: «أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦.

(٣) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٦٠٦.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٢، ومسلم: ٣٧٥، وأبو داود: ٤ و ٥، والترمذي: ٥ و ٦، والنسائي: ١٩.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەچوو بۆ سەرئاو، دەیفەرموو: پەنا دەگرم بە خوا لە خراپەی جنۆکەی نێر و مێ.

**٢٩٩-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَعْجِزْ أَحَدُكُمْ إِذَا دَخَلَ مِرْفَقَهُ أَنْ يَقُولَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الرِّجْسِ النَّجِسِ، الْخَبِيثِ الْمُخْبِثِ، الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ».

قَالَ أَبُو الْحَسَنِ: وَحَدَّثَنَا أَبُو حَاتِمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَقُلْ فِي حَدِيثِهِ: مِنَ الرِّجْسِ النَّجِسِ، إِنَّمَا قَالَ: مِنَ الْخَبِيثِ الْمُخْبِثِ، الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ[1].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێکتان دەچێتە سەرئاو با ئەوە لەبیر نەکات کە بڵێ: خوایە پەنات پێدەگرم لە پیسێکی زۆر قێزەون، لە پیسێکی پیسکەر، کە شەیتانی دوورخراوەیە لە بەزەیی خوا.

ئەبو حەسەن گوتوویەتی: ئەبو حاتیم بۆی گێڕاینەوەو گوتی: کوڕی ئەبو مەڕیەم بۆی گێڕاینەوەو هەمان شتی باسکرد، لە فەرموودەکەدا نەیگوت: پیسێکی زۆر قێزەون، تەنیا گوتی: لە پیسێکی پیسکەر، کە شەیتانی دوورخراوەیە لە بەزەیی خوا.

## بابەت: ئەوەی کە کەسێک لە سەرئاو دەردەچێ چی دەڵێ

**٣٠٠-** عَنْ يُوسُفُ بْنُ أَبِي بُرْدَةَ، سَمِعْتُ أَبِي ﷺ يَقُولُ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ، فَسَمِعْتُهَا تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْغَائِطِ قَالَ: «غُفْرَانَكَ»[2].

واتە: یوسوفی کوڕی ئەبو بوڕدە دەڵێ: گوێم لە باوکم ﷺ بوو دەیگوت: چووم بۆ لای عائیشە، جا گوێم لێبوو دەیگوت: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرئاو دەهاتە دەرەوە، دەیفەرموو: خوایە داوای لێ خۆشبونت لێدەکەم.

**٣٠١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْخَلَاءِ، قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنِّي الْأَذَى وَعَافَانِي»[3].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٠، والترمذي: ٧.

(٣) ضعيف.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە سەرئاو دەهاتە دەرەوە، دەیفەرموو: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئازار و ناڕەحەتی لەسەر لابردم و لەشساغی و تەندروستی پێبەخشیم.

## بابەت: هێنانی ناوی خوا ﷻ لە سەرئاو، وە بردنی ئەنگوستیلە بۆ سەرئاو

**٣٠٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «كَانَ يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ»[١].**

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو حاڵەتێکدا یادی خوای دەکرد.

**٣٠٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «كَانَ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ وَضَعَ خَاتَمَهُ»[٢].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک دەچووە سەرئاو ئەنگوستیلەکەی دادەنا.

## بابەت: ناپەسەندی سەرئاوکردن لەسەر گەرماو (حەمام)

**٣٠٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي مُسْتَحَمِّهِ، فَإِنَّ عَامَّةَ الْوَسْوَاسِ مِنْهُ»**

قَالَ: أَبُو عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَاجَةَ: سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ مُحَمَّدٍ الطَّنَافِسِيَّ، يَقُولُ: إِنَّمَا هَذَا فِي الْحَفِيرَةِ، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَلَا، فَمُغْتَسَلَاتُهُمُ الْجِصُّ، وَالصَّارُوجُ، وَالْقِيرُ، فَإِذَا بَالَ فَأَرْسَلَ عَلَيْهِ الْمَاءَ، لَا بَأْسَ بِهِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با کەستان لە شوێنی خۆشۆردن میز نەکات (تارەت نەگرێ)، چونکە زۆربەی وەسوەسە لەوێوەیە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٧٣، وأبو داود: ١٨، والترمذي: ٣٣٨٤.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩، والترمذي: ١٧٤٦، والنسائي: ٥٢١٣.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٧، والترمذي: ٢١، والنسائي: ٣٦.

ئەبو عەبدوڵڵا ئیبنو ماجە گوتی: گوێم لە عەلی کوڕی موحەممەدی تەنافیسی بوو، دەیگوت: ئەوە بۆ شوێنێک بووە کە گڵ و چاڵ بووەو، خۆ لێ پاراستنی قورس بووە، بەڵام ئەمڕۆ وانیە، چونکە زۆربەی شوێنی خۆشوشتنەکان لە گەچ و قسڵ و قیرە، واتە: هەرکات میزیش بکات و ئاوی بەسەردا بکات، کێشەی نیە.

## بابەت: میزکردن بە پێوە

٣٠٥- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «أَتَى سُبَاطَةَ قَوْمٍ، فَبَالَ عَلَيْهَا قَائِمًا»[١].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە سەر زبڵدانێک (سەرگوێلکێک) کە تایبەت بوو بە هۆزێک و لەوێ بە پێوە (بە وەستانەوە) میزی کرد.

٣٠٦- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَتَى سُبَاطَةَ قَوْمٍ، فَبَالَ قَائِمًا» قَالَ شُعْبَةُ: قَالَ عَاصِمٌ يوْمئذٍ، وَهَذَا الْأَعْمَشُ، يَرْوِيهِ عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذيْفةَ، وَمَا حَفِظَهُ، فَسَأَلْتُ عَنْهُ مَنْصُورًا، فَحَدَّثَنِيهِ عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَتَى سُبَاطَةَ قوْمٍ، فَبَالَ قَائِمًا»[٢].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە سەر زبڵدانێک (سەرگوێلکێک) کە تایبەت بوو بە هۆزێک و لەوێ بەپێوە (بە وەستانەوە) میزی کرد. شوعبە دەڵێ: ئەو ڕۆژە عاصیمم بینی گوتی: ئەوە ئەعمەشە کە لە ئەبو وائیلەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە حوزەیفەوە، وە وەک خۆی لەبەری نەکردوە، بۆیە پرسیارم لە مەنصوڕ کرد دەربارەی، ئەویش لە ئەبو وائیلەوە لە حوزەیفەوە بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە سەر زبڵدانێک (سەرگوێلکێک) کە تایبەت بوو بە قەومێک و لەوێ بەپێوە (بە وەستانەوە) میزی کرد.

## بابەت: میزکردن بە دانیشتنەوە

٣٠٧- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «مَنْ حَدَّثَكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَالَ قَائِمًا فَلَا تُصَدِّقْهُ، أَنَا رَأَيْتُهُ يَبُولُ قَاعِدًا»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٤، ومسلم: ٢٧٣، وأبو داود: ٢٣، والترمذي: ١٣، والنسائي: ١٨ و ٢٦ و ٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٤، ومسلم: ٢٧٣.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٢، والنسائي: ٢٩.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هەر کەسێک هەواڵی پێدای کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێوە میزی کردوە، بەڕاستی دامەنێ، من پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە دانیشتنەوە میزی دەکرد.

**٣٠٨-** عَنْ عُمَرَ ﵁، قَالَ: رَآنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا أَبُولُ قَائِمًا، فَقَالَ: «يَا عُمَرُ لَا تَبُلْ قَائِمًا» فَمَا بُلْتُ قَائِمًا بَعْدُ[1].

واتە: عومەر ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ منی بینی بە پێوە میزم دەکرد، جا فەرمووی: ئەی عومەر بەپێوە میز مەکە. ئیتر بەپێوە میزم نەکردوە لەوکاتەوە.

**٣٠٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبُولَ قَائِمًا» سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ يَزِيدَ أَبَا عَبْدِ اللَّهِ، يَقُولُ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيَّ، يَقُولُ: قَالَ: سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ فِي حَدِيثِ عَائِشَةَ.: أَنَا رَأَيْتُهُ يَبُولُ قَاعِدًا قَالَ: الرَّجُلُ أَعْلَمُ بِهَذَا مِنْهَا قَالَ أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَكَانَ مِنْ شَأْنِ الْعَرَبِ الْبَوْلُ قَائِمًا، أَلَا تَرَاهُ فِي حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ابْنِ حَسَنَةَ، يَقُولُ: «قَعَدَ يَبُولُ كَمَا تَبُولُ الْمَرْأَةُ»[2].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە بەپێوە میز بکرێ. گوێم لە موحەممەدی کوڕی یەزید ئەبو عەبدوڵڵا بوو، دەیگوت: گوێم لە ئەحمەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی مەخزومی بوو دەیگوت: سوفیانی سەوری دەربارەی فەرموودەکەی عائیشە کە دەگێڕنەوە، گوتوویەتی: ((من بینیومە بە دانیشتنەوە میزی کردوە)) گوتی: پیاو لەو بابەتانە شارەزاترە لەو (مەبەست عائیشەیە)، ئەحمەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان گوتی: ئەوە نەریتی عەڕەب بووە کە بەپێوە میز بکەن، ئایا نابینی لە فەرموودەی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حەسەنە، کە گوتوویەتی: دانیشت بۆ میزکردن، هەروەکو چۆن ئافرەت دادەنیشێ بۆ میزکردن.

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي تعليقاً بإثر: ١٢.

(٢) ضعيف جداً.

## بابەت: ناپەسەندی دەستدان لە عەورەت
## بە دەستی ڕاست و پاککردنەوەی

٣١٠- عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلَا يَسْتَنْجِ بِيَمِينِهِ»(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: باوکم هەواڵی پێدام کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوویەتی دەیفەرموو: ئەگەر یەکێک لە ئێوە میزی کرد با دەستی ڕاستی لە داوێنی نەدا (و نەیگرێ)، وە بە دەستی ڕاستی خۆی پاک نەکاتەوە.

٣١٠م- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَوْزَاعِيُّ، بِإِسْنَادِهِ، نَحْوَهُ(٢).

واتە: ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.

٣١١- عَنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ، يَقُولُ: «مَا تَغَنَّيْتُ، وَلَا تَمَنَّيْتُ، وَلَا مَسِسْتُ ذَكَرِي بِيَمِينِي مُنْذُ بَايَعْتُ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ»(٣).

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەیگوت: گۆرانیم نەگوتووەو درۆم نەکردوە، وە دەستی ڕاستم لە داوێنی خۆم نەداوە لەوکاتەوەی کە بەو دەستە پەیمانم بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە.

٣١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اسْتَطَابَ أَحَدُكُمْ، فَلَا يَسْتَطِبْ بِيَمِينِهِ، لِيَسْتَنْجِ بِشِمَالِهِ»(٤).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان خۆی پاک کردەوە (دوای سەرئاو کردن)، با بە دەستی ڕاستی خۆی پاک نەکاتەوە، بەڵکو با بە دەستی چەپی خۆی پاک بکاتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٣، ومسلم: ٢٦٧، وأبو داود: ٣١، والترمذي: ١٥، والنسائي: ٢٤ و ٢٥ و ٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٣، ومسلم: ٢٦٧، وأبو داود: ٣١، والترمذي: ١٥، والنسائي: ٢٤ و ٢٥ و ٤٧.

(٣) ضعيف جداً.

(٤) حسن. أخرجه أبو داود: ٨، والنسائي: ٤٠.

## بابەت: خۆپاککردنەوە لە سەرئاو بە بەرد، وە قەدەغەکردن بە پاشەڕۆی ماڵات و ئێسکی ڕزیو (یان هەر ئێسکێک)

٣١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ مِثْلُ الْوَالِدِ لِوَلَدِهِ، أُعَلِّمُكُمْ، إِذَا أَتَيْتُمُ الْغَائِطَ فَلَا تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ، وَلَا تَسْتَدْبِرُوهَا، وَأَمَرَ بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ. وَنَهَى عَنِ الرَّوْثِ، وَالرِّمَّةِ، وَنَهَى أَنْ يَسْتَطِيبَ الرَّجُلُ بِيَمِينِهِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من بۆ ئێوە وەکو باوکێک وام بۆ منداڵەکەی، فێرتان دەکەم، کاتێک چوون بۆ سەرئاو ڕووەو قیبلە سەرئاو مەکەن و، پشتیشی تێمەکەن، وە فەرمانی کرد کە بە سێ بەرد خۆ پاک بکەنەوە، وە قەدەغەی کرد کە بە پاشەڕۆی ماڵات (پشقل، تەپاڵە) و ئێسکی ڕزیو خۆ پاک بکەنەوە، وە هەروەها قەدەغەی کردوە کە پیاو بە دەستی ڕاستی خۆی پاک بکاتەوە.

٣١٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَى الْخَلَاءَ فَقَالَ: «ائْتِنِي بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ» فَأَتَيْتُهُ بِحَجَرَيْنِ وَرَوْثَةٍ، فَأَخَذَ الْحَجَرَيْنِ وَأَلْقَى الرَّوْثَةَ، وَقَالَ: «هِيَ رِجْسٌ»[2].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ سەرئاو، ئنجا فەرمووی: سێ بەردم بۆ بێنە، منیش دوو بەرد و تەپاڵەیەکم بۆ هێنا، جا دوو بەردەکەی لێوەرگرتم و تەپاڵەکەی فڕێداو، فەرمووی: ئەوە پیسە.

٣١٥- عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فِي الِاسْتِنْجَاءِ ثَلَاثَةُ أَحْجَارٍ، لَيْسَ فِيهَا رَجِيعٌ»[3].

واتە: خوزەیمەی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ خۆپاک کردنەوە (دوای سەرئاوکردن) دەبێ سێ بەرد بەکاربهێنرێ، وە نابێت پشقل، یان هەر شتێکی تری وێنەی ئەوە بەکاربهێنرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٥ مختصراً، وأبو داود: ٨، والنسائي: ٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٦، والترمذي: ١٧، والنسائي: ٤٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١.

**٣١٦-** عَنْ سَلْمَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ: لَهُ بَعْضُ الْمُشْرِكِينَ، وَهُمْ يَسْتَهْزِئُونَ بِهِ: إِنِّي أَرَى صَاحِبَكُمْ يُعَلِّمُكُمْ كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى الْخِرَاءَةِ قَالَ: «أَجَلْ، أَمَرَنَا أَنْ لَا نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ، وَلَا نَسْتَنْجِيَ بِأَيْمَانِنَا، وَلَا نَكْتَفِيَ بِدُونِ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ، لَيْسَ فِيهَا رَجِيعٌ وَلَا عَظْمٌ»[١].

واتە: سەلمان ﷺ گوتوویەتی: یەکێک لە هاوبەشدانەرەکان بە گاڵتەپێکردنەوە پێی گوت: دەبینم هاوڕێکەتان هەموو شتێکتان فێردەکات، تەنانەت سەرئاوکردنیش، گوتی: بەڵێ، فەرمانی پێکردووین کە ڕوو لە قیبلە نەکەین، وە بە دەستی ڕاست خۆمان پاک نەکەینەوە، وە هەروەها کەمتر لە سێ بەرد بەکارنەهێنین، وە نابێ پشقل و تەپاڵە و ئێسک بەکاربێنین.

## بابەت: قەدەغەکردنی ڕووکردنە قیبلە لەکاتی سەرئاوکردندا

**٣١٧-** عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ الزُّبَيْدِيَّ ﷺ، يَقُولُ: أَنَا أَوَّلُ مَنْ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ» وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ حَدَّثَ النَّاسَ بِذَلِكَ[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی جەزئی زوبەیدی ﷺ گوتوویەتی: من یەکەم کەسم کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەیفەرموو: هیچ یەکێکتان ڕووە و قیبلە میز مەکەن. وە من یەکەم کەس بووم کە ئەوەم بۆ خەڵکی گێڕایەوە.

**٣١٨-** عَنْ أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الَّذِي يَذْهَبُ إِلَى الْغَائِطِ الْقِبْلَةَ» وَقَالَ: «شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا»[٣].

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاریی ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە ئەو کەسەی دەچێتە سەرئاو ڕوو لە قیبلە بکات. وە فەرموویەتی: ڕوو لە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا بکەن.

**٣١٩-** عَنْ مَعْقِلِ بْنِ أَبِي مَعْقِلٍ الْأَسَدِيَّ ﷺ، وَقَدْ صَحِبَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَتَيْنِ بِغَائِطٍ أَوْ بِبَوْلٍ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٢، وأبو داود: ٧، والترمذي: ١٦، والنسائي: ٤١ و ٤٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٤، ومسلم: ٢٦٤، وأبو داود: ٩، والترمذي: ٨، والنسائي: ٢٠ و ٢١ و ٢٢.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٠.

واتە: مەعقیلی کوڕی ئەبو مەعقیلی ئەسەدی ﷺ کە هاوەڵی پێغەمبەری ﷺ کردوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە کاتی سەرئاوکردندا ڕوو بکەینە دوو قیبلەکە (کەعبە و بیت المقدس).

٣٢٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ، أَنَّهُ شَهِدَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ «نَهَى أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ بِغَائِطٍ أَوْ بِبَوْلٍ»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئەبو سەعیدی خودری بۆی گێڕامەوە، کە گەواهیدا لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ: کە قەدەغەی کردوە لە کاتی سەرئاوکردن، یان لە کاتی میزکردن ڕووبکەینە قیبلە.

٣٢١- عَنْ أَبَا سعيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ، يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «نَهَانِي أَنْ أَشْرَبَ قَائِمًا، وَأَنْ أَبُولَ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی قەدەغە کردم بە پێوە ئاو بخۆمەوەو، ڕووەو قیبلەش میز بکەم.

## بابەت: مۆڵەتی سەرئاوکردن ڕووەو قیبلە لە سەرئاو وە ڕێپێدانی جگە لە دەشت و دەر

٣٢٢- عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: يَقُولُ أُنَاسٌ: إِذَا قَعَدْتَ لِلْغَائِطِ فَلَا تَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ، وَلَقَدْ ظَهَرْتُ ذَاتَ يَوْمٍ مِنَ الْأَيَّامِ عَلَى ظَهْرِ بَيْتِنَا، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «قَاعِدًا عَلَى لَبِنَتَيْنِ، مُسْتَقْبِلَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ» هَذَا حَدِيثُ يَزِيدَ بْنِ هَارُونَ[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتوویەتی: خەڵکانێک دەڵێن: ئەگەر بۆ سەرئاو کردن دانیشتی ڕوو لە قیبلە مەکە، لە کاتێکدا کە خۆم ڕۆژێک سەرکەوتمە سەربانی خانووی خۆمانەوە بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر دوو خشت دانیشتبوو ڕووەو بیت المقدس. ئەوە فەرموودەی یەزیدی کوڕی هاڕوونە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٥، ومسلم: ٢٦٦، وأبو داود: ١٢، والترمذي: ١١، والنسائي: ٢٣.

**٣٢٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: فِي كَنِيفِهِ، مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، قَالَ عِيسَى: فَقُلْتُ ذَلِكَ لِلشَّعْبِيِّ، فَقَالَ: صَدَقَ ابْنُ عُمَرَ، وَصَدَقَ أَبُو هُرَيْرَةَ أَمَّا قَوْلُ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَقَالَ: «فِي الصَّحْرَاءِ، لَا يَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ، وَلَا يَسْتَدْبِرْهَا». وَأَمَّا قَوْلُ ابْنِ عُمَرَ، فَإِنَّ الْكَنِيفَ لَيْسَ فِيهِ قِبْلَةٌ، اسْتَقْبِلْ فِيهِ حَيْثُ شِئْتَ[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ئاودەستەکەی خۆیدا ڕووەو قیبلە، عیسا دەڵێ: ئەوەم بە شەعبی گوت، ئەویش گوتی: ئیبنو عومەر ڕاستی گوتوە، وە ئەبو هورەیرەش ڕاستی گوتوە، ئەبو هورەیرە گوتوویەتی: لە دەشت و بیاباندا ڕوو لە قیبلە ناکات، وە پشتیشی لێ ناکات (لە کاتی سەرئاوکردندا). وە بۆ قسەکەی ئیبنو عومەریش، بەڕاستی ئاودەستی ناو ماڵ قیبلەی تێدانیە (واتە: ئەو حوکمە نایگرێتەوە)، بۆیە هەر لایەکت ویست ڕوو لەوێ بکە.

**٣٢٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَوْمٌ يَكْرَهُونَ أَنْ يَسْتَقْبِلُوا بِفُرُوجِهِمُ الْقِبْلَةَ، فَقَالَ: «أُرَاهُمْ قَدْ فَعَلُوهَا، اسْتَقْبِلُوا بِمَقْعَدَتِي الْقِبْلَةَ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: لای پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کۆمەڵێک کرا کە حەزناکەن لە کاتی سەرئاو کردندا ڕوو لە قیبلە بکەن، ئەویش فەرمووی: وادەزانم کە وایان کردوە، بۆیە ڕووی سەرئاوەکەم لە قیبلە بکەن.

**٣٢٥-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ بِبَوْلٍ، فَرَأَيْتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْبَضَ بِعَامٍ يَسْتَقْبِلُهَا»[3].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد کە بۆ میزکردن ڕووبکەینە قیبلە، وە من ساڵێک پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات بینیم کە ڕووەو قیبلە سەرئاوی کرد.

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) حسن لغيره.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ١٣، والترمذي: ٩.

## بابەت: خۆپاککردنەوە لەدوای میزکردن

٣٢٦- عَنْ عِيسَى بْنِ يَزْدَادَ الْيَمَانِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلْيَنْتُرْ ذَكَرَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[1].

واتە: عیسای کوڕی یەزدادی یەمانی لە باوکی دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان میزی کرد سێ جار دەست بێنێ بە داوێنیدا.

## بابەت: ئەو کەسەی کە میزبکات و ئاو بەکارنەهێنێ

٣٢٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ يَبُولُ، فَاتَّبَعَهُ عُمَرُ بِمَاءٍ، فَقَالَ: «مَا هَذَا يَا عُمَرُ؟» قَالَ: مَاءٌ، قَالَ: «مَا أُمِرْتُ كُلَّمَا بُلْتُ أَنْ أَتَوَضَّأَ، وَلَوْ فَعَلْتُ لَكَانَتْ سُنَّةً»[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ میزکردن، جا عومەر بە دوای کەوت و ئاوی بۆ برد، ئەویش فەرمووی: ئەوە چییە ئەی عومەر؟ گوتی: ئاوە، فەرمووی: فەرمانم پێنەکراوە هەرکات سەرئاوم کرد دەستنوێژ بشۆم، ئەگەر وابکەم دەبێتە واجب و پێویست (لەسەر ئوممەتەکەم) یان سوننەتێک (ی تەرک نەکراو).

## بابەت: قەدەغەکردنی سەرئاوکردن لەسەر ڕێگا

٣٢٨- عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْحِمْيَرِيَّ، حَدَّثَهُ، قَالَ: كَانَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ ﵁ يَتَحَدَّثُ بِمَا لَمْ يَسْمَعْ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَيَسْكُتُ عَمَّا سَمِعُوا، فَبَلَغَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو ﵄، مَا يَتَحَدَّثُ بِهِ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ هَذَا، وَأَوْشَكَ مُعَاذٌ أَنْ يَفْتِنَكُمْ فِي الْخَلَاءِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ مُعَاذًا، فَلَقِيَهُ، فَقَالَ مُعَاذٌ: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو إِنَّ التَّكْذِيبَ بِحَدِيثٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نِفَاقٌ، وَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى مَنْ قَالَهُ، لَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اتَّقُوا الْمَلَاعِنَ الثَّلَاثَ: الْبَرَازَ فِي الْمَوَارِدِ، وَالظِّلِّ، وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ»[3].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٢.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٦.

واتە: حەیوەی کوڕی شوڕەیح دەگێڕێتەوە کە ئەبو سەعیدی حیمیەری بۆی گێڕاوەتەوەو گووتویەتی: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ ئەو فەرموودانەی دەگێڕایەوە کە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیانبیستبوو، وە ئەوەی کە ئەوان بیستبوویان و پێیان گەیشتبوو نەیدەگێڕایەوە، ئەوەشی (کە موعاز فەرمووده گەلێک دەگێڕێتەوە کە مەشهور و بڵاونین لای هاوەڵان) گەیشتەوە بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ، ئەویش گوتی: سوێند بە خوا من ئەوەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبیستووە، وە گومانی ئەوەم هەیە کە نزیکە موعاز کاری سەرئاوکردنتان لەلا قورس بکات. جا ئەوە گەیشتەوە بە موعاز، ئەویش گەیشت بە ئیبنو عومەر و گوتی: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر درۆ هەڵبەستن بە زمانی پێغەمبەری خوا ﷺ کاری دووڕووەکانە و تاوانەکەشی بۆ ئەو کەسەیە کە هەڵیدەبەستێ، بێگومان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە کە دەیفەرموو: خۆتان بپارێزن لەو سێ شوێنەی کە دەبنە هۆی نەفرەت لێکردن: سەرئاوکردن لە جۆگاو ئەو شوێنانەی کە ئاویان پێدا دەڕوات، هەروەها ئەو شوێنانەی کە سێبەرن و خەڵکی لێیان دەحەسێنەوە، وە هەروەها (سەرئاوکردن) لە ناوەڕاتسی ڕێگا.

**٣٢٩-** عَن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالتَّعْرِيسَ عَلَى جَوَادِّ الطَّرِيقِ، وَالصَّلَاةَ عَلَيْهَا، فَإِنَّهَا مَأْوَى الْحَيَّاتِ وَالسِّبَاعِ، وَقَضَاءَ الْحَاجَةِ عَلَيْهَا، فَإِنَّهَا مِنَ الْمَلَاعِنِ»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە بارگە و بنەخستن و شەو مانەوە لەسەر ڕێگا و نوێژکردن لێی، چونکە ئەوە شوێنی حەوانەوەی مار و دڕندەیە، وە خۆتان بپارێزن لە سەرئاوکردن لەو شوێنە، چونکە (ئەوەی ئەو کارە بکات) دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی نەفرەتی بۆ بنێرن.

**٣٣٠-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «نَهَى أَنْ يُصَلَّى عَلَى قَارِعَةِ الطَّرِيقِ، أَوْ يُضْرَبَ الْخَلَاءُ عَلَيْهَا، أَوْ يُبَالَ فِيهَا»[2].

واتە: سالیم لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لەسەر چەقی ڕێگا نوێژ بکرێ، یان سەرئاوی لێ دروست بکرێ، یان میزی لێ بکرێ.

---

(١) حسن دون قوله: «وَالصَّلَاةَ عَلَيْهَا».

(٢) ضعيف.

## بابەت: دوورکەوتنەوە بۆ سەرئاوکردن لە دەشت و دەردا

**٣٣١-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا ذَهَبَ الْمَذْهَبَ أَبْعَدَ»[١].

واتە: موغەیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێک دەچووە سەرئاو دوور دەکەوتەوە (لە پێش چاوی خەڵکی، ئەمە ئەوکاتە بوو، هێشتا شوێنی سەرئاوکردن دروست نەکرابوو).

**٣٣٢-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: «كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ فَتَنَحَّى لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ جَاءَ فَدَعَا بِوَضُوءٍ، فَتَوَضَّأَ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم، جا دوورکەوتەوەو خۆی پەنادا بۆ سەرئاوکردن، پاشان هات داوای ئاوی دەستنوێژی کرد و دەستنوێژی هەڵگرت.

**٣٣٣-** عَنْ يَعْلَى بْنِ مُرَّةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «كَانَ إِذَا ذَهَبَ إِلَى الْغَائِطِ أَبْعَدَ»[٣].

واتە: یەعلای کوڕی موڕڕە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک دەچوو بۆ سەرئاو دووردەکەوتەوە.

**٣٣٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي قُرَادٍ ﷺ، قَالَ: حَجَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ «فَذَهَبَ لِحَاجَتِهِ فَأَبْعَدَ»[٤].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو قوڕاد ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ حەجم کرد، جا چوو بۆ سەرئاوکردن و دوورکەوتەوە.

**٣٣٥-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لَا يَأْتِي الْبَرَازَ حَتَّى يَتَغَيَّبَ فَلَا يُرَى»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١، والترمذي: ٢٠، والنسائي: ١٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه النسائي: ١٦.

(٥) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢.

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ سەفەرێک، وە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرئاوی نەدەکرد تاوەکو لە چاوی خەڵک ون دەبوو و نەدەبینرا.

٣٣٦- عَنْ بِلَالِ بْنِ الْحَارِثِ الْمُزَنِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ إِذَا أَرَادَ الْحَاجَةَ أَبْعَدَ»[١].

واتە: بیلالی کوڕی حاریسی موزەنی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ویستبای سەرئاو بکات دووردەکەوتەوە.

## بابەت: دەستنیشان کردنی شوێنێک بۆ سەرئاوکردن

٣٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ، مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَحْسَنَ، وَمَنْ لَا فَلَا حَرَجَ، وَمَنْ تَخَلَّلَ فَلْيَلْفِظْ، وَمَنْ لَاكَ فَلْيَبْتَلِعْ، مَنْ فَعَلَ ذَاكَ فَقَدْ أَحْسَنَ، وَمَنْ لَا فَلَا حَرَجَ. وَمَنْ أَتَى الْخَلَاءَ فَلْيَسْتَتِرْ. فَإِنْ لَمْ يَجِدْ إِلَّا كَثِيبًا مِنْ رَمْلٍ فَلْيَمْدُدْهُ عَلَيْهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَلْعَبُ بِمَقَاعِدِ ابْنِ آدَمَ. مَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَحْسَنَ، وَمَنْ لَا فَلَا حَرَجَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە بەرد خۆی پاک کردەوە با ژمارەی بەردەکان تاک بێت، ئەوەی ئاوا بکات بەڕاستی کارێکی باشی کردوە، وە ئەوەشی وا نەکات کێشە نیە، وە هەر کەسێک بە چیلکەیەک (پارچە دارێک) ددانەکانی پاک کردەوە با دواتر تفی بکاتەوە، وە ئەوەی بە زمانی ددانەکانی پاک کردەوە با دواتر قوتی بداتەوە، ئەوەی ئاوا بکات بەڕاستی کارێکی باشی کردوە، وە ئەوەشی وا نەکات کێشە نیە، وە هەر کەسێک چوو بۆ سەرئاو با خۆی بشارێتەوە، وە ئەگەر هیچی دەست نەکەوت با بە خۆڵ گردۆلکەیەک دروست بکات و خۆی لە پشتی حەشار بدات، چونکە بەڕاستی شەیتان گاڵتە بە پاشەڵی (عەورەتی) مرۆڤ دەکات. ئەوەی ئاوا بکات ئیشێکی باشی کردوە، وە ئەوەشی وا نەکات کێشە نیە.

٣٣٨- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْن عُمَرَ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ الصَّبَّاحِ بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ. وَزَادَ فِيهِ «وَمَنِ اكْتَحَلَ فَلْيُوتِرْ، مَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَحْسَنَ، وَمَنْ لَا فَلَا حَرَجَ، وَمَنْ لَاكَ فَلْيَبْتَلِعْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٥.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٥.

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عومەر ﷺ گوتوویەتی: عەبدولمەلیکی کوڕی صەبباح بە ئیسنادی خۆی هەمان شتی بۆ گێڕاینەوە. وە ئەوەی لێ زیاد کرد، هەر کەسێک کلی کردە چاوی با تاک بێت، ئەوەی ئاوا بکات بەڕاستی کارێکی باشی کردوە، وە ئەوەشی وا نەکات کێشە نیە، وە هەرکەسێک بە زمانی ددانەکانی پاک کردەوە با دواتر قوتی بداتەوە.

**٣٣٩-** عَنْ يَعْلَى بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأَرَادَ أَنْ يَقْضِيَ حَاجَتَهُ، فَقَالَ لِي: «ائْتِ تِلْكَ الْأَشَاءَتَيْنِ - قَالَ: وَكِيعٌ: يَعْنِي النَّخْلَ الصِّغَارَ - فَقُلْ لَهُمَا: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُكُمَا أَنْ تَجْتَمِعَا» فَاجْتَمَعَتَا، فَاسْتَتَرَ بِهِمَا، فَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ قَالَ لِي «ائْتِهِمَا، فَقُلْ لَهُمَا: لِتَرْجِعْ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْكُمَا إِلَى مَكَانِهَا» فَقُلْتُ لَهُمَا. فَرَجَعَتَا[1].

واتە: یەعلای کوڕی موڕڕە لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم، جا (پێغەمبەر ﷺ) ویستی سەرئاو بکات، پێمی فەرموو: ئەو دوو دار خورما بچووکانە بێنە (بۆ ئەوەی خۆی لە پەنایاندا حەشار بدات) - وەکیع دەڵێ: «الأشاءتين» واتە: دارخورمای گچکە- جا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی پێیان بڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانتان پێدەکات کە بچنە پاڵ یەک و لە یەکتر نزیک ببنەوە، ئەوانیش کۆبوونەوە و (پێغەمبەر ﷺ) خۆی لە پەنایاندا حەشاردا و سەرئاوی کرد، پاشان پێمی فەرموو بیانهێنە و پێیان بڵێ: با هەر یەکێکیان بچێتەوە شوێنی خۆی، منیش پێم گوتن، ئەوانیش چوونەوە شوێنی خۆیان.

**٣٤٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ أَحَبَّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ لِحَاجَتِهِ، هَدَفٌ، أَوْ حَائِشُ نَخْلٍ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەڵێ: ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆشبوو لە کاتی سەرئاوکردندا خۆی لە پەنادا حەشار بدات، هەر شتێک بوو کە بەرز بێ، (وەک بینا یان تەپۆڵکە)، یان چڕی دارخورما بوو.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٤٢، وأبو داود: ٢٥٤٩.

**٣٤١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: «عَدَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الشِّعْبِ فَبَالَ، حَتَّى أَنِّي آوِي لَهُ مِنْ فَكِّ وَرِكَيْهِ حِينَ بَالَ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕێگایەکدا لایداو میزی کرد، هەتا خۆم یارمەتیم دا لە کردنەوەی پۆشاکەکانی لە کاتی سەرئاو کردنەکەیدا.

## بابەت: قەدەغەکردنی کۆبونەوە و قسەکردن لە سەرئاو

**٣٤٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ عَلَى غَائِطِهِمَا، يَنْظُرُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا إِلَى عَوْرَةِ صَاحِبِهِ، فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ يَمْقُتُ عَلَى ذَلِكَ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کاتی سەرئاوکردن نابێ دوو کەس قسە بەیەکەوە بکەن و، تەماشای عەورەتی یەکتر بکەن، چونکە بەو کارە خوای ﷻ لە خۆیان تورە دەکەن.

**٣٤٢ (م١)-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا سَلْمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الْوَرَّاقُ قَالَ: حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ هِلَالٍ، قَالَ: مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى وَهُوَ الصَّوَابُ[3].

واتە: بەم سەنەدەش هەمان فەرمودە گێڕدراوەتەوە.

**٣٤٢ (م٢)-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ عَمَّارٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ نَحْوَهُ[4].

واتە: بەم سەنەدەش هەمان فەرمودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: قەدەغەی میزکردن لە ئاوی ڕاوەستاودا

**٣٤٣-** عَنْ جَابِرٍ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ «نَهَى عَنْ أَنْ يُبَالَ فِي الْمَاءِ الرَّاكِدِ»[5].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٥.

(٣) ضعيف.

(٤) ضعيف.

(٥) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨١، والنسائي: ٣٥.

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە میز بکرێتە نێو ئاوی ڕاوەستاو.

٣٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الرَّاكِدِ»[1].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێک لە ئێوە لە ئاوی ڕاوەستاودا میز نەکات.

٣٤٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ النَّاقِعِ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێک لە ئێوە میز نەکاتە ناو ئاوێ کە بۆ بەکارهێنان دەشێ.

## بابەت: هەڕەشەی توند لەسەر خۆپاک نەکردنەوە لە میز

٣٤٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ابْنِ حَسَنَةَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَفِي يَدِهِ الدَّرَقَةُ، فَوَضَعَهَا ثُمَّ جَلَسَ، فَبَالَ إِلَيْهَا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: انْظُرُوا إِلَيْهِ، يَبُولُ كَمَا تَبُولُ الْمَرْأَةُ، فَسَمِعَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ «وَيْحَكَ أَمَا عَلِمْتَ مَا أَصَابَ صَاحِبَ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانُوا إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَوْلُ قَرَضُوهُ بِالْمَقَارِيضِ، فَنَهَاهُمْ عَنْ ذَلِكَ، فَعُذِّبَ فِي قَبْرِهِ»[3].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حەسەنە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان، وە مەتاڵیەکی بە دەستەوە بوو، لە پێشە خۆی دانا (بۆ خۆ پەنادان) پاشان دانیشت، بەرەو ڕووی مەتاڵەکە سەرئاوی کرد، جا یەکێکیان گوتی: تەماشای بکەن چۆن وەک ئافرەت دانیشتووەو میز دەکات! جا پێغەمبەر ﷺ گوێی لێبوو، وە فەرمووی: هاوار بۆ تۆ، ئایا نازانی کابرای بەنو ئیسرائیل چی بەسەر هات؟ جاران ئەگەر کەسێک لە بەنو ئیسرائیل میز بەر شوێنێکی پۆشاکەکەی کەوتبا، ئەو شوێنەی بە مەقەس دەبڕی (لێیدەکردەوە)، ئەویش قەدەغەی کردن لەو کارە (لە بڕینی پۆشاکەکە)، جا لەسەر ئەو کارە لە ناو گۆڕەکەی سزا درا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٩، ومسلم: ٢٨٢، وأبو داود: ٦٩، والترمذي: ٦٨، والنسائي: ٥٧ و ٥٨ و ٢٢١ و ٣٩٥ و ٣٩٨.

(٢) صحيح بلفظ: «الْماَءِ الدَّائِمِ».

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢، والنسائي: ٣٠.

**٣٤٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقَبْرَيْنِ جَدِيدَيْنِ، فَقَالَ: «إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَنْزِهُ مِنْ بَوْلِهِ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﭭ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای دوو گۆڕی تازەدا ڕۆیشت و فەرمووی: بەڕاستی ئەوانە سزا دەدرێن، وە لەسەر تاوانە گەورەکان سزا نادرێن، بەڵکو یەکێکیان لەبەر ئەوەی لە دوای سەرئاوکردن خۆی پاک نەدەکردەوە، ئەوەی دیکەیان دوو زمانی دەکرد سزا دەدرێن.

**٣٤٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَكْثَرُ عَذَابِ الْقَبْرِ مِنَ الْبَوْلِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زۆربەی سزای نێو گۆڕ لەسەر خۆپاک نەکردنەوەیە لە کاتی میزکردندا.

**٣٤٩-** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﭬ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ، بِقَبْرَيْنِ. فَقَالَ: «إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَيُعَذَّبُ فِي الْبَوْلِ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَيُعَذَّبُ فِي الْغِيبَةِ»[٣].

واتە: ئەبو بەکرە ﭬ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە لای دوو گۆڕیدا ڕۆیشت و فەرمووی: بەڕاستی وا هەردووکیان سزا دەدرێن، وە لەسەر گوناهی گەورە سزا نادرێن، یەکێکیان لەبەر ئەوەی لە کاتی میزکردن خۆی پاک نەدەکردەوە، وە ئەوەی دیکەیان لە پاشملە بە خراپە باسی خەڵکی دەکرد، سزا دەدرێن.

## بابەت: کەسێک کە سەرئاو دەکات و سەلامی لێدەکرێ

**٣٥٠-** عَنِ الْمُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذِ بْنِ عُمَيْرِ بْنِ جُدْعَانَ ﭬ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَتَوَضَّأُ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ السَّلَامَ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ وُضُوئِهِ، قَالَ: «إِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي مِنْ أَنْ أَرُدَّ عَلَيْكَ إِلَّا أَنِّي كُنْتُ عَلَى غَيْرِ وُضُوءٍ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٦، ومسلم: ٢٩٢، وأبو داود: ٢٠، والترمذي: ٧٠، والنسائي: ٣١ و ٢٠٦٨.

(٢) صحيح.

(٣) حسن.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧ مطولًا، والنسائي: ٣٨.

واتە: موهاجیری کوڕی قونفوزی کوڕی عومەیری کوڕی جودعانە ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی دەگرت، منیش سەلامم لێکرد، کەچی وەڵامی نەدامەوە، جا کاتێک لە دەستنوێژەکەی تەواو بوو، فەرمووی: بەڕاستی ئەوەی کە ڕێگەی لێگرتم وەڵامت بدەمەوە ئەوەبوو، کە حەزم نەکرد بەبێ دەستنوێژ وەڵامی سەلامەکەت بدەمەوە.

٣٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «مَرَّ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَبُولُ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ، فَلَمَّا فَرَغَ ضَرَبَ بِكَفَّيْهِ الْأَرْضَ، فَتَيَمَّمَ ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ»[1].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک بە لای پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشت، ئەویش میزی دەکرد، (پیاوەکە) سەلامی لێکرد، (پێغەمبەر ﷺ) وەڵامی نەدایەوە، کاتێک تەواوبوو هەردوو لەپی دەستی لە زەویدا، وە تەیەممومی کرد، پاشان وەڵامی سەلامەکەی دایەوە.

٣٥٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَجُلًا مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَبُولُ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَيْتَنِي عَلَى مِثْلِ هَذِهِ الْحَالَةِ، فَلَا تُسَلِّمْ عَلَيَّ، فَإِنَّكَ إِنْ فَعَلْتَ ذَلِكَ لَمْ أَرُدَّ عَلَيْكَ»[2].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێک بەلای پێغەمبەردا ﷺ ئەویش میزی دەکرد، (پیاوەکە) سەلامی لێکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: هەر کاتێک لەوبارەدا (بەو شێوەیە) منت بینی، ئەوە سەلامم لێمەکە، وە ئەگەر هاتوو سەلامیشت لێکردم، وەڵامت نادەمەوە.

٣٥٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «مَرَّ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَبُولُ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ»[3].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پیاوێک بەلای پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشت ئەویش میزی دەکرد، پیاوەکە سەلامی لێکرد، بەڵام (پێغەمبەری خوا ﷺ) وەڵامی نەدایەوە.

---

(١) صحيح بلفظ: «الْجِدَار» مكان «الْأَرْضِ».

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٧٠، وأبو داود: ١٦، والترمذي: ٩٠ و ٢٧٢٠، والنسائي: ٣٧.

## بابەت: خۆپاککردنەوە بە ئاو

**٣٥٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ مِنْ غَائِطٍ قَطُّ إِلَّا مَسَّ مَاءً»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هەرگیز نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرئاو دەربچێ و دەستی بە ئاو نەشوات.

**٣٥٥-** عَنْ أَبُو أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيُّ، وَجَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﵃، أَنَّ هَذِهِ الْآيَةَ نَزَلَتْ: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ التوبة، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَثْنَى عَلَيْكُمْ فِي الطُّهُورِ، فَمَا طُهُورُكُمْ؟» قَالُوا: نَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ، وَنَغْتَسِلُ مِنَ الْجَنَابَةِ، وَنَسْتَنْجِي بِالْمَاءِ. قَالَ: «فَهُوَ ذَاكَ، فَعَلَيْكُمُوهُ»[٢].

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری و جابیری کوڕی عەبدوڵلاو ئەنەسی کوڕی مالیک ﵃ دەگێڕنەوە کە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ التوبة، واتە: پیاوانێکی تێدایە پێیان خۆشە کە خۆیان خاوێن و پاک بکەنەوە (لە ژەنگ و ژاری سەردەمی نەفامی) خواش ئەوانەی خۆش دەوێت کە دەیانەوێت خۆیان پاک بکەنەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کۆمەڵەی پشتیوانان بەڕاستی خوا ستایشی ئێوەی کردوە لە پاکیەتیدا، ئایا ئەو پاک و خاوێنییەی ئێوە چییە؟ ئەوانیش گوتیان: دەستنوێژ دەگرین بۆ نوێژو، لە کاتی لەشگرانیشدا خۆمان دەشۆین، وە لە کاتی سەرئاوکردندا خۆمان بە ئاو پاک دەکەینەوە. فەرمووی: ئا ئەوەیە (کە خوا ستایشی کردوون لەسەری)، بۆیە لەسەری بەردەوام بن.

**٣٥٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يَغْسِلُ مَقْعَدَتَهُ ثَلَاثًا» قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَعَلْنَاهُ، فَوَجَدْنَاهُ دَوَاءً وَطُهُورًا»[٣].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ (دوای سەرئاوکردن) سێ جار خۆی دەشۆردەوە، ئیبنو عومەر دەڵێ: ئێمەش وامان دەکرد، بۆمان بوو بە دەرمان (لە نەخۆشی) وە بۆمان بوو بە مایەی پاکییەتی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.




٣٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَزَلَتْ فِي أَهْلِ قُبَاءٍ: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ (١٠٨)﴾ التوبة، قَالَ: «كَانُوا يَسْتَنْجُونَ بِالْمَاءِ، فَنَزَلَتْ فِيهِمْ هَذِهِ الْآيَةُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی خەڵکی قوباء دابەزی: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ (١٠٨)﴾ التوبة، واتە: پیاوانێکی تێدایە پێیان خۆشە کە خۆیان خاوێن و پاک بکەنەوە (لە ژەنگ و ژاری سەردەمی نەفامی) خواش ئەوانەی خۆش دەوێت کە دەیانەوێت خۆیان پاک بکەنەوە، فەرمووی: ئەوان لە کاتی سەرئاوکردندا خۆیان بە ئاو پاک دەکردەوە، جا بۆیە ئەو ئایەتە دەربارەیان دابەزی.

## بابەت: ئەو کەسەی کە دەست دێنێ بە زەویدا دوای خۆپاککردنەوە

٣٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «قَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ اسْتَنْجَى مِنْ تَوْرٍ، ثُمَّ دَلَكَ يَدَهُ بِالْأَرْضِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ سەرئاوی کرد، پاشان خۆی پاک کردەوە (بە ئاو) لە تاسێکدا یان لە جامێکدا کە لە مس دروستکرابوو، پاشان دەستی بە زەویدا هێنا.

**سەرنج:** دەست بە زەویدا هێنانەکەی بۆ زیادە پاکیەتی و بۆ نەهێشتنی هەر بۆنێکی ناخۆش بوو، وە مەبەستیشی فێرکردنی ئوممەتەکەی بووە.

٣٥٩- عَنْ إِبْرَاهِيمُ بْنُ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ «دَخَلَ الْغَيْضَةَ، فَقَضَى حَاجَتَهُ، فَأَتَاهُ جَرِيرٌ، بِإِدَاوَةٍ مِنْ مَاءٍ، فَاسْتَنْجَى مِنْهَا، وَمَسَحَ يَدَهُ بِالتُّرَابِ»[٣].

---

(١) صحيح بشواهده. أخرجه أبو داود: ٤٤، والترمذي: ٣١٠٠.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥، والنسائي: ٥٠.

(٣) حسن. أخرجه النسائي: ٥١.

واتە: ئیبراهیمی کوڕی جەریر لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو دارەڵێنێیک، ئنجا سەرئاوی کرد، جەریریش جامێک ئاوی بۆ هێنا، ئەویش بەو ئاوە تارەتی گرت، وە دەستی لە گڵ (خۆڵ) خشاند.

إِدَاوَة: جامێکە کە لە پێستە دروست دەکرێ. وەکو: کوندە.

الْغَيْضَة: دارەڵێنێیک یان دارستانێکی چڕ.

## بابەت: سەر داپۆشینی تاس و تەشتێ کە ئاوی تێدابێ

٣٦٠- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ نُوكِيَ أَسْقِيَتَنَا، وَنُغَطِّيَ آنِيَتَنَا»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردووین کە دەمی ئەو شتانە ببەستین کە ئاوی خواردنەوەی تێدەکەین، وە سەری قاپ و قاچاخیش (کە خواردنی تێدایە) داپپۆشین.

٣٦١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «كُنْتُ أَصْنَعُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَةَ آنِيَةٍ مِنَ اللَّيْلِ مُخَمَّرَةً، إِنَاءً لِطَهُورِهِ، وَإِنَاءً لِسِوَاكِهِ، وَإِنَاءً لِشَرَابِهِ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: لە شەودا سێ جامی سەرداپۆشراوم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ساز دەکرد، جامێک بۆ دەستنوێژەکەی، وە جامێک بۆ سیواکەکەی، وە جامێکیش بۆ ئەوەی ئاوی لێبخواتەوە.

٣٦٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَكِلُ طُهُورَهُ إِلَى أَحَدٍ، وَلَا صَدَقَتَهُ الَّتِي يَتَصَدَّقُ بِهَا، يَكُونُ هُوَ الَّذِي يَتَوَلَّاهَا بِنَفْسِهِ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە کەس نەدەکرد بۆ ئەوەی ئاوی دەستنوێژی لێبکات، وە بەخشینەکانی بە کەس نەدەسپارد، (بەڵکو) بۆ خۆی بەو کارە هەڵدەستا.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠١٢ و ٢٠١٤.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف جداً.

تێبینی: ئەمە مانای ئەوە نیە کە یارمەتی کەسی لەو کارانەدا قبووڵ نەکردوە، بەڵکو مانای ئەوەیە کە بە زۆری و لە زۆر حاڵەتدا تەنیا پشتی بە خۆی بەستووە.

## بابەت: شوشتنی ئەو قاپ و قاچاخەی کە سەگ دەمی تێناوە

**٣٦٣-** عَنْ أَبِي رَزِينٍ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَضْرِبُ جَبْهَتَهُ، بِيَدِهِ، وَيَقُولُ: يَا أَهْلَ الْعِرَاقِ أَنْتُمْ تَزْعُمُونَ أَنِّي أَكْذِبُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لِيَكُونَ، لَكُمُ الْمَهْنَأُ، وَعَلَيَّ الْإِثْمُ، أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ، فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ»[(١)].

واتە: ئەبو ڕەزین ﷺ دەڵێ: ئەبو هوڕەیرەم ﷺ بینی بە دەستی لە نێوچاوانی خۆی دەداو دەیگوت: ئەی خەڵکی عێراق ئێوە پێتان وایە کە من درۆ بە زمانی پێغەمبەری خواوە ﷺ هەڵدەبەستم، بۆ ئەوەی ئێوە کارئاسانیتان بۆ بکرێ و پاداشتی بۆ ئێوە بێت و گوناهەکەشی بۆ من بێت؟ گەواهی دەدەم بە دڵنیایی لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: هەر کاتێک سەگ دەمی خستە ناو قاپ و قاچاخی یەکێکتان، ئەوە دەبێ حەوت جار بیشوات.

**٣٦٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ، فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ»[(٢)].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک سەگ دەمی خستە ناو قاپ و قاچاخی یەکێکتان، با حەوت جار بیشواتەوە.

**٣٦٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُغَفَّلِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي الْإِنَاءِ، فَاغْسِلُوهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، وَعَفِّرُوهُ الثَّامِنَةَ بِالتُّرَابِ»[(٣)].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٢، ومسلم: ٢٧٩، وأبو داود: ٧١ و ٧٣، والنسائي: ٦٣ و ٦٤ و ٦٦ و ٣٣٥ و ٣٣٨ و ٣٣٩. وأخرجه الترمذي: ٩١ بقصة ولوغ الهرة المدرجه من كلام أبي هريرة.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٢، ومسلم: ٢٧٩، والنسائي: ٦٣.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٠، وأبو داود: ٧٤، والنسائي: ٦٧ و ٣٣٦ و ٣٣٧.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک سەگ دەمی خستە ناو قاپ و قاچاخی یەکێکتان، ئەوە دەبێ حەوت جار بیشوات، جاری هەشتەم لە گڵی هەڵبسوێ (قوڕی لەگەڵ بێت).

**٣٦٦**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ، فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک سەگ دەمی خستە ناو قاپ و قاچاخی یەکێکتان، ئەوە دەبێ حەوت جار بیشواتەوە.

## بابەت: دەستنوێژگرتن بە بەرماوەی پشیلە و، مۆڵەت لەو بوارەدا

**٣٦٧**- عَنْ كَبْشَةَ بِنْتِ كَعْبٍ ﷺ، وَكَانَتْ تَحْتَ بَعْضِ وَلَدِ أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّهَا صَبَّتْ لِأَبِي قَتَادَةَ مَاءً، يَتَوَضَّأُ بِهِ، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ تَشْرَبُ، فَأَصْغَى لَهَا الْإِنَاءَ، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا ابْنَةَ أَخِي أَتَعْجَبِينَ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، هِيَ مِنَ الطَّوَّافِينَ، أَوِ الطَّوَّافَاتِ»[٢].

واتە: کەبشەی کچی کەعب ﷺ کە لە ژێر (نیکاحی) یەکێک لە کوڕەکانی ئەبو قەتادە بوو، کەبشە ئاوی بە دەستی ئەبو قەتادەدا دەکرد بۆ دەستنوێژگرتن، جا پشیلەیەک هات و لێی خواردەوە (یان بۆ ئەوەی لێی بخواتەوە)، ئەبو قەتادەش جامەکەی خوار (لار) کردەوە (بۆ پشیلەکە)، (کەبشە دەڵێ:) منیش تەماشام دەکرد، ئەویش گوتی: ئەی کچی برام پێت سەیرە (کە جامەکە لار دەکەمەوە بۆ ئەوەی پشیلەکە لێی بخواتەوە)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی پشیلە پیس نیە، چونکە لەوانەیە کە لە دەورتان دێن و دەچن (واتە: خۆلێ پاراستنیان ئەستەمە، چونکە لەگەڵتان تێکەڵن).

**٣٦٨**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «كُنْتُ أَتَوَضَّأُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، قَدْ أَصَابَتْ مِنْهُ الْهِرَّةُ قَبْلَ ذَلِكَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٧٥، والترمذي: ٩٢، والنسائي: ٦٨.

(٣) صحيح.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ لە جامێکدا دەستنوێژمان دەگرت کە پێشتر پشیلە لێی خواردبوویەوە (واتە: پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی دەزانی، بەڵام پێی پیس نەبوو، بۆیە دەستنوێژی پێ شوشت).

٣٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْهِرَّةُ لَا تَقْطَعُ الصَّلَاةَ، لِأَنَّهَا مِنْ مَتَاعِ الْبَيْتِ»[(١)].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پشیلە نوێژ نابڕێ، چونکە لە کەل و پەل و پێداویستیماڵە.

## بابەت: مۆڵەتی دەستنوێژگرتن بەو ئاوەی کە زیادەو دەمێنێتەوە لەبەر ئافرەت

٣٧٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: اغْتَسَلَ بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ فِي جَفْنَةٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ، لِيَغْتَسِلَ، أَوْ يَتَوَضَّأَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي كُنْتُ جُنُبًا، فَقَالَ: «الْمَاءُ لَا يُجْنِبُ»[(٢)].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: یەکێک لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە تەشتێکدا خۆی شۆرد، جا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ئەوەی خۆی بشوات، یان دەستنوێژبگرێت، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لەشگران بووم، ئەویش فەرمووی: ئاو لەشگران نابێ (واتە: ئاو بەوە پیس نابێ).

٣٧١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، اغْتَسَلَتْ مِنْ جَنَابَةٍ، «فَتَوَضَّأَ وَاغْتَسَلَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ فَضْلِ وَضُوئِهَا»[(٣)].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە کە ژنێک لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ غوسڵی لەشگرانی لە خۆی دەرکرد، جا پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت و خۆی شۆرد لە پاشماوەی ئاوەکەی (واتە: ئەوەی کە لێی زیاد بووە).

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦٨، والترمذي: ٦٥، والنسائي: ٣٢٥.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦٨، والترمذي: ٦٥، والنسائي: ٣٢٥.

**٣٧٢-** عَنْ مَيْمُونَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «تَوَضَّأَ بِفَضْلِ غُسْلِهَا مِنَ الْجَنَابَةِ»[1].

**واتە:** مەیمونەی ﵂، خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت بە پاشماوەی ئەو ئاوەی کە (مەیمونە) لەکاتی لەشگرانی خۆی پێ شوشتبوو.

## بابەت: قەدەغەکردنی دەستنوێژگرتن بەو ئاوەی کە زیادەو دەمێنێتەوە لەبەر ئافرەت

**٣٧٣-** عَنِ الْحَكَمِ بْنِ عَمْرٍو ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «نَهَى أَنْ يَتَوَضَّأَ الرَّجُلُ بِفَضْلِ وَضُوءِ الْمَرْأَةِ»[2].

**واتە:** حەکەمی کوڕی عەمرِ ﵁ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد کە پیاو دەستنوێژ بگرێت بە پاشماوەی ئاوی دەستنوێژی ئافرەت.

**٣٧٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ ﵁، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنْ يَغْتَسِلَ الرَّجُلُ بِفَضْلِ وَضُوءِ الْمَرْأَةِ، وَالْمَرْأَةُ بِفَضْلِ الرَّجُلِ، وَلَكِنْ يَشْرَعَانِ جَمِيعًا». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَاجَةَ: الصَّحِيحُ هُوَ الْأَوَّلُ وَالثَّانِي وَهْمٌ[3].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد کە پیاو دەستنوێژ بگرێت بە پاشماوەی ئاوی دەستنوێژی ئافرەت، وە هەروەها ئافرەتیش بە پاشماوەی ئاوی دەستنوێژی پیاو، بەڵکو هەردووکیان بەیەکەوە دروستە. ئەبو عەبدوڵڵا ئیبنو ماجە دەڵێ: (فەرموودەی) یەکەمیان ڕاست و دروستە، وە (فەرموودەی) دووەمیان خەیاڵە (وەهمە).

**٣٧٥-** عَنْ عَلِيٍّ ﵁، قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَهْلُهُ يَغْتَسِلُونَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، وَلَا يَغْتَسِلُ أَحَدُهُمَا بِفَضْلِ صَاحِبِهِ»[4].

**واتە:** عەلی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ و خێزانەکانی لە یەک تەشتدا خۆیان دەشۆرد، وە هیچ یەکێکیان بە پاشماوەی ئاوی ئەوەی تریان خۆی نەدەشۆرد (واتە: بەیەکەوە خۆیان دەشۆرد).

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٢، والترمذي: ٦٤، والنسائي: ٣٤٣.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف.

## بابەت: ئەوەی کە ئافرەت و پیاو دەتوانن بە ئاوی یەک تەشت خۆیان بشۆن

**٣٧٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ»[١].

**واتە:** عائیشە ﵂ دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەک تەشتدا خۆمان دەشۆرد.

**٣٧٧-** عَنْ مَيْمُونَةَ ﵂، قَالَتْ: «كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ»[٢].

**واتە:** مەیمونە ﵂ دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەک تەشتدا خۆمان دەشۆرد.

**٣٧٨-** عَنْ أُمِّ هَانِئٍ ﵂، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اغْتَسَلَ وَمَيْمُونَةَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ فِي قَصْعَةٍ فِيهَا أَثَرُ الْعَجِينِ»[٣].

**واتە:** ئوممو هانیئ ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ و مەیمونەی خێزانی لە تەشتێکدا خۆیان شۆرد کە شوێنەواری هەویری پێوەبوو.

**٣٧٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَزْوَاجُهُ يَغْتَسِلُونَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ»[٤].

**واتە:** جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ و خێزانەکانی لە یەک تەشتدا خۆیان دەشۆرد.

**٣٨٠-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، «أَنَّهَا كَانَتْ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَغْتَسِلَانِ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ»[٥].

**واتە:** ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە کە ئەو و پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەک تەشتدا خۆیان دەشۆرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٠، ومسلم: ٣١٩ و ٣٢١ و ٣٣١، وأبو داود: ٧٧ و ٢٣٨، والترمذي: 1755 الشرط الأول، والنسائي: ٢٣١ و ٢٣٥ و ٢٣٩ و ٤١٠ و ٤١٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٣، ومسلم: ٣٢٢، والترمذي: ٦٢، والنسائي: ٢٣٦.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٤٠.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٢ و ١٩٢٩، ومسلم: ٢٩٦ و ٣٢٤.

## بابەت: ئەوەی کە پیاو و ئافرەت بە ئاوی یەک تەشت یان قاپ دەستنوێژ دەشۆن

٣٨١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: «كَانَ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَتَوَضَّئُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوان و ئافرەتان لە یەک تەشتدا دەستنوێژیان دەشۆرد.

٣٨٢- عَنْ أُمِّ صُبَيَّةَ الْجُهَنِيَّةِ ﵂، قَالَتْ: «رُبَّمَا اخْتَلَفَتْ يَدِي وَيَدُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْوُضُوءِ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ».

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَاجَةَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: أُمُّ صُبَيَّةَ هِيَ خَوْلَةُ بِنْتُ قَيْسٍ، فَذَكَرْتُ لِأَبِي زُرْعَةَ فَقَالَ: صَدَقَ[٢].

واتە: ئوممو صوبەیەی جوهەنیی ﵂ دەڵێ: لەوانەیە هەندێجار کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژمان دەشۆرد لە یەک تەشتدا، جارێک ئەو دەستی دێنا و، جارێکیش من.

ئەبو عەبدوڵڵا ئیبنو ماجە گوتی: گوێم لە موحەممەد بوو دەیگوت: ئوممو صوبەیە خەولەی کچی قەیسە، ئەوەم بۆ ئەبو زورعە باسکرد، ئەویش گوتی: ڕاستی گوتووە.

٣٨٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «أَنَّهُمَا كَانَا يَتَوَضَّآنِ جَمِيعًا لِلصَّلَاةِ»[٣].

واتە: عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە هەردووکیان بەیەکەوە دەستنوێژیان دەشۆرد بۆ نوێژ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٣، وأبو داود: ٧٩، والنسائي: ٧١ و ٣٤٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٧٨.

(٣) صحيح.

## بابەت: دەستنوێژ شوشتن بە خۆشاو (شەربەت)

**٣٨٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُ لَيْلَةَ الْجِنِّ «عِنْدَكَ طَهُورٌ» قَالَ: لَا، إِلَّا شَيْءٌ مِنْ نَبِيذٍ فِي إِدَاوَةٍ، قَالَ: «تَمْرَةٌ طَيِّبَةٌ، وَمَاءٌ طَهُورٌ» فَتَوَضَّأَ هَذَا حَدِيثُ وَكِيعٍ[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە کە شەوی جنۆکەکان (ئەو شەوەی کە جنۆکەکان وەکو نوێنەر هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ)، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئاوی پاکت چنگ دەکەویٚ؟ گوتی: نەخێر، جگە لە کەمێک خۆشاو کە لە تاس (جام)ێکدایە، فەرمووی: خورما پاکەو، ئاویش پاک و پاک کەرەوەیە، ئنجا دەستنوێژی پیٚ شۆرد (واتە: دەستنوێژگرتن بە خۆشاو یانی: شەربەتی خورما، دروستە). ئا ئەو فەرموودەیە لە وەکیعەوەیە.

**٣٨٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِابْنِ مَسْعُودٍ، لَيْلَةَ الْجِنِّ: «مَعَكَ مَاءٌ؟» قَالَ: لَا. إِلَّا نَبِيذًا فِي سَطِيحَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَمْرَةٌ طَيِّبَةٌ وَمَاءٌ طَهُورٌ، صُبَّ عَلَيَّ». قَالَ: فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ، فَتَوَضَّأَ بِهِ[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە لە شەوی جنۆکەکاندا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیبنو مەسعوودی فەرموو: ئایا ئاوی پاکت چنگ دەکەویٚ؟ گوتی: نەخێر، جگە لە کەمێک خۆشاو کە لە کوندەیەکدایە، فەرمووی: خورما پاکە و، ئاویش پاک و پاک کەرەوەیە، ئاو بە دەستمدا بکە. گوتی: منیش ئاوم بە دەستی داکردو دەستنوێژی پیٚ شۆرد.

## بابەت: دەستنوێژ شوشتن بە ئاوی دەریا

**٣٨٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ، وَنَحْمِلُ مَعَنَا الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِهِ عَطِشْنَا، أَفَنَتَوَضَّأُ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ»[3].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٨٤، والترمذي: ٨٨.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٣، والترمذي: ٦٩، والنسائي: ٥٩ و ٣٣٢ و ٤٣٥٠.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە کاتێک بە دەریادا گەشت دەکەین، بڕێکی کەم ئاو لەگەڵ خۆمان هەڵدەگرین، جا ئەگەر دەستنوێژی پێبگرین تینومان دەبێ، ئایا دەکرێ بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئاوی دەریا پاکە و مردارە بووەکەشی حەڵاڵە (بۆ خواردن).

**٣٨٧-** عَنِ ابْنِ الْفِرَاسِيِّ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ أَصِيدُ، وَكَانَتْ لِي قِرْبَةٌ أَجْعَلُ فِيهَا مَاءً، وَإِنِّي تَوَضَّأْتُ بِمَاءِ الْبَحْرِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ»[١].

واتە: ئیبنو فیراسیی ﷺ دەڵێ: من ڕاوم دەکرد (ڕاوچی بووم)، وە کوندەیەکم هەبوو ئاوم تێدەکردو، بە ئاوی دەریاش دەستنوێژم دەشۆرد، جا ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، ئەویش فەرمووی: ئاوی دەریا پاکە و مردارە بووەکەشی حەڵاڵە.

**٣٨٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنْ مَاءِ الْبَحْرِ، فَقَالَ: «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ»[٢].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئاوی دەریا، ئەویش فەرمووی: ئاوی دەریا پاک و پاککەرەوەیە و مردارە بووەکەشی حەڵاڵە.

## بابەت: ئەوەی کە پیاو یارمەتی بدرێ لە دەستنوێژ و ئاوی بەدەستدا بکرێ

**٣٨٩-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ لِبَعْضِ حَاجَتِهِ، فَلَمَّا رَجَعَ تَلَقَّيْتُهُ بِالْإِدَاوَةِ، فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ، «فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ، ثُمَّ ذَهَبَ يَغْسِلُ ذِرَاعَيْهِ، فَضَاقَتِ الْجُبَّةُ، فَأَخْرَجَهُمَا مِنْ تَحْتِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَهُمَا، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ صَلَّى بِنَا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٩ و ١٥١، والترمذي: ٩٨، والنسائي: ٧٩ و ٨٢ و ١٢٤. وأصل الحديث عند البخاري: ١٨٢، ومسلم: ٢٧٤.

واتە: موغەیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بۆ سەرئاوکردن چووە دەرەوە، جا کاتێک گەڕایەوە بە تاسێک (قاپێک) ئاوەوە چوومە خزمەتی و، ئاوم بە دەستی داکرد، ئەویش دەستی شۆردو، پاشان دەم و چاو و ڕوخساری شۆرد، دواتر ویستی باسکەکانی بشۆرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی سەردەستی جبەکەی تەسک بوو، دەستەکانی لە ژێر جبەکەیەوە دەرهێنان و شۆردنی، وە مەسحی خوفەکانی کرد، پاشان نوێژی بۆ کردین.

**٣٩٠-** عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ ﵁، قَالَتْ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِمِيضَأَةٍ، فَقَالَ: «اسْكُبِي» فَسَكَبْتُ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ، وَأَخَذَ مَاءً جَدِيدًا فَمَسَحَ بِهِ رَأْسَهُ، مُقَدَّمَهُ وَمُؤَخَّرَهُ، وَغَسَلَ قَدَمَيْهِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا»[1].

واتە: ڕوبەیعی کچی موعەویز ﵁ دەڵێ: بە تەشتێک ئاوەوە هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا فەرمووی: بەدەستم دا بکە، منیش بە دەستیم داکرد، ئەویش ڕوخسار و باسکەکانی شۆرد، وە بە ئاوێکی تر پێشەوە و پشتەوەی سەری مەسح کرد، (واتە: بۆ مەسح کردنەکە دووبارە ئاوی تازەی کرد بە دەستیدا، نەک بە پاشماوەی ئاوی دەم و چاو و باسکی)، وە پێیەکانی سێ جار سێ جار شۆرد.

**٣٩١-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ ﵁، قَالَ: «صَبَبْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ الْمَاءَ فِي السَّفَرِ وَالْحَضَرِ فِي الْوُضُوءِ»[2].

واتە: صەفوانی کوڕی عەسسال ﵁ دەڵێ: لەماڵەوەو لە گەشتدا ئاوم بە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ داکردوە بۆ دەستنوێژگرتن.

**٣٩٢-** عَنْ أَبِي رَوْحُ بْنُ عَنْبَسَةَ بْنِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَيَّاشٍ مَوْلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، عَنْ أَبِيهِ عَنْبَسَةَ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ أَبِيهِ، أُمِّ عَيَّاشٍ، وَكَانَتْ أَمَةً لِرُقَيَّةَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: «كُنْتُ أُوَضِّئُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا قَائِمَةٌ، وَهُوَ قَاعِدٌ»[3].

---

(١) حسن دون قوله «الْمَاءً جَدِيدًا». أخرجه أبو داود: ١٢٦، والترمذي: ٣٣ أخرجاه بنحوه، وللماء الجديد شاهد صحيح عند مسلم: ٢٣٦، والترمذي: ٣٥ عن عبد الله بن زيد.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.

واتە: ئەبو ڕەوحی کوڕی عەنبەسەی کوڕی سەعیدی کوڕی ئەبو عەییاش ﷺ مەولای عوسمانی کوڕی عەففان لە عەنبەسەی کوڕی سەعیدی باوکییەوە لە دایکی باوکییەوە (دایە گەورەیەوە) ئوممو عەییاش، کە کەنیزەکی ڕوقیەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەگێڕنەوە، کە گوتوویەتی: من ئاوم بە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ دادەکرد، بە جۆرێک من بەپێوە بووم، ئەویش دانیشتبوو.

## بابەت: کەسێک کە لە خەو هەڵدەستێ
## ئایا دەست دەخاتە ناو دەفری ئاو پێش ئەوەی دەستی بشوات

**٣٩٣-** عَنْ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَا يُدْخِلْ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ، حَتَّى يُفْرِغَ عَلَيْهَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَا يَدْرِي فِيمَ بَاتَتْ يَدُهُ»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان شەو لە خەو هەڵسا، با دەستی نەخاتە ناو تاسێکەوە کە ئاوی تێدایە، تاوەکو دوو جار، یان سێ جار، ئاو بە دەستیدا نەکات، چونکە بێگومان هیچ کام لە ئێوە نازانێ کە شەو (لە کاتی خەودا) دەستی لە کوێ بووەو چی بەرکەوتوە.

**٣٩٤-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ، فَلَا يُدْخِلْ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا»[٢].

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لە خەو هەڵسا با دەستی نەخاتە ناو تاسێکەوە (کە ئاوی تێدایە) تاوەکو دەستی دەشۆرێ.

**٣٩٥-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ النَّوْمِ، فَأَرَادَ أَنْ يَتَوَضَّأَ، فَلَا يُدْخِلْ يَدَهُ فِي وَضُوئِهِ حَتَّى يَغْسِلَهَا، فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ، وَلَا عَلَى مَا وَضَعَهَا»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٢، ومسلم: ٢٧٨، وأبو داود: ١٠٣ و ١٠٥، والترمذي: ٢٤، والنسائي: ١ و ١٦١ و ٤٤١.

(٢) صحيح.

(٣) منكر بزيادة: «وَلاَ عَلَىَ مَا وَضَعَهَا».

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لە خەو هەڵساو، ویستی دەستنوێژ بگرێ، با دەستی نەخاتە ناو ئاوی دەستنوێژەکەیەوە تاوەکو نەیشوات، چونکە بێگومان نازانێ کە شەو (لە کاتی خەودا) دەستی لە کوێ بووە، وە نازانێ کە لەسەر چی داناوە (یان بەر چی کەوتووە).

**٣٩٦-** عَنِ الْحَارِثِ ﷺ قَالَ: دَعَا عَلِيٌّ بِمَاءٍ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ قَبْلَ أَنْ يُدْخِلَهُمَا الْإِنَاءَ، ثُمَّ قَالَ: «هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَنَعَ»[١].

واتە: حاریس ﷺ دەڵێ: عەلی داوای ئاوی کرد، ئنجا هەردوو دەستی شۆرد پێش ئەوەی بیانخاتە ناو تاسەکەوە، پاشان گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ئا بەو شێوەیەی کرد.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی (بسم الله) کردن هاتووە لە دەستنوێژگرتندا

**٣٩٧-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک دەستنوێژی تەواو نیە ئەگەر ناوی خوای لەسەر نەهێنێ (واتە: کە بە ناوی خواوە دەست پێنەکات).

**٣٩٨-** عَنْ سَعِيدَ بْنَ زَيْدٍ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا وُضُوءَ لَهُ، وَلَا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ»[٣].

واتە: سەعیدی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دەستنوێژی نەبێ نوێژی بەرناکەوێ، وە هیچ کەسێکیش دەستنوێژی تەواو نیە ئەگەر ناوی خوای لەسەر نەهێنێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٧، والنسائي: ٩٥ علي بن أبي طالب.

(٢) حسن.

(٣) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٥.

**٣٩٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا وُضُوءَ لَهُ، وَلَا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ»[١].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دەستنوێژی نەبێ نوێژی بەرناکەوێ، وە هیچ کەسێکیش دەستنوێژی تەواو نیە ئەگەر ناوی خوای لەسەر نەهێنێ.**

**٤٠٠-** عَنْ عَبْدِ الْمُهَيْمِنِ بْنِ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا وُضُوءَ لَهُ، وَلَا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ، وَلَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ، وَلَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا يُحِبُّ الْأَنْصَارَ»[٢].

**واته: عەبدولموهەیمینی کوڕی عەبباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، فەرموویەتی: هەر کەسێک دەستنوێژی نەبێ نوێژی بەرناکەوێ، وە هیچ کەسێکیش دەستنوێژی تەواو نیە ئەگەر ناوی خوای لەسەر نەهێنێ، وە هەر کەسێک صەڵاوات نەدا لەسەر پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەرناکەوێ، وە هەر کەسێکیش پشتیوانانی خۆش نەوێ نوێژی بەرناکەوێ.**

## بابەت: پێش خستنی لای ڕاست لە دەستنوێژدا

**٤٠١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي الطُّهُورِ إِذَا تَطَهَّرَ، وَفِي تَرَجُّلِهِ إِذَا تَرَجَّلَ، وَفِي انْتِعَالِهِ إِذَا انْتَعَلَ»[٣].

**واته: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لێبوو لە کاتی دەستنوێژ گرتندا لەلای ڕاستەوە دەست پێبکات (بۆ ئەندامە جووتەکان)، هەروەها لە کاتی قژ داهێنانیدا حەزی دەکرد لەلای ڕاستەوە دەست پێبکات، وە لە کاتی پێڵاو لە پێکردنیشدا حەزی دەکرد سەرەتا ئەوەی قاچی ڕاستەی لەپێ بکات.**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٠١.

(٢) منكر بالشطر الثاني.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٨، ومسلم: ٢٦٨، وأبو داود: ٤١٤٠، والترمذي: ٦٠٨، والنسائي: ١١٢ و ٤٢١ و ٥٢٤٠.

٤٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَوَضَّأْتُمْ فَابْدَءُوا بِمَيَامِنِكُمْ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێک دەستنوێژتان گرت لەلای ڕاستتانەوە دەست پێبكەن.

## بابەت: ئاو لە زار و لوت ڕادان بە یەک مشت لوێچ (مست)

٤٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ غُرْفَةٍ وَاحِدَةٍ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی لە دەم و لوتی وەركرد بە یەک مست (لوێچ).

٤٠٤- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «تَوَضَّأَ، فَمَضْمَضَ ثَلَاثًا وَاسْتَنْشَقَ ثَلَاثًا مِنْ كَفٍّ وَاحِدٍ»[3].

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی شۆرد، جا سێ جار ئاوی لە دەمی وەركردو، سێ جاریش ئاوی لە لووتی وەركرد بە یەک لوێچی دەست.

٤٠٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: «أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْنَا وَضُوءًا، فَأَتَيْتُهُ بِمَاءٍ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ وَاحِدٍ»[4].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی زەیدی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان، داوای ئاوی دەستنوێژی لێكردین، منیش ئاوم بۆ هێنا، ئنجا ئاوی لە دەمی وەركرد و، ئاوی لە لووتی وەركرد بە یەک لوێچی دەست.

## زیادە ڕەوی كردن لە ئاو لە لوت ڕاداندا

٤٠٦- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ قَيْسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَوَضَّأْتَ فَانْثُرْ، وَإِذَا اسْتَجْمَرْتَ فَأَوْتِرْ»[5].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٤١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٠، وأبو داود: ١٣٧، مختصراً النسائي: ١٠١ و ١٠٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٢، والنسائي: ٩٤.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩١، ومسلم: ٢٣٥، وأبو داود: ١١٩، والترمذي: ٢٨، والنسائي: ٩٧ و ٩٨.

(٥) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٧، والنسائي: ٨٩.

واتە: سەلەمەی کوڕی قەیس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەگەر دەستنوێژت گرت ئاو لە لووتت ڕادە و فن (مش) بکە، وە ئەگەر بە بەرد تارەتت گرت با (ژمارەی) بەردەکان تاک بێ.

**٤٠٧-** عَنْ عَاصِمِ بْنِ لَقِيطِ بْنِ صَبْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخْبِرْنِي عَنِ الْوُضُوءِ، قَالَ: «أَسْبِغِ الْوُضُوءَ، وَبَالِغْ فِي الِاسْتِنْشَاقِ، إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَائِمًا»[1].

واتە: عاصیمی کوڕی لەقیتی کوڕی صەبرە، لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دەستنوێژم بۆ بکە، فەرمووی: دەستنوێژێکی تەواو (بە جوانی) بشۆرە، وە زۆر ئاو لە لوتت وەربدە، مەگەر بەڕۆژوو بیت.

**٤٠٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَنْثِرُوا مَرَّتَيْنِ بَالِغَتَيْنِ، أَوْ ثَلَاثًا»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو جار، یان سێ جار، بە باشی ئاو لە لوتتان وەربکەن و فن (مش) بکە.

**٤٠٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ، وَمَنِ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دەستنوێژی شۆرد با ئاو لە لوتی وەربکات و فن (مش) بکە، وە هەر کەس تارەتی بە بەرد گرت، با (ژمارەی) بەردەکان تاک بن.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی شوشتنی ئەندامانی دەستنوێژ هاتووە یەک جار یەک جار

**٤١٠-** عَنْ ثَابِتِ بْنِ أَبِي صَفِيَّةَ الثُّمَالِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا جَعْفَرٍ، قُلْتُ لَهُ: حُدِّثْتَ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً» قَالَ: «نَعَمْ» قُلْتُ: وَمَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَثَلَاثًا ثَلَاثًا؟ قَالَ: «نَعَمْ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢ و ٢٣٦٦، والترمذي: ٧٨٨، والنسائي: ٨٧ و ١١٤.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦١ و ١٦٢، ومسلم: ٢٣٧، وأبو داود: ١٤٠، والنسائي: ٨٨.

(٤) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٤٥.

واتە: سابیتی کوڕی ئەبو صەفیەی سومالیی، دەڵێ: : پرسیارم کرد لە ئەبو جەعفەر، پێمگوت: پێت گەیشتووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی دەستنوێژگرتندا ئەندامەکانی یەک جار یەک جار دەشۆردن؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: دوو جار دوو جار و، سێ جار سێ جاریش؟ گوتی: بەڵێ.

**٤١١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «تَوَضَّأَ غُرْفَةً غُرْفَةً»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی دەستنوێژ گرتندا بۆ هەر ئەندامێکی یەک مست ئاوی بەکاردەهێنا.

**٤١٢-** عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ تَوَضَّأَ وَاحِدَةً وَاحِدَةً»[٢].

واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: لە جەنگی تەبوکدا بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، بە جۆرێک ئەندامەکانی یەک جار یەک جار دەشۆرد.

## بابەت: شوشتنی ئەندامانی دەستنوێژ سێ جار سێ جار

**٤١٣-** عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ وَعَلِيًّا، يَتَوَضَّآنِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا، وَيَقُولَانِ: هَكَذَا كَانَ وُضُوءُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٣].

واتە: شەقیقی کوڕی سەلەمە ﷺ دەڵێ: بینیم عوسمان و عەلی سێ جار سێ جار ئەندامەکانی دەستنوێژیان دەشۆرد، دەیانگوت: دەستنوێژگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئا بەو شێوە بوو.

**٤١٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ «تَوَضَّأَ ثَلَاثًا ثَلَاثًا. وَرَفَعَ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ»[٤].

واتە: لە ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕنەوە کاتێ دەستنوێژی دەگرت سێ جار سێ جار ئەندامەکانی دەشۆرد. ئەو شێوازەشی پاڵدەدایە لای پێغەمبەر ﷺ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٧، وأبو داود: ١٣٨، والترمذي: ٤٢، والنسائي: ٨٠.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي بإثر: ٤٢ تعليقاً.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١١ و ١١٥ و ١١٦ و ١١٧، والترمذي: ٤٤ و ٤٨، والنسائي: ٩١ و ٩٦ و ١١٥.

(٤) صحيح لغيره. أخرجه النسائي: ٨١.

**٤١٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ وَأَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ ثَلَاثًا ثَلَاثًا»[١].

واتە: عائیشە ﵂ و ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی دەگرت و سێ جار سێ جار ئەندامەکانی دەشۆرد.

**٤١٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﵄، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ ثَلَاثًا ثَلَاثًا، وَمَسَحَ رَأْسَهُ مَرَّةً»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﵄ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی دەگرت و سێ جار سێ جار ئەندامەکانی دەشۆرد، وە یەک جار دەستی تەڕی بەسەر سەریدا هێنا.

**٤١٧-** عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ ﵁، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ ثَلَاثًا ثَلَاثًا»[٣].

واتە: ئەبو مالیکی ئەشعەریی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی دەستنوێژگرتندا سێ جار سێ جار ئەندامەکانی (دەستنوێژی) دەشۆرد.

**٤١٨-** عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ ثَلَاثًا ثَلَاثًا[٤].

واتە: ڕوبەیعی کچی موعەویزی کوڕی عەفرائ ﵄ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی دەگرت، سێ جار سێ جار ئەندامەکانی دەشۆرد.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی شوشتنی ئەندامانی دەستنوێژ هاتووە یەک جار و دوو جار و سێ جار

**٤١٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: تَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاحِدَةً وَاحِدَةً، فَقَالَ: «هَذَا وُضُوءُ مَنْ لَا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَلَاةً إِلَّا بِهِ» ثُمَّ تَوَضَّأَ ثِنْتَيْنِ ثِنْتَيْنِ، فَقَالَ: «هَذَا وُضُوءُ الْقَدْرِ مِنَ الْوُضُوءِ» وَتَوَضَّأَ ثَلَاثًا ثَلَاثًا، وَقَالَ: «هَذَا أَسْبَغُ الْوُضُوءِ، وَهُوَ وُضُوئِي، وَوُضُوءُ خَلِيلِ اللَّهِ إِبْرَاهِيمَ، وَمَنْ تَوَضَّأَ

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي بإثر: ٤٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٢٦ و ١٢٧ مطولًا.

هَكَذَا، ثُمَّ قَالَ عِنْدَ فَرَاغِهِ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فُتِحَ لَهُ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت و (ئەندامەکانی دەستنوێژی) یەک جار یەک جار شۆرد فەرمووی: ئەوە ئەو دەستنوێژەیە کە خوا هیچ دەستنوێژێک قبووڵ ناکات (وەرناگرێ) بەبێ ئەو ئەندازەیە لە دەستنوێژ، پاشان دەستنوێژی دوو جار دوو جار گرت (ئەندامەکانی شۆرد) و فەرمووی: ئەوە ئەندازەی دەستنوێژە، ئەوجار سێ جار سێ جار ئەندامەکانی شۆردو فەرمووی: ئەوە جوانترین و تەواوترینی دەستنوێژە، وە ئەوە دەستنوێژی منە، وە دەستنوێژی خۆشەویستی خوا ئیبراهیمە ﷺ، وە هەر کەس بەو شێوازە دەستنوێژ بشوات، پاشان کە تەواو بوو، بڵێ: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»، واتە: گەواهی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا، وە گەواهی دەدەم کە موحەممەد ﷺ بەندە و نێردراوی خوایە، ئەوە هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بەڕوودا دەکرێنەوە لە کامیان حەزی کرد دەچێتە ناو بەهەشتەوە.

**٤٢٠-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَعَا بِمَاءٍ، فَتَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً، فَقَالَ: «هَذَا وَظِيفَةُ الْوُضُوءِ» أَوْ قَالَ: وُضُوءٌ مَنْ لَمْ يَتَوَضَّأْهُ، لَمْ يَقْبَلِ اللَّهُ لَهُ صَلَاةً، ثُمَّ تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: «هَذَا وُضُوءٌ مَنْ تَوَضَّأَهُ، أَعْطَاهُ اللَّهُ كِفْلَيْنِ مِنَ الْأَجْرِ» ثُمَّ تَوَضَّأَ ثَلَاثًا ثَلَاثًا، فَقَالَ: «هَذَا وُضُوئِي، وَوُضُوءُ الْمُرْسَلِينَ مِنْ قَبْلِي»(٢).

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئاوی کرد، ئنجا دەستنوێژی گرت یەک جار یەک جار (ئەندامەکانی شۆرد) و فەرمووی: ئەوە ئادابی دەستنوێژە، یان فەرمووی: ئەوە ئەو دەستنوێژەیە کە هەر کەسێک بەو شێوەیە دەستنوێژ نەگرێت، خوا نوێژی لێ وەرناگرێت، پاشان دوو جار دوو جار ئەندامەکانی دەستنوێژی شوشت، پاشان فەرمووی: ئەوە ئەو دەستنوێژەیە کە هەر کەسێک بەو شێوەیە بیشوات خوا دوو جار پاداشتی دەکات، پاشان دەستنوێژی

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) ضعيف.

گرت سێ جار سێ جار ئەندامەکانی شوشت و فەرمووی: ئا ئەوە دەستنوێژی منە و دەستنوێژی پێغەمبەرانی پێش منیشە.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نێوەندگیری هاتووە لە دەستنوێژدا و ناپەسەندی زیادەڕەوی

**٤٢١-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلْوُضُوءِ شَيْطَانًا يُقَالُ لَهُ وَلَهَانُ، فَاتَّقُوا وَسْوَاسَ الْمَاءِ»[١].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﵁ دەڵێ: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستنوێژگرتن شەیتانێکی هەیە (بۆ دانراوە) پێی دەگوترێ وەلەهان، جا بۆیە خۆتان بپارێزن لە وەسوەسەی ئاو (واتە: لە کاتی دەستنوێژگرتندا ئاو زۆر بەفیڕۆ مەدەن).

**٤٢٢-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﵁، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنِ الْوُضُوءِ، فَأَرَاهُ ثَلَاثًا ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: «هَذَا الْوُضُوءُ، فَمَنْ زَادَ عَلَى هَذَا فَقَدْ أَسَاءَ، أَوْ تَعَدَّى، أَوْ ظَلَمَ»[٢].

واتە: عەمرى کوڕی شوعەیب ﵁ لە باوکییەوە، لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: دەشتەکییەک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو، پرسیاری لێکرد دەربارەی دەستنوێژ، ئەویش سێ جار سێ جار نیشانیدا (لەبەر چاوی دەستنوێژی گرت)، پاشان فەرمووی: ئا ئەوە دەستنوێژە، جا هەر کەسێک لەوە زیاتری کرد ئەوە کارێکی خراپی کردوە، یان زێدەڕۆیی کردوە، یان ستەمی کردوە.

**٤٢٣-** عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، «فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَتَوَضَّأَ مِنْ شَنَّةٍ، وُضُوءًا يُقَلِّلُهُ، فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ كَمَا صَنَعَ»[٣].

**شنة:** واتە: گۆزەیەک کە تەمەنی زۆرە (کۆنە).

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٥٧.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ١٣٥ مطولًا، والنسائي: ١٤٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٨ و ٦٣١٦، ومسلم: ٧٦٣، والنسائي: ٤٤٢.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ گوتوویەتی: شەو لەلای مەیمونەی پوورم مامەوە، جا پێغەمبەر ﷺ (شەو هەڵساو) دەستنوێژی گرت لە ئاوی گۆزەیەک کە کەم بەکاری دەهێنا، ئنجا هەڵسام ئەو چی کرد، منیش وام کرد (واتە: دەستنوێژم گرت).

٤٢٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا يَتَوَضَّأُ، فَقَالَ: «لَا تُسْرِفْ، لَا تُسْرِفْ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی دەستنوێژی دەگرت، جا فەرمووی: زێدەڕۆیی مەکە، زێدەڕۆیی مەکە (لە بەکارهێنانی ئاودا، یان لە شۆردنی ئەندامەکاندا).

٤٢٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِسَعْدٍ، وَهُوَ يَتَوَضَّأُ، فَقَالَ: «مَا هَذَا السَّرَفُ» فَقَالَ: أَفِي الْوُضُوءِ إِسْرَافٌ، قَالَ: «نَعَمْ، وَإِنْ كُنْتَ عَلَى نَهَرٍ جَارٍ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای سەعد تێپەڕی، کە خەریکی دەستنوێژ گرتن بوو، جا پێی فەرموو: ئەو زێدەڕۆییە چییە؟!! ئەویش گوتی: ئایا لە دەستنوێژ گرتنیشدا زێدەڕۆیی هەیە! فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر لەسەر ڕووبارێکیش بیت کە ئاوەکەی بڕوات.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی جوان دەستنوێژ گرتن هاتووە

٤٢٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِإِسْبَاغِ الْوُضُوءِ»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووین کە دەستنوێژێکی تێر و تەواو بگرین.

٤٢٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يُكَفِّرُ اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَزِيدُ بِهِ فِي الْحَسَنَاتِ؟» قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ»[4].

---

(١) موضوع.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٠٨ مطولًا، والترمذي: ١٧٠١، والنسائي: ١٤١ و ٣٥٨١ مطولًا.

(٤) صحيح.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستویەتی کە فەرموویەتی: ئایا ڕێنمایتان نەکەم بۆ شتێک کە تاوانەکان دەسڕێتەوە و چاکە زیاد دەکات، گوتیان: بـا، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دەستنوێژگرتنی تێر و تەواو لە کاتی ناڕەحەتی، وە زۆر هەنگاونان بەرەو مزگەوت، وە چاوەڕوان کردنی نوێژ لە دوای نوێژ.

٤٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كَفَّارَاتُ الْخَطَايَا، إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَإِعْمَالُ الْأَقْدَامِ إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەفارەتی تاوانەکان (ئەو شتانەی تاوانەکان دەسڕنەوە) بریتین لە: دەستنوێژگرتنی تێر و تەواو لە کاتی ناڕەحەتیدا، وە هەنگاو نان و هاتووچۆ کردنی مزگەوت، وە چاوەڕوانی کردنی نوێژ لە دوای نوێژ.

## بابەت: پەنجە خستنە ناو ڕیش لەکاتی دەستنوێژدا

٤٢٩- عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُخَلِّلُ لِحْيَتَهُ»[2].

واتە: عەماری کوڕی یاسر ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەکانی لە ناو ڕیشیدا دەهێنا و دەبرد (بۆ ئەوەی بە باشی تەڕببێ لە کاتی دەستنوێژدا).

٤٣٠- عَنْ عُثْمَانَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «تَوَضَّأَ، فَخَلَّلَ لِحْيَتَهُ»[3].

واتە: عوسمان ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت و بە پەنجەکانی ڕیشی شیدەکردەوە.

٤٣١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا تَوَضَّأَ خَلَّلَ لِحْيَتَهُ، وَفَرَّجَ أَصَابِعَهُ مَرَّتَيْنِ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٥١، والترمذي: ٥١ و ٥٢، والنسائي: ١٤٣.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٩ و ٣٠.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٣١.

(٤) صحيح دون المرتين.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەستنوێژی دەگرت، دەستی لە ناو ڕیشی ڕادەبرد (بۆ ئەوەی بنی ڕیشی تەڕ ببێ)، وە نێوان پەنجەکانیشی دوو جار دەکردەوە (واتە: پەنجەکانی لێک دوور دەکردنەوە).

**٤٣٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا تَوَضَّأَ عَرَكَ عَارِضَيْهِ بَعْضَ الْعَرْكِ، ثُمَّ شَبَكَ لِحْيَتَهُ بِأَصَابِعِهِ مِنْ تَحْتِهَا»[(١)].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەستنوێژی دەشۆرد دەستی بە ڕوومەتەکانیدا دەهێنا، پاشان لە ژێرەوە پەنجەکانی دەخستە ناو ڕیشی (بۆ ئەوەی بە باشی تەڕببێ).

**عَارِض:** واتە: لا چاو.

**٤٣٣-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ، فَخَلَّلَ لِحْيَتَهُ»[(٢)].

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، وە پەنجەی خستە ناو ڕیشی.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی مەسح کردنی سەر هاتووە

**٤٣٤-** عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ وَهُوَ جَدُّ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُرِيَنِي، كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ: «نَعَمْ، فَدَعَا بِوَضُوءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ تَمَضْمَضَ، وَاسْتَنْثَرَ ثَلَاثًا، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ، ثُمَّ ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا حَتَّى رَجَعَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ»[(٣)].

واتە: عەمری کوڕی یەحیا ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە بە عەبدوڵڵای کوڕی زەید کە باپیرەی عەمری کوڕی یەحیایە گوتوە: ئایا دەتوانی نیشانم بدەی (و پێم بڵێی) پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەستنوێژی دەگرت؟ عەبدوڵڵای کوڕی زەید

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٥، ومسلم: ٢٣٥، وأبو داود: ١١٨ و ١١٩، والترمذي: ٢٨ و ٤٧، والنسائي: ٩٧ و ٩٨.

گوتی: بەڵێ، داوای ئاوی دەستنوێژی کرد، (بۆیان هێنا) بەسەر دەستەکانی داکرد و دووجار دەستەکانی شۆرد، پاشان سێ جار ئاوی لە دەم و لوتی ڕادا (مشی کرد)، دواتر سێ جار دەم و چاوی (ڕوخساری) شۆرد، پاشان دووجار دەستەکانی تا ئانیشکی شۆرد، دواتر بە هەر دوو دەستی مەسحی سەری کرد بە جۆرێک دەستەکانی لە پێشی سەریەوە دەبرد تاوەکو پشتە ملی دواتر دەیهێنانەوە بۆ پێشەوەی سەری، پاشان هەردوو پێیەکانی شۆرد.

**٤٣٥-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ، فَمَسَحَ رَأْسَهُ مَرَّةً»[١].

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، وە یەک جار مەسحی سەری کرد.

**٤٣٦-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَسَحَ رَأْسَهُ مَرَّةً»[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ یەک جار مەسحی سەری کرد.

**٤٣٧-** عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ، فَمَسَحَ رَأْسَهُ مَرَّةً»[٣].

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، وە یەک جار مەسحی سەری کرد.

**٤٣٨-** عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ ﷺ، قَالَتْ: «تَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَمَسَحَ رَأْسَهُ مَرَّتَيْنِ»[٤].

واتە: ڕوبەییعی کچی موعەویزی کوڕی عەفڕاء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، وە دووجار مەسحی سەری کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٤٨.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٢٦، والترمذي: ٣٣.

## بابەت: مەسح کردنی گوێچکەکان

**٤٣٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَسَحَ أُذُنَيْهِ دَاخِلَهُمَا بِالسَّبَّابَتَيْنِ، وَخَالَفَ إِبْهَامَيْهِ إِلَى ظَاهِرِ أُذُنَيْهِ، فَمَسَحَ ظَاهِرَهُمَا وَبَاطِنَهُمَا»**[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوەوەی گوێیەکانی بە پەنجەی شایەتومان و دەرەوەی گوێیەکانیشی بە پەنجە گەورەی مەسح کرد. کەواتە: ڕووکاری دەرەوە و ناوەوەی گوێیەکانی مەسح دەکرد.**

**سَبَّاب: ئەو پەنجەیە کە لە دەستی ڕاستدا بۆ شایەتومان بەکاری دێنین، وە لە دەستی چەپیش هەمان پەنجەیە.**

**٤٤٠- عَنِ الرُّبَيِّعِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «تَوَضَّأَ فَمَسَحَ ظَاهِرَ أُذُنَيْهِ وَبَاطِنَهُمَا»**[2].

**واتە: ڕوبەیع ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت و دیوی دەرەوە و ناوەوەی گوێیەکانی مەسح کرد.**

**٤٤١- عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ ﵄، قَالَتْ: «تَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَدْخَلَ إِصْبَعَيْهِ فِي جُحْرَيْ أُذُنَيْهِ»**[3].

**واتە: ڕوبەیعی کچی موعەویزی کوڕی عەفڕاء ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت و پەنجەکانی خستە ناو کونی گوێیەکانی.**

**٤٤٢- عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ معْدِ يكَرِبَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «تَوَضَّأَ، فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ، ظَاهِرَهُمَا وَبَاطِنَهُمَا»**[4].

**واتە: میقدامی کوڕی مەعدی یەکریب ﵁ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، جا مەسحی سەری کرد و، مەسحی دیوی دەرەوە و ناوەوەی گوێیەکانی کرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٦، والنسائي: ١٠٢.

(٢) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٣. وانظر أبو داود: ١٢٦.

(٣) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٢٩.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢١ و ١٢٢ و ١٢٣.

## بابەت: گوێچکەکان بەشێکن لەسەر

**٤٤٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأُذُنَانِ مِنَ الرَّأْسِ»[١].

**واتە:** عەبدوڵلای کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گوێیەکانیش بەشێکن لە سەر.

**٤٤٤-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْأُذُنَانِ مِنَ الرَّأْسِ» وَكَانَ يَمْسَحُ رَأْسَهُ مَرَّةً، وَكَانَ يَمْسَحُ الْمَأْقَيْنِ[٢].

**المأقين:** ئەو شوێنەیە لە چاو کە فرمێسکی لێوە دێ.

**واتە:** ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گوێیەکانیش بەشێکن لە سەر. وە یەک جار سەری مەسح دەکرد و، قنچکە چاوەکانی مەسح دەکرد.

**٤٤٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأُذُنَانِ مِنَ الرَّأْسِ»[٣].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گوێیەکانیش بەشێکن لە سەر.

## بابەت: شوشتنی نێوان (کەلێن) پەنجەکان

**٤٤٦-** عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ فَخَلَّلَ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ بِخِنْصِرِهِ»[٤].

**واتە:** موستەوریدی کوڕی شەداد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستنوێژی گرت، جا پەنجە گچکەی دەستی خستە نێوان پەنجەکانی پێی.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره دون مسح المأقين. أخرجه أبو داود: ١٣٤، والترمذي: ٣٧.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٤٨، والترمذي: ٤٠.

**٤٤٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَأَسْبِغِ الْوُضُوءَ وَاجْعَلِ الْمَاءَ بَيْنَ أَصَابِعِ يَدَيْكَ، وَرِجْلَيْكَ»[1].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک هەڵسای بۆ نوێژکردن، بە تێر و تەواوی دەستنوێژ بگرە و، ئاو بە نێوانی پەنجەی دەست و پێیەکانتدا بکە.

**٤٤٨- عَنْ عَاصِمِ بْنِ لَقِيطِ بْنِ صَبْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَسْبِغِ الْوُضُوءَ، وَخَلِّلْ بَيْنَ الْأَصَابِعِ»[2].**

واتە: عاصیمی کوڕی لەقیتی کوڕی صەبرە، لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە تێر و تەواوی دەستنوێژ بگرە و، پەنجە بخەرە نێوان پەنجەکانتەوە.

**٤٤٩- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «إِذَا تَوَضَّأَ، حَرَّكَ خَاتَمَهُ»[3].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕافیع ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی دەگرت، موستیلەکەی (ئەنگوستیلە) دەجوڵاند.

## بابەت: شوشتنی گۆزینگ و پاژنە پێ

**٤٥٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَوْمًا يَتَوَضَّئُونَ وَأَعْقَابُهُمْ تَلُوحُ فَقَالَ: «وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ، أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ»[4].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند کەسێکی بینی کە دەستنوێژیان دەگرت و پاژنەپێکانیان دیاربوو کە ئاوی پێ نەکەتبوو، ئنجا فەرمووی: وەیل (سزای سەخت لە ئاگردا) بۆ ئەو پاژنانە، کە لە دەستنوێژدا بە تێر و تەواوی ناشۆردرێن.

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢ و ١٤٤، والترمذي: ٣٨ و ٧٨٨، والنسائي: ١١٤.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠ و ١٦٣، ومسلم: ٢٤١، وأبو داود: ٩٧، والنسائي: ١١١ و ١٤٢.

**٤٥١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ويْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ»(١).

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وەیل (سزای سەخت لە ئاگردا) بۆ ئەو پاژنانە لە ئاگر، کە لە دەستنوێژدا ناشۆردرێن.

**٤٥٢-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﵁، قَالَ: رَأَتْ عَائِشَةُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ وَهُوَ يَتَوَضَّأُ، فَقَالَتْ: أَسْبِغِ الْوُضُوءَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «وَيْلٌ لِلْعَرَاقِيبِ مِنَ النَّارِ»(٢).

واتە: ئەبو سەلەمە ﵁ دەڵێ: عائیشە ﵂ عەبدوڕەحمانی بینی کە خەریکی دەستنوێژگرتن بوو، جا پێی گوت: بە تێر و تەواوی دەستنوێژ بگرە، چونکە بەڕاستی من گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: وەیل (سزای سەخت لە ئاگردا) بۆ پاژنە پێکان لە ئاگر، کە لە کاتی دەستنوێژدا بە باشی ناشۆردرێن.

**٤٥٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: وەیل (سزای سەخت لە ئاگردا) بۆ ئەو پاژنانە لە ئاگر، کە لە دەستنوێژدا ناشۆردرێن.

**٤٥٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «وَيْلٌ لِلْعَرَاقِيبِ مِنَ النَّارِ»(٤).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: وەیل (سزای سەخت لە ئاگردا) بۆ پاژنە پێکان لە ئاگر، کە لە کاتی دەستنوێژدا بە باشی ناشۆردرێن.

**٤٥٥-** عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ، وَيَزِيدَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، وَشُرَحْبِيلَ ابْنِ حَسَنَةَ، وَعَمْرِو بْنِ الْعَاصِ كُلُّ هَؤُلَاءِ، سَمِعُوا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَتِمُّوا الْوُضُوءَ، وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ»(٥).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٥، ومسلم: ٢٤٢، والترمذي: ٤١، والنسائي: ١١٠.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.

واتە: خالیدی کوڕی وەلیدو یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان و شورەحبیلی کوڕی حەسەن و عەمڕی کوڕی عاص ﭭ دەگێڕنەوە کە هەموو ئەوانە گوێیان لێبووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستنوێژ بە تێر و تەواوی بگرن، وەیل بۆ ئەو پاژنانە لە ئاگر، کە لە دەستنوێژدا ناشۆردرێن.

## بابەت: شوشتنی هەردوو پێیەکان

**٤٥٦-** عَنْ أَبِي حَيَّةَ، قَالَ: رَأَيْتُ عَلِيًّا تَوَضَّأَ، فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: أَرَدْتُ أَنْ أُرِيَكُمْ، طُهُورَ نَبِيِّكُمْ ﷺ»[١].

واتە: ئەبو حەییە ﭬ دەڵێ: بینیم عەلی دەستنوێژی دەگرت، جا هەردوو پێیەکانی تاکو گۆزینگ شۆرد، پاشان گوتی: ویستم (شێوازی) دەستنوێژی پێغەمبەرەکەتان ﷺ پیشان بدەم.

**٤٥٧-** عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ معْدِ يكَرِبَ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ، فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا»[٢].

واتە: میقدامی کوڕی مەعدی یەکریب ﭬ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت و، سێ جار سێ جار پێیەکانی شۆرد.

**٤٥٨-** عَنِ الرُّبَيِّعِ، قَالَتْ: أَتَانِي ابْنُ عَبَّاسٍ، فَسَأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، تَعْنِي حَدِيثَهَا الَّذِي ذَكَرَتْ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «تَوَضَّأَ، وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ» فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ إِنَّ النَّاسَ أَبَوْا، إِلَّا الْغَسْلَ، وَلَا أَجِدُ فِي كِتَابِ اللَّهِ، إِلَّا الْمَسْحَ[٣].

واتە: ڕوبەییع ﭭ دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﭭ هات بۆلام، وە پرسیاری لێکردم دەربارەی ئەو فەرموودەیە، مەبەستی ئەو فەرمودەیەیە کە باسی کرد، کە پێغەمبەری خوا ﷺ (دەستنوێژی گرت و، پێیەکانی شۆرد) جا ئیبنو عەبباس ﭭ گوتی: خەڵکی جگە لە شۆردن نکوڵی دەکەن، وە منیش ئەوەی لە قورئاندا بینیومە تەنها مەسحە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١١ و ١١٣ و ١١٦، والترمذي: ٤٨ و ٤٩، والنسائي: ٩٤ و ٩٥ و ٩٦ و ١١٥.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢١ و ١٢٢ و ١٢٣.

(٣) حسن دون: «فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ النَّاسَ أَبَوْا إِلاَّ الْغَسْلَ، وَلاَ أَجِدُ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلاَّ الْمَسْحَ». فإنه منكر.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی ئەو دەستنوێژە هاتووە کە خوا فەرمانی پێکردوە

**٤٥٩-** عَنْ جَامِعِ بْنِ شَدَّادٍ أَبِي صَخْرَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ حُمْرَانَ، يُحَدِّثُ أَبَا بُرْدَةَ فِي الْمَسْجِدِ أَنَّهُ سَمِعَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَتَمَّ الْوُضُوءَ، كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ، فَالصَّلَاةُ الْمَكْتُوبَاتُ، كَفَّارَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ»(١).

واتە: جامیعی کوڕی شەددادی ئەبو صەخرە دەڵێ: گوێم لە حومڕان بوو، لە مزگەوتدا بۆ ئەبو بوڕدەی دەگێڕایەوە کە گوێی لە عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بووە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک دەستنوێژ بە تەواوی بگرێ، بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی پێکردوە، ئەوە نوێژە واجبەکان، هۆی لێخۆشبوونی ئەو تاوانەن کە لە نێوانیان دان.

**٤٦٠-** عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ، أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّهَا لَا تَتِمُّ صَلَاةٌ لِأَحَدٍ، حَتَّى يُسْبِغَ الْوُضُوءَ، كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ تَعَالَى، يَغْسِلُ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَيَمْسَحُ بِرَأْسِهِ، وَرِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ»(٢).

واتە: ڕیفاعەی کوڕی ڕافیع ﷺ دەگێڕێتەوە، لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، ئەویش فەرمووی: نوێژی هیچ یەکێکتان تەواو نیە، تاکو دەستنوێژێکی تێر و تەواو نەگرێ، بە شێوازێک کە خوای بەرز فەرمانی پێکردوە (ئەویش بەو شێوەیەیە): ڕووخساری بشۆرێ، هەروەها دەستەکانی تاکو ئانیشکەکان، وە مەسحی سەری بکات وە پێیەکانی تاکو گوێزینگەکانی.

## بابەت: ئاو پڕژاندن لەدوای دەستنوێژ

**٤٦١-** عَنِ الْحَكَمِ بْنِ سُفْيَانَ الثَّقَفِيِّ ﷺ، «أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ، ثُمَّ أَخَذَ كَفًّا مِنْ مَاءٍ، فَنَضَحَ بِهِ فَرْجَهُ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٣١، والنسائي: ١٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٥٧ و ٨٦١، والترمذي: ٣٠٢، والنسائي: ١٠٥٣ و ١١٣٦ و ١٣١٣ و ١٣١٤.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٦ و ١٦٧ و ١٦٨، والنسائي: ١٣٤ و ١٣٥.

واتە: حەکەمی کوڕی سوفیانی سەقەفیی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوای ﷺ بینی دەستنوێژی هەڵگرت، پاشان لوێچێک ئاوی هەڵگرت و پڕژاندی بەسەر داوێنیدا.

**٤٦٢-** عَنْ زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَّمَنِي جِبْرَائِيلُ الْوُضُوءَ، وَأَمَرَنِي أَنْ أَنْضَحَ تَحْتَ ثَوْبِي، لِمَا يَخْرُجُ مِنَ الْبَوْلِ بَعْدَ الْوُضُوءِ»[1].

واتە: زەیدی کوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جیبرائیل فێری دەستنوێژگرتنی کردم، وە فەرمانی پێکردم کە ئاو بپرژێنم بە ژێر پۆشاکەکەمدا، لەبەر ئەو میزەی کە لە دوای دەستنوێژ دێتە دەرەوە.

**٤٦٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَوَضَّأْتَ، فَانْتَضِحْ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک دەستنوێژت گرت، ئاو بپرژێنە (بەسەر داوێنتدا).

**٤٦٤-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «تَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَنَضَحَ فَرْجَهُ»[3].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی هەڵگرت، پاشان ئاوی پڕژاند بەسەر داوێنیدا.

## بابەت: بەکارهێنانی خاولی
## دوای دەستنوێژ گرتن و دوای خۆشۆردن

**٤٦٥-** عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، حَدَّثَتْهُ أَنَّهُ لَمَّا كَانَ عَامُ الْفَتْحِ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى غُسْلِهِ، فَسَتَرَتْ عَلَيْهِ فَاطِمَةُ بِثَوْبٍ، ثُمَّ أَخَذَ ثَوْبَهُ، فَالْتَحَفَ بِهِ»[4].

---

(١) حسن دون الأمر.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٥٠.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٠ و ٣٥٧ و ٣١٧١ و ٦١٥٨، ومسلم: ٣٣٦، والترمذي: ١٥٧٩ و ٢٧٣٤، والنسائي: ٢٢٥.

واتە: ئوممو هانیئی کچی ئەبو تاڵیب ﵂ دەگێڕێتەوە کە لەساڵی ڕزگارکردنەکەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بۆ ئەوەی خۆی بشۆرێ، جا فاتیمە پۆشاکێکی بۆ گرتەوە (بۆئەوەی لە پشتی ئەوەوە خۆی بشۆرێ)، پاشان (کە تەواو بوو) پۆشاکەکەی خۆی هەڵگرت و لە خۆیەوە پێچا (لە خۆی ئاڵاند).

٤٦٦- عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ ﵁، قَالَ: «أَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ فَوَضَعْنَا لَهُ مَاءً، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ أَتَيْنَاهُ بِمِلْحَفَةٍ، وَرْسِيَّةٍ، فَاشْتَمَلَ بِهَا، فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى أَثَرِ الْوَرْسِ عَلَى عُكَنِهِ»[1].

واتە: قەیسی کوڕی سەعد ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هاتە ماڵمان، جا ئاومان هێنایە خزمەتی، ئەویش خۆی شۆرد، پاشان چەرچەفێکی ڕەنگ سورمان بۆ هێنا، ئەویشی بەکارهێنا (خۆی پێ وشک کردەوە)، ئێستا وەکو ئەوە وایە سەیری شوێنەواری ڕەنگە سورەکە بکەم لەسەر لۆچی سکی پێغەمبەر ﷺ.

٤٦٧- عَنْ مَيْمُونَةَ ﵂، قَالَتْ: «أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِثَوْبٍ، حِينَ اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَرَدَّهُ، وَجَعَلَ يَنْفُضُ الْمَاءَ»[2].

واتە: مەیمونە ﵂ دەڵێ: پۆشاکێکم هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لە کاتێکدا خۆی دەشۆرد لە لەشگرانی، ئەویش وەری نەگرت، وە بە دەستی ئاوەکەی لە لەشی ڕادەماڵی (دەتەکاند).

٤٦٨- عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «تَوَضَّأَ، فَقَلَبَ جُبَّةَ صُوفٍ كَانَتْ عَلَيْهِ، فَمَسَحَ بِهَا وَجْهَهُ»[3].

واتە: سەلمانی فارسیی ﵁ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، پاشان بە بەرگی ناوەوەی جبە خورییەکەی ڕووخساری وشک کردەوە.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٩، ومسلم: ٣١٧، وأبو داود: ٢٤٥، والنسائي: ٢٥٣ و ٤١٨ و ٤١٩.

(٣) حسن.

## بابەت: ئەوەی کە دەگوترێ دوای دەستنوێژ

٤٦٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ قَالَ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فُتِحَ لَهُ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، مِنْ أَيِّهَا شَاءَ، دَخَلَ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: هەر کەس دەستنوێژی گرت، جا بە باشترین شێوە دەستنوێژەکەی گرت، پاشان سێ جار گوتی: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»، هەر هەشت دەرگایەکەی بەهەشتی بۆ دەکرێنەوە، لە کامەیانەوە ویستی دەچێتە ژوورەوە.

٤٧٠- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ، فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ»[2].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ مسوڵمانێک نیە دەستنوێژ بشۆرێ، جا بە جوانترین (باشترین) شێواز دەستنوێژ بگرێ، پاشان بڵێ: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»، بێگومان هەر هەشت دەرگایەکەی بەهەشتی بۆ دەکرێنەوە، لە کامەیانی پێخۆش بوو دەچێتە ژوورەوە.

## بابەت: دەستنوێژ گرتن بە ئاوی قاپ و دەفری مس

٤٧١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ صَاحِبِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَخْرَجْنَا لَهُ مَاءً فِي تَوْرٍ مِنْ صُفْرٍ، فَتَوَضَّأَ بِهِ»[3].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٣٤، وأبو داود: ١٦٩، والترمذي: ٥٥، والنسائي: ١٤٨. وزاد الترمذي: «اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ وَمِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ».

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٠.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەید ﷺ هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاتە لامان، ئێمەش لە جامێکی مسدا ئاومان بۆ هێنا، ئەویش دەستنوێژی تێداگرت.

**٤٧٢-** عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ ﷺ «أَنَّهُ كَانَ لَهَا مِخْضَبٌ مِنْ صُفْرٍ قَالَتْ: كُنْتُ أُرَجِّلُ رَأْسَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِيهِ»[١].

واتە: زەینەبی کچی جەحش ﷺ کە تەشتێکی مسی هەبوو، دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: من قژی پێغەمبەری خوام ﷺ تێدا شانە دەکرد.

**مِخْضَبٌ:** تەشتێکە پۆشاکی تێدا دەشۆرێ، یان خۆی تێدا دەشۆررێ.

**٤٧٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «تَوَضَّأَ فِي تَوْرٍ»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە جامێکی مسدا دەستنوێژی گرت.

## بابەت: دەستنوێژ گرتنەوە لە خەو

**٤٧٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنَامُ حَتَّى يَنْفُخَ، ثُمَّ يَقُومُ، فَيُصَلِّي، وَلَا يَتَوَضَّأُ» قَالَ الطَّنَافِسِيُّ: قَالَ وَكِيعٌ: تَعْنِي وَهُوَ سَاجِدٌ[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەخەوت تاوەکو پرخەی ئەهات، پاشان هەڵئەسا و نوێژی دەکرد، وە دەستنوێژی نەدەگرتەوە، تەنافیسی دەڵێ: وەکیع گوتی: مەبەستی ئەوەیە لە حاڵەتی سوجدەبردن دابووە.

**٤٧٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «نَامَ حَتَّى نَفَخَ، ثُمَّ قَامَ، فَصَلَّى»[٤].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت تاوەکو پرخەی هات، پاشان هەڵسا و نوێژی کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥، والنسائي: ٥٠.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




٤٧٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ نَوْمُهُ ذَلِكَ، وَهُوَ جَالِسٌ، يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: نوستنەکەی بەو جۆرە بوو، ئەویش دانیشتبوو، مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوو.

٤٧٧- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْعَيْنُ وِكَاءُ السَّهِ، فَمَنْ نَامَ، فَلْيَتَوَضَّأْ»[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاو کۆنترۆڵی بەشی دواوەی مرۆڤە، بۆیە هەر کەسێک خەوت، با دەستنوێژ بگرێتەوە (واتە: مرۆڤ کە خەوی لێکەوت نازانێ لە دواوەی چی ڕوودەدات).

٤٧٨- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُنَا، أَنْ لَا نَنْزِعَ خِفَافَنَا، ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، إِلَّا مِنْ جَنَابَةٍ، لَكِنْ مِنْ غَائِطٍ، وَبَوْلٍ، وَنَوْمٍ»[٣].

واتە: صەفوانی کوڕی عەسسال ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدەکردین، تا سێ ڕۆژ لەبەر چوونە سەرئاو، یان لەبەر خەوتن خوففەکانمان دانەنێین، مەگەر لە کاتی (تووش بوون بە) لەشگرانی.

## بابەت: دەستنوێژ گرتنەوە لە دەست لێدانی ئەندامی نێرینە

٤٧٩- عَنْ بُسْرَةَ بِنْتِ صَفْوَانَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا مَسَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ، فَلْيَتَوَضَّأْ»[٤].

واتە: بوسڕەی کچی صەفوان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لەئێوە دەستی لە داوێنی خۆیدا، با دەستنوێژ بگرێتەوە.

٤٨٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا مَسَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ، فَعَلَيْهِ الْوُضُوءُ»[٥].

---

(١) منكر. أخرجه أبو داود: ٢٠٢، والترمذي: ٧٧.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠٣.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٩٦، والنسائي: ١٢٦ و ١٢٧ و ١٥٩.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨١، والترمذي: ٨٢ و ٨٤، والنسائي: ١٦٣ و ٤٤٤_٤٤٧.

(٥) صحيح لغيره.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لەئێوە دەستی لە داوێنی خۆیدا، لەسەری پێویستە دەستنوێژ بگرێتەوە.

٤٨١- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﷺ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ مَسَّ فَرْجَهُ، فَلْيَتَوَضَّأْ»(١).

واتە: ئوممو حەبیبە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک دەستی لە داوێنی خۆیدا، با دەستنوێژ بگرێتەوە.

٤٨٢- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ مَسَّ فَرْجَهُ، فَلْيَتَوَضَّأْ»(٢).

واتە: ئەبو ئەییوب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک دەستی لە داوێنی خۆیدا، با دەستنوێژ بگرێتەوە.

## بابەت: مۆڵەتدان لەو بابەتە

٤٨٣- عَنْ قَيْسَ بْنَ طَلْقٍ الْحَنَفِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، سُئِلَ عَنْ مَسِّ الذَّكَرِ، فَقَالَ: «لَيْسَ فِيهِ وُضُوءٌ، إِنَّمَا هُوَ مِنْكَ»(٣).

واتە: قەیسی کوڕی تەڵقی حەنەفیی لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: گوێم لێبوو پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ، دەربارەی دەست کەوتن بە داوێن، ئەویش فەرمووی: دەستنوێژ گرتنەوەی لەسەر نیە، بێگومان داوێنیش هەر بەشێکە لە لاشەی خۆت.

٤٨٤- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ مَسِّ الذَّكَرِ، فَقَالَ: «إِنَّمَا هُوَ جِذْيَةٌ مِنْكَ»(٤).

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی دەست کەوتن بە داوێن (ئایا دەستنوێژ دەشکێنێ؟)، ئەویش ﷺ فەرمووی: داوێنیش پارچەیەکە لە خۆت (واتە: دەستنوێژ ناشکێنێ).

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ١٨٢ و ١٨٣، والترمذي: ٨٥، والنسائي: ١٦٥.

(٤) ضعيف جداً.




## بابەت: دەستنوێژ گرتنەوە لەو شتەی بەر ئاگر دەکەوێ

٤٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «تَوَضَّئُوا مِمَّا غَيَّرَتِ النَّارُ» فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: أَتَوَضَّأُ مِنَ الْحَمِيمِ؟ فَقَالَ لَهُ: يَا ابْنَ أَخِي، إِذَا سَمِعْتَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا، فَلَا تَضْرِبْ لَهُ الْأَمْثَالَ[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستنوێژ بگرنەوە لەوەی کە بە ئاگر گۆڕاوە (واتە: کوڵابێ، یان سوورکرابێتەوە، یان ئاگری بەرکەوتبێ)، جا ئیبنو عەبباس ﷺ گوتی: ئایا لە ئاوی کوڵاو دەستنوێژ بگرمەوە؟ (ئەبو هورەیرە) پێی وت: ئەی برازای خۆم، ئەگەر فەرموودەیەکت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیست، ئەوە نمونەی بۆ مەهێنەوە (نمونەی نامەعقول).

٤٨٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَوَضَّئُوا، مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستنوێژ بگرنەوە لە هەر چییەک کە ئاگری بەرکەوتبێ.

٤٨٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ يَضَعُ يَدَيْهِ عَلَى أُذُنَيْهِ وَيَقُولُ: صُمَّتَا، إِنْ لَمْ أَكُنْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «تَوَضَّئُوا، مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەستی لەسەر گوێیەکانی دادەناو دەیگوت: کەڕبن (ئەو گوێیانە) ئەگەر لە پێغەمبەری خوام ﷺ نەبیستبێ کە دەیفەرموو: دەستنوێژ بگرنەوە لە هەر شتێک کە ئاگری بەرکەوتبێ.

**تێبینی:** بە ڕاو بۆچوونی هەندێ لە زانایان ئەم فەرمانە لێرەدا سوننەتە نەک فەرز، سوننەتەکەش نەسخ بۆتەوەو حوکمەکەی هەڵوەشێنراوەتەوە، کەواتە: لە کاتی خواردنی هەر شتێکی گەرم و سوورکراوەو کوڵاودا، ئاساییە دەستنوێژ دووبارە نەشۆردرێتەوە.

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٩٤، والترمذي: ٧٩ واقتصر علي قوله: «الْوُضُوءُ مِماَّ مَسَّتِ النَّارُ». ٣٥٢، والنسائي: ١٧١_١٧٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٥٣.

(٣) ضعيف.

## بابەت: مۆڵەت لەو بارەوە

٤٨٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «أَكَلَ النَّبِيُّ ﷺ كَتِفًا، ثُمَّ مَسَحَ يَدَيْهِ بِمِسْحٍ كَانَ تَحْتَهُ، ثُمَّ قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَصَلَّى»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لاشانی بەرخێکی خوارد، پاشان دەستی سڕیەوە بە دەستەسڕێک کە لە ژێر دەستی بوو، پاشان هەڵسا بۆ نوێژ و، نوێژی کرد (واتە: دەستنوێژی نەگرتەوە).

٤٨٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «أَكَلَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ خُبْزًا وَلَحْمًا، وَلَمْ يَتَوَضَّئُوا»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر ﷺ و، عومەر ﷺ نان و گۆشتیان خوارد و، دەستنوێژیان هەڵنەگرتەوە.

٤٩٠- عَنْ الزُّهْرِيِّ ﷺ، قَالَ: حَضَرْتُ عَشَاءَ الْوَلِيدِ أَوْ عَبْدِ الْمَلِكِ. فَلَمَّا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ قُمْتُ، لِأَتَوَضَّأَ، فَقَالَ: جَعْفَرُ بْنُ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ: أَشْهَدُ عَلَى أَبِي أَنَّهُ شَهِدَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ أَكَلَ طَعَامًا، مِمَّا غَيَّرَتِ النَّارُ، ثُمَّ صَلَّى، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ وَقَالَ عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ وَأَنَا أَشْهَدُ عَلَى أَبِي بِمِثْلِ ذَلِكَ[٣].

واتە: زوهریی ﷺ دەڵێ: بۆ نانی ئێوارە لە ماڵی وەلید، یان عەبدولمەلیک بووم، جا کە کاتی نوێژ هات، هەڵسام بۆ ئەوەی دەستنوێژ بگرم، ئنجا جەعفەری کوڕی عەمڕی کوڕی ئومەییە گوتی: شاهێدی دەدەم بۆ باوکم کە شاهێدی داوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەوەی کە خواردنێکی خواردوە، لەوانەی کە بە ئاگر لێدەنرێن، پاشان نوێژی کردوە و دەستنوێژی نەگرتۆتەوە، وە عەلی کوڕی عەبباسیش ﷺ گوتی: منیش شاهێدی دەدەم بۆ باوکم کە هەمان قسەی جەعفەر گوتوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٧، ومسلم: ٣٥٤، وأبو داود: ١٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩١ بنحوه، والترمذي: ٨٠ ضمن قصة. وانظر النسائي: ١٨٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٨، ومسلم: ٣٥٥، والترمذي: ١٨٣٦.

٤٩١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: «أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِكَتِفِ شَاةٍ، فَأَكَلَ مِنْهُ، وَصَلَّى، وَلَمْ يَمَسَّ مَاءً»(١).

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: گۆشتی لاشانی بەرخێکیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش لێیخوارد و، نوێژی کرد، وە هەردەستیشی بەر ئاو نەکەوت (واتە: نەک دەستنوێژی نەگرتەوە، بەڵکو هەر دەستیشی لە ئاو نەدا).

٤٩٢- عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ ﵁ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُوَيْدُ بْنُ النُّعْمَانِ الْأَنْصَارِيُّ أَنَّهُمْ خَرَجُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى خَيْبَرَ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالصَّهْبَاءِ، «صَلَّى الْعَصْرَ، ثُمَّ دَعَا بِأَطْعِمَةٍ، فَلَمْ يُؤْتَ، إِلَّا بِسَوِيقٍ، فَأَكَلُوا وَشَرِبُوا، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَمَضْمَضَ فَاهُ، ثُمَّ قَامَ، فَصَلَّى بِنَا الْمَغْرِبَ»(٢).

واتە: بوشەیری کوڕی یەسار ﵁ دەڵێ: سوەیدی کوڕی نوعمانی ئەنصاڕی هەواڵی پێداین کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوون بۆ خەیبەر، تاوەکو گەیشتنە صەهباء (شوێنێکە لە نزیک خەیبەر)، (پێغەمبەر ﷺ) نوێژی عەسری کرد، پاشان داوای خواردنی کرد، تەنیا ئاردێکی زۆر وردیان بۆ هێنا، جا خواردیان و خواردیانەوە، پاشان داوای ئاوی کرد، جا ئاوی لە دەمی وەرکرد، پاشان هەڵساو نوێژی ئێوارەی بۆ کردین.

٤٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَكَلَ كَتِفَ شَاةٍ، فَمَضْمَضَ، وَغَسَلَ يَدَيْهِ، وَصَلَّى»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لاشانی بەرخێکی خوارد، پاشان ئاوی لە دەمی وەرداو دەستەکانی شۆردو نوێژی کرد.

## بابەت: ئەوەی هاتووە دەربارەی دەستنوێژ گرتنەوە لە (خواردنی) گۆشتی حوشتر

٤٩٤- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْوُضُوءِ مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ؟ فَقَالَ «تَوَضَّئُوا مِنْهَا»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٨٢٩ بنحوه، والنسائي: ١٨٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٩، والنسائي: ١٨٦.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨٤ و ٤٩٣، والترمذي: ٨١.




واتە: بەرِائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی دەستنوێژ گرتنەوە دوای خواردنی گۆشتی حوشتر، ئەویش فەرمووی: (کە خواردتان) دەستنوێژی لێبگرنەوە.

٤٩٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَتَوَضَّأَ، مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ، وَلَا نَتَوَضَّأَ، مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ»(١).

واتە: جابیری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووین کە لە دوای خواردنی گۆشتی حوشتر دەستنوێژ بگرینەوە، بەڵام لە دوای خواردنی گۆشتی مەڕ دەستنوێژ نەگرینەوە.

٤٩٦- عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَتَوَضَّئُوا مِنْ أَلْبَانِ الْغَنَمِ، وَتَوَضَّئُوا مِنْ أَلْبَانِ الْإِبِلِ»(٢).

واتە: ئوسەیدی کوڕی حوزەیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە (خواردنی) بەرهەمە شیرییەکانی مەڕ دەستنوێژ مەگرنەوە، وە لە (خواردنی) بەرهەمە شیرییەکانی حوشتر دەستنوێژ بگرنەوە.

٤٩٧- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «تَوَضَّئُوا مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ، وَلَا تَتَوَضَّئُوا مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ، وَتَوَضَّئُوا مِنْ أَلْبَانِ الْإِبِلِ، وَلَا تَوَضَّئُوا مِنْ أَلْبَانِ الْغَنَمِ، وَصَلُّوا فِي مُرَاحِ الْغَنَمِ، وَلَا تُصَلُّوا فِي مَعَاطِنِ الْإِبِلِ»(٣).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەستنوێژ بگرنەوە لە گۆشتی حوشتر، وە دەستنوێژ مەگرنەوە لە گۆشتی مەڕ، وە دەستنوێژ بگرنەوە لە بەرهەمە شیرییەکانی حوشتر، وە دەستنوێژ مەگرنەوە لە بەرهەمە شیرییەکانی مەڕ، وە نوێژ بکەن لە مۆڵگەی مەڕدا، وە نوێژ مەکەن لە مۆڵگەی حوشتردا.

**مُرَاح:** شوێنی مۆڵ و مانەوەی مەڕە.

**مَعَاطِن:** شوێنی مۆڵ و مانەوەی حوشترە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٦٠.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.




## بابەت: ئاو لە دەم وەردان لە شیر خواردنەوە

٤٩٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَضْمِضُوا مِنَ اللَّبَنِ؛ فَإِنَّ لَهُ دَسَمًا»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئاو لە دەمتان ڕادەن دوای شیر خواردنەوە، چونکە بێگومان چەوری تێدایە.

٤٩٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَرِبْتُمُ اللَّبَنَ فَمَضْمِضُوا؛ فَإِنَّ لَهُ دَسَمًا»(٢).

واتە: ئوممو سەلەمەی ﷺ هاوسەری پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاتێک شیرتان خواردەوە ئاو لە دەمتان ڕادەن، چونکە بێگومان چەوری تێدایە.

٥٠٠- عَنْ عَبْدُ الْمُهَيْمِنِ بْنُ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَضْمِضُوا مِنَ اللَّبَنِ؛ فَإِنَّ لَهُ دَسَمًا»(٣).

واتە: عبدالموهەیمینی کوڕی عەبباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدی ساعدیی لە باوکییەوە، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاو لە دەم ڕادەن دوای شیر خواردنەوە، چونکە بێگومان چەوری تێدایە.

٥٠١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «حَلَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَاةً، وَشَرِبَ مِنْ لَبَنِهَا، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَمَضْمَضَ فَاهُ، وَقَالَ: «إِنَّ لَهُ دَسَمًا»(٤).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مەڕێکی دۆشی و، لە شیرەکەی خواردەوە، پاشان داوای ئاوی کرد، ئنجا ئاوی لە دەمی ڕاداو فەرمووی: بێگومان چەوری تێدایە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١١، ومسلم: ٣٥٨، وأبو داود: ١٩٦، والترمذي: ٨٩، والنسائي: ١٨٧.

(٢) صحيح.

(٣) حسن بشواهده.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٩٧.

## بابەت: دەستنوێژ گرتنەوە لە ماچ کردن

٥٠٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «قَبَّلَ بَعْضَ نِسَائِهِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ» قُلْتُ: مَا هِيَ إِلَّا أَنْتِ «فَضَحِكَتْ»(١).

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێک لە هاوسەرەکانی ماچ کرد، پاشان چووە دەرەوە (بۆ مزگەوت) بۆ نوێژکردن و، دەستنوێژی هەڵنەگرتەوە، (ڕاوی دەڵێ:) گوتم: مەگەر کێ بوو جگە لەتۆ (مەبەستی خاتوو عائیشەیە ﵂)، ئەویش پێکەنی.

٥٠٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يُقَبِّلُ وَيُصَلِّي وَلَا يَتَوَضَّأُ، وَرُبَّمَا فَعَلَهُ بِي»(٢).

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی دەگرت و پاشان ماچی (هاوسەرەکانی) دەکرد و نوێژی دەکرد، بێ ئەوەی دەستنوێژ بگرێتەوە، وە هەندێ جار ئەوەی لەگەڵ منیش کردوە.

## بابەت: دەستنوێژ گرتنەوە لە مەزی

٥٠٤- عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمَذْيِ فَقَالَ: «فِيهِ الْوُضُوءُ، وَفِي الْمَنِيِّ الْغُسْلُ»(٣).

واتە: عەلی ﵁ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی مەزی (ئایا دەستنوێژ دەشکێنێ)، ئەویش فەرمووی: پێویستە دەستنوێژی بۆ بگیرێتەوە، وە بۆ مەنی پێویستە خۆی بۆ بشۆردرێ (واتە: مەزی دەستنوێژ دەشکێنێ بەڵام خۆشۆردن واجب ناکات، بەڵام مەنی خۆشتن واجب دەکات).

٥٠٥- عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الْأَسْوَدِ ﵁، أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَدْنُو مِنَ امْرَأَتِهِ، فَلَا يُنْزِلُ قَالَ: «إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ ذَلِكَ، فَلْيَنْضَحْ فَرْجَهُ - يَعْنِي لِيَغْسِلْهُ - وَيَتَوَضَّأْ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٨ و ١٧٩، والترمذي: ٨٦، والنسائي: ١٧٠.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٦، والترمذي: ١١٤، والنسائي: ١٩٣ و ١٩٤ بنحوه. وانظر البخاري: ١٣٢، ومسلم: ٣٠٣.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٧، والنسائي: ١٥٦ و ٤٤٠.

واتە: میقدادی كوڕی ئەسوەد ﷺ دەگێڕێتەوە كە پرسیاری كرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی پیاوێک كە لە هاوسەرەكەی (ژنەكەی) نزیک ببێتەوە، بەڵام لەگەڵی جووت نەبێ، جا تەواو نەبێ (ئاوی نەیەتەوە)، ئەویش فەرمووی: ئەگەر یەكێک لە ئێوە ئەو حاڵەتەی بەسەر هات، با دامێنی ئاوپڕژێن بكات (بیشۆرێ) وە دەستنوێژ بگرێتەوە.

٥٠٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ أَلْقَى مِنَ الْمَذْيِ شِدَّةً، فَأُكْثِرُ مِنْهُ الِاغْتِسَالَ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّمَا يُجْزِيكَ مِنْ ذَلِكَ الْوُضُوءُ» قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ بِمَا يُصِيبُ ثَوْبِي؟ قَالَ: «إِنَّمَا يَكْفِيكَ كَفٌّ مِنْ مَاءٍ تَنْضَحُ بِهِ مِنْ ثَوْبِكَ حَيْثُ تَرَى أَنَّهُ أَصَابَ»[1].

واتە: سەهلی كوڕی حونەیف ﷺ دەڵێ: من لەوانە بووم كە زۆر لە هاتنە خوارەوەی مەزیم ناڕەحەت (بێزار) بووم، وە بەردەوام خۆم دەشۆردەوە، بۆیە پرسیارم كرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: بە تەنها دەستنوێژ گرتنەوەت بەسە، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەوەی بەر پۆشاكەكەم دەكەوێ چی؟ فەرمووی: تەنها لوێچە ئاوێكت بەسە كە بیپڕژێنی بەسەر پۆشاكەكەتدا بە جۆرێک كە پێتوابێ ئاوەكە بەری كەوتووە (بەر ئەو شوێنە كە مەزییەكەی پێوەیە).

٥٠٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ أَتَى أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ، وَمَعَهُ عُمَرُ، فَخَرَجَ عَلَيْهِمَا، فَقَالَ: «إِنِّي وَجَدْتُ مَذْيًا، فَغَسَلْتُ ذَكَرِي، وَتَوَضَّأْتُ» فَقَالَ: عُمَرُ: أَوَيُجْزِئُ ذَلِكَ؟ قَالَ: «نَعَمْ» قَالَ: أَسَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «نَعَمْ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، چووە بۆ لای ئوبەی كوڕی كەعب و عومەریشی لەگەڵدا بووە، جا ئوبەی هاتە دەرەوە بۆ لایان و گوتی: مەزیم بینی (بە لاشەمەوە) دامێنم شۆردەوە و دەستنوێژم شوشت، عومەریش گوتی: ئەوەندە بەسە؟ گوتی: بەڵێ، عومەر گوتی: ئەوەت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوە؟ گوتی: بەڵێ.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢١٠، والترمذي: ١١٥.

(٢) ضعيف.

## بابەت: دەم و چاو شۆردنی لە خەو هەڵسان و خەوتنەوە

٥٠٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «قَامَ مِنَ اللَّيْلِ، فَدَخَلَ الْخَلَاءَ، فَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ، ثُمَّ نَامَ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەو لە خەو هەڵسا، ئنجا چوو بۆ سەرئاو و، سەرئاوی کرد، پاشان (کە هاتە دەرەوە) دەم و چاو و هەردوو دەستی شۆرد، پاشان خەوتەوە.

٥٠٨م- حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ خَلَّادٍ الْبَاهِلِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنَا سَلَمَةُ بْنُ كُهَيْلٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا بُكَيْرٌ، عَنْ كُرَيْبٍ قَالَ: فَلَقِيتُ كُرَيْبًا، فَحَدَّثَنِي عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَ نَحْوَهُ(٢).

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەستنوێژ گرتنەوە بۆ هەر نوێژێک وە کردنی هەموو نوێژەکان بە دەستنوێژێک

٥٠٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، وَكُنَّا نَحْنُ نُصَلِّي الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ»(٣).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژی دەگرتەوە، بەڵام ئێمە هەموو نوێژەکانمان بەیەک دەستنوێژ دەکرد.

٥١٠- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ صَلَّى الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣١٦، ومسلم: ٣٠٤، وأبو داود: ٥٠٤٣، والنسائي: ١١٢١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣١٦، ومسلم: ٣٠٤، وأبو داود: ٥٠٤٣، والنسائي: ١١٢١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤، وأبو داود: ١٧١، والترمذي: ٦٠، والنسائي: ١٣١.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٧، وأبو داود: ١٧٢، والترمذي: ٦١، والنسائي: ١٣٣.

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژی دەگرتەوە، بەڵام ئەو ڕۆژەی مەککە ئازاد کرا، هەموو نوێژەکانی بە یەک دەستنوێژ کرد.

**٥١١-** عَنْ الْفَضْلُ بْنُ مُبَشِّرٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ «يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ» فَقُلْتُ مَا هَذَا؟ فَقَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ هَذَا، فَأَنَا أَصْنَعُ كَمَا صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»(١).

واتە: فەزڵی کوڕی موبەششیر ﷺ دەڵێ: بینیم جابیری کوڕی عەبدوڵڵا هەموو نوێژەکانی بە یەک دەستنوێژ دەکرد، منیش گوتم: ئەوە چییە؟ گوتی: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیەی دەکرد، منیش هەر بەو جۆرە دەکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی.

## بابەت: دەستنوێژ گرتن لەسەر دەستنوێژ (دەستنوێژ نوێکردنەوە)

**٥١٢-** عَنْ أَبِي غُطَيْفٍ الْهُذَلِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فِي مَجْلِسِهِ فِي الْمَسْجِدِ، فَلَمَّا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ قَامَ فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى، ثُمَّ عَادَ إِلَى مَجْلِسِهِ، فَلَمَّا حَضَرَتِ الْعَصْرُ قَامَ فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى، ثُمَّ عَادَ إِلَى مَجْلِسِهِ، فَلَمَّا حَضَرَتِ الْمَغْرِبُ قَامَ فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى، ثُمَّ عَادَ إِلَى مَجْلِسِهِ، فَقُلْتُ: أَصْلَحَكَ اللَّهُ، أَفَرِيضَةٌ، أَمْ سُنَّةٌ الْوُضُوءُ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ، قَالَ: أَوَفَطِنْتَ إِلَيَّ، وَإِلَى هَذَا مِنِّي؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: لَا لَوْ تَوَضَّأْتُ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ، لَصَلَّيْتُ بِهِ الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا، مَا لَمْ أُحْدِثْ، وَلَكِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَوَضَّأَ عَلَى كُلِّ طُهْرٍ، فَلَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ، وَإِنَّمَا رَغِبْتُ فِي الْحَسَنَاتِ»(٢).

واتە: ئەبو غوتەیفی هوزەلیی ﷺ دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گرتبوو لە کۆڕەکەیدا لە مزگەوت، جا کە کاتی نوێژ هات هەڵسا و دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد، پاشان گەڕایەوە بۆ کۆڕەکەی، کە کاتی نوێژی عەصر هات هەڵسا و دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد، پاشان گەڕایەوە بۆ کۆڕەکەی، کە کاتی نوێژی ئێوارە هات هەڵسا و دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد، پاشان گەڕایەوە

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٩١.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٦٢، والترمذي: ٥٩.

بۆ کوڕەکەی، منیش گوتم: خوا چاکەت بۆ بکات، ئایا دەستنوێژ گرتنەوە بۆ هەموو نوێژێک واجبە یان سوننەتە؟ گوتی: ئایا ئاگاداری من بووی و ئاگاداری ئەو کارەی من بووی؟ گوتم: بەڵێ، ئەویش گوتی: نەخێر، ئەگەر دەستنوێژ بگرم بۆ نوێژی بەیانی ئەوە هەموو نوێژەکانی ڕۆژەکەی پێدەکەم، مادەم دەستنوێژم نەشکاوە، بەڵام گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێک دەستنوێژ بگرێت لەسەر پاکی (واتە: لەکاتێکدا دەستنوێژیشی هەبێ)، ئەوا دە چاکەی بۆ دەنوسرێ، منیش حەزم لە چاکەکارییە.

## بابەت: نەشکان و هەڵنەگرتنەوەی دەستنوێژ مەگەر دوای بێ دەستنوێژ بوون

**٥١٣-** عَنْ عَبَّادُ بْنُ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ قَالَ: شُكِيَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ الرَّجُلُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «لَا، حَتَّى يَجِدَ رِيحًا، أَوْ يَسْمَعَ صَوْتًا»(١).

واتە: عەببادی کوڕی تەمیم ﷺ لە مامیەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پیاوێک سکاڵای حاڵی خۆی بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە نوێژدا هەست بە شتێک دەکات (واتە: دڵنیا نیە کە دەستنوێژی شکاوە، یاخود نا)، ئەویش فەرمووی: نەخێر (واتە: دەستنوێژت نەشکاوە)، تاوەکو هەست بە بۆنێک نەکا، یان گوێی لە دەنگێک نەبێت.

**٥١٤-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ التَّشَبُّهِ فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «لَا يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا، أَوْ يَجِدَ رِيحًا»(٢).

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی وەسوەسەو خوتخوتەی ناو نوێژ (کە سک قوڕە قوڕە دەکات)، ئەویش فەرمووی: نوێژەکەی نەبڕێ، تاوەکو گوێی لە دەنگێک نەبێت، یان هەست بە بۆنێک نەکا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٧، ومسلم: ٣٦١، وأبو داود: ١٧٦، والنسائي: ١٦٠.

(٢) صحيح لغيره.

**٥١٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا وُضُوءَ إِلَّا مِنْ صَوْتٍ أَوْ رِيحٍ»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستنوێژ گرتنەوە نیە، مەگەر لە کاتی بیستنی دەنگ، یان لە (هەستکردن بە) بۆن.

**٥١٦-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ يَشُمُّ ثَوْبَهُ، فَقُلْتُ: مِمَّ ذَاكَ؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا وُضُوءَ إِلَّا مِنْ رِيحٍ أَوْ سَمَاعٍ»[٢].

**واتە:** موحەممەدی کوڕی عەمڕی کوڕی عەتاء ﷺ دەڵێ: بینیم سائیبی کوڕی یەزید بۆنی جلەکانی دەکرد، گوتم: ئەوە بۆ وا دەکەی؟ ئەویش گوتی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: دەستنوێژ گرتنەوە نیە مەگەر لە بۆن، یاخود لە دەنگێک.

## بابەت: ئەندازەی ئەو ئاوەی کە پیس نابێ

**٥١٧-** عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، سُئِلَ عَنِ الْمَاءِ يَكُونُ بِالْفَلَاةِ مِنَ الْأَرْضِ، وَمَا يَنُوبُهُ مِنَ الدَّوَابِّ، وَالسِّبَاعِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا بَلَغَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يُنَجِّسْهُ شَيْءٌ»[٣].

**واتە:** عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پرسیاری لێکرا دەربارەی ئاوێک کە لە زەویەکی چۆڵەوانیدایە، وە ئەو جرو‌جانەوەرانەی کە تێیدەکەون و ئەو دڕندانەشی کە لێی دەخۆنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر (ئەندازەی) ئاوەکە گەیشتە دوو قوللە، ئەوە هیچ شتێک پیسی ناکات.

**٥١٧م-** حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ رَافِعٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جَعْفَرٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[٤].

**واتە:** ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٦٢، وأبو داود: ١٧٧ بنحوه، والترمذي: ٧٤.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦٣ و ٦٤، والترمذي: ٦٧ و ٣٢٨.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦٣ و ٦٤، والترمذي: ٦٧ و ٣٢٨.

٥١٨- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ، أَوْ ثَلَاثًا، لَمْ يُنَجِّسْهُ شَيْءٌ»[١].

واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئاو دوو قوللە، یان سێ قوللە بوو، ئەوە هیچ شتێک پیسی ناکات.

## بابەت: ئاوی حەوزەکان

٥١٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، سُئِلَ عَنِ الْحِيَاضِ الَّتِي بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، تَرِدُهَا السِّبَاعُ، وَالْكِلَابُ، وَالْحُمُرُ، وَعَنِ الطَّهَارَةِ مِنْهَا؟ فَقَالَ «لَهَا مَا حَمَلَتْ فِي بُطُونِهَا، وَلَنَا مَا غَبَرَ طَهُورٌ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﵁ دەگێڕێتەوە کە پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو گۆماوانەی کە لە نێوان مەککەو مەدینەدا بوون، وە ئەو دڕندە و سەگ و کەرانەی کە بەسەریدا دەڕۆن و لێی دەخۆنەوە، وە دەربارەی دەستنوێژ گرتن بەو ئاوە؟ ئەویش فەرمووی: ئەوەی کە خواردوویانەتەوە بۆ ئەوانە و ئەوەشی کە ماوەتەوە بۆ ئێمە پاک و پاک کەرەوەیە.

٥٢٠- عَنْ طَرِيفِ بْنِ شِهَابٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا نَضْرَةَ، يُحَدِّثُ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: انْتَهَيْنَا إِلَى غَدِيرٍ، فَإِذَا فِيهِ جِيفَةُ حِمَارٍ، قَالَ: فَكَفَفْنَا عَنْهُ، حَتَّى انْتَهَى إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ الْمَاءَ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ» فَاسْتَقَيْنَا، وَأَرْوَيْنَا، وَحَمَلْنَا[٣].

واتە: تەریفی کوڕی شیهاب ﵁ دەڵێ: گوێم لە ئەبو نەزرە بوو، لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ﵄ دەیگێڕایەوە کە گوتوویەتی: گەیشتینە غەدیر (گۆماوێک بوو)، جا لە ناویدا لاشەی کەرێکی تێدابوو کە بۆگەنی کردبوو، ئێمەش وازمان لە ئاوەکە هێنا (بەکارمان نەهێنا)، تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە لامان و فەرمووی: بە دڵنیایی هیچ شتێک ئاو پیس ناکات. ئێمەش لێیان هەڵێنجاو لێیان خواردەوە و لێیان هەڵگرت.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦٣ و ٦٤، والترمذي: ٦٧، والنسائي: ٣٢٨.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح دون قصة الجيفة.

**٥٢١-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْمَاءَ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ إِلَّا مَا غَلَبَ عَلَى رِيحِهِ وَطَعْمِهِ وَلَوْنِهِ»(١).

**واتە:** ئەبو ئومامەی باهیلیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هیچ شتێک ئاو پیس ناکات، مەگەر شتێک بەسەریدا زاڵبێ کە بۆن و تام و ڕەنگەکەی بگۆڕێ.

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی میزی منداڵی نێرینە هاتووە کە هێشتا تەنها شیری دایکی دەخوات

**٥٢٢-** عَنْ لُبَابَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ ﷺ، قَالَتْ: بَالَ الْحُسَيْنُ بْنُ عَلِيٍّ فِي حِجْرِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْطِنِي ثَوْبَكَ، وَالْبَسْ ثَوْبًا غَيْرَهُ، فَقَالَ: «إِنَّمَا يُنْضَحُ مِنْ بَوْلِ الذَّكَرِ وَيُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الْأُنْثَى»(٢).

**واتە:** لوبابەی کچی حاریس ﷺ دەڵێ: حوسەینی کوڕی عەلی میزی کرد بە خۆیدا لە ناو کۆشی پێغەمبەردا ﷺ، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکەکەتم بدەرێ و دانەیەکی دیکە بپۆشە، فەرمووی: میزی کوڕ تەنیا ئاوپڕژێن دەکرێ و میزی کچ دەشۆردرێتەوە.

**٥٢٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِصَبِيٍّ، فَبَالَ عَلَيْهِ، فَأَتْبَعَهُ الْمَاءَ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ»(٣).

**واتە:** عائیشە ﷺ دەڵێ: منداڵێکی کوڕیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، میزی کرد بە خۆیدا (لە ناو کۆشی پێغەمبەردا ﷺ)، ئەویش ئاوی بە شوێنی میزەکەدا کرد و نەیشۆردەوە.

**٥٢٤-** عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ ﷺ، قَالَتْ: «دَخَلْتُ بِابْنٍ لِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ، فَبَالَ عَلَيْهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ، فَرَشَّ عَلَيْهِ»(٤).

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٧٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٢، ومسلم: ٢٨٦، والنسائي: ٣٠٣.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٣، ومسلم: ٢٨٧، وأبو داود: ٣٧٤، والترمذي: ٧١، والنسائي: ٣٠٢.

واتە: ئوممو قەیسی کچی میحصەن ﷺ دەڵێ: کوڕێکی خۆم کە هێشتا خۆراکی نەخواردبوو (شیرە خۆرە بوو) بردمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا میزی بە خۆیدا کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئاوی کرد و، ئنجا ڕشاندی بەسەر ئەو شوێنەدا کە میزەکەی بەرکەوتبوو.

٥٢٥- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي بَوْلِ الرَّضِيعِ: «يُنْضَحُ بَوْلُ الْغُلَامِ، وَيُغْسَلُ بَوْلُ الْجَارِيَةِ» قَالَ أَبُو الْحَسَنِ بْنُ سَلَمَةَ، حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُوسَى بْنِ مَعْقِلٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ الْمِصْرِيُّ، قَالَ: سَأَلْتُ الشَّافِعِيَّ، عَنْ حَدِيثِ النَّبِيِّ ﷺ «يُرَشُّ مِنْ بَوْلِ الْغُلَامِ، وَيُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الْجَارِيَةِ، وَالْمَاءَانِ جَمِيعًا وَاحِدٌ» قَالَ: لِأَنَّ بَوْلَ الْغُلَامِ مِنَ الْمَاءِ وَالطِّينِ، وَبَوْلَ الْجَارِيَةِ مِنَ اللَّحْمِ وَالدَّمِ، ثُمَّ قَالَ لِي: «فَهِمْتَ؟» أَوْ قَالَ: «لَقِنْتَ؟» قَالَ، قُلْتُ: لَا. قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى، لَمَّا خَلَقَ آدَمَ، خُلِقَتْ حَوَّاءُ مِنْ ضِلْعِهِ الْقَصِيرِ، فَصَارَ بَوْلُ الْغُلَامِ مِنَ الْمَاءِ وَالطِّينِ، وَصَارَ بَوْلُ الْجَارِيَةِ مِنَ اللَّحْمِ وَالدَّمِ. قَالَ، قَالَ لِي: فَهِمْتَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ لِي: نَفَعَكَ اللَّهُ بِهِ[1].

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی میزی منداڵی شیرەخۆرە فەرموویەتی: میزی کوڕ ئاوپڕژێن دەکرێ و میزی کچ دەشۆردرێ. ئەبو حەسەنی کوڕی سەلەمە دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی موسای کوڕی مەعقیل بۆی گێڕاینەوە، گوتی: ئەبو یەمانی میصری بۆی گێڕاینەوە، گوتی: پرسیارم کرد لە شافیعی، دەربارەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: میزی کوڕ ئاوپڕژێن دەکرێ و میزی کچ دەشۆررێ، وە گوتم: خۆ هەردوو ئاوەکە هەر یەکن!! شافیعی گوتی: لەبەر ئەوەی میزی کوڕ لە ئاو و خۆڵ پێکهاتووە، وە میزی کچ لە گۆشت و خوێن پێکهاتوە، پاشان پێی گوتم: تێگەیشتی؟ یان گوتی: دڵنیا بوویت؟ دەڵێ: گوتم: نەخێر، ئەویش گوتی: خوای بەرز کاتێک ئادەمی دروستکرد، حەووای لە پەراسووی کورتی ئەو دروستکرا، بۆیە میزی کوڕ لە ئاو و خۆڵ پێکهاتووە، وە میزی کچ لە گۆشت و خوێن پێکهاتووە، دەڵێ: پێی گوتم: تێگەیشتی؟ گوتم: بەڵێ، پێی گوتم: خوا بە هۆی ئەوەوە سوودت پێبگەیەنێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٧٨، والترمذي: ٦١٠.




٥٢٦- عَنْ أَبُو السَّمْحِ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ خَادِمَ النَّبِيِّ ﷺ، فَجِيءَ بِالْحَسَنِ أَوِ الْحُسَيْنِ، فَبَالَ عَلَى صَدْرِهِ، فَأَرَادُوا أَنْ يَغْسِلُوهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «رُشَّهُ، فَإِنَّهُ يُغْسَلُ بَوْلُ الْجَارِيَةِ، وَيُرَشُّ مِنْ بَوْلِ الْغُلَامِ»[١].

واتە: ئەبو سەمح ﷺ دەڵێ: من خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ بووم، ئنجا حەسەن، یان حوسەینیان هێنا بۆ خزمەتی، ئەویش لەسەر سینگی پێغەمبەری خوا ﷺ میزی کرد بە خۆیدا، ویستیان بیشۆنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تەنیا ئاوپرژێنی بکەن، لەبەر ئەوەی میزی کچی بچکۆلە (شیرە خۆرە) دەشۆردێتەوە، بەڵام میزی کوڕی بچکۆلە ئاوپرژێن دەکرێ.

٥٢٧- عَنْ أُمِّ كُرْزٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَوْلُ الْغُلَامِ يُنْضَحُ، وَبَوْلُ الْجَارِيَةِ يُغْسَلُ»[٢].

واتە: ئوممو کورز ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: میزی کوڕی بچکۆلە ئاوپرژێن دەکرێ، وە میزی کچی بچکۆلە دەشۆردرێ.

## بابەت: ئەوەی کە زەوی میزی بەرکەوت چۆن پاک دەکرێتەوە

٥٢٨- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَالَ فِي الْمَسْجِدِ، فَوَثَبَ إِلَيْهِ بَعْضُ الْقَوْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُزْرِمُوهُ، ثُمَّ دَعَا بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ، فَصَبَّ عَلَيْهِ»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، دەشتەکییەک لە ناو مزگەوتدا میزی کرد، جا هەندێک لە خەڵکەکە لێی ڕاستبوونەوە هێرشی بکەنە سەر، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: پێی مەبڕن، پاشان داوای دۆلکەیەک ئاوی کرد، ئنجا ڕشتی بەسەر ئەو شوێنەدا کە میزەکەی پێداکرابوو.

٥٢٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: دَخَلَ أَعْرَابِيٌّ الْمَسْجِدَ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلِمُحَمَّدٍ وَلَا تَغْفِرْ لِأَحَدٍ مَعَنَا، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: «لَقَدْ احْتَظَرْتَ وَاسِعًا» ثُمَّ وَلَّى، حَتَّى إِذَا كَانَ فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ، فَشَجَ يَبُولُ، فَقَالَ: الْأَعْرَابِيُّ بَعْدَ أَنْ فَقِهَ، فَقَامَ إِلَيَّ بِأَبِي وَأُمِّي،

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٧٦، والنسائي: ٣٠٤.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠٢٥، ومسلم: ٢٨٤، والنسائي: ٥٣ و ١٤٨.

فَلَمْ يُؤَنِّبْ، وَلَمْ يَسُبَّ، فَقَالَ: «إِنَّ هَذَا الْمَسْجِدَ لَا يُبَالُ فِيهِ، وَإِنَّمَا بُنِيَ لِذِكْرِ اللَّهِ وَلِلصَّلَاةِ، ثُمَّ أَمَرَ بِسَجْلٍ مِنْ مَاءٍ، فَأُفْرِغَ عَلَى بَوْلِهِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: دەشتەکییەک هاتە مزگەوت، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، جا پیاوەکە گوتی: خوایە لە من و موحەممەد ﷺ خۆشبە و لە کەسی تر خۆشمەبە لەگەڵ ئێمە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و فەرمووی: بەڕاستی فراوانی (بەزەیی خوات) بەرتەسک کردەوە (خەڵکی دیکەت لێ بێبەش کرد)، پاشان (پیاوەکە) ڕۆیشت، تاکو گەیشتە گۆشەیەکی (لایەکی) مزگەوت، قاچەکانی لێک بڵاوکرد و میزی کرد، دوای ئەوەی دەشتەکییەکە تێگەیشت گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دایک و باوکەوە فیدای بم هەڵسا بەرانبەرم و سەرزەنشتی نەکردم و قسەی نەگونجاوی پێ نەگوتم، ئنجا فەرمووی: ئا ئەوە مزگەوتە نابێ میزی لێبکرێ، بەڵکو تەنها بۆ یادی خوا و نوێژکردن دروست کراوە، پاشان فەرمانی کرد کە دۆلکەیەک ئاوی بۆ بێنن، ئنجا بەسەر میزەکەی داکرد.

**٥٣٠-** عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ ﷺ، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّدًا، وَلَا تُشْرِكْ فِي رَحْمَتِكَ إِيَّانَا أَحَدًا، فَقَالَ: «لَقَدْ حَظَرْتَ وَاسِعًا، وَيْحَكَ أَوْ وَيْلَكَ» قَالَ: فَشَجَ يَبُولُ، فَقَالَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ: مَهْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعُوهُ» ثُمَّ دَعَا بِسَجْلٍ مِنْ مَاءٍ، فَصَبَّ عَلَيْهِ»[٢].

واتە: واسیلەی کوڕی ئەسقەع ﷺ دەڵێ: دەشتەکییەک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی خوایە بەزەییت بە من و موحەممەد ﷺ دابێتەوە، وە جگە لەو دوانەمان بەزەییت بە هیچ کەسێکی دیکەدا نەیێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی شتێکی زۆر فراوان (کە بەزەیی خوایە) بەرتەسک کردەوە، واوەیلا بۆ تۆ، یان وەیل بۆ تۆ، ڕاوی دەڵێ: ئنجا هەردوو قاچی لێک بڵاوکرد و میزی کرد، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گوتیان: وامەکە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: وازی لێ بێنن، پاشان داوای دۆلکەیەک ئاوی کرد، ئنجا ڕشتی بەسەر شوێنی میزەکەدا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٠، وأبو داود: ٣٨٠، والترمذي: ١٤٧، والنسائي: ٥٦ و ٣٣٠ و ١٢١٦ و ١٢١٧.

(٢) صحيح لغيره.

## بابەت: زەوی بەشێکی بەشەکەیتر پاک دەکاتەوە

**٥٣١-** عَنْ أُمِّ وَلَدٍ لِإِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، أَنَّهَا سَأَلَتْ أُمَّ سَلَمَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: إِنِّي امْرَأَةٌ أُطِيلُ ذَيْلِي، فَأَمْشِي فِي الْمَكَانِ الْقَذِرِ، فَقَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُطَهِّرُهُ مَا بَعْدَهُ»(١).

واتە: ئوممو وەلەدی ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پرسیاری لە ئوممو سەلەمەی ﷺ هاوسەری پێغەمبەر ﷺ کرد و گوتی: من ئافرەتێکم کراسەکەم درێژە و بە شوێنی پیسیشدا دەڕۆم، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر زەوییەکە دواتر پاکی دەکاتەوە (واتە: ئەگەر لە زەوی پاک خشا ئەوە پاک ئەبێتەوە).

**٥٣٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نُرِيدُ الْمَسْجِدَ، فَنَطَأُ الطَّرِيقَ النَّجِسَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأَرْضُ يُطَهِّرُ بَعْضُهَا بَعْضًا»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە دەمانەوێ بێین بۆ مزگەوت، بەڵام ڕێگایەکی دوور و درێژی پیسمان لە پێشە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەندێکی زەوی هەندێکی تری پاک دەکاتەوە.

**٥٣٣-** عَنْ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ ﷺ قَالَتْ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: إِنَّ بَيْنِي وَبَيْنَ الْمَسْجِدِ طَرِيقًا قَذِرَةً، قَالَ: «فَبَعْدَهَا طَرِيقٌ أَنْظَفُ مِنْهَا؟» قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «فَهَذِهِ بِهَذِهِ»(٣).

واتە: ئافرەتێکی بەنی عەبدولئەشهەل ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ، گوتم: بەڕاستی لە نێوان من (ماڵی من) و مزگەوت ڕێگایەکی پیس هەیە، فەرمووی: ئایا لە دوای ئەو ڕێگا پیسە هیچ ڕێگایەکی پاکتر هەیە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: کەواتە ئەوە بە ئەوە (واتە: ئەو زەوییە پیسە بەو زەوییە پاکە، پاک دەبێتەوە).

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٨٣، والترمذي: ١٤٣.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٤.

## بابەت: تۆقەکردن لەگەڵ کەسی لەشگران

٥٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ لَقِيَهُ النَّبِيُّ ﷺ فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ، وَهُوَ جُنُبٌ، فَانْسَلَّ، فَفَقَدَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: لَقِيتَنِي وَأَنَا جُنُبٌ، فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ حَتَّى أَغْتَسِلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «الْمُؤْمِنُ لَا يَنْجُسُ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە جارێکیان لە کۆڵانێکی مەدینەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی بینی، بەڵام لەبەر ئەوەی لەشگران بوو (لە جەنابەت دابوو)، خۆی پەنادا و، لە پێغەمبەر ﷺ ونبوو، پاشان (دوای غوسڵ دەرکردن) هاتەوە خزمەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی پرسی: ئەرێ ئەبو هورەیرە لە کوێ بووی؟ ئەویش گوتی: لەو کاتەی پێتگەیشتم لەشگران بووم، بۆیە حەزم نەکرد بەو شێوەیە لە خزمەتت دانیشم تاوەکو خۆم نەشۆم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڕوادار پیس نابێت.

٥٣٥- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ، فَلَقِيَنِي وَأَنَا جُنُبٌ، فَحِدْتُ عَنْهُ، فَاغْتَسَلْتُ، ثُمَّ جِئْتُ، فَقَالَ: «مَا لَكَ» قُلْتُ: كُنْتُ جُنُبًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْمُسْلِمَ لَا يَنْجُسُ»[2].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ هاتە دەرەوە، پێمگەیشت و منیش لەشگران بووم، بۆیە خۆم لێ لادا، ئنجا چووم خۆم شۆرد، پاشان هاتمەوە خزمەتی، فەرمووی: ئەوە چیتە؟ گوتم: لەشگران بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی مسوڵمان پیس نابێت.

## بابەت: پۆشاکێک کە مەنی بەرکەوتبێ

٥٣٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ، عَنِ الثَّوْبِ يُصِيبُهُ الْمَنِيُّ، أَنَغْسِلُهُ، أَوْ نَغْسِلُ الثَّوْبَ كُلَّهُ، قَالَ: سُلَيْمَانُ، قَالَتْ: عَائِشَةُ، كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يُصِيبُ ثَوْبَهُ، فَيَغْسِلُهُ مِنْ ثَوْبِهِ، ثُمَّ يَخْرُجُ فِي ثَوْبِهِ إِلَى الصَّلَاةِ، وَأَنَا أَرَى أَثَرَ الْغَسْلِ فِيهِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٣، ومسلم: ٣٧١، وأبو داود: ٢٣١، والترمذي: ١٢١، والنسائي: ٢٦٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٧٢، وأبو داود: ٢٣٠، والنسائي: ٢٦٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٩، ومسلم: ٢٨٩، وأبو داود: ٣٧٣، والترمذي: ١١٧، والنسائي: ٢٩٥.

واتە: عەمری کوڕی مەیمونە ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە سولەیمانی کوڕی یەسار دەربارەی ئەو مەنییەی کە بەر پۆشاک دەکەوێ، ئایا تەنیا شوێنی مەنییەکە بشۆرین، یان هەموو پۆشاکەکە بشۆرین؟ سولەیمان گوتی، عائیشە ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەر پۆشاکەکانی دەکەوت، ئەویش بە ئاو لێی دەکردەوە، پاشان بەو پۆشاکەوە دەرۆیشت بۆ نوێژکردن، وە من شوێنەواری شۆردنم بە پۆشاکەکانییەوە دەبینی.

## بابەت: کراندنی مەنی کە بە پۆشاکەوە بێ

٥٣٧- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «رُبَّمَا فَرَكْتُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِيَدِي»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: هەندێک جار بە دەستی خۆم لە پۆشاکی پێغەمبەری خوا ﷺ کراندوومە.

٥٣٨- عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ ﷺ، قَالَ: نَزَلَ بِعَائِشَةَ ضَيْفٌ، فَأَمَرَتْ لَهُ بِمِلْحَفَةٍ لَهَا صَفْرَاءَ، فَاحْتَلَمَ فِيهَا، فَاسْتَحْيَا أَنْ يُرْسِلَ بِهَا وَفِيهَا أَثَرُ الِاحْتِلَامِ، فَغَمَسَهَا فِي الْمَاءِ، ثُمَّ أَرْسَلَ بِهَا، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: «لِمَ أَفْسَدَ عَلَيْنَا ثَوْبَنَا؟ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَفْرُكَهُ بِإِصْبَعِهِ، رُبَّمَا فَرَكْتُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِإِصْبَعِي»[٢].

واتە: هەمامی کوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: عائیشە ﷺ میوانێکی هات، فەرمانیدا لێفێکی (پێخەفێکی) زەردی پێبدرێ، (میوانەکەش) لە ناو ئەو پێخەفەدا لەشگران بوو، شەرمیشی دەکرد بە شێوازێک بینێرێتەوە کە شوێنەواری لەشگرانییەکەی پێوە دیاربێ، بۆیە لە ناو ئاوی هەڵکێشا پاشان ناردییەوە بۆ دایکی برواداران، ئەویش گوتی: بۆچی پێخەفەکەمانی خراپ کردوە (بە هۆی لە ئاو هەڵکێشانی کە لەوانەیە ڕەنگی بگۆڕێ)؟ ئەگەر بە پەنجەکانی بیکراندایە (بیگوشیبایە) بەس بوو (بۆ پاکبوونەوەی)، من چەند جار پۆشاکی پێغەمبەری خوام ﷺ بە پەنجەکانم کراندوە.

٥٣٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «لَقَدْ رَأَيْتُنِي أَجِدُهُ فِي ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَحُتُّهُ عَنْهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٨، وأبو داود: ٣٧١ و ٣٧٢، والترمذي: ١١٦، والنسائي: ٢٩٦ و ٣٠١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٨، وأبو داود: ٣٧١ و ٣٧٢، والترمذي: ١١٦، والنسائي: ٢٩٦ و ٣٠١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٨، والنسائي: ٣٠١.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: بۆ خۆم بینیومە بە پۆشاکی پێغەمبەری خواوە ﷺ و (بۆ پاککردنەوە) لە پۆشاکەکەی کڕاندوومە (بە پەنجە گوشیومە تاوەکو لامبردوە).

## بابەت: نوێژکردن لە پۆشاکێکدا کە جیماعی پێوەکرابێ

٥٤٠- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﵁ أَنَّهُ سَأَلَ أُخْتَهُ أُمَّ حَبِيبَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُجَامِعُ فِيهِ؟ قَالَتْ: «نَعَمْ، إِذَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ أَذًى»[١].

واتە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﵁ دەگێڕێتەوە کە پرسیاری کرد لە خوشکی خۆی ئوممو حەبیبەی خێزانی پێغەمبەرﷺ، ئایا پێغەمبەری خواﷺ بەو پۆشاکەی کە کرداری جووتبوونی دەکرد نوێژیشی دەکرد؟ گوتی: بەڵێ، بە مەرجێک هیچ پیسیەکی پێوەنەبووایە.

٥٤١- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ مَاءً، فَصَلَّى بِنَا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُتَوَشِّحًا بِهِ، قَدْ خَالَفَ بَيْنَ طَرَفَيْهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تُصَلِّي بِنَا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ؟ قَالَ: «نَعَمْ، أُصَلِّي فِيهِ وَفِيهِ» أَيْ قَدْ جَامَعْتُ فِيهِ[٢].

واتە: ئەبو دەرداء﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ هات دەرەوە بۆ لامان لەو کاتەدا دڵۆپی ئاو لەسەری دەتکا، ئنجا نوێژی بۆ کردین لە پۆشاکێکدا کە لە خۆیەوە پێچابوو، بە جۆرێک کە ئەملاولای پۆشاکەکەی بە پێچەوانەوە بەسەر شانیدا دابۆوە، کاتێک تەواو بوو (لە نوێژ)، عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە یەک پۆشاکدا نوێژمان بۆ دەکەی؟ فەرمووی: بەڵێ نوێژیشی پێوە دەکەم و جیماعیشی پێوە دەکەم.

٥٤٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ: يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يَأْتِي فِيهِ أَهْلَهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِلَّا أَنْ يَرَى فِيهِ شَيْئًا فَيَغْسِلَهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٦، والنسائي: ٢٩٤.

(٢) حسن لغيره.

(٣) صحيح.

واتە: جابیری کوڕی سەموڕە ﷺ دەڵێ: پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ: کە ئایا بەو پۆشاکەوە نوێژ دەکات کە پێیەوە دەچێتە لای خێزانەکانی (جیماعی پێوە دەکەی)؟ فەرمووی: بەڵێ، مەگەر شتێکی پێوە ببینێ کە پێویست بکات بیشۆرێ.

## بابەت: ئەوەی کە هاتووە دەربارەی مەسح کردنی خوففەکان

٥٤٣- عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ ﷺ، قَالَ: بَالَ جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، ثُمَّ «تَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ» فَقِيلَ لَهُ: أَتَفْعَلُ هَذَا؟ قَالَ: «وَمَا يَمْنَعُنِي وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُهُ» قَالَ إِبْرَاهِيمُ: كَانَ يُعْجِبُهُمْ حَدِيثُ جَرِيرٍ، لِأَنَّ إِسْلَامَهُ كَانَ بَعْدَ نُزُولِ الْمَائِدَةِ[1].

واتە: هەمامی کوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا میزی کرد، پاشان دەستنوێژی گرت، وە دەستی تەڕی هێنا بەسەر خوففەکانیدا، جا پێی گوترا: ئایا ئەمە دەکەی؟ گوتی: چ شتێک ڕێگریم لێدەکات لە کردنی ئەوە لە کاتێکدا بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ وای دەکرد. ئیبراهیم (کە ڕاوی فەرموودەکەیە) دەڵێ: فەرموودەکەی جەریر تووشی سەرسوڕمانی کردن، چونکە مسوڵمان بوونەکەی دوای دابەزینی سووڕەتی مائیدە بوو.

٥٤٤- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ»[2].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت و مەسحی خوففەکانی کرد.

٥٤٥- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ خَرَجَ لِحَاجَتِهِ، فَاتَّبَعَهُ الْمُغِيرَةُ بِإِدَاوَةٍ فِيهَا مَاءٌ، حَتَّى فَرَغَ مِنْ حَاجَتِهِ «فَتَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٧، ومسلم: ٢٧٢، وأبو داود: ١٥٤، والترمذي: ٩٣، والنسائي: ١١٨ و ٧٧٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٩_١٥١، والترمذي: ٩٨، والنسائي: ٧٩ و ٨٢ و ١٢٤. وأصل الحديث عند البخاري: ١٨٢، ومسلم: ٢٧٤.

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ﷺ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ سەرئاوکردن، موغەیرەش بە جامێک ئاوەوە دوای کەوت، تاوەکو سەرئاوی کرد و دەستنوێژی گرت، وە مەسحی خوففەکانی کرد.

٥٤٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى سَعْدَ بْنَ مَالِكٍ وَهُوَ «يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ» فَقَالَ: إِنَّكُمْ لَتَفْعَلُونَ ذَلِكَ، فَاجْتَمَعْنَا عِنْدَ عُمَرَ، فَقَالَ سَعْدٌ لِعُمَرَ أَفْتِ ابْنَ أَخِي فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَ عُمَرُ كُنَّا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ «نَمْسَحُ عَلَى خِفَافِنَا لَا نَرَى بِذَلِكَ بَأْسًا» فَقَالَ: ابْنُ عُمَرَ وَإِنْ جَاءَ مِنَ الْغَائِطِ؟ قَالَ: «نَعَمْ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە سەعدی کوڕی مالیکی بینی مەسحی خوففەکانی دەکرد، جا (ئیبن عومەر) گوتی: ئێوە ئەو کارە دەکەن؟! بۆیە دواتر چووینە لای عومەر، ئنجا سەعد بە عومەری ﷺ گوت: ئەی برازا فەتوا بدە دەربارەی مەسحکردن لەسەر خوفف، عومەر ﷺ گوتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ مەسحمان دەکرد لەسەر خوففەکانمان، هیچ کێشەیەکیشمان تێدا نەدەبینی، ئنجا ئیبنو عومەر گوتی: ئەگەر لە دوای سەرئاوکردنیش بێت؟! گوتی: بەڵێ.

٥٤٧- عَنْ عَبْدُ الْمُهَيْمِنِ بْنُ الْعَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ السَّاعِدِيُّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ، وَأَمَرَنَا بِالْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ»[٢].

واتە: عەبدولموهەیمینی کوڕی عەبباسی کوڕی سەهلی ساعیدیی ﷺ لە باوکییەوە، لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ خوففەکانی مەسح کرد، وە فەرمانی بە ئێمەش کرد کە مەسحی خوففەکانمان بکەین.

٥٤٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ فَقَالَ: «هَلْ مِنْ مَاءٍ، فَتَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ لَحِقَ بِالْجَيْشِ فَأَمَّهُمْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) ضعيف.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، جا فەرمووی: ئایا ئاوت چنگ دەکەوێ؟ (منیش ئاوم بۆ هێناو)، ئنجا دەستنوێژی گرت و مەسحی سەر خوففەکانی کرد، پاشان گەیشتەوە بە سوپاکە و پێش نوێژی بۆ کردن.

٥٤٩- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّجَاشِيَّ أَهْدَى لِلنَّبِيِّ ﷺ خُفَّيْنِ أَسْوَدَيْنِ سَاذَجَيْنِ، فَلَبِسَهُمَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَيْهِمَا»[١].

واتە: ئیبنو بورەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: نەجاشی دوو خوففی ڕەشی سادەی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش لە پێی کردن، پاشان دەستنوێژی گرت و مەسحی لەسەریان کرد.

## بابەت: مەسح کردنی سەرو ژێری خوففەکان

٥٥٠- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «مَسَحَ أَعْلَى الْخُفِّ، وَأَسْفَلَهُ»[٢].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەوە و ژێرەوەی خوففی مەسح کرد.

٥٥١- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِرَجُلٍ يَتَوَضَّأُ، وَيَغْسِلُ خُفَّيْهِ، فَقَالَ بِيَدِهِ، كَأَنَّهُ دَفَعَهُ «إِنَّمَا أُمِرْتَ بِالْمَسْحِ» وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بِيَدِهِ هَكَذَا مِنْ أَطْرَافِ الْأَصَابِعِ، إِلَى أَصْلِ السَّاقِ، وَخَطَّطَ بِالْأَصَابِعِ»[٣].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای پیاوێکدا تێپەڕی کە دەستنوێژی دەگرت و خوففەکانیشی دەشۆرد، جا پێغەمبەر ﷺ بە دەستی پاڵی پێوەنا وەکو ئەوەی کە ڕایبگرێ لەو کارە و فەرمووی: تەنها فەرمانت پێکراوە کە خوفف مەسح بکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستەکانی پێی فەرموو (واتە: ئاماژەی بۆ کرد بەوەی کە): لەسەری پەنجەی پێیەکانەوە دەست بە مەسح کردن بکات تاکو لوولاکی لاق، وە پەنجەکانی دەستی بە بڵاوی بە پێیەکانی داهێنا.

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٥٥، والترمذي: ٢٨٢٠.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٦٥، والترمذي: ٩٧.

(٣) ضعيف جداً.

## بابەت: ماوەی دیاریکراو بۆ مەسحی خوففەکان بۆ ئەو کەسەی لە ماڵەوەیە یان لە سەفەرە

٥٥٢- عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ، عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَتْ: ائْتِ عَلِيًّا، فَسَلْهُ، فَإِنَّهُ أَعْلَمُ بِذَلِكَ مِنِّي، فَأَتَيْتُ عَلِيًّا، فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْمَسْحِ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَأْمُرُنَا أَنْ نَمْسَحَ، لِلْمُقِيمِ يَوْمًا وَلَيْلَةً، وَلِلْمُسَافِرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ»(١).

واتە: شورەیحی کوڕی هانیئ ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﷺ، دەربارەی مەسح کردن لەسەر خوفف، ئەویش گوتی: بڕۆ بۆ لای عەلی، وە پرسیاری لێبکە، چونکە بەڕاستی ئەو باشتری لێدەزانێ، منیش چووم بۆ لای عەلی ﷺ، وە پرسیارم لێکرد دەربارەی مەسح، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدەکردین کە مەسح بکەین، بۆ کەسی نیشتەجێ ڕۆژ و شەوێک، وە بۆ ڕێبوار سێ ڕۆژ.

٥٥٣- عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: «جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْمُسَافِرِ ثَلَاثًا، وَلَوْ مَضَى السَّائِلُ عَلَى مَسْأَلَتِهِ، لَجَعَلَهَا خَمْسًا»(٢).

واتە: خوزەیمەی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژی داناوە بۆ ڕێبوار، وە ئەگەر هاتباو کەسی پرسیاکار زۆر لەسەری ڕۆیشتبا ئەوە بۆی دەکرد بە پێنج ڕۆژ.

٥٥٤- عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ» أَحْسِبُهُ قَالَ: «وَلَيَالِيهِنَّ لِلْمُسَافِرِ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ»(٣).

واتە: خوزەیمەی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ ڕۆژ، وابزانم فەرمووی: شەوەکانیشی بۆ ڕێبوار کە مەسحی سەر خوففەکانی بکات.

٥٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الطُّهُورُ عَلَى الْخُفَّيْنِ؟ قَالَ: «لِلْمُسَافِرِ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ وَلَيَالِيهِنَّ، وَلِلْمُقِيمِ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٦، والنسائي: ١٢٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٧، والترمذي: ٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٧، والترمذي: ٩٥

(٤) صحيح لغيره.





واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژ چۆنە بە خوففەوە؟ (واتە: مەسح کردن لەسەر خوف ماوەکەی چەندە؟) فەرمووی: بۆ ڕێبوار سێ ڕۆژ بە شەوەکانیشیەوە (سێ ڕۆژ و سێ شەو)، وە بۆ نیشتەجێ ڕۆژ و شەوێک.

٥٥٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ «رَخَّصَ لِلْمُسَافِرِ إِذَا تَوَضَّأَ وَلَبِسَ خُفَّيْهِ، ثُمَّ أَحْدَثَ وُضُوءًا، أَنْ يَمْسَحَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ، وَلِلْمُقِيمِ يَوْمًا وَلَيْلَةً»[1].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرەوە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داوە بۆ ڕێبوار کاتێک دەستنوێژی گرت و خوففەکانی لەپێ کرد، پاشان (دەستنوێژی شکاو) دەستنوێژی گرتەوە، (دەتوانێ) خوففەکانی مەسح بکات سێ ڕۆژ بە شەوەکانیشیەوە، وە بۆ نیشتەجێ ڕۆژ و شەوێک.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی مەسح هاتووە بەبێ دیاری کردنی کات

٥٥٧- عَنْ أُبَيِّ بْنِ عِمَارَةَ ﷺ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَدْ صَلَّى فِي بَيْتِهِ الْقِبْلَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا، أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ؟ قَالَ «نَعَمْ» قَالَ: يَوْمًا؟ قَالَ «وَيَوْمَيْنِ» قَالَ: وَثَلَاثًا؟ حَتَّى بَلَغَ سَبْعًا. قَالَ لَهُ: «وَمَا بَدَا لَكَ»[2].

واتە: ئوبەی کوڕی عیمارە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی خۆی بەرەو هەردوو قیبلەکە نوێژی کردوە، بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: مەسحی سەر خوفەکان بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتی: ماوەی ڕۆژێک؟ فەرمووی: ماوەی دوو ڕۆژ، گوتی: ماوەی سێ ڕۆژ؟ تاوەکو گەشتە حەوت. پێی فەرموو: هەتا چەند ڕۆژ پێویستت بێت.

٥٥٨- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، مِنْ مِصْرَ فَقَالَ: «مُنْذُ كَمْ لَمْ تَنْزِعْ خُفَّيْكَ؟» قَالَ: مِنَ الْجُمُعَةِ إِلَى الْجُمُعَةِ، قَالَ: «أَصَبْتَ السُّنَّةَ»[3].

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف جداً. أخرجه أبو داود: ١٥٨.

(٣) صحيح.

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﷺ دەگێڕێتەوە کە کاتێ لە میصرڕ هاتەوە، چووە خزمەت عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: لە کەیەوە خوفەکانت دانەکەندووە (ماوەی چەند خوف داناکەنی)؟ گوتی: لە هەینییەوە بۆ هەینی، گوتی: سوننەتت پێکاوە.

## بابەت: مەسح کردن لەسەر گۆرەوی و نەعلەکان

**٥٥٩-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ»[1].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت و مەسحی سەر گۆرەوییەکانی و نەعلەکانی کرد.

**٥٦٠-** عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ» قَالَ الْمُعَلَّى فِي حَدِيثِهِ: لَا أَعْلَمُهُ، إِلَّا قَالَ: وَالنَّعْلَيْنِ[2].

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت و مەسحی سەر گۆرەوییەکانی و نەعلەکانی کرد. موعەلا لە گێڕانەوەی فەرموودەکەدا گوتی: نازانم تەنها گوتی: نەعلەکانی.

## بابەت: مەسح کردن لەسەر مێزەر

**٥٦١-** عَنْ بِلَالٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ، وَالْخِمَارِ»[3].

واتە: بیلال ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ مەسحی لەسەر خوفەکانی و لەسەر مێزەرەکەی کرد.

**٥٦٢-** عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ، وَالْعِمَامَةِ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٩، والترمذي: ٩٩.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٥، والترمذي: ١٠١، والنسائي: ١٠٤_١٠٦.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٤_٢٠٥، والنسائي: ١١٩.

واتە: جەعفەری کوڕی عەمرٍ لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ مەسحی لەسەر خوفەکانی و مێزەرەکەی دەکرد.

**٥٦٣-** عَنْ أَبِي مُسْلِمٍ مَوْلَى زَيْدِ بْنِ صُوحَانَ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ سَلْمَانَ، فَرَأَى رَجُلًا يَنْزِعُ خُفَّيْهِ لِلْوُضُوءِ، فَقَالَ لَهُ سَلْمَانُ: امْسَحْ عَلَى خُفَّيْكَ، وَعَلَى خِمَارِكَ، وَبِنَاصِيَتِكَ، فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ وَالْخِمَارِ»[١].

واتە: ئەبو موسلیم مەولای زەیدی کوڕی صوحان ﷺ دەڵێ: لەگەڵ سەلمان بووم، پیاوێکی بینی خوفەکانی دادەکەند بۆ دەستنوێژ، سەلمانیش ﷺ پێی گوت: مەسحی خوفەکانت و مێزەرەکەت و پێشە سەرت بکە، چونکە من پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە کە مەسحی دەکرد لەسەر خوفەکانی و مێزەرەکەی (ئەو شتەی کە لەسەری بووە).

**خِمَار:** پارچە قوماشێکە کە سەری پێ دادەپۆشرێ.

**٥٦٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «تَوَضَّأَ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ قِطْرِيَّةٌ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ مِنْ تَحْتِ الْعِمَامَةِ، فَمَسَحَ مُقَدَّمَ رَأْسِهِ، وَلَمْ يَنْقُضِ الْعِمَامَةَ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی دەگرت و مێزەرێکی قیتری (جۆرێکە بووە لە قوماش) بەسەرەوە بوو، دەستی دەکرد بە ژێر مێزەرەکەیدا و پێشی سەری مەسح دەکرد، وە مێزەرەکەی لانەدەبرد.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٤٧.

# باسەکانی تەیەمموم

## بابەت: هۆکارەکانی تەیەمموم کردن

٥٦٥- عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَقَطَ عِقْدُ عَائِشَةَ، فَتَخَلَّفَتْ لِالْتِمَاسِهِ، فَانْطَلَقَ أَبُو بَكْرٍ إِلَى عَائِشَةَ، فَتَغَيَّظَ عَلَيْهَا فِي حَبْسِهَا النَّاسَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ الرُّخْصَةَ فِي التَّيَمُّمِ، قَالَ: فَمَسَحْنَا يَوْمَئِذٍ إِلَى الْمَنَاكِبِ، قَالَ: فَانْطَلَقَ أَبُو بَكْرٍ إِلَى عَائِشَةَ فَقَالَ: «مَا عَلِمْتُ إِنَّكِ لَمُبَارَكَةٌ»[١].

واتە: عەمماڕی کوڕی یاسر ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: دایکی ئیمانداران عائیشە ﷺ ملوانکەیەکی لێکەوت، بەهۆی گەڕان بەدوایدا دواکەوت، بۆیە ئەبو بەکر ڕۆیشت بۆ لای عائیشە ﷺ لێی توڕەبوو چونکە بوو بە هۆی ئەوەی خەڵکی بمێننەوەو ڕێنەکەن، ئنجا خوا ﷻ ئایەتی تەیەممومی دابەزاند، یاسر ﷺ دەڵێ: ئەو ڕۆژە ئێمە تاوەکو شانەکانمان مەسحمان کرد، گوتی: ئەبو بەکر ﷺ ڕۆیشت بۆ لای عائیشە ﷺ پێی گوت: نەمزانی کە تۆ خێر و بەرەکەتی (چونکە بە هۆی ئەو دواکەوتن و نەگەیشتنە ئاوو، کاتی نوێژیش هات، بۆیە لە جیاتی دەستنوێژ مۆڵەتی تەیەمموم دابەزی).

٥٦٦- عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ، قَالَ: «تَيَمَّمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْمَنَاكِبِ»[٢].

واتە: عەمماری کوڕی یاسر ﷺ دەڵێ: تەیەممومان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و تاوەکو شانمان (مەسح) کرد.

٥٦٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «جُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەوی بۆ من کراوە بە مزگەوت و پاک و پاککەرەوە (واتە: لە هەر شوێنێک کاتی نوێژ بوو دەکرێ لەو شوێنە نوێژ بکرێ مادەم خاوێن بێ، وە هەروەها دەکرێ لە جیاتی ئاو خۆڵ بەکاربهێنرێ، لە کاتێکدا کە ئاو دەست نەکەوێ).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٠، والنسائي: ٣١٤.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٣١٥، وانظر ٥٦٥.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٢٣، والترمذي بإثر: ١٥٥٣.

٥٦٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا اسْتَعَارَتْ مِنْ أَسْمَاءَ قِلَادَةً، فَهَلَكَتْ «فَأَرْسَلَ النَّبِيُّ ﷺ أُنَاسًا فِي طَلَبِهَا، فَأَدْرَكَتْهُمُ الصَّلَاةُ، فَصَلَّوْا بِغَيْرِ وُضُوءٍ، فَلَمَّا أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ شَكَوْا ذَلِكَ إِلَيْهِ، فَنَزَلَتْ آيَةُ التَّيَمُّمِ» فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ: جَزَاكِ اللَّهُ خَيْرًا، فَوَاللَّهِ مَا نَزَلَ بِكِ أَمْرٌ قَطُّ، إِلَّا جَعَلَ اللَّهُ لَكِ مَخْرَجًا، وَجَعَلَ لِلْمُسْلِمِينَ فِيهِ بَرَكَةً[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە گەردن بەندێکی (ملوانکەیەکی) لە ئەسماء وەرگرتبوو، ئنجا ئەو گەردن بەندەی لێ ونبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکانێکی نارد بۆ بینینەوەی گەردن بەندەکە، (لەوکاتەدا) کاتی نوێژ هات، ئەوانیش نوێژیان کرد بەبێ دەستنوێژ گرتن، جا کاتێک هاتنەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای ئەوەیان لەلا کرد (کە لەبەر بێ ئاوی بەبێ دەستنوێژ گرتن نوێژیان کردوە)، ئنجا ئایەتی تەیەمموم دابەزی، جا ئوسەیدی کوڕی حوزەیر بە عائیشەی گوت: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، سوێند بە خوا هیچ کاتێک نەبووە تۆ شتێکت بەسەر بێت، مەگەر خوا دەرووی خێری بۆ تۆ کردۆتەوە، وە بووەتە هۆی خێر و بەرەکەتیش بۆ مسوڵمانان.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی تەیەمموم هاتووە بە یەک جار دەست لە زەویدان

٥٦٩- عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أَبِيهِ ﵁ أَنَّ رَجُلًا أَتَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، فَقَالَ: إِنِّي أَجْنَبْتُ، فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ، فَقَالَ عُمَرُ: لَا تُصَلِّ، فَقَالَ: عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ: أَمَا تَذْكُرُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ أَنَا وَأَنْتَ فِي سَرِيَّةٍ، فَأَجْنَبْنَا، فَلَمْ نَجِدِ الْمَاءَ، فَأَمَّا أَنْتَ فَلَمْ تُصَلِّ، وَأَمَّا أَنَا فَتَمَعَّكْتُ فِي التُّرَابِ، فَصَلَّيْتُ، فَلَمَّا أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ» وَضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدَيْهِ إِلَى الْأَرْضِ، ثُمَّ نَفَخَ فِيهِمَا، وَمَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ[2].

واتە: سەعیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزا لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە کە پیاوێک هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ و گوتی: من لەشگران بووم، وە ئاوم دەستنەکەوت (بۆ خۆشۆردن)، ئنجا عومەر گوتی: نوێژ مەکە، عەممماری کوڕی یاسریش گوتی: ئەی پێشەوای بڕواداران بە بیرت نەماوە کە من و تۆ لە لەشکرێکدا

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٤، ومسلم: ٣٦٧، وأبو داود: ٣١٧، والنسائي: ٣١٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٨، ومسلم: ٣٦٨، وأبو داود: ٣٢٢_٣٢٨، والترمذي: ١٤٤، والنسائي: ٣١٢ و ٣١٦_٣١٩.




بووین و توشی لەشگرانی بووین، وە ئاومان چنگ نەکەوت، ئنجا تۆ نوێژت نەکرد، بەڵام من خۆم لە خۆڵ وەردا و دواتر نوێژم کرد، کاتێک هاتینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: تەنها ئەوەندە بەس بوو، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی لە زەوی دا و پاشان فوی لێکردن و بە دەستەکانی مەسحی ڕوخسار و لەپەدەستەکانی کرد.

٥٧٠- عَنِ الْحَكَمِ وَسَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ ﷺ، أَنَّهُمَا سَأَلَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى، عَنِ التَّيَمُّمِ فَقَالَ: «أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ عَمَّارًا أَنْ يَفْعَلَ هَكَذَا، وَضَرَبَ بِيَدَيْهِ إِلَى الْأَرْضِ، ثُمَّ نَفَضَهُمَا، وَمَسَحَ عَلَى وَجْهِهِ» قَالَ الْحَكَمُ: وَيَدَيْهِ، وَقَالَ سَلَمَةُ: وَمِرْفَقَيْهِ[١].

واتە: حەکەم و سەلەمەی کوڕی کوهەیل ﷺ دەگێڕنەوە کە پرسیاریان کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەربارەی تەیەمموم، ئەویش گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە عەممارِ کرد کە بەو شێوەیە تەیەمموم بکات، هەردوو دەستەکانی لە زەوی داو، پاشان فوی لێکردن (بۆ ئەوەی خۆڵەکە تەنک ببێ)، وە مەسحی ڕوخساری پێ کردن، حەکەم گوتی: وە دەستەکانیشی (مەسح کرد)، سەلەمەش گوتی: ئانیشکەکانیشی.

## بابەت: دوو جار دەست لە زەویدان بۆ تەیەمموم

٥٧١- عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ، حِينَ تَيَمَّمُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ «فَأَمَرَ الْمُسْلِمِينَ، فَضَرَبُوا بِأَكُفِّهِمُ التُّرَابَ، وَلَمْ يَقْبِضُوا مِنَ التُّرَابِ شَيْئًا، فَمَسَحُوا بِوُجُوهِهِمْ مَسْحَةً وَاحِدَةً، ثُمَّ عَادُوا، فَضَرَبُوا بِأَكُفِّهِمُ الصَّعِيدَ مَرَّةً أُخْرَى، فَمَسَحُوا بِأَيْدِيهِمْ»[٢].

واتە: عەممارِی کوڕی یاسر ﷺ دەگێڕێتەوە کە کاتێک لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ تەیەممومیان کردوە و فەرمانی بە مسوڵمانان کردوە، ئەوانیش بەری دەستیان لە خۆڵ داوەو، هیچ شتێکیان لە خۆڵەکە هەڵنەگرتووە، وە جارێک بە ڕوخساریان (دەم و چاویان)دا هێناوە، پاشان جارێکی دیکە هاتوون بەری دەستیان لە ڕووی زەوی داوەو دەستەکانیان پێ مەسح کردوە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٠، والنسائي: ٣١٤.




## بابەت: کەسێ کە بریندار دەبێ و توشی لەشگرانی دەبێ و مەترسی لەسەر گیانی هەیە، ئەگەر ئاو بەکاربێنێ بۆ خۆشوشتن

**٥٧٢-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يُخْبِرُ أَنَّ رَجُلًا أَصَابَهُ جُرْحٌ فِي رَأْسِهِ، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ أَصَابَهُ احْتِلَامٌ، فَأُمِرَ بِالِاغْتِسَالِ، فَاغْتَسَلَ، فَكُزَّ فَمَاتَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «قَتَلُوهُ، قَتَلَهُمُ اللَّهُ، أَوَلَمْ يَكُنْ شِفَاءَ الْعِيِّ السُّؤَالُ؟!» - قَالَ عَطَاءٌ: وَبَلَغَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: - «لَوْ غَسَلَ جَسَدَهُ، وَتَرَكَ رَأْسَهُ حَيْثُ أَصَابَهُ الْجِرَاحُ»[١].

واتە: عەتائی کوڕی ئەبو ڕەباح ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو دەیگێڕایەوە کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێک سەری بریندار ببوو، پاشان تووشی لەشگرانی هاتبوو، جا فەرمانی پێکرابوو کە دەبێ خۆی بشوات، بۆیە خۆی شۆرد، دواتر بە هۆی هەوکردنی برینەکەیەوە (تەڕکردنی برینەکەی) تووشی گرژبوونی ماسوولکەکانی هات و گیانی لە دەستدا، ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: کوشتیان خوا بیانکوژێ، ئایا دەرمانی نەزانین پرسیارکردن نیە؟ عەتاء دەڵێ: پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر جەستەی شۆردبا و شوێنی برینەکەی سەری جێهێشتبا تەواو بوو.

## بابەت: خۆشوشتن لە لەشگرانی

**٥٧٣-** عَنْ مَيْمُونَةَ ﷺ قَالَتْ: «وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ غُسْلًا فَاغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَأَكْفَأَ الْإِنَاءَ بِشِمَالِهِ عَلَى يَمِينِهِ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى فَرْجِهِ، ثُمَّ دَلَكَ يَدَهُ بِالْأَرْضِ، ثُمَّ مَضْمَضَ، وَاسْتَنْشَقَ، وَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَذِرَاعَيْهِ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَفَاضَ الْمَاءَ عَلَى سَائِرِ جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى، فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ»[٢].

واتە: مەیمونە ﷺ دەڵێ: ئاوی خۆشۆردنم بۆ پێغەمبەر ﷺ دانا، ئەویش لە لەشگرانی خۆی شۆرد، بە جامەکەی کە بە دەستی چەپی گرتبووی ئاوی بەلای ڕاستی داکرد و دەستەکانی سێ جاری شۆرد، پاشان ئاوی بە دامێنی داکرد، دواتر دەستی هێنا

---

(١) حسن دون بلاغ عطاء. أخرجه أبو داود: ٣٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٩، ومسلم: ٣١٧، وأبو داود: ٢٤٥، والنسائي: ٢٥٣ و ٤١٨ و ٤١٩.

بە زەوی دا، پاشان ئاوی لە دەم و لوتی ڕادا، وە دەم و چاوی سێ جار شۆرد، وە باسکەکانی سێ جار شۆرد، دواتر ئاوی بەسەر هەموو جەستەی داکرد، پاشان داهاتەوە و پێیەکانی شۆرد.

**٥٧٤-** عَنْ جُمَيْعُ بْنُ عُمَيْرٍ التَّيْمِيُّ ﷺ، قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ عَمَّتِي وَخَالَتِي، فَدَخَلْنَا عَلَى عَائِشَةَ فَسَأَلْنَاهَا: كَيْفَ كَانَ يَصْنَعُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ غُسْلِهِ مِنَ الْجَنَابَةِ؟، قَالَتْ: «كَانَ يُفِيضُ عَلَى كَفَّيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ يُدْخِلُهَا فِي الْإِنَاءِ، ثُمَّ يَغْسِلُ رَأْسَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ يُفِيضُ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ يَقُومُ إِلَى الصَّلَاةِ، وَأَمَّا نَحْنُ، فَإِنَّا نَغْسِلُ رُءُوسَنَا خَمْسَ مِرَارٍ؛ مِنْ أَجْلِ الضَّفْرِ»[١].

واتە: جومەیعی کوڕی عومەیری تەیمیی ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پورەکانم چووین بۆ لای عائیشە و پرسیارمان لێکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەکرد بۆ خۆشۆردن لە لەشگرانی؟ ئەویش گوتی: سێ جار ئاوی بە دەستەکانی دادەکرد، پاشان دەیخستنە ناو جامەکەوە (بۆ ئاو دەرهێنان)، دواتر سێ جار سەری دەشۆرد (یان سێ جار ئاوی پێدا دەکرد)، پاشان ئاوی دەکرد بەسەر جەستەیدا، وە دواتر هەڵدەستا بۆ نوێژ کردن، بەڵام ئێمە پێنج جار سەرمان دەشۆرین، لەبەر پرچ و کەزییەکان (بۆ ئەوەی جوان تەڕ بین).

## بابەت: خۆشوشتن لە لەشگرانی

**٥٧٥-** عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ، قَالَ: تَمَارَوْا فِي الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَّا أَنَا، فَأُفِيضُ عَلَى رَأْسِي ثَلَاثَ أَكُفٍّ»[٢].

واتە: جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بابەتی خۆشۆردن بوو بە دەمە دەمە (موناقەشە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من بۆ خۆم، سێ مست ئاو دەکەم بەسەر سەرمدا.

**٥٧٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَهُ عَنِ الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَقَالَ: «ثَلَاثًا» فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنْ شَعْرِي كَثِيرٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَانَ أَكْثَرَ شَعْرًا مِنْكَ، وَأَطْيَبَ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨، ومسلم: ٣١٦، وأبو داود: ٢٤١، والترمذي: ١٠٤، والنسائي: ٢٤٣_٢٤٩ و ٤٢٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٤، ومسلم: ٣٢٧، وأبو داود: ٢٣٩، والنسائي: ٢٥٠ و ٤٢٥.

(٣) صحيح بما بعده.

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێک پرسیاری لێکرد دەربارەی خۆشۆردنی لەشگرانی، ئەویش گوتی: سێ جار (ئاو دەکەی بەسەر خۆتدا)، پیاوەکەش گوتی: ئاخر من پرچم زۆر و پڕە، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرچی لە تۆش زیاتر بوو، وە پاک و خاوێنتریش بوو.

**٥٧٧-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا فِي أَرْضٍ بَارِدَةٍ، فَكَيْفَ الْغُسْلُ مِنَ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ ﷺ: «أَمَّا أَنَا، فَأَحْثُو عَلَى رَأْسِي ثَلَاثًا»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لە خاکێکی سارد دا دەژیم، چۆن غوسڵی لەشگرانی لە خۆم دەربکەم؟ فەرمووی: من بۆ خۆم، سێ جار (سێ مست) ئاو دەکەم بەسەر سەرمدا.

**٥٧٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، سَأَلَهُ رَجُلٌ: كَمْ أُفِيضُ عَلَى رَأْسِي، وَأَنَا جُنُبٌ؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَحْثُو عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ» قَالَ الرَّجُلُ: إِنَّ شَعْرِي طَوِيلٌ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَكْثَرَ شَعْرًا مِنْكَ، وَأَطْيَبَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێک پرسیاری لێکردوە کە چەند ئاو بەسەرمدا بکەم کاتێک من لەشگرانم؟ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار یان سێ مست ئاوی بەسەریدا دەکرد، پیاوەکە گوتی: من پرچم درێژە، ئەویش گوتی: پرچی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پرچی تۆ زیاتر و پڕتر بوو، وە پاک و خاوێنتریش بوو.

## بابەت: دەستنوێژ دوای خۆشوشتن

**٥٧٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لَا يَتَوَضَّأُ بَعْدَ الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای خۆشۆردنی لە لەشگرانی دەستنوێژی نەدەگرت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٢، ومسلم: ٣٢٩.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٠، والترمذي: ١٠٧، والنسائي: ٤٣٠.

## بابەت: پیاوی لەشگران کە (دوای خۆشوشتن) خۆی بە خێزانەکەی گەرم دەکاتەوە پێش ئەوەی ئەو (خێزانەکەی) خۆی بشوات

٥٨٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَغْتَسِلُ مِنَ الْجَنَابَةِ، ثُمَّ يَسْتَدْفِئُ بِي قَبْلَ أَنْ أَغْتَسِلَ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە خۆی دەشۆرد لە لەشگرانی، پاشان باوەشی لە من دەدا بۆ ئەوەی خۆی گەرم بکاتەوە پێش ئەوەی من خۆم بشۆم.

## بابەت: لەشگران کە دەخەوێ بێ ئەوەی ئاو بەکاربهێنێ (خۆی بشوات)

٥٨١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُجْنِبُ ثُمَّ يَنَامُ وَلَا يَمَسُّ مَاءً حَتَّى يَقُومَ بَعْدَ ذَلِكَ فَيَغْتَسِلَ»[٢].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەشگران دەبوو، پاشان دەنوست و دەستیشی لە ئاو نەدەدا (خۆی نەدەشۆرد)، تاوەکو دواتر لە خەو هەڵدەستا ئنجا خۆی دەشۆرد (واتە: یەکسەر خۆی نەدەشۆرد).

٥٨٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: «إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِنْ كَانَتْ لَهُ إِلَى أَهْلِهِ حَاجَةٌ قَضَاهَا، ثُمَّ يَنَامُ كَهَيْئَتِهِ، لَا يَمَسُّ مَاءً»[٣].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئیشی هەبووایە بە خێزانەکانی دەچوو ئیشەکەی دەکردو، پاشان دەنوست بەو حاڵەوە، وە دەستی لە ئاو نەدەدا.

٥٨٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُجْنِبُ، ثُمَّ يَنَامُ كَهَيْئَتِهِ، لَا يَمَسُّ مَاءً» قَالَ: سُفْيَانُ، فَذَكَرْتُ الْحَدِيثَ يَوْمًا، فَقَالَ لِي إِسْمَاعِيلُ يَا فَتَى يُشَدُّ هَذَا الْحَدِيثُ بِشَيْءٍ[٤].

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٢٣.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٢٨، والترمذي: ١١٨ و ١١٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٨، والترمذي: ١١٨ و ١١٩.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٨، والترمذي: ١١٨ و ١١٩.

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لەشگران دەبوو، پاشان دەنوست بەو حاڵەوە دەستی لە ئاو نەدەدا. سوفیان گوتی: ڕۆژێک ئەو فەرموودەیەم گێڕایەوە، جا ئیسماعیل پێی گوتم: گەنجۆ ئەو فەرموودەیە پێویستی بە پشتگیری هەیە بە شتێکی تر.

## بابەت: ئەوەی گوتوویەتی: لەشگران ناخەوێ تاکو دەستنوێژ نەگرێ

٥٨٤- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ وَهُوَ جُنُبٌ، تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەیویست بخەوێت و لەشگران بوو، دەستنوێژی دەگرت هەروەکو چۆن دەستنوێژی دەگرت بۆ نوێژ.

٥٨٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَيَرْقُدُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِذَا تَوَضَّأَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئایا دەکرێ یەکێک لە ئێمە بە لەشگرانییەوە بخەوین؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر دەستنوێژ بگرێ.

٥٨٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ تُصِيبُهُ الْجَنَابَةُ بِاللَّيْلِ، فَيُرِيدُ أَنْ يَنَامَ، «فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَتَوَضَّأَ ثُمَّ يَنَامَ»[٣].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە کە شەوانە تووشی لەشگرانی دەبوو، وە دەیویست بخەوێ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێکرد کە دەستنوێژ بگرێ پاشان بخەوێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٦ و ٢٨٨، ومسلم: ٣٠٥، وأبو داود: ٢٢٢، والترمذي بإثر: ١١٩، والنسائي: ٢٥٧ و ٢٥٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٧، ومسلم: ٣٠٦، وأبو داود: ٢٢١، والترمذي: ١٢٠، والنسائي: ٢٥٩ و ٢٦٠.

(٣) صحيح.

## بابەت: لەشگران کە بیەوێ
## دووبارە جیماع بکاتەوە دەستنوێژ بگرێ

٥٨٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ، فَلْيَتَوَضَّأْ»[١].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە چوو بۆ لای خێزانی، پاشان ویستی دووبارەی بکاتەوە، با دەستنوێژ بگرێ.

## بابەت: یەک جار خۆشوشتن بۆ کەسێک
## کە دەچێتە لای هەموو خێزانەکانی

٥٨٨- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ فِي غُسْلٍ وَاحِدٍ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەچوو بۆ لای هەموو خێزانەکانی و یەک جار خۆی دەشۆرد.

٥٨٩- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: وَضَعْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ غُسْلًا «فَاغْتَسَلَ مِنْ جَمِيعِ نِسَائِهِ فِي لَيْلَةٍ»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئاوی خۆشۆردنم دانا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش بەو ئاوە غوسڵی گشت خێزانەکانی دەرکرد کە ئەو شەوە چوو بوو بۆ لایان.

## بابەت: خۆشوشتن بۆ هەر جارێک کە دەچێتە لای خێزانەکانی

٥٩٠- عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «طَافَ عَلَى نِسَائِهِ فِي لَيْلَةٍ، وَكَانَ يَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ» فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا تَجْعَلُهُ غُسْلًا وَاحِدًا، فَقَالَ: «هُوَ أَزْكَى، وَأَطْيَبُ، وَأَطْهَرُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٠٨، وأبو داود: ٢٢٠، والترمذي: ١٤١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٤، ومسلم: ٣٠٩، وأبو داود: ٢١٨، والترمذي: ١٤٠، والنسائي: ٢٦٣ و ٢٦٤. وانظر البخاري: ٢٦٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٤، ومسلم: ٣٠٩، وأبو داود: ٢١٨، والترمذي: ١٤٠، والنسائي: ٢٦٣ و ٢٦٤. وانظر البخاري: ٢٦٨.

(٤) حسن. أخرجه أبو داود: ٢١٩.

واتە: ئەبو ڕافیع ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ شەوێکیان گەڕا بەسەر هەموو خێزانەکانی، وە بۆ هەر یەکێکیان (کە تەواو دەبوو) غوسڵی دەکرد. پێی گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی نایکەیتە یەک غوسڵ و تەواو (واتە: کە لە هەموویان تەواو بوویت یەکجار غوسڵ دەربکە)، فەرمووی: ئەوە باشتر و پاکوخاوێنترە بۆ جەستە و دەروون.

## بابەت: لەشگران شت دەخوا و دەشخواتەوە

٥٩١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ وَهُوَ جُنُبٌ تَوَضَّأَ»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەیویست خۆراک بخوات و لە حاڵەتی لەشگرانیدا بوو، دەستنوێژی دەگرت.

٥٩٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْجُنُبِ، هَلْ يَنَامُ، أَوْ يَأْكُلُ، أَوْ يَشْرَبُ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِذَا تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی کەسی لەشگران، ئایا دەکرێ بخەوێ، یان بخوات، یان بخواتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر دەستنوێژ بگرێ هەروەکو چۆن دەستنوێژ دەگرێ بۆ نوێژ.

## بابەت: ئەوەی کە گوتوویەتی: تەنها دەست شوشتن دروستە بۆ خواردن و خواردنەوە

٥٩٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ وَهُوَ جُنُبٌ غَسَلَ يَدَيْهِ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک دەیویست شتێک بخوات و لە حاڵەتی لەشگرانی دابوو، دەستەکانی دەشۆرد.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٠٥، وأبو داود: ٢٢٤، والترمذي بإثر: ١١٩، والنسائي: ٢٥٥_٢٥٨. وانظر البخاري: ٢٨٦ و ٢٨٨.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. تخريجه: تقديم (٥٨٤) و (٥٩١).




## بابەت: ئەوەی کە هاتووە دەربارەی قورئان خوێندن بەبێ دەستنوێژی

**٥٩٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَمَةَ ﷺ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْتِي الْخَلَاءَ، فَيَقْضِي الْحَاجَةَ، ثُمَّ يَخْرُجُ، فَيَأْكُلُ مَعَنَا الْخُبْزَ، وَاللَّحْمَ، وَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَلَا يَحْجُبُهُ - وَرُبَّمَا قَالَ: لَا يَحْجُزُهُ - عَنِ الْقُرْآنِ شَيْءٌ، إِلَّا الْجَنَابَةُ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلەمە ﷺ دەڵێ: چووم بۆ لای عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ، جا گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەچوویە سەرئاو، وە سەرئاوی دەکرد، پاشان دەهاتە دەرەوە، جا لەگەڵ ئێمە نان و گۆشتی دەخوارد، وە قورئانی دەخوێند، وە هیچ شتێک ڕێی قورئان خوێندنی لێ نەدەگرت، مەگەر لەشگرانی.

**٥٩٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ الْجُنُبُ، وَلَا الْحَائِضُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی لەشگران و ئافرەتێک کە لە سووڕی مانگانەدا بێ نابێ قورئان بخوێنن.

**٥٩٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَقْرَأُ الْجُنُبُ وَالْحَائِضُ شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی لەشگران و ئافرەتێک کە لە سوڕی مانگانەدا بێت نابێ هیچ شتێک لە قورئان بخوێنن.

## بابەت: لەژێر هەر موویەک لەشگرانی هەیە

**٥٩٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ تَحْتَ كُلِّ شَعَرَةٍ جَنَابَةً، فَاغْسِلُوا الشَّعَرَ، وَأَنْقُوا الْبَشَرَةَ»[٤].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٢٩، والترمذي: ١٤٦، والنسائي: ٢٦٥_٢٦٦.

(٢) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١٣١.

(٣) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١٣١.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٤٨، والترمذي: ١٠٦.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ژێر هەموو موویەک لەشگرانیەکە (واتە: دەبێ هەموو جەستە بشۆردرێ هەتا تاڵە موویەکیش نابێ جێبهێڵدرێ بە کەمتەرخەمی)، بۆیە موو بشۆن و پێست پاک بکەنەوە.

٥٩٨- عَنْ أَبُو أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيُّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَأَدَاءُ الْأَمَانَةِ، كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهَا» قُلْتُ: وَمَا أَدَاءُ الْأَمَانَةِ، قَالَ: «غُسْلُ الْجَنَابَةِ، فَإِنَّ تَحْتَ كُلِّ شَعَرَةٍ جَنَابَةً»[١].

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاریی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێنج نوێژەکەو، نوێژی هەینی بۆ نوێژی هەینی و، بەجێگەیاندنی ڕاسپاردەکە، هۆکاری لێخۆشبونی ئەو تاوانەن کە لە نێوانیان دایە، گوتم: بە جێگەیاندنی ڕاسپاردەکە چییە؟ فەرمووی: خۆشۆردنە لە لەشگرانی، چونکە بێگومان لە ژێر هەر موویەکدا لەشگرانییەک هەیە.

٥٩٩- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَرَكَ مَوْضِعَ شَعَرَةٍ مِنْ جَسَدِهِ مِنْ جَنَابَةٍ لَمْ يَغْسِلْهَا، فُعِلَ بِهِ كَذَا وَكَذَا مِنَ النَّارِ» قَالَ: عَلِيٌّ، فَمِنْ ثَمَّ عَادَيْتُ شَعَرِي، وَكَانَ يَجُزُّهُ[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە کاتی غوسڵ دەرکردندا جێ موویەکی لەشی جێ بهێڵێ و نەیشۆرێ، لە دۆزەخدا ئاوا و ئاوای پێدەکرێ. عەلی گوتی: لەوکاتە بە دواوە بەرەو ڕووی مووەکانم بوومەوە، وە دەیتاشین.

## بابەت: ئەوەی پیاو لە خەودا دەیبینێ ئافرەتیش دەیبینێ

٦٠٠- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَسَأَلَتْهُ عَنِ الْمَرْأَةِ تَرَى فِي مَنَامِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ فَلْتَغْتَسِلْ» فَقُلْتُ: فَضَحْتِ النِّسَاءَ، وَهَلْ تَحْتَلِمُ الْمَرْأَةُ؟، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَرِبَتْ يَمِينُكِ، فَبِمَ يُشْبِهُهَا وَلَدُهَا إِذًا»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٤٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٠، ومسلم: ٣١٣، والترمذي: ١٢٢، والنسائي: ١٩٧.

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: ئوممو سولەیم هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو پرسیاری لێکرد دەربارەی ئافرەتێک کە لە خەودا ئەو شتە دەبینێ کە پیاو دەیبینێ (خەونی لەشگرانی)؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر (ئافرەت) ئاوی بینی با خۆی بشۆرێ، منیش (ئوممو سەلەمە) گوتم: ئافرەتت ڕیسوا کرد، ئایا ئافرەت تووشی لەشگرانی دەبێ (لە خەودا)؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: دەستت بە خۆڵ بێت، ئەی ئەگەر وانەبێ چۆن منداڵەکەی لەخۆی دەچێ.

**٦٠١-** عَنْ أَنَسٍ ﵁، أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ ﵂ سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الْمَرْأَةِ تَرَى فِي مَنَامِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَتْ ذَلِكَ فَأَنْزَلَتْ، فَعَلَيْهَا الْغُسْلُ» فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيَكُونُ هَذَا، قَالَ: «نَعَمْ، مَاءُ الرَّجُلِ غَلِيظٌ أَبْيَضُ، وَمَاءُ الْمَرْأَةِ رَقِيقٌ أَصْفَرُ، فَأَيُّهُمَا سَبَقَ، أَوْ عَلَا، أَشْبَهَهُ الْوَلَدُ»[1].

واتە: ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە کە ئوممو سولەیم ﵂ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئافرەتێک کە لە خەودا ئەو شتە دەبینێ کە پیاو دەیبینێ (خەونی لەشگرانی)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەوەی بینی وە ئاوی هاتەوە، پێویستە خۆی بشۆرێ. ئوممو سەلەمە ﵂ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەوە دەبێ (ڕوودەدات)؟ فەرمووی: بەڵێ، ئاوی پیاو ئەستوور و سپییە، وە ئاوی ئافرەت ناسک و زەردە، جا کامیان زاڵ بوو (زیاتر بوو)، یان سەرکەوت، ئەوا منداڵەکە بەو دەچێ.

**٦٠٢-** عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ حَكِيمٍ ﵂ أَنَّهَا سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الْمَرْأَةِ تَرَى فِي مَنَامِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ؟ فَقَالَ: «لَيْسَ عَلَيْهَا غُسْلٌ حَتَّى تُنْزِلَ، كَمَا أَنَّهُ لَيْسَ عَلَى الرَّجُلِ غُسْلٌ حَتَّى يُنْزِلَ»[2].

واتە: خەولەی کچی حەکیم ﵂ دەگێڕێتەوە کە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، دەربارەی ئافرەتێک کە لە خەودا ئەو شتە دەبینێ کە پیاو دەیبینێ (خەونی لەشگرانی)؟ فەرمووی: پێویست ناکات خۆی بشۆرێ تاوەکو ئاوی نەیەتەوە، هەروەکو چۆن پیاو خۆشۆردنی لەسەر نیە تاوەکو ئاوی نەیەتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣١١، والنسائي: ١٩٥ و ٢٠٠.

(٢) حسن. أخرجه النسائي: ١٩٨.

## بابەت: ئەوەی کە هاتووە دەربارەی خۆشوشتنی ئافرەتان لە لەشگرانی

٦٠٣- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي، فَأَنْقُضُهُ لِغُسْلِ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ: «إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِي عَلَيْهِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ تُفِيضِي عَلَيْكِ مِنَ الْمَاءِ، فَتَطْهُرِينَ - أَوْ قَالَ - فَإِذَا أَنْتِ قَدْ طَهُرْتِ»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من کەزی بەتوندی دەبەستم، ئایا لە کاتی غوسڵ دەرکردندا بیکەمەوە؟ ئەویش فەرمووی: سێ مشت ئاوت بەسە بیکەیت بەسەر سەرتدا، پاشان ئاو بکەیت بەسەر هەموو جەستەتدا، ئاوا پاک دەبیتەوە، یان فەرمووی ئەو کاتە تۆ پاک بوویتەتەوە.

٦٠٤- عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ ﵀، قَالَ: بَلَغَ عَائِشَةَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو يَأْمُرُ نِسَاءَهُ إِذَا اغْتَسَلْنَ أَنْ يَنْقُضْنَ رُءُوسَهُنَّ، فَقَالَتْ: يَا عَجَبًا لِابْنِ عَمْرٍو هَذَا، أَفَلَا يَأْمُرُهُنَّ أَنْ يَحْلِقْنَ رُءُوسَهُنَّ، لَقَدْ كُنْتُ أَنَا، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «نَغْتَسِلُ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، فَلَا أَزِيدُ عَلَى أَنْ أُفْرِغَ عَلَى رَأْسِي ثَلَاثَ إِفْرَاغَاتٍ»[٢].

واتە: عوبەیدی کوڕی عومەیر ﵀ دەڵێ: بە عائیشە ﵂ گەیشتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ ﵄ فەرمانی بە ژنەکانی کردوە کە کەزییەکانیان بکەنەوە لە کاتی خۆشۆردندا، خاتوو عائیشە ﵂ گوتی: ئای لە ئیبنو عەمڕ، جا بۆ یەکجاری فەرمانیان پێناکات سەریان بتاشن؟! بەڕاستی من و پێغەمبەری خوا ﷺ غوسڵی خۆمان لە تەشتێکدا دەردەکرد، تەنها سێ مشت ئاویشم دەکرد بەسەرمدا و بەس.

## بابەت: لەشگرانی ئەگەر خۆی لە ئاودا نقوم بکات ئایا دروستە و لەسەری لادەچێ؟

٦٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَغْتَسِلْ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ، وَهُوَ جُنُبٌ» فَقَالَ: كَيْفَ يَفْعَلُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ فَقَالَ: «يَتَنَاوَلُهُ تَنَاوُلًا»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٣٠، وأبو داود: ٢٥١ و ٢٥٢، والترمذي: ١٠٥، والنسائي: ٢٤١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٣١، والنسائي: ٤١٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٣، والنسائي: ٢٢٠ و ٣٣١ و ٣٩٦.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان لە ناو ئاوی وەستاودا خۆی نەشۆرێ، کە لەشی گران بێت. (ڕاوی) گوتی: ئەی ئەبو هورەیرە ئایا چ بکات؟ گوتی: با ئاوی لێ هەڵبێنجێ (واتە: لە دەرەوەی ئاوە وەستاوەکە ئاو بەکاربێنێ).

## بابەت: ئاو (خۆشوشتن) لە ئاوە (مەنی هاتنەوە)

٦٠٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَخَرَجَ رَأْسُهُ يَقْطُرُ، فَقَالَ: «لَعَلَّنَا أَعْجَلْنَاكَ» قَالَ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «إِذَا أُعْجِلْتَ، أَوْ أُقْحِطْتَ، فَلَا غُسْلَ عَلَيْكَ، وَعَلَيْكَ الْوُضُوءُ»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای پیاوێک لە ئەنصارێدا تێپەڕی، وە ناردی بەدوایدا، کابراش سەری هێنیایە دەر (لە پەنجەرەوە، یان لە دەرگاوە) کە ئاوی لێدەچۆڕایەوە، فەرمووی: وا دیارە پەلەمان لێکردی، گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەگەر پەلەت لێکرا، یان پەلەت کردو و ئاوت نەهاتەوە (تەواو نەبووی)، ئەوە پێویست ناکات خۆت بشۆی، تەنیا دەبێ دەستنوێژ بگریەوە (واتە: تەنیا دەستنوێژت دەشکێ).

٦٠٧- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ»[2].

واتە: ئەبو ئەییوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشۆردن بە ئاو هاتنەوە واجب دەبێ.

## بابەت: واجب بوونی خۆشوشتن ئەگەر ئەندامی نێرینە و مێینەی پیاو و ئافرەت بەر یەک کەوتن

٦٠٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: «إِذَا الْتَقَى الْخِتَانَانِ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ، فَعَلْتُهُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَاغْتَسَلْنَا»[3].

---

(١) صحيح منسوخ. أخرجه البخاري: ١٨٠، ومسلم: ٣٤٥.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه النسائي: ١٩٩. وانظر مسلم: ٣٤٧.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٨ و ١٠٩. وانظر مسلم: ٣٥٠.

واتە: عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: هەر کاتێک شوێن خەتەنەی پیاو و ئافرەت بەیەک گەیشت، ئەوە خۆشۆردن واجب دەبێ، (عائیشە ﷺ دەڵێ:) من و پێغەمبەری خوا ﷺ وامان دەکردو خۆشمان دەشۆرد.

٦٠٩- عَنْ أُبَيِّ بْنُ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: «إِنَّمَا كَانَتْ رُخْصَةً فِي أَوَّلِ الْإِسْلَامِ، ثُمَّ أُمِرْنَا بِالْغُسْلِ بَعْدُ»[١].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: سەرەتای ئیسلام مۆڵەت پێدراو بوو، پاشان فەرمانمان پێکرا بە خۆشۆردن.

٦١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَلَسَ الرَّجُلُ بَيْنَ شُعَبِهَا الْأَرْبَعِ، ثُمَّ جَهَدَهَا، فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاو لە نێوان چوارپەلی ئافرەت دانیشت و پاشان جووت بوو لەگەڵی (و ئاویشی نەیەتەوە)، ئەوە خۆشۆردنی لەسەر واجب دەبێ.

٦١١- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا الْتَقَى الْخِتَانَانِ، وَتَوَارَتْ الْحَشَفَةُ، فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ»[٣].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شوێن خەتەنەی پیاو و ئافرەت بەیەک گەیشت، وە سەری ئەندامی نێرینە چووە نێو ئەندامی مێینەی ئافرەت (بزر بوو)، ئەوە خۆشۆردن واجب دەبێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٤ و ٢١٥، والترمذي: ١١٠ و ١١١.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ٢٩١، ومسلم: ٣٤٨، وأبو داود: ٢١٦، النسائي بنحوه: ١٩١.

(٣) صحيح لغيره.

## بابەت: کەسێ خەو ببینێ بەڵام تەڕی بە جەستە و پۆشاکییەوە نەبێت

٦١٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ، فَرَأَى بَلَلًا، وَلَمْ يَرَ أَنَّهُ احْتَلَمَ، اغْتَسَلَ، وَإِذَا رَأَى أَنَّهُ قَدْ احْتَلَمَ، وَلَمْ يَرَ بَلَلًا، فَلَا غُسْلَ عَلَيْهِ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لە خەو هەڵسا، وە تەڕی بە پۆشاکیەوە بینی (شوێنەواری مەنی بینی)، هەرچەندە خەوی لەشگرانیشی نەبینێ، دەبێ خۆی بشۆرێ، وە ئەگەر هاتوو خەوی لەشگرانی بینی، بەڵام شوێنەواری تەڕایەتی مەنی نەبینی، ئەوە خۆشۆردنی لەسەر نییە.

## بابەت: خۆ پەنادان لەکاتی خۆشوشتندا

٦١٣- عَنْ أَبُو السَّمْحِ ﵁ قَالَ: كُنْتُ أَخْدُمُ النَّبِيَّ ﷺ، فَكَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَغْتَسِلَ قَالَ: «وَلِّنِي» فَأُوَلِّيهِ قَفَايَ، وَأَنْشُرُ الثَّوْبَ، فَأَسْتُرُهُ بِهِ[٢].

واتە: ئەبو سەمح ﵁ دەڵێ: من خزمەتی پێغەمبەرم ﷺ دەکرد، کاتێک کە دەیویست خۆی بشۆرێ دەیفەرموو: پشتم تێبکە منیش پشتم تێ دەکردو، پۆشاکەکەم بڵاودەکردەوە و، دامدەپۆشی.

٦١٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، سَبَّحَ فِي سَفَرٍ، فَلَمْ أَجِدْ أَحَدًا يُخْبِرُنِي، حَتَّى أَخْبَرَتْنِي أُمُّ هَانِئٍ بِنْتُ أَبِي طَالِبٍ أَنَّهُ قَدِمَ عَامَ الْفَتْحِ، «فَأَمَرَ بِسِتْرٍ، فَسُتِرَ عَلَيْهِ، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ سَبَّحَ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی نەوفەل ﵁ دەڵێ: پرسیارم کرد کە ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەفەردا نوێژی سوننەتی کردوە، بەڵام هیچ کەس وەڵامی نەدامەوە، تاوەکو ئوممو هانیئی کچی ئەبو تاڵیب بۆی گێڕامەوە، کە کاتێک پێغەمبەری

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٣٦، والترمذي: ١١٣.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٧٦ مطولًا، والنسائي: ٢٢٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٧ و ١١٧٦، ومسلم: ٣٣٦ وبإثر ٧١٩، وأبو داود: ١٢٩٠ و ١٢٩١.

خوا ﷺ ساڵی ئازادکردنی مەککە گەڕایەوە، فەرمانی کرد کە پەنای بدەن، ئنجا پەنا درا، جا دەستنوێژی گرت (خۆی شۆرد)، پاشان هەشت ڕکات نوێژی سوننەتی کرد.

٦١٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَغْتَسِلَنَّ أَحَدُكُمْ بِأَرْضِ فَلَاةٍ، وَلَا فَوْقَ سَطْحٍ لَا يُوَارِيهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ يَرَى، فَإِنَّهُ يُرَى»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان لە دەشت مەشۆن، وە لەسەر سەربان خۆتان مەشۆن کاتێ خۆتان پەنا نەدابێ، چونکە ئەگەر ئێوەش (خەڵک) نەبینن، ئەوە ئێوە دەبینرێن.

## بابەت: قەدەغەکردن لە کەسی تەنگاو کە نوێژ بکات

٦١٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمُ الْغَائِطَ، وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَلْيَبْدَأْ بِهِ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان ویستی بچێ بۆ سەرئاو، وە کاتی نوێژ کردنیش بوو، با سەرەتا سەرئاوەکەی بکات.

٦١٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «نَهَى أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ وَهُوَ حَاقِنٌ»[٣].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە پیاو بە تەنگاوییەوە نوێژ بکات.

٦١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَقُومُ أَحَدُكُمْ إِلَى الصَّلَاةِ وَبِهِ أَذًى»[٤].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان بە تەنگاوییەوە نوێژ نەکات.

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٨، والترمذي: ١٤٢، والنسائي: ٨٥٢.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح لغيره.

**٦١٩-** عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «لَا يَقُومُ أَحَدٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَهُوَ حَاقِنٌ حَتَّى يَتَخَفَّفَ»[١].

واتە: سەوبان ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە مسوڵمانان هەڵنەستێ (بۆ نوێژکردن) کە تەنگاو بێت، تاوەکو باری خۆی سووک نەکا.

## بابەت: خوێنچرکەی "الإستحاضة" ئەو ئافرەتەی ڕۆژەکانی پاکێتی یان سووڕی مانگانەی ژمارد و پێش ئەوە تووشی خوێنی بەردەوام بێت

**٦٢٠-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ ﷺ، حَدَّثَتْهُ أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَشَكَتْ إِلَيْهِ الدَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ، فَانْظُرِي إِذَا أَتَى قَرْؤُكِ فَلَا تُصَلِّي، فَإِذَا مَرَّ الْقَرْءُ، فَتَطَهَّرِي، ثُمَّ صَلِّي مَا بَيْنَ الْقَرْءِ إِلَى الْقَرْءِ»[٢].

واتە: عوڕوەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە فاتیمەی کچی حوبەیش ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە، کە چووە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای حاڵی خۆی بۆ کردوە لەسەر خوێن بینین، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: بەڕاستی ئەوەی تۆ دەیڵێی خوێنی دەمارێکە (واتە: حەیز نیە)، جا تۆ تەماشا بکە و ئاگاداربە، کاتێک کاتی عادەی مانگانەت هات ئەوە نوێژ مەکە، کاتێکیش عادەت بەسەرچوو ئەوە خۆت پاک بکەوەو، دواتر نوێژ بکە لە نێوانی هەردوو عادەبوونەکەدا.

**٦٢١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ ﷺ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ، فَلَا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ، قَالَ: «لَا، إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ، وَلَيْسَ بِالْحَيْضَةِ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ، فَدَعِي الصَّلَاةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ، فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ، وَصَلِّي» هَذَا حَدِيثُ وَكِيعٍ[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش ﷺ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئافرەتێکم خوێن زۆر دەبینم و پاک

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٩٠، والترمذي: ٣٥٧.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٨٠ و ٢٨١ و ٢٨٦، والنسائي: ٢٠١ و ٢١١ و ٢١٥ و ٣٤٩ و ٣٥٨ و ٣٥٥٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٨، ومسلم: ٣٣٣، وأبو داود: ٢٨٢ و ٢٨٣ و ٣٠٤، والترمذي: ١٢٥، والنسائي: ٢١٢ و ٢١٨ و ٢١٩ و ٣٥٩ و ٣٦٣ و ٣٦٧.




نابمەوە، ئایا واز لە نوێژکردن بێنم؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: نەخێر، ئەوە تەنها دەمارێکە خوێنی لێدێت و حەیز نیە، بۆیە (بە گوێرەی شارەزای خۆت کە دەزانی کەی عادە دەبی) هەر کاتێک عادەبووی وە کاتی سوڕی مانگانەت هات (بە پێی زانینی ڕابردووت) ئەوە وازبێنە لە نوێژکردن، وە هەرکات سوڕی مانگانەت ماوەکەی بەسەرچوو (با خوێنیش ببینی) خۆت پاک بکەوە لەو خوێنەی بە جەستەتەوەیە و نوێژ بکە. ئەمە ئەو فەرموودەیەیە کە وەکیع گێڕاویەتیەوە.

٦٢٢- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ جَحْشٍ ﵂، قَالَتْ: كُنْتُ أُسْتَحَاضُ حَيْضَةً كَثِيرَةً طَوِيلَةً، قَالَتْ: فَجِئْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ أَسْتَفْتِيهِ وَأُخْبِرُهُ، قَالَتْ: فَوَجَدْتُهُ عِنْدَ أُخْتِي زَيْنَبَ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً، قَالَ: «وَمَا هِيَ؟ أَيْ هَنْتَاهُ» قُلْتُ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ حَيْضَةً طَوِيلَةً كَبِيرَةً، وَقَدْ مَنَعَتْنِي الصَّلَاةَ وَالصَّوْمَ، فَمَا تَأْمُرُنِي فِيهَا؟ قَالَ: «أَنْعَتُ لَكِ الْكُرْسُفَ، فَإِنَّهُ يُذْهِبُ الدَّمَ» قُلْتُ: هُوَ أَكْثَرُ فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ شَرِيكٍ[١].

واتە: ئوممو حەبیبەی کچی جەحش ﵂ دەڵێ: من ئافرەتێک بووم خوێنی زۆر و ماوە درێژم دەبینی لە کاتی سوڕی مانگانەدا، بۆیە هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی پرسیاری لێبکەم و حوکمەکەم پێبڵێ، وە هەواڵەکەی خۆمی پێبدەم، دەڵێ: جا بینیم لەوکاتەدا لەلای زەینەبی خوشکم بوو، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی کارێک و پێویستییەکم کەوتۆتە لای جەنابت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەو کارە چییە ئەی ژن؟ گوتم: من کاتێ دەچمە سوڕی مانگانەوە خوێنی زۆر و ماوە درێژ دەبینم، وە ئەوەش وام لێدەکات کە واز لە نوێژ و ڕۆژوگرتن بێنم، جا هاتووم بزانم چ فەرمانێکم پێدەکەی؟ جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من شتێکت بۆ وەسف دەکەم کە بێگومان خوێن لادەبات و نایهێڵێ ئەویش (کورسوف) لۆکەیە، گوتم: خوێنەکە لەوە زیاترە. ڕاوی فەرموودەکەی شەریک گێڕاویەتیەوە کە ژمارە (٦٢٧)ـە.

٦٢٣- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَةٌ النَّبِيَّ ﷺ قَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ، فَلَا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ؟ قَالَ: «لَا، وَلَكِنْ دَعِي قَدْرَ الْأَيَّامِ وَاللَّيَالِي الَّتِي كُنْتِ تَحِيضِينَ» قَالَ: أَبُو بَكْرٍ فِي حَدِيثِهِ «وَقَدْرَهُنَّ مِنَ الشَّهْرِ، ثُمَّ اغْتَسِلِي وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ، وَصَلِّي»[٢].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٨٧، والترمذي: ١٢٨.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٧٤ و ٢٧٨، والنسائي: ٢٠٨ و ٣٥٤ و ٣٥٥.

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: ئافرەتێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردو گوتی: من توشی خوێن بەربوون بووم و پاک نابمەوە، ئایا واز لە نوێژکردن بێنم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، بەڵام بە ئەندازەی ئەو شەو و ڕۆژانەی کە پێشتر سوڕی مانگانەت تێدا بینیون (نوێژ مەکە)، ئەبو بەکر لە فەرموودەکەدا دەڵێ: ئەندازەکەیان لە مانگەکەدایە (کاتێک ماوەکە تەواوبوو) دواتر خۆت بشۆ و داوێنت بە پارچە قوماشێک ببەستە (تاکو خوێنی لێنەیەت) پاشان نوێژبکە.

٦٢٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ، فَلَا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ؟ قَالَ: «لَا، إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِالْحَيْضَةِ، اجْتَنِبِي الصَّلَاةَ أَيَّامَ مَحِيضِكِ، ثُمَّ اغْتَسِلِي، وَتَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلَاةٍ، وَإِنْ قَطَرَ الدَّمُ عَلَى الْحَصِيرِ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش ﵂ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئافرەتێکم خوێنم زۆرە، یان خوێن بەربوونم زۆرە و پاک نابمەوە، جا ئایا واز لە نوێژکردن بێنم لەو حاڵەتەدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، بەڕاستی ئەوە خوێنی حەیز نیە، ئەوە خوێنی دەمارێکە، بۆیە بە ئەندازەی ڕۆژانی سوڕی مانگانەت نوێژ مەکە، پاش ئەوەی کە ڕۆژانی حەیزت تەواوبوو، ئەوە خۆت بشۆرەو بۆ هەر نوێژێکیش دەستنوێژ بگرە (نوێژەکانت بکە) ئەگەر دلۆپی خوێن بکەوێتە سەر حەسیرەکەش.

**الْحَصِير**: وەکو بەرماڵ وایە کە لە پوش و گەڵای دارخورما دروست دەکرێ.

٦٢٥- عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُسْتَحَاضَةُ تَدَعُ الصَّلَاةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلُ، وَتَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، وَتَصُومُ، وَتُصَلِّي»[2].

واتە: عەدی کوڕی سابیت لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﵁ ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، کە فەرموویەتی: ئەو ئافرەتەی خوێن بەربوونی هەیە و خوێنەکەش خوێنی حەیز نیە، ئەوە واز لە نوێژ دێنێ بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی کە پێشتر تێیدا

---

(١) صحيح إلا قوله: «وَإِنْ قَطَرَ الدَّمُ عَلَى الْحَصِيرِ». أخرجه أبو داود: ٢٩٨.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٩٧، والترمذي: ١٢٦.

توشی سوڕی مانگانە بووە، پاشان خۆی دەشۆرێ بۆ هەموو نوێژێکیش دەستنوێژ دەگرێ و ڕۆژووش دەگرێ و نوێژیش دەکات.

**تێبینی:** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (قرء) بە مانـای حەیزو سووڕی مانگانە نیە.

## بابەت: ئەو ئافرەتەی "استحاض"یەتی خوێنەکانی لێ تێکەڵ بووە و نایانناسێتەوە

٦٢٦- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَعَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: اسْتُحِيضَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ وَهِيَ تَحْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ سَبْعَ سِنِينَ، فَشَكَتْ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ هَذِهِ لَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ، وَإِنَّمَا هُوَ عِرْقٌ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ، فَدَعِي الصَّلَاةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ، فَاغْتَسِلِي وَصَلِّي» قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، ثُمَّ تُصَلِّي، وَكَانَتْ تَقْعُدُ فِي مِرْكَنٍ لِأُخْتِهَا زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، حَتَّى إِنَّ حُمْرَةَ الدَّمِ لَتَعْلُو الْمَاءَ[1].

واتە: عوڕوەی کوڕی زوبەیر و عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمان دەگێڕنەوە کە عائیشە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: ئوممو حەبیبەی کچی جەحش ﵂ کە هاوسەری عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بوو ﵁، حەوت ساڵ توشی نەخۆشی خوێن بەربوون بوو، بۆ ئەو مەبەستە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای حاڵی خۆی کرد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو خوێنە خوێنی حەیز نیە، بەڵکو دەمارێکە ئەو خوێنەی لێدێتە دەرەوە، بۆیە بە گوێرەی پێش توش بوون بەو نەخۆشییە، هەرکات ڕۆژانی سوڕی مانگانەت هات، ئەوە واز لە نوێژکردن بێنە، وە کاتێکیش ئەو کاتەی سوڕی مانگانە تەواو بوو ڕۆیشت، ئەوە خۆت بشۆرەو نوێژ بکە، عائیشە ﵂ دەڵێ: بۆ هەموو نوێژێک خۆی دەشۆردو دواتر نوێژی دەکرد، وە لە تەشتێکدا خۆی دەشۆرد کە هی زەینەبی کچی جەحشی خوشکی بوو، کە ڕەنگی سوری خوێنەکەی بەسەر ئاوەکەدا دەکەوت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٧، ومسلم: ٣٣٤، وأبو داود: ٢٨٩_٢٩١، والترمذي: ١٢٩، والنسائي: ٢٠٣ و ٢٠٤ و ٢٠٥ و ٢٠٦ و ٢٠٧ و ٢١٠ و ٣٥١ و ٣٥٧.

## بابەت: ئەو کچەی کە لە سەرەتاوە تووشی خوێن بەربوون بووە یان ڕۆژەکانی عادەی بیرچۆتەوە

**٦٢٧-** عَنْ أُمِّهِ حَمْنَةَ بِنْتِ جَحْشٍ ﵂ أَنَّهَا اسْتُحِيضَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي اسْتُحِضْتُ حَيْضَةً مُنْكَرَةً شَدِيدَةً، قَالَ لَهَا: «احْتَشِي كُرْسُفًا» قَالَتْ لَهُ: إِنَّهُ أَشَدُّ مِنْ ذَلِكَ، إِنِّي أَثُجُّ ثَجًّا، قَالَ: «تَلَجَّمِي، وَتَحَيَّضِي فِي كُلِّ شَهْرٍ فِي عِلْمِ اللَّهِ سِتَّةَ أَيَّامٍ، أَوْ سَبْعَةَ أَيَّامٍ، ثُمَّ اغْتَسِلِي غُسْلًا، فَصَلِّي، وَصُومِي ثَلَاثَةً وَعِشْرِينَ، أَوْ أَرْبَعَةً وَعِشْرِينَ، وَأَخِّرِي الظُّهْرَ، وَقَدِّمِي الْعَصْرَ، وَاغْتَسِلِي لَهُمَا غُسْلًا، وَأَخِّرِي الْمَغْرِبَ، وَعَجِّلِي الْعِشَاءَ، وَاغْتَسِلِي لَهُمَا غُسْلًا، وَهَذَا أَحَبُّ الْأَمْرَيْنِ إِلَيَّ»[1].

واتە: حەمنەی کچی جەحش ﵂ دەگێڕێتەوە، لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ توشی خوێنبەربوون بوو، جا هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: من توشی خوێنبەربوون و حەیزێک بووم کە خوێنەکەی یەکجار زۆرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پارچە لۆکەیەک لە شوێنی خوێن هاتنەکە دابنێ، ئەویش گوتی: خوێنەکە زۆر لەوە زیاترە کە بەو پارچە لۆکەیە ڕابوەستێ، چونکە من خوێنێکی زۆر زۆرم لەبەر دەڕوات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە پارچە پەڕۆیەک ئەو شوێنەی خوێنەکە ببەستە، ئنجا بە پێی شەریعەتی خوا لەهەر مانگێکدا شەش، یان حەوت ڕۆژ بە حەیز و عادە هەژمار بکە، پاشان خۆت بشۆ و بیست و سێ یان بیست و چوار (ڕۆژ) نوێژ بکە و بەڕۆژ ووبە، وە نوێژی نیوەڕۆ دوابخە و نوێژی عەصریش پێشبخە و بۆ هەردوو نوێژەکە یەکجار خۆت بشۆ، وە نوێژی مەغریب دوابخە و نوێژی عیشاش پێشبخە، بۆ هەردووکیان یەکجار خۆت بشۆ، ئەوە باشترین و ڕاسترینی دوو ڕایەکەیە لە لای من.

**تێبینی:** مەبەست لە دوو ڕایەکە ئەوەیە کە یەکەم: بۆ هەر نوێژێک خۆی بشۆرێ، دووەم: کە نیوەڕۆ و عەصر کۆبکاتەوەو بۆ هەردووکیان یەکجار خۆی بشۆرێ، وە هەروەها مەغریب و عیشا (بۆیە دووەمی هەڵبژارد، چونکە هی یەکەم قورسی و نارەحەتی زیاتری تێدایە).

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٨٧، والترمذي: ١٢٨.

## بابەت: بەرکەوتنی خوێنی حەیز بە پۆشاک

٦٢٨- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ ﵂، قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَنْ دَمِ الْحَيْضِ يُصِيبُ الثَّوْبَ، قَالَ: «اغْسِلِيهِ بِالْمَاءِ وَالسِّدْرِ، وَحُكِّيهِ وَلَوْ بِضِلَعٍ»[1].

واتە: ئوممو قەیسی کچی میحصەن ﵂ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی خوێنی حەیز کاتێک بەر پۆشاک دەکەوێ (ئایا پیسە، یان نا؟)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە ئاو و مۆرد (یە کێکە لەو شتانەی کە پۆشاکی پێ دەشۆردرێ وەکو صابون و تایت) بیشۆ، وە شوێنەکەی بکرێنە ئەگەر بەچیلکەدارێکیش بێ (بۆ ئەوەی شوێنەواری نەمێنێ).

٦٢٩- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﵄ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ دَمِ الْحَيْضِ يَكُونُ فِي الثَّوْبِ، قَالَ: «اقْرُصِيهِ، وَاغْسِلِيهِ، وَصَلِّي فِيهِ»[2].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکری صیددیق ﵄ دەڵێ: پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی خوێنی حەیز کاتێک کە بە پۆشاکەوە بێ، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: (بە پەنجە و نینۆکت) بیکرێنە و ئاوی بەسەردا برێژە، ئنجا نوێژی پێوە بکە.

٦٣٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: «إِنْ كَانَتْ إِحْدَانَا لَتَحِيضُ، ثُمَّ تَقْرُصُ الدَّمَ مِنْ ثَوْبِهَا عِنْدَ طُهْرِهَا، فَتَغْسِلُهُ وَتَنْضَحُ عَلَى سَائِرِهِ، ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ»[3].

واتە: عائیشە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: ئەگەر یەکێکمان توشی عادەی مانگانە بووباین، ئەوە ئەو کەسە پۆشاکەکەی دەکرِاند لە کاتی پاککردنەوەدا، ئنجا (شوێنەکەی) دەشۆرد، پاشان ئاوی لە هەموو پۆشاکەکە دەپرژاند و دواتر نوێژی پێوە دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٣، والنسائي: ٢٩٢ و ٣٩٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٧ و ٣٠٧، ومسلم: ٢٩١، وأبو داود: ٣٦٠_٣٦٢، والترمذي: ١٣٨، والنسائي: ٢٩٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٨.

## بابەت: ئافرەتی بێنوێژ نوێژەکانی ناگێڕێتەوە

**٦٣١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْهَا: أَتَقْضِي الْحَائِضُ الصَّلَاةَ؟ قَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قَدْ «كُنَّا نَحِيضُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ نَطْهُرُ، وَلَمْ يَأْمُرْنَا بِقَضَاءِ الصَّلَاةِ»[1].

واتە: عائیشەی ﵂ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک پرسیاری لێکرد: دەربارەی ئەوەی کە ئایا ئافرەت کە عادە دەبێ پێویستە دوای پاک بوونەوە نوێژەکانی بگێڕێتەوە؟ عائیشە ﵂ پێی گوت: ئایا تۆ حەڕوریت (دەستەیەک بوون لە خەواریج کە پێیان وابووە ئافرەت دوای پاکبوونەوە دەبێ نوێژەکانی بگێڕێتەوە)؟ (دوای ئەوە عائیشە ﵂) گوتی: ئێمە لە لای پێغەمبەر ﷺ توشی سوڕی مانگانە دەبووین، پاشان پاک دەبووینەوە، فەرمانیشی پێ نەدەکردین نوێژەکانمان بگێڕینەوە.

## بابەت: ئەوەی کە ئافرەتی بێ نوێژ دەتوانێ شتێک لە مزگەوت بێنێ

**٦٣٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَاوِلِينِي الْخُمْرَةَ مِنَ الْمَسْجِدِ» فَقُلْتُ: إِنِّي حَائِضٌ، فَقَالَ: لَيْسَتْ حَيْضَتُكِ فِي يَدِكِ[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەو بەرماڵەم بدەیە پێغەمبەریش ﷺ لە ناو مزگەوت بوو، منیش گوتم: لە عادەی مانگانەدام، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: خۆ خوێنی عادە بوونەکە بە دەستتەوە نیە (واتە: ئافرەتی عادە جەستەی پاکە).

**٦٣٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يُدْنِي رَأْسَهُ إِلَيَّ، وَأَنَا حَائِضٌ، وَهُوَ مُجَاوِرٌ - تَعْنِي مُعْتَكِفًا - فَأَغْسِلُهُ، وَأُرَجِّلُهُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢١، ومسلم: ٣٣٥، وأبو داود: ٢٦٢ و ٢٦٣، والترمذي: ١٣٠، والنسائي: ٣٨٢ و ٢٣١٨. وانظر الترمذي: ٧٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٨، وأبو داود: ٢٦١، والترمذي: ١٣٤، والنسائي: ٢٧١ و ٣٨٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٢٨، ومسلم: ٢٩٧، وأبو داود: ٢٤٦٧ و ٢٤٦٩، والترمذي: ٨٠٤، والنسائي: ٢٧٥_٢٧٧ و ٣٨٦_٣٨٨.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەری (موبارەکی) لە من نزیک کردەوە و بۆ لای منی هێنا، وە منیش لە عادەی مانگانەدا بووم، وە پێغەمبەریش ﷺ لە ئیعتیکاف دابوو (لە مزگەوت)، ئنجا منیش سەریم بۆ شۆرد و بۆم شانەکرد.

٦٣٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَضَعُ رَأْسَهُ فِي حِجْرِي، وَأَنَا حَائِضٌ، وَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لەسەر کۆشی من دادەنا و قورئانی دەخوێند، لە کاتێکدا من لە سوڕی مانگانەدا بووم.

## بابەت: ئەوەی کە پیاو چی بۆ هەیە بیکات کە خێزانەکەی عادە دەبێ

٦٣٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَتْ إِحْدَانَا إِذَا كَانَتْ حَائِضًا، أَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تَأْتَزِرَ فِي فَوْرِ حَيْضَتِهَا، ثُمَّ يُبَاشِرُهَا، وأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَهُ كَمَا كانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْلِكُ إِرْبَهُ؟»[٢].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەگەر یەکێکمان لە عادەی مانگانەدا بووینایە، ئەوە پێغەمبەر ﷺ (ئەگەر بیویستایە دەستبازی لە گەڵدا بکات) فەرمانی پێدەکرد کە لە گەرمەی عادەبوونەکەدا نێوان ناوک و ئەژنۆ بە پارچە قوماشێک داپۆشێ و پاشان تێکەڵی دەبوو، بەڵام کێ لە ئێوە دەتوانێ وەکو پێغەمبەر ﷺ ئارەزووی خۆی کپ بکات و بەسەریدا زاڵبێت (بە تایبەتی لەو حاڵەتەدا).

٦٣٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَتْ إِحْدَانَا إِذَا حَاضَتْ، أَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تَأْتَزِرَ بِإِزَارٍ، ثُمَّ يُبَاشِرُهَا»[٣].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەگەر یەکێکمان توشی عادەی مانگانە بووباین، ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدەکرد بە پۆشاکێک (نێوانی ئەژنۆ و پشتێنی) داپۆشێ، پاشان لەگەڵیدا تێکەڵ دەبوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٧ و ٧٥٤٩، ومسلم: ٣٠١، وأبو داود: ٢٦٠، والنسائي: ٢٧٤ و ٣٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٢، ومسلم: ٢٩٣، وأبو داود: ٢٦٨ و ٢٧٣، والترمذي: ١٣٢، والنسائي: ٢٨٥ و ٢٨٦ و ٣٧٣ و ٣٧٤.

(٣) صحيح.

٦٣٧- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي لِحَافِهِ، فَوَجَدْتُ مَا تَجِدُ النِّسَاءُ، مِنَ الْحَيْضَةِ، فَانْسَلَلْتُ مِنَ اللِّحَافِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَفِسْتِ؟» قُلْتُ: وَجَدْتُ مَا تَجِدُ النِّسَاءُ مِنَ الْحَيْضَةِ، قَالَ: «ذَلِكِ مَا كَتَبَ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ» قَالَتْ: فَانْسَلَلْتُ، فَأَصْلَحْتُ مِنْ شَأْنِي، ثُمَّ رَجَعْتُ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَعَالَيْ، فَادْخُلِي مَعِي فِي اللِّحَافِ» قَالَتْ: فَدَخَلْتُ مَعَهُ[1].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە پێخەفێکدا، ئنجا توشی ئەو حاڵەتە بووم کە ئافرەتان توشی دەبن لە سوڕی مانگانەدا، منیش لەژێر پێخەفەکە هاتمە دەرەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا توشی سوڕی مانگانە بووی؟ منیش گوتم: هەست بەوە دەکەم کە ئافرەتان توشی دەبن لە سوڕی مانگانەدا، ئەویش فەرمووی: ئەوە شتێکە کە خوا لەسەر ئافرەتانی نەوەی ئادەم دایناوە، گوتی: منیش بەهێواشی دەرچووم و ئەوەی پێویست بێ کردم بۆ ئەو حاڵەتە و پاشان گەڕامەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: وەرە لەگەڵ من بۆ ژێر پێخەفەکە، دەڵێ: منیش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چوومە ناو پێخەفەکە.

٦٣٨- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﵁، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُهَا: كَيْفَ كُنْتِ تَصْنَعِينَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْحَيْضَةِ؟ قَالَتْ: «كَانَتْ إِحْدَانَا فِي فَوْرِهَا، أَوَّلَ مَا تَحِيضُ، تَشُدُّ عَلَيْهَا إِزَارًا إِلَى أَنْصَافِ فَخِذَيْهَا، ثُمَّ تَضْطَجِعُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[2].

واتە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﵁ دەگێڕێتەوە کە ئوممو حەبیبەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتی: پرسیارم کرد لە ئوممو حەبیبە کە ئایا لە کاتی سوڕی مانگانەدا لەلای پێغەمبەر ﷺ چیت دەکرد؟ ئەویش گوتی: ئەگەر یەکێکمان توشی عادەی مانگانە بووباین لە سەرەتای عادەبوونەکەدا ئەوە توند بە پۆشاکێک تاکو نیوەی ڕانی دادەپۆشی و پاشان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەچوو بۆ سەر جێگای خەوتن.

---

(١) حسن. انفرد بهذا اللفظ ابن ماجه. وانظر البخاري: ٢٩٨، ومسلم: ٢٩٦، والنسائي: ٢٨٣ و ٣٧١.

(٢) حسن.

## بابەت: قەدەغەکردنی چوونە لای ئافرەتی عادە

٦٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَتَى حَائِضًا، أَوِ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا، أَوْ كَاهِنًا، فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بچێتە لای ئافرەتێکی عادە (تا لەگەڵی جووت بێ)، یان بچێتە لای ئافرەت لە دواوە، (واتە: لە شوێنی جگە لە منداڵبوون جووت بێ)، یان بچێتە لای فاڵچی و جادووگەرەکان و بڕوایان پێبکات، ئەوە ئەو کەسە بێ بڕوایە بەو وەحیەی کە بۆ سەر موحەممەد (پێغەمبەری خوا ﷺ) دابەزیوە.

## بابەت: کەفارەتی ئەو کەسەی دەچێتە لای ئافرەتەکەی کە عادەیە

٦٤٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: «يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَوْ بِنِصْفِ دِينَارٍ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی ئەوانەی کە دەچنە لای خێزانەکانیان لە کاتێکدا خێزانەکانیان لە سوڕی مانگانەدان فەرموویەتی: ئەو کەسە دەبێ دینارێک، یان نیو دینار ببەخشێ (لە کەفارەتی ئەوەی کە چۆتە لای خێزانی لە سوڕی مانگانەدا).

## بابەت: چۆنیەتی خۆشوشتنی ئافرەتی عادە

٦٤١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا، وَكَانَتْ حَائِضًا: «انْقُضِي شَعْرَكِ، وَاغْتَسِلِي» قَالَ: عَلِيٌّ فِي حَدِيثِهِ: «انْقُضِي رَأْسَكِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٩٠٤، والترمذي: ١٣٥.

(٢) صحيح. أبو داود: ٢٦٤ و ٢٦٦ و ٢١٦٨، والترمذي: ١٣٦، والنسائي: ٢٨٩ و ٣٧٠. وبلفظ «يَتَصَدَّقُ بِنِصْفِ دِينَارٍ» ضعيف.

(٣) صحيح.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا کە (عائیشە) لە سوڕی مانگانەدا بووە پێی فەرمووە: پرچت بکەوە و هەڵیانبوەشێنەوە ئەوجار خۆت بشۆرە، عەلی لە فەرموودەکەیدا دەڵێ: سەرت بکەوە.

**٦٤٢-** عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ أَسْمَاءَ ﵂ سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الْغُسْلِ مِنَ الْمَحِيضِ، فَقَالَ: «تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا، وَسِدْرَهَا، فَتَطْهُرُ، فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ، أَوْ تَبْلُغُ فِي الطُّهُورِ، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا، فَتَدْلُكُهُ دَلْكًا شَدِيدًا، حَتَّى تَبْلُغَ شُئُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَيْهَا الْمَاءَ، ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً، فَتَطْهُرُ بِهَا» قَالَتْ أَسْمَاءُ: كَيْفَ أَتَطَهَّرُ بِهَا؟ قَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ، تَطَهَّرِي بِهَا» قَالَتْ عَائِشَةُ، كَأَنَّهَا تُخْفِي ذَلِكَ: تَتَبَّعِي بِهَا أَثَرَ الدَّمِ، قَالَتْ: وَسَأَلَتْهُ عَنِ الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَقَالَ: «تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا، فَتَطْهُرُ، فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ، أَوْ تَبْلُغُ فِي الطُّهُورِ، حَتَّى تَصُبَّ الْمَاءَ عَلَى رَأْسِهَا، فَتَدْلُكُهُ حَتَّى تَبْلُغَ شُئُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى جَسَدِهَا» فَقَالَتْ عَائِشَةُ: نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الْأَنْصَارِ، لَمْ يَمْنَعْهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ[1].

واتە: عائیشە دەگێڕێتەوە کە ئەسماء ﵂ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی خۆشۆردن لە دوای حەیز، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هەر یەکێکتان ئاو و مۆرد بەکاربێنێ و خۆی پێ بشوات، وە خۆشۆردنەکەی بە شێوازێکی باش و جوان بێ، یان زۆر باش هەوڵی خۆپاک کردنەوە بدات، پاشان ئاو بکات بەسەر سەریدا و دەستی بخاتە ناوی و دەستی پێدا بێنێ بە تەواوی و بەهێزی، تاکو شۆردنەکە دەگاتە بن هەموو مویەکی سەر، پاشان ئاوی پێدابکات، دواتر پارچە لۆکەیەکی بۆن خۆش بێنێ و خۆی پێپاک بکاتەوە، ئەسماء ﵂ گوتی: چۆن چۆنی بە پارچە لۆکەکە خۆم پاک بکەمەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سبحان الله! خۆتی پێپاک بکەوە، عائیشە ﵂ گوتی: (وەک بڵێی شتەکەی بە شاراوەیی پێدەگوت) بۆیە گوتی: شوێنەواری خوێنەکەی پێ پاک بکەوە، دەڵێ: پرسیارم لێکرد دەربارەی خۆشۆردنی لەشگرانی، ئەویش فەرمووی: هەر یەکێکتان ئاوەکە هەڵبگرێ و بەکاری بێنێ بۆ خۆشوشتن، وە جوان خۆی پاک بکاتەوە، ئەوجار ئاو بڕێژێ بەسەر سەریدا و دەستی تێبخا تاکو تەواوی مو و بنی مووەکانی دەشۆرێ، دواتر ئاو بکات بەسەر تەواوی جەستەیدا. عائیشە ﵂ دەڵێ: باشترینی ئافرەتان ئافرەتی ئەنصاریەکانن، شەرم ڕێیان لێناگرێ لە پرسیارکردن و شارەزابوون لە ئایین.

---

(١) حسن. أخرجه البخاري: ٣١٤ مختصراً، ومسلم: ٣٣٢، وأبو داود: ٣١٤ و ٣١٥ و ٣١٦، والترمذي: ٢٥١ و ٤٢٧.

## بابەت: نان خواردن لەگەڵ ئافرەتی عادە و بەرماوەکەی

٦٤٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: «كُنْتُ أَتَعَرَّقُ الْعَظْمَ، وَأَنَا حَائِضٌ، فَيَأْخُذُهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَيَضَعُ فَمَهُ حَيْثُ كَانَ فَمِي، وَأَشْرَبُ مِنَ الْإِنَاءِ، فَيَأْخُذُهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَيَضَعُ فَمَهُ حَيْثُ كَانَ فَمِي، وَأَنَا حَائِضٌ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێک من ئێسکێکم دەکرِییەوە (واتە: بە ددان گۆشتەکەم لێ دەکردەوە) لە کاتێکدا کە لە سورِی مانگانە دابووم، دوای من پێغەمبەر ﷺ ئێسکە گۆشتەکەی لێوەردەگرتم و دەمی دەخستە ئەو شوێنەی کە من دەمم خستبووە سەری، وە ئاوم دەخواردەوە لە دەفرێکدا، پێغەمبەر ﷺ لێی وەردەگرتم و دەمی دەخستە ئەو شوێنەی من دەمم پێووەنابوو بۆ ئاو خواردنەوە، لە کاتێکدا من لە سورِی مانگانەدا بووم.

٦٤٤- عَنْ أَنَسٍ ﵁، أَنَّ الْيَهُودَ كَانُوا لَا يَجْلِسُونَ مَعَ الْحَائِضِ فِي بَيْتٍ، وَلَا يَأْكُلُونَ وَلَا يَشْرَبُونَ، قَالَ: فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلْمَحِيضِ ﴿٢٢٢﴾ ﴾ البقرة، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «اصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ، إِلَّا الْجِمَاعَ»[٢].

واتە: ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە، جوولەکە نەریتیان وابوو کە ئافرەتێک لە سورِی مانگانەدا بووایە ئەوە لە ماڵەوە لە گەڵیدا دانەدەنیشتن و خواردن و خواردنەوەشیان لەگەڵ نەدەخواردن، دەڵێ: ئەو حاڵەتەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، یەکسەر ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلْمَحِيضِ ﴿٢٢٢﴾ ﴾ البقرة، واتە: وە پرسیارت لێدەکەن دەربارەی حەیز (بێ نوێژی ئافرەتان) بڵێ ئەوە ئازارە کەواتە دوور بکەونەوە لە هاوسەرەکانتان لەکاتی حەیز دا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەموو شتێکیان لەگەڵدا بکەن (لەگەڵ ئافرەتی حەیزدار) جگە لە جووتبوون.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٠٠، وأبو داود: ٢٥٩، والنسائي: ٧٠ و ٢٨١ و ٢٨٢ و ٣٤١ و ٣٧٧_٣٨٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٠٢، وأبو داود: ٢٥٨ و ٢١٦٥، والترمذي: ٢٩٧٧، والنسائي: ٢٨٨ و ٣٦٩.

## بابەت: خۆ دوورگرتنی ئافرەتی عادە لە مزگەوت

**٦٤٥-** عَنْ جَسْرَةَ ﵂، قَالَتْ: أَخْبَرَتْنِي أُمُّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَرْحَةَ هَذَا الْمَسْجِدِ، فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ «إِنَّ الْمَسْجِدَ لَا يَحِلُّ لِجُنُبٍ، وَلَا لِحَائِضٍ»(١).

**واتە: جەسرە ﵂ دەڵێ: ئوممو سەلەمە ﵂ هەواڵی پێدام گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ناو حەوشەی ئەو مزگەوتە و بە دەنگێکی بەرز فەرمووی: بەڕاستی کەسێک لەشگران بێ، یان ئافرەتی حەیزدار بۆیان حەڵاڵ و دروست نیە بچنە ناو مزگەوت (یان لە ناو مزگەوت بمێننەوە).**

## بابەت: ئافرەتی عادە
## کە دوای پاک بوونەوە زەردی یان لێڵی دەبینێ

**٦٤٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فِي الْمَرْأَةِ تَرَى مَا يَرِيبُهَا بَعْدَ الطُّهْرِ قَالَ: «إِنَّمَا هِيَ عِرْقٌ، أَوْ عُرُوقٌ» قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى: يُرِيدُ بَعْدَ الطُّهْرِ بَعْدَ الْغُسْلِ(٢).

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو ئافرەتەی کە دەکەوێتە گومان لە دوای پاکبوونەوە فەرموویەتی: ئەوە خوێنی دەمارێکە یان چەند دەمارێکە (واتە: بە خوێنی حەیز هەژمار ناکرێ). موحەممەدی کوڕی یەحیا دەڵێ: مەبەست لە (بَعْدَ الطُّهْرِ) واتە: دوای خۆ شوشتن.**

**٦٤٧-** عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂، قَالَتْ: «لَمْ نَكُنْ نَرَى الصُّفْرَةَ وَالْكُدْرَةَ شَيْئًا»(٣).

**واتە: ئوممو عەتیە ﵂ دەڵێ: ئەگەر خوێن زەرد بووایە، یان لێڵ بووایە بە هیچمان نەدەزانی. (واتە: بە خوێنی حەیز هەژمار نەدەکرا، چونکە خوێنی حەیز مەیلە و ڕەشی دەنوێنێ لەبەر تۆخی سوریەکەی).**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٩٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٦، وأبو داود: ٣٠٧، والنسائي: ٣٦٨.

٦٤٧م- قَالَ مُحمَّدُ بْنُ يَحْيَى: حَدَّثَنَا مُحمَّدُ بْنُ عبْدِ اللَّهِ الرَّقَاشِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حَفْصَةَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂، قَالَتْ: «كُنَّا لَا نَعُدُّ الصُّفْرَةَ وَالْكُدْرَةَ شيْئًا» قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى: وُهَيْبٌ أَوْلَاهُمَا عِنْدَنَا بِهَذَا[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی یەحیا دەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای ڕەقاشی بۆی گێڕاینەوەو گوتی: وهەیب لە ئەیوبەوە، لە حەفصەوە، لە ئوممو عەتیەوە ﵂ بۆی گێڕاینەوە و گوتی: ئێمە خوێنی زەرد یان لێڵمان هەژمار نەدەکرد، موحەممەدی کوڕی یەحیا گوتی: لای ئێمە وهەیب لە پێشترە بۆ ئەوە.

## بابەت: مانەوە و کاتی ئافرەتێک کە منداڵی بووە

٦٤٨- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَتِ النُّفَسَاءُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ «تَجْلِسُ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، وَكُنَّا نَطْلِي وُجُوهَنَا بِالْوَرْسِ مِنَ الْكَلَفِ»[2].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کە ئافرەتێک منداڵی ببوایە ئەوە چل ڕۆژ دادەنیشت (واتە: دەستی لە نوێژ و ڕۆژو هەڵدەگرت و لەگەڵ مێردەکەی جووت نەدەبوو)، دەڵێ: لەبەر زیپکە و پەڵەی ڕەشی دەم و چاو و ڕووخسار، ڕووخسارمان بە وەڕس (جۆرە گیایەکە) دەرمان دەکرد و، لە دەم و چاومان هەڵدەسوو.

٦٤٩- عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «وَقَّتَ لِلنُّفَسَاءِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، إِلَّا أَنْ تَرَى الطُّهْرَ قَبْلَ ذَلِكَ»[3].

واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چل ڕۆژی دیاری کردوە بۆ زەیستان (بۆ ئەوەی کە واز لە نوێژ و ڕۆژوو بێنێ) مەگەر (ئافرەتێک) زووتر لەو ماوەیە پاک ببێتەوە (ئەوە ئەو کات دەبێ هەرکە پاک بۆوە دەست بکاتەوە بە نوێژ).

---

(١) صحيح. تخريجه انفرد به ابن ماجه. وانظر الحديث المتقدم.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٣١١ و ٣١٢، والترمذي: ١٣٩.

(٣) ضعيف جداً.

## بابەت: کەسێ کە تووشی جیماع دەبێ لەگەڵ خێزانەکەی کە عادەیە

٦٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا وَقَعَ عَلَى امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ، أَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ «أَنْ يَتَصَدَّقَ بِنِصْفِ دِينَارٍ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: هەرکات پیاوێک چووبا بۆ لای ژنەکەی و جیماعی لەگەڵدا بکردایە لە کاتی سوڕی مانگانەدا، ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدەکرد نیو دینار (لە زێڕ) لە کەفارەتی ئەو کارە ببەخشێ.

## بابەت: نان خواردن لەگەڵ ئافرەتی عادە

٦٥١- عَنْ عَمِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ مُؤَاكَلَةِ الْحَائِضِ، فَقَالَ: «وَاكِلْهَا»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی خواردن لەگەڵ ئافرەتێک کە لە سوڕی مانگانەدا بێت، ئەویش فەرمووی: لەگەڵی بخۆ.

## بابەت: نوێژکردن لە پۆشاکێکدا کە تێیدا عادە بووە

٦٥٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي وَأَنَا إِلَى جَنْبِهِ، وَأَنَا حَائِضٌ، وَعَلَيَّ مِرْطٌ لِي، وَعَلَيْهِ بَعْضُهُ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکردو منیش لە تەنیشتیەوە بووم و لە سوڕی مانگانەشدا بووم، جا پۆشاکێک (کە لە خوری دروستکرابوو) بە سەرمەوە بوو، هەندێکیشی بەسەر پێغەمبەرەوە ﷺ بوو.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٦٦، والترمذي: ١٣٦.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٣٣. وانظر أبو داود: ٢١٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥١٤، وأبو داود: ٣٧٠، والنسائي: ٧٦٨.

٦٥٣- عَنْ مَيْمُونَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «صَلَّى وَعَلَيْهِ مِرْطٌ بَعْضُهُ عَلَيْهِ، وَعَلَيْهَا بَعْضُهُ، وَهِيَ حَائِضٌ»[1].

واتە: مەیمونە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد لە کاتێکدا پارچە پۆشاکێکی بە خۆیدا دابوو، کە هەندێکی لەسەر پێغەمبەر ﷺ بوو، هەندێکیشی بەسەر مەیمونەوە بوو، لە کاتێکدا کە مەیمونە بێ نوێژیش بووە.

## بابەت: ئافرەتێک کە باڵغ دەبێ نابێ بە بێ سەرپۆش نوێژ بکات

٦٥٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا، فَاخْتَبَأَتْ مَوْلَاةٌ لَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «حَاضَتْ؟» فَقَالَتْ: نَعَمْ، فَشَقَّ لَهَا مِنْ عِمَامَتِهِ، فَقَالَ «اخْتَمِرِي بِهَذَا»[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە لای لەوکاتەدا کەنیزەکەکەی عائیشە ﵂ خۆی حەشاردا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەوە باڵغ بووە و کەوتۆتە حەیزەوە؟ عائیشە ﵂ دەڵێ: منیش گوتم: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ عیمامەکەی لەت کردو و فەرمووی: بە ئەوەیان خۆت داپۆشە و بیکە سەرت.

٦٥٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةَ حَائِضٍ إِلَّا بِخِمَارٍ»[3].

واتە: عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: خوا نوێژی ئافرەتی باڵغ وەرناگرێ و قبووڵی ناکات کە خۆی دانەپۆشیبێ.

**تێبینی:** لەم فەرموودەیەدا وشەی (حَائِض) بە مانای بالغ بوون دێت.

## بابەت: بەکارهێنانی خەنە و ڕەنگ بۆ ئافرەتی عادە

٦٥٦- عَنْ مُعَاذَةَ ﵂ أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: تَخْتَضِبُ الْحَائِضُ، فَقَالَتْ: «قَدْ كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ نَخْتَضِبُ، فَلَمْ يَكُنْ يَنْهَانَا عَنْهُ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٩.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦٤١، والترمذي: ٣٧٧.

(٤) صحيح.

واتە: موعازە ﷞ دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێک پرسیاری کرد لە عائیشە ﷞ گوتی: ئایا ئافرەتی حەیزدار خەنە بەکاردێنێ و دروستە؟ گوتی: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووین، خەنەشمان لە خۆمان دەداو، پێغەمبەریش ﷺ لەو کارە قەدەغەی نەدەکردین.

## بابەت: مەسح کردن لەسەر برینپێچی ئەندامێکی شکاو

٦٥٧- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷛، قَالَ: انْكَسَرَتْ إِحْدَى زَنْدَيَّ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ، «فَأَمَرَنِي أَنْ أَمْسَحَ عَلَى الْجَبَائِرِ».

قَالَ أَبُو الْحَسَنِ بْنُ سَلَمَةَ، أَنْبَأَنَا الدَّبَرِيُّ، عَنْ عَبْدِ الرَّزَّاقِ نَحْوَهُ[١].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷛ دەڵێ: یەکێک لە ئێسکەکانی باسکم شکا، ئنجا بۆ ئەوە پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ (بۆ حوکمی شۆردنەکە)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێکردم کە لەسەر پێچراوەکە مەسحی بکەم.

ئەبو حەسەنی کوڕی سەلەمە دەڵێ: دەبەری لە عەبدوڕڕەزاقەوە هەواڵی پێداین و هەمان شتی باسکرد.

## بابەت: لیک کە بەر پۆشاک دەکەوێ

٦٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛، قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ حَامِلَ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ عَلَى عَاتِقِهِ، وَلُعَابُهُ يَسِيلُ عَلَيْهِ»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷛ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە کە حەسەنی کوڕی عەلی بەسەر شانیەوە بوو، لیکی حەسەنیش بەسەر پۆشاکەکانی پێغەمبەردا ﷺ دەهاتە خوارەوە.

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح.

## بابەت: تفینەوە لە تاس و قاپ

**٦٥٩-** عَنْ عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ «أُتِيَ بِدَلْوٍ، فَمَضْمَضَ مِنْهُ، فَمَجَّ فِيهِ مِسْكًا، أَوْ أَطْيَبَ مِنَ الْمِسْكِ، وَاسْتَنْثَرَ خَارِجًا مِنَ الدَّلْوِ»[١].

واتە: عەبدولجەبباری کوڕی وائیل لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە دۆڵچەیەک (سەتڵێک) ئاویان بۆ هێنا، ئنجا لە ئاوی دۆڵچەکەی لە دەم ڕادا و، پاشان مسک، یان بۆن خۆشتر لە مسکی کردە ناو دۆڵچەکە (کە مەبەستی پێ ئاوی ناو دەمی پێغەمبەرە ﷺ) ئنجا لە دەرەوەی دۆڵچەکە ئاوی لە لووتی ڕادا.

**٦٦٠-** عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ ﷺ «وَكَانَ قَدْ عَقَلَ مَجَّةً مَجَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي دَلْوٍ مِنْ بِئْرٍ لَهُمْ»[٢].

واتە: مەحمودی کوڕی ڕەبیع ﷺ کە لای خۆی پاراستویەتی و بیری ماوە دەگێڕنەوە کە جارێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئاوی دۆڵچەیەک لە بیرەکەی خۆیان بە دەمی دەپرژێنێتە ڕوخساری مەحمود (ئەوەش یان بۆ پیت و فەڕ بووە، یان بۆ سوعبەت کردن بووە لەگەڵ مەحموددا، چونکە ئەوکات منداڵ بووە).

## بابەت: قەدەغەکردن لە بینینی عەورەتی یەکتر

**٦٦١-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا تَنْظُرِ الْمَرْأَةُ إِلَى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ، وَلَا يَنْظُرِ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ»[٣].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودریی لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت نابێ تەماشای عەورەتی ئافرەت بکات، وە هەروەها نابێ پیاو تەماشای عەورەتی پیاو بکات.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٧ و ١٨٩ و ١١٨٥ و ٦٣٥٤ و ٦٤٢٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٣٨، وأبو داود: ٤٠١٨، والترمذي: ٢٧٩٣.

**٦٦٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «مَا نَظَرْتُ، أَوْ مَا رَأَيْتُ فَرْجَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَطُّ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هیچ کات دامێنی پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە و تەماشام نەکردوە.

## بابەت: کەسێ کە خۆی لە لەشگرانی بشوات بەڵام کەمێک لە لاشەی بمێنێ ئاوی بەر نەکەوتبێ چی دەکات

**٦٦٣-** عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «اغْتَسَلَ مِنْ جَنَابَةٍ، فَرَأَى لُمْعَةً لَمْ يُصِبْهَا الْمَاءُ، فَقَالَ بِجُمَّتِهِ، فَبَلَّهَا عَلَيْهَا». قَالَ إِسْحَاقُ فِي حَدِيثِهِ: فَعَصَرَ شَعْرَهُ عَلَيْهَا[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ خۆی شۆرد لە لەشگرانی، بینی کە شوێنێکی کەم تەڕ نەبووەو ئاوی پێنەگەیشتووە، دەڵێ: ئەو مووانەی سەری کە بەسەر شانیدا هاتبوونە خوارێ گوشینی تاکو ئاویان لێچۆڕاوەو بەو ئاوە ئەو شوێنەی کە تەڕ نەببوو تەڕی کرد. ئیسحاق لە فەرموودەکەیدا دەڵێ: مووەکانی گوشی بەسەریدا.

**٦٦٤-** عَنْ عَلِيٍّ ﵁: قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي اغْتَسَلْتُ مِنَ الْجَنَابَةِ، وَصَلَّيْتُ الْفَجْرَ، ثُمَّ أَصْبَحْتُ، فَرَأَيْتُ قَدْرَ مَوْضِعِ الظُّفْرِ، لَمْ يُصِبْهُ الْمَاءُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كُنْتَ مَسَحْتَ عَلَيْهِ بِيَدِكَ، أَجْزَأَكَ»[٣].

واتە: عەلی ﵁ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: من لە لەشگرانی خۆم شۆردو، نوێژی بەیانیشم کرد، دواتر کە بەیانیم کردەوە، زانیم کە بە ئەندازەی نینۆکێک لە جەستەم ئاوی پێنەکەوتووە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر تەنها بە دەستی تەڕ مەسحت کردبایە بەست بوو.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف جداً.

## بابەت: کەسێ دەستنوێژ بگرێ بەڵام شوێنێک جێبهێڵێ کە و ئاوی بەر نەکەوێ

٦٦٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، وَقَدْ تَوَضَّأَ وَتَرَكَ مَوْضِعَ الظُّفْرِ، لَمْ يُصِبْهُ الْمَاءُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ «ارْجِعْ، فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، لە کاتێکدا کە دەستنوێژی گرتبوو، بەڵام بە ئەندازەی نینۆکێکی جێهێشتبوو و ئاوی پێنەکەوتبوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بگەڕێوە دەستنوێژێکی جوان و تەواو بگرە.

٦٦٦- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «رَجُلًا تَوَضَّأَ، فَتَرَكَ مَوْضِعَ الظُّفْرِ عَلَى قَدَمِهِ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ الْوُضُوءَ وَالصَّلَاةَ» قَالَ: فَرَجَعَ[2].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی دەستنوێژی گرت، بەڵام بە ئەندازەی نینۆکێکی لە پێیەکانی بە جێهێشتبوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد، هەم دەستنوێژەکە و هەم نوێژەکە دووبارە بکاتەوە، ڕاوی دەڵێ: پیاوەکەش گەڕایەوەو وای کرد.

* * *

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤٣ بإثر ١٧٣.

## بابەت: کاتەکانی نوێژ

**٦٦٧-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ وَقْتِ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «صَلِّ مَعَنَا هَذَيْنِ الْيَوْمَيْنِ» فَلَمَّا زَالَتِ الشَّمْسُ، «أَمَرَ بِلَالًا فَأَذَّنَ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الظُّهْرَ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ بَيْضَاءُ نَقِيَّةٌ،» ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الْمَغْرِبَ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الْفَجْرَ حِينَ طَلَعَ الْفَجْرُ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْيَوْمِ الثَّانِي أَمَرَهُ فَأَذَّنَ الظُّهْرَ، فَأَبْرَدَ بِهَا، وَأَنْعَمَ أَنْ يُبْرِدَ بِهَا، ثُمَّ صَلَّى الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، أَخَّرَهَا فَوْقَ الَّذِي كَانَ، فَصَلَّى الْمَغْرِبَ قَبْلَ أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ، وَصَلَّى الْعِشَاءَ بَعْدَ مَا ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، وَصَلَّى الْفَجْرَ فَأَسْفَرَ بِهَا، ثُمَّ قَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ عَنْ وَقْتِ الصَّلَاةِ؟» فَقَالَ الرَّجُلُ: أَنَا، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «وَقْتُ صَلَاتِكُمْ بَيْنَ مَا رَأَيْتُمْ»[١].

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پرسیاری کاتی نوێژی لێ کرد، ئەویش فەرمووی: ئەو دوو ڕۆژە لەگەڵ ئێمە نوێژ بکە (بۆ ئەوەی کاتەکان بزانێ بە کردەیی)، جا کاتێک ڕۆژ لە نێوەڕاستی ئاسمان لایدا فەرمانی بە بیلال کرد کە بانگ بدا ئەویش بانگیدا، پاشان فەرمانی پێکرد و ئەویش قامەتی کرد بۆ نوێژی نیوەڕۆ، دواتر فەرمانی پێکرد و ئەویش قامەتی کرد بۆ نوێژی عەصر لە کاتێکدا کە خۆر ڕوون بوو (واتە: زەردەپەڕ نەبوو، زیاد شۆڕ نەبێوەوە بەرەو ڕۆژئاوا)، پاشان فەرمانی پێکرد و ئەویش قامەتی کرد بۆ نوێژی مەغریب لە کاتێکدا کە ڕۆژ تەواو ئاوابوو، دواتر فەرمانی پێکرد و ئەویش قامەتی کرد بۆ نوێژی عیشا لە کاتێکدا کە سورایی بەری ئاسمان ئاوا بو و نەما، پاشان فەرمانی پێکرد ئەویش قامەتی کرد بۆ نوێژی بەیانی لە کاتی بەیانیدا (کاتێک کە هەر تاریکە و ڕووناک نەبووە)، ئنجا لە ڕۆژی دووەمدا فەرمانی کردەوە بە بیلال بانگیدا بۆ نوێژی نیوەڕۆ، وە نیوەڕۆی دواخست تاکو گەرمی نیوەڕۆ بە تەواوی ڕۆیشت، پاشان نوێژی عەصری کرد کە خۆر هێشتا هەر بەرز بوو، بەڵام لە ڕۆژی پێشوو زیاتر دوای خست، دواتر نوێژی مەغریبی کرد پێش ئەوەی سورایی بەری ئاسمان ئاوابێ (بە کەمێک پێش کاتی نوێژی عیشا)، وە نوێژی عیشای کرد لە دوای ئەوەی

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦١٣، والترمذي: ١٥٢، والنسائي: ٥١٩.

کە سێیەکی شەو ڕۆیشت، وە نوێژی بەیانی کرد کاتێ کە دونیا ڕووناک بوو، پاشان فەرمووی: کوا ئەو کەسەی پرسیاری کرد (لە کاتی نوێژەکان)؟ کابرا گوتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: کاتی نوێژەکان بەینی ئەو دوو کاتە جیاوازانە بوو کە بینیتان (نوێژم تێداکرد).

٦٦٨- عَنِ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّهُ كَانَ قَاعِدًا عَلَى مَيَاثِرِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ فِي إِمَارَتِهِ عَلَى الْمَدِينَةِ، وَمَعَهُ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، فَأَخَّرَ عُمَرُ الْعَصْرَ شَيْئًا، فَقَالَ لَهُ عُرْوَةُ: أَمَا إِنَّ جِبْرِيلَ نَزَلَ، فَصَلَّى إِمَامَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: اعْلَمْ مَا تَقُولُ يَا عُرْوَةُ قَالَ: سَمِعْتُ بَشِيرَ بْنَ أَبِي مَسْعُودٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا مَسْعُودٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «نَزَلَ جِبْرِيلُ، فَأَمَّنِي، فَصَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ» يَحْسُبُ بِأَصَابِعِهِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ[1].

واتە: لەیسی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئیبنو شیهاب گێڕاویەتیەوە: لە کاتێکدا دانیشتبوو لەسەر جێگای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە کاتی فەرمان ڕەواییەکەی لە مەدینە، وە عوڕوەی کوڕی زوبەیریشی لەگەڵ دابوو، (لەوکاتەدا) عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نوێژی عەصری کەمێک دواخست، عوڕوەش پێی گوت: بەڵام جیبریل ﷺ دابەزی و پێش نوێژی کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ (کاتی نوێژەکانی بۆ دیاری کرد، مەبەستی عوڕوە ئەوەبوو کە پێی سەیر بوو عومەر نوێژی دواخست، ویستی کاتەکەی پێبڵێ)، عومەریش لە وەڵامدا گوتی: بزانە چی دەڵێی ئەی عوڕوە! (واتە: ئایا بەڵگەت پێیە یان هەر لە خۆوە ئەو قسەیە دەکەی، بۆیە بە بەڵگە وەڵامی دایەوە و) گوتی: لە بەشیری کوڕی ئەبو مەسعوودم بیستووە دەیگوت: لە ئەبو مەسعوودم بیستووە دەیگوت: لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە کە دەیفەرموو: جیبریل ﷺ دابەزی و پێش نوێژی بۆ کردم، منیش نوێژم لەگەڵدا کرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا کرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا کرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا کرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا کرد، بە پەنجەکانی پێنج نوێژەکانی دەژمارد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢١، ومسلم: ٦١٠ و ٦١١، وأبو داود: ٣٩٤ مطولًا، والنسائي: ٤٩٤.

## بابەت: کاتی نوێژی بەیانی

**٦٦٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كُنَّ نِسَاءُ الْمُؤْمِنَاتِ، يُصَلِّينَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ صَلَاةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ يَرْجِعْنَ إِلَى أَهْلِهِنَّ، فَلَا يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ» تَعْنِي مِنَ الْغَلَسِ[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئافرەتانی ئیماندار لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی بەیانییان دەکرد، پاشان دەگەڕانەوە بۆناو خێزانەکانیان و هیچ کەسیش (کە بینیبانی لە ڕێگا و بان) نەیدەناسینەوە، مەبەستی ئەوە بوو کە هەر تاریک بوو کە دەگەڕانەوە (بۆیە لەبەر تاریکی نەدەناسرانەوە)

**٦٧٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: ﴿وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾﴾ الإسراء، قَالَ: «تَشْهَدُهُ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا: ﴿وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾﴾ الإسراء، واتە: هەروەها نوێژی بەیانی (بەجێ بهێنە) بەڕاستی قوڕئان خوێندنی نوێژی بەیانی هەمیشە دەبینرێت (لەلایەن فریشتەکانی شەو و ڕۆژەوە)، فەرمووی: فریشتەی شەو و ڕۆژ ئامادە دەبن تیایدا.

**٦٧١-** عَنْ مُغِيث بْن سُمَيٍّ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﵄، الصُّبْحَ بِغَلَسٍ، فَلَمَّا سَلَّمَ، أَقْبَلْتُ عَلَى ابْنِ عُمَرَ، فَقُلْتُ: مَا هَذِهِ الصَّلَاةُ؟ قَالَ: «هَذِهِ صَلَاتُنَا، كَانَتْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، فَلَمَّا طُعِنَ عُمَرُ، أَسْفَرَ بِهَا عُثْمَانُ»[٣].

واتە: موغیسی کوڕی سومەیی، دەڵێ: نوێژی بەیانیم لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﵄ کرد لە تاریکیدا (سەرەتای کاتی نوێژی بەیانی)، جا کاتێک سەلامی دایەوە، ڕووم کردە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و گوتم: ئەوە چ نوێژێک بوو لەوکاتەدا؟! ئەویش گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژی بەیانیمان ئاوا بوو، وە لە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٢، ومسلم: ٦٤٥، وأبو داود: ٤٢٣، والترمذي: ١٥٣، والنسائي: ٥٤٥ و ٥٤٦ و ١٣٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣١٣٥.

(٣) صحيح.

سەردەمی ئەبو بەکر و عومەریشدا هەر ئاوا بوو، بەڵام کاتێک کە عومەر لێیدرا (بە هۆی ئەوەی کە تاریک بوو)، عوسمان بڕیاریدا نوێژی بەیانی لەو کاتەدا بکرێ کە دونیا تەواو ڕووناک دەبێ.

**٦٧٢-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَصْبِحُوا بِالصُّبْحِ، فَإِنَّهُ أَعْظَمُ لِلْأَجْرِ، أَوْ لِأَجْرِكُمْ»[1].

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی بەیانی لە بەرەبەیاندا بکەن، بێگومان ئەوە دەبێتە هۆی گەورەترین پاداشت، یان گەورەترین پاداشت بۆ ئێوە.

## بابەت: کاتی نوێژی نیوەڕۆ

**٦٧٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يُصَلِّي الظُّهْرَ إِذَا دَحَضَتِ الشَّمْسُ»[2].

واتە: جابیری کوڕی سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی دەکرد کاتێک کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدەداو دەترازا.

**٦٧٤-** عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يُصَلِّي صَلَاةَ الْهَجِيرِ الَّتِي تَدْعُونَهَا الظُّهْرَ، إِذَا دَحَضَتِ الشَّمْسُ»[3].

واتە: ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی هەجیری دەکرد کە ئێوە پێی دەڵێن: (الظهر) واتە: نیوەڕۆ، کاتێک کە خۆر لایدەدا لە ناوەڕاستی ئاسمان دەترازا.

**٦٧٥-** عَنْ خَبَّابٍ ﷺ، قَالَ: «شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَرَّ الرَّمْضَاءِ، فَلَمْ يُشْكِنَا»[4].

واتە: خەبباب ﷺ دەڵێ: سکاڵامان کرد لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەرمایی بەتینی زەوی، بەڵام سکاڵاکەی قبووڵ نەکردین.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢٤، والترمذي: ١٥٤، والنسائي: ٥٤٨ و ٥٤٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٦١٨، وأبو داود: ٤٠٣ و ٨٠٦ بنحوه.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤١، ومسلم: ٦٤٧، وأبو داود: ٣٩٨.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٦١٩، والنسائي: ٤٩٧.

**٦٧٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: «شَكَوْنَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ حَرَّ الرَّمْضَاءِ فَلَمْ يُشْكِنَا»[١].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: سکاڵامان بردە لای پێغەمبەر ﷺ لەبەر گەرمی بەتینی زەوی (کە لە کاتی بەسەر ڕۆیشتندا پێیەکانی ئەزیەت دەدا و لە کاتی سوجدەش ناوچەوان)، بەڵام پێغەمبەر ﷺ سکاڵاکەی قبووڵ نەکردین.

## بابەت: دواخستنی نوێژی نیوەڕۆ لەبەر خاتری فێنکی لە کاتی گەرمای بەتیندا

**٦٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلَاةِ؛ فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ»[٢].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گەرما تینی هێناو زۆر گەرم بوو ئەوە (نوێژی نیوەڕۆ) دوابخەن تا فێنک دەبێ، چونکە بەڕاستی گەرمای بەتین وەکو ئەوە وایە لە هەناسەی دۆزەخەوە بێ.

**٦٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالظُّهْرِ؛ فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ»[٣].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک گەرما تینی هێناو زۆر گەرم بوو ئەوە نوێژ (کەمێک) دوابخەن، چونکە بەڕاستی گەرمای بەتین لە هەناسەی جەهەننەمەوەیە.

**٦٧٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبْرِدُوا بِالظُّهْرِ؛ فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ»[٤].**

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی نیوەڕۆ بخەنە کاتی فێنکی، چونکە بەڕاستی گەرمای بەتین لە هەناسەی دۆزەخەوەیە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٣ و ٥٣٤، ومسلم: ٦١٥ و ٦١٧، وأبو داود: ٤٠٢، والترمذي: ١٥٧، والنسائي: ٥٠٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٣ و ٥٣٤، ومسلم: ٦١٥ و ٦١٧، وأبو داود: ٤٠٢، والترمذي: ١٥٧، والنسائي: ٥٠٠.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٨.

**٦٨٠-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الظُّهْرِ بِالْهَاجِرَةِ، فَقَالَ لَنَا: «أَبْرِدُوا بِالصَّلَاةِ؛ فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ»[1].

**واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆمان دەکرد، ئەویش پێیانی فەرموو: نوێژەکە بخەنە کاتی فێنکی، بەڕاستی گەرمی بەتین لە دۆزەخەوەیە.**

**٦٨١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَبْرِدُوا بِالظُّهْرِ»[2].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی نیوەڕۆ بخەنە کاتی فێنکایەتی.**

## بابەت: کاتی نوێژی عەصر

**٦٨٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ، فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى الْعَوَالِي، وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ»[3].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کە نوێژی عەصری کردوە هێشتا خۆر بەرز و بەتین و بە شەوق بوو، وە ڕێبوار دەچوو بۆ عەوالی (چەند لادێیەک بوون، دوو تا سێ میل دوور بوون لە مەدینەوە)، دەگەیشتە ئەوێ لە کاتێکدا کە خۆر هەر بەرز بوو.**

**٦٨٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الْعَصْرَ، وَالشَّمْسُ فِي حُجْرَتِي، لَمْ يُظْهِرْهَا الْفَيْءُ بَعْدُ»[4].

**واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەصری لە ژوورەکەی من کرد، لە کاتێکدا تیشکی خۆر هەر لە ناو ژوورەکەمدا بوو سێبەری بەسەر نەکشابوو.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٠، ومسلم: ٦٢١، وأبو داود: ٤٠٤، والنسائي: ٥٠٧.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٢، ومسلم: ٦١١، وأبو داود: ٤٠٧، والترمذي: ١٥٩، والنسائي: ٥٠٥.

## بابەت: پارێزگاری کردن لە نوێژی عەصر

**٦٨٤-** عَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ: «مَلَأَ اللَّهُ بُيُوتَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا، كَمَا شَغَلُونَا عَنِ الصَّلَاةِ الْوُسْطَى»(١).

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەنگی خەندەقدا فەرمووی: خوا ماڵ و گۆڕیان پڕ ئاگر بکات (کافرەکان)، هەروەکو چۆن سەرقاڵیان کردین لە نوێژی عەصر (واتە: نوێژی عەصرمان دواکەوت بە هۆی ئەوەی سەرقاڵی جەنگی ئەوان بووین).**

**٦٨٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الَّذِي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ، فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلُهُ وَمَالُهُ»(٢).

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەو کەسەی نوێژی عەصر لە دەست دەدات (دەیچوێنێ)، وەکو ئەوە وایە کە منداڵ و ماڵ و سامانی لە دەست دابێت.**

**٦٨٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: حَبَسَ الْمُشْرِكُونَ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ: «حَبَسُونَا عَنْ صَلَاةِ الْوُسْطَى، مَلَأَ اللَّهُ قُبُورَهُمْ وَبُيُوتَهُمْ نَارًا»(٣).

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: هاوبەشدانەران پێغەمبەریان ﷺ لە نوێژی عەصر دواخست هەتاکو ڕۆژ ئاوابوو، ئنجا فەرمووی: لە نوێژی عەصر دوایان خستین، خوا گۆڕ و ماڵەکانیان پڕ ئاگر بکات.**

## بابەت: کاتی نوێژی مەغریب (شێوان)

**٦٨٧-** عَنْ أَبُو النَّجَاشِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ يَقُولُ: «كُنَّا نُصَلِّي الْمَغْرِبَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا، وَإِنَّهُ لَيَنْظُرُ إِلَى مَوَاقِعِ نَبْلِهِ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٣١، ومسلم: ٦٢٧، وأبو داود: ٤٠٩، والترمذي: ٢٩٨٤، والنسائي: ٤٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٢، ومسلم: ٦٢٦، وأبو داود: ٤١٤، والترمذي: ١٧٥، والنسائي: ٤٧٨_٤٨٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٢٨، والترمذي بنحوه: ١٨١.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٩، ومسلم: ٦٣٧.

واتە: ئەبو نەجاشیی ﷺ دەڵێ: گوێم لە ڕافیعی کوڕی خەدیج بوو دەیگوت: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کە نوێژی مەغریبمان دەکرد، کاتێک یەکێکمان لێدەبوویەوە ئەگەر تەماشای جێی تیرەکەی بکردبایە دەیبینی (مەبەست ئەوەیە کە هێندە زوو لە کاتی خۆیدا نوێژەکەیان دەکرد، واتە: لە سەرەتای کاتی بوونی نوێژەکە، وە سوورەتی کورتی تێدا خوێندوە).

٦٨٨- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ «أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْمَغْرِبَ إِذَا تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ»[1].

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەگێڕێتەوە، کە نوێژی مەغریبی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردوە کاتێک کە خۆر ئاوا دەبوو.

٦٨٩- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَزَالُ أُمَّتِي عَلَى الْفِطْرَةِ، مَا لَمْ يُؤَخِّرُوا الْمَغْرِبَ حَتَّى تَشْتَبِكَ النُّجُومُ» قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَاجَةَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ يَحْيَى يَقُولُ: اضْطَرَبَ النَّاسُ فِي هَذَا الْحَدِيثِ بِبَغْدَادَ، فَذَهَبْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ الْأَعْيَنُ إِلَى الْعَوَّامِ بْنِ عَبَّادِ بْنِ الْعَوَّامِ، فَأَخْرَجَ إِلَيْنَا أَصْلَ أَبِيهِ، فَإِذَا الْحَدِيثُ فِيهِ[2].

واتە: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئوممەتەکەم لەسەر سوننەت بەردەوامە مادام نوێژی شێوان دوانەخەن تاکو ئەستێرەکان هەڵدێن و تێکەڵ دەبن. ئەبو عەبدوڵڵای ئیبنو ماجە گوتی: لە موحەممەدی کوڕی یەحیام بیستووە دەیگوت: خەڵکی لە بەغداد لەم فەرموودەیە لە دڵەڕاوکێدا بوون کە ئایا دروستە یان نا، دەڵێ: من و ئەبو بەکری ئەعیەن چووین بۆ لای عەوامی کوڕی عەببادی کوڕی عەوام، ئەویش کیتابە ئەصڵەکەی باوکی هێناو ئەم فەرموودەیەی تێدابوو.

## بابەت: کاتی نوێژی عیشا (خەوتنان)

٦٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لَأَمَرْتُهُمْ بِتَأْخِيرِ الْعِشَاءِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦١، ومسلم: ٦٣٦، وأبو داود: ٤١٧، والترمذي: ١٦٤.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٦، والنسائي: ٥٣٤.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بارگرانی نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم، ئەوە فەرمانم پێدەکردن کە نوێژی خەوتنان دوا بخەن.

٦٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لَأَخَّرْتُ صَلَاةَ الْعِشَاءِ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ، أَوْ نِصْفِ اللَّيْلِ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بارگرانی نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم، ئەوە نوێژی خەوتنانم دوا دەخست تاکو سێیەکی شەو، یان تاکو نیوەی شەو.

٦٩٢- عَنْ حُمَيْد ﷺ، قَالَ: سُئِلَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ هَلِ اتَّخَذَ النَّبِيُّ ﷺ خَاتَمًا؟ قَالَ: نَعَمْ، أَخَّرَ لَيْلَةً صَلَاةَ الْعِشَاءِ، إِلَى قَرِيبٍ مِنْ شَطْرِ اللَّيْلِ، فَلَمَّا صَلَّى أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: «إِنَّ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا وَنَامُوا، وَإِنَّكُمْ لَنْ تَزَالُوا فِي صَلَاةٍ مَا انْتَظَرْتُمُ الصَّلَاةَ» قَالَ أَنَسٌ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ خَاتَمِهِ(٢).

واتە: حومەید ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەربارەی ئەوەی کە ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەی بەکارهێناوە؟ گوتی: بەڵێ، شەوێک پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی خەوتنانی دواخست تا نزیک نیوەی شەو، جا کاتێک نوێژی بۆ کردین ڕووی تێیان کرد و فەرمووی: بەڕاستی خەڵکی تر نوێژیان کردوە و خەوتوون، وە ئێوە بەردەوام لە نوێژدا بوون مادام چاوەڕێی نوێژتان کردوە (نوێژی بە کۆمەڵ). ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئێستا وەک ئەوە وایە کە تەماشای ڕەونەق و درەوشاوەیی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر ﷺ دەکەم.

٦٩٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْمَغْرِبِ، ثُمَّ لَمْ يَخْرُجْ حَتَّى ذَهَبَ شَطْرُ اللَّيْلِ، فَخَرَجَ فَصَلَّى بِهِمْ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا وَنَامُوا، وَأَنْتُمْ لَمْ تَزَالُوا فِي صَلَاةٍ مَا انْتَظَرْتُمُ الصَّلَاةَ، وَلَوْلَا الضَّعِيفُ وَالسَّقِيمُ، أَحْبَبْتُ أَنْ أُؤَخِّرَ هَذِهِ الصَّلَاةَ إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٢ و ٨٤٧، ومسلم: ٦٤٠، والنسائي: ٥٣٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢٢، والنسائي: ٥٣٨.

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی شێوانی بۆ کردین، پاشان لە ماڵەکەی خۆی نەهاتە دەرەوە تاکو نیوەی شەو ڕۆیشت، ئەوجار هاتەدەر و نوێژی عیشای بۆ کردین، پاشان فەرمووی: خەڵکی تر نوێژیان کردوە و خەتوون (چاوەڕێی جەماعەتیان نەکردوە)، بەڵام ئێوە بەردەوام لە نوێژ دابوون مادام چاوەڕێی نوێژی جەماعەتتان کردوە، خۆ ئەگەر لەبەر (لاوازی) لاوازەکان و (نەخۆشی) نەخۆشەکان نەبووایە، ئەوە پێم خۆشبوو ئەو نوێژە (نوێژی خەوتنان) دوابخەم بۆ نیوەی شەو.

## بابەت: دیاریکردنی کات بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەور و تەمدا

٦٩٤- عَنْ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةٍ، فَقَالَ: «بَكِّرُوا بِالصَّلَاةِ فِي الْيَوْمِ الْغَيْمِ، فَإِنَّهُ مَنْ فَاتَتْهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ حَبِطَ عَمَلُهُ»(١).

واتە: بورەیدەی ئەسلەمیی ﷺ دەڵێ: لە یەکێک لە غەزاکان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، ئەویش فەرمووی: پەلە بکەن لە نوێژ کردن (لە کاتی خۆیداو دوای مەخەن) لە ڕۆژێکدا کە هەورو تەمە، چونکە هەر کەسێک نوێژی عەصر لە دەست بدات کردەوەکانی پووچەڵ دەبنەوە.

**تێبینی:** ئەوە هەڕەشەیە بۆ گەورەیی گوناهو تاوانەکەیە، نەک حەقیقەت بێ بۆ پووچەڵ بوونەوەی کردەوەکان (والله أعلم).

## بابەت: ئەوانەی کە لە کاتی نوێژدا خەویان لێدەکەوێ یان لەبیریان دەچێتەوە

٦٩٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ، عَنِ الرَّجُلِ يَغْفُلُ عَنِ الصَّلَاةِ أَوْ يَرْقُدُ عَنْهَا، قَالَ: «يُصَلِّيهَا إِذَا ذَكَرَهَا»(٢).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی پیاوێک کە نوێژەکەی لە یاد دەکات، یان دەخەوێ (خەبەری نابێتەوە تا کاتی نوێژەکە دەڕوات)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکات بە بیری هاتەوە با ئەو کاتە نوێژەکە بکات.

---

(١) ضعيف إلا قوله : «فَإِنَّهُ مَنْ فَاتَتْهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ حَبِطَ عَمَلُهُ» فصحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٣ و ٥٩٤ بنحوه.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٧، ومسلم: ٦٨٤، وأبو داود: ٤٤٢، والترمذي: ١٧٨، والنسائي: ٦١٣ و ٦١٤.

٦٩٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَسِيَ صَلَاةً، فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژی لە بیرچۆوە (لە کاتی خۆیدا نەیکرد)، ئەوە با هەرکات بە بیری هاتەوە نوێژەکە بکات.

٦٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَفَلَ مِنْ غَزْوَةِ خَيْبَرَ، فَسَارَ لَيْلَةً، حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْكَرَى عَرَّسَ، وَقَالَ لِبِلَالٍ: «اكْلَأْ لَنَا اللَّيْلَ» فَصَلَّى بِلَالٌ مَا قُدِّرَ لَهُ، وَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ، فَلَمَّا تَقَارَبَ الْفَجْرُ، اسْتَنَدَ بِلَالٌ إِلَى رَاحِلَتِهِ مُوَاجِهَ الْفَجْرِ، فَغَلَبَتْ بِلَالًا عَيْنَاهُ وَهُوَ مُسْتَنِدٌ إِلَى رَاحِلَتِهِ، فَلَمْ يَسْتَيْقِظْ بِلَالٌ وَلَا أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِهِ حَتَّى ضَرَبَتْهُمُ الشَّمْسُ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَوَّلَهُمُ اسْتِيقَاظًا، فَفَزِعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَيْ بِلَالُ» فَقَالَ بِلَالٌ: أَخَذَ بِنَفْسِي الَّذِي أَخَذَ بِنَفْسِكَ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «اقْتَادُوا» فَاقْتَادُوا رَوَاحِلَهُمْ شَيْئًا، ثُمَّ تَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَمَرَ بِلَالًا فَأَقَامَ الصَّلَاةَ، فَصَلَّى بِهِمُ الصُّبْحَ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ ﷺ الصَّلَاةَ قَالَ: مَنْ نَسِيَ صَلَاةً، فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا، فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ قَالَ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾ طه، قَالَ: وَكَانَ ابْنُ شِهَابٍ يَقْرَؤُهَا: لِلذِّكْرَى[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی خەیبەر گەڕایەوە، شەو ڕۆیشتن تاکو خەویان هات و لایاندا و شەو مانەوە، وە بە بیلالی فەرموو: ئەم شەو تۆ پاسەوانیمان بۆ بکە، بیلالیش تا توانی نوێژی کرد و پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵان خەوتن، لە نزیکی بەرەبەیان بیلال پاڵی دایەوە بە وڵاخەکەی ڕووەو شوێنی هاتنی بەیانی، (بەڵام) بیلال خەو بەسەر چاوەکانیدا زاڵ بوو (خەوی لێکەوت) لە حاڵەتێکدا کە پاڵی بە بارگەکەیەوە دابوو، بیلال و هیچ یەکێک لە هاوەڵان (بۆ نوێژی بەیانی) بێدار نەبوونەوە تاکو خۆر لێیدان، ئنجا یەکەم کەسێک کە لە پێش هەمووان بێدار بوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاچڵەکی و فەرمووی: ئەی بیلال (بۆ بێدارت نەکردینەوە)، بیلالیش گوتی: ئەو کەسە منی خەواند کە جەنابتی خەواند بە دایک و باوکەوە بە فیدات بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: وڵاخەکانتان لێبخوڕن، ئەوانیش کەمێک لێیان خوڕین و، پاشان

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٧، ومسلم: ٦٨٤، وأبو داود: ٤٤٢، والترمذي: ١٧٨، والنسائي: ٦١٣ و ٦١٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٨٠، وأبو داود: ٤٣٥، والترمذي: ٣١٦٣، والنسائي: ٦٢٣.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت و فەرمانی بە بیلال کرد بۆ قامەت کردن و نوێژی بەیانی بۆ کردن، ئنجا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژ بۆوە فەرمووی: هەر کەسێک بیری چوو نوێژ لە کاتی خۆیدا بکات، ئەوە با هەرکات بیری هاتەوە نوێژەکە بکات، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ۝١٤﴾ طه، واتە: بە چاکی نوێژ بەجێ بهێنە تامنت بێتەوە یاد، ڕاوی فەرموودەکە دەڵێ: ئیبنو شیهاب وشەی (لِذِكْرِى) بە «لِلذِّكْرَى» دەخوێندەوە.

**٦٩٨-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: ذَكَرُوا تَفْرِيطَهُمْ فِي النَّوْمِ فَقَالَ: نَامُوا حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ، إِنَّمَا التَّفْرِيطُ فِي الْيَقَظَةِ، فَإِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ صَلَاةً، أَوْ نَامَ عَنْهَا، فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا، وَلِوَقْتِهَا مِنَ الْغَدِ» قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَبَاحٍ، فَسَمِعَنِي عِمْرَانُ بْنُ الْحُصَيْنِ، وَأَنَا أُحَدِّثُ بِالْحَدِيثِ، فَقَالَ: يَا فَتَى انْظُرْ كَيْفَ تُحَدِّثُ، فَإِنِّي شَاهِدٌ لِلْحَدِيثِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَمَا أَنْكَرَ مِنْ حَدِيثِهِ شَيْئًا[1].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: باسی ئەوەیان دەکرد، کەمتەرخەمییان کردوە لە نوێژەکانیاندا بە هۆی خەوتنەوە، ئنجا یەکێکیان (وەک ئینکاری کردنی کارەکەیان و بە خراپ زانینی کەمتەرخەمییەکە) گوتی: خەوتن هەتاکو خۆر هەڵهات، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ (وەک دڵدانەوەیەک بۆ ئەو پەرۆشیەیان) فەرمووی: خەوتن بە کەمتەرخەمی هەژمار ناکرێ (با بە هۆی خەوەوە نوێژیش بچێ)، بەڵکو کەمتەرخەمی لە کاتی بە خەبەریدایە (کە نوێژەکە دوابخەی، یان هەر نەیکەی، ئەوە کەمتەرخەمییە)، ئنجا فەرمووی: هەر یەکێکتان ئەگەر بیری چوو نوێژ لە کاتی خۆیدا بکات، یان خەوی لێکەوت، ئەوە کەی بیری هاتەوە، با بیکات ئەگەر لە کاتی نوێژەکەی بەیانی ڕۆژی دواتریش دابوو. عەبدوڵڵای کوڕی ڕەباح دەڵێ: کە ئەو فەرموودەیەم دەگێڕایەوە عیمڕانی کوڕی حوصەین گوێی لێم بوو و گوتی: گەنجۆ تەماشا بکە چۆن فەرموودە دەگێڕیتەوە، من شاهێد و ئاگاداربووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: هیچ ئینکاری لە فەرموودەکە نەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٨١، وأبو داود: ٤٣٧ و ٤٤١، والترمذي: ١٧٧، والنسائي: ٦١٦.

## بابەت: کاتی نوێژ کە بەهانەیەکی شەرعی هەبوو یان زەرورەتێک هەبوو

**٦٩٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْعَصْرِ رَكْعَةً قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَهَا، وَمَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَهَا»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک فریای یەک ڕکات نوێژی عەصر بکەوێ پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێ، ئەوە فریای نوێژەکە کەوتووە (واتە: بە ئامادە هەژمار دەکرێ)، وە هەر کەسێک فریای یەک ڕکاتی نوێژی بەیانی بکەوێ، پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ، ئەوە فریای نوێژەکە کەوتووە.

**٧٠٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً، قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَهَا، وَمَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْعَصْرِ رَكْعَةً، قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَهَا»[٢].

**واتە:** عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک فریای یەک ڕکاتی نوێژی بەیانی بکەوێ پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ، ئەوە فریای هەموو نوێژەکە کەوتووە، وە هەر کەسێک فریای یەک ڕکات نوێژی عەصر بکەوێ پێش ئەوەی خۆر ئاوابێ، ئەوە فریای نوێژەکە کەوتووە.

**٧٠٠م-** حَدَّثَنَا جَمِيلُ بْنُ الْحَسَنِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَذَكَرَ نَحْوَهُ[٣].

**واتە:** ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٦، ومسلم: ٦٠٨، وأبو داود: ٤١٢ و ٨٩٣ و ١١٢١، والترمذي: ١٨٦، والنسائي: ٥١٤_٥١٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٠٩، والنسائي: ٥٥١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٠٩، والنسائي: ٥٥١.

## بابەت: قەدەغەکردنی نوستن پێش نوێژی (عیشا) خەوتنان وە قسەکردن لەدوای نوێژی خەوتنان

**٧٠١-** عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ الْعِشَاءَ، وَكَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَهَا، وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا»[١].

واتە: ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆشبوو نوێژی خەوتنان دوابخات، وە پێی ناخۆش بوو کە پێش نوێژی خەوتنان بخەوێ، وە لە دوای نوێژەکە قسە بکات.

**٧٠٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «مَا نَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَبْلَ الْعِشَاءِ، وَلَا سَمَرَ بَعْدَهَا»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نوێژی خەوتنان نەخەوتووەو، دوای نوێژی خەوتنانیش قسەی نەکردوە.

**٧٠٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: «جَدَبَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ السَّمَرَ بَعْدَ الْعِشَاءِ» يَعْنِي زَجَرَنَا[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لۆمەی کردین لەسەر قسەکردن لە دوای نوێژی خەوتنان، واتە: سەرزەنشتی کردین.

## بابەت: قەدەغەکردنی ناوی (عەتەمە) بۆ نوێژی (عیشا) خەوتنان

**٧٠٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا تَغْلِبَنَّكُمُ الْأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلَاتِكُمْ، فَإِنَّهَا الْعِشَاءُ، وَإِنَّهُمْ لَيُعْتِمُونَ بِالْإِبِلِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٨، ومسلم: ٦٤٧، وأبو داود: ٣٩٨ و ٤٨٤٩، والترمذي: ١٦٨، والنسائي: ٤٩٥ و ٥٣٠.

(٢) صحيح.

(٣) حسن.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٤٤، وأبو داود: ٤٩٨٤، والنسائي: ٥٤١ و ٥٤٢.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ناوی دەشتەکییەکان بۆ نوێژی (عیشا) کە پێیان دەگوت: «العتمة» بە سەرتان زاڵ نەبێ (واتە: زۆر ئەو ناوە بۆ نوێژی عیشا بەکارمەهێنن)، چونکە (ئەو نوێژە) ناوی عیشایە، وە ئەوان بەو ناوە ناوی دەنێن کە لە تاریکایی شەودا حوشتر دەدۆشن.

**٧٠٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا تَغْلِبَنَّكُمُ الْأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلَاتِكُمْ» زَادَ ابْنُ حَرْمَلَةَ «فَإِنَّمَا هِيَ الْعِشَاءُ، وَإِنَّمَا يَقُولُونَ الْعَتَمَةُ، لِإِعْتَامِهِمْ بِالْإِبِلِ»[(١)].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەشتەکییەکان بەسەرتان زاڵ نەبن لە ناونانی نوێژەکەتان (نوێژی عیشا). ئیبنو حەرمەلە ئەوەشی بە زیاتر هێناوە: وە بێگومان ئەو نوێژە ناوی عیشایە، وە بەڕاستی دەشتەکییەکان بە کاتی دۆشینی حوشتر لە تاریکی شەو دەڵێن: (العتمة).



---

(١) صحيح.



# پەرتووكی

# بانگ و سوننەتەكانی



كِتَابُ الْأَذَانِ، وَالسُّنَّةُ فِيهِ

## بابەت: دەسپێکی بانگدان (بانگی نوێژ)

**٧٠٦-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَدْ هَمَّ بِالْبُوقِ، وَأَمَرَ بِالنَّاقُوسِ فَنُحِتَ، فَأُرِيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ فِي الْمَنَامِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلًا عَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ يَحْمِلُ نَاقُوسًا، فَقُلْتُ لَهُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ تَبِيعُ النَّاقُوسَ؟ قَالَ: وَمَا تَصْنَعُ بِهِ؟ قُلْتُ: أُنَادِي بِهِ إِلَى الصَّلَاةِ، قَالَ: أَفَلَا أَدُلُّكَ عَلَى خَيْرٍ مِنْ ذَلِكَ؟ قُلْتُ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ تَقُولُ: «اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ» قَالَ: فَخَرَجَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ، حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ بِمَا رَأَى، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَأَيْتُ رَجُلًا عَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ، يَحْمِلُ نَاقُوسًا، فَقَصَّ عَلَيْهِ الْخَبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِنَّ صَاحِبَكُمْ قَدْ رَأَى رُؤْيَا، فَاخْرُجْ مَعَ بِلَالٍ إِلَى الْمَسْجِدِ فَأَلْقِهَا عَلَيْهِ، وَلْيُنَادِ بِلَالٌ؛ فَإِنَّهُ أَنْدَى صَوْتًا مِنْكَ» قَالَ: فَخَرَجْتُ مَعَ بِلَالٍ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَجَعَلْتُ أُلْقِيهَا عَلَيْهِ وَهُوَ يُنَادِي بِهَا، قَالَ: فَسَمِعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ بِالصَّوْتِ، فَخَرَجَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ الَّذِي رَأَى قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: فَأَخْبَرَنِي أَبُو بَكْرٍ الْحَكَمِيُّ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ الْأَنْصَارِيَّ قَالَ فِي ذَلِكَ:

أَحْمَدُ اللَّهَ ذَا الْجَلَالِ وَذَا الْإِكْرَامِ ... حَمْدًا عَلَى الْأَذَانِ كَثِيرَا

إِذْ أَتَانِي بِهِ الْبَشِيرُ مِنَ اللَّهِ ... فَأَكْرِمْ بِهِ لَدَيَّ بَشِيرَا

فِي لَيَالٍ وَالَى بِهِنَّ ثَلَاثٍ ... كُلَّمَا جَاءَ زَادَنِي تَوْقِيرَا[1].

**واتە:** موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زەید لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لە کەڕەنایەک دەکردەوە (بۆ ئەوەی خەڵکی پێ ئاگادار بکاتەوە بۆ نوێژ)، جا فەرمانی کرد بەوەی کە زەنگ دروست بکرێ، ئنجا عەبدوڵڵای کوڕی زەید لە خەودا نیشانی درا کە پیاوێک دوو پۆشاکی سەوزی پۆشی بوو و زەنگێکی پێبوو و هەڵیگرتبوو، دەڵێ: منیش پێم گوت: ئەی بەندەی خوا ئەو زەنگانە دەفرۆشی؟ ئەویش گوتی: چییان پێدەکەی؟ منیش گوتم: (خەڵکی) پێ بانگ دەکەم بۆ نوێژ، ئەویش گوتی: ئایا شتێکی لەوە باشترت پێ نەڵێم؟ منیش گوتم:

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٩٩، والترمذي: ١٨٩.

ئەو شتە چییە؟ گوتی: ئەوەیە کە بڵێی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، موحەممەد دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی زەید لە ماڵ هاتە دەرێ تاکو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شتەی کە لە خەودا بینیبووی بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاند و، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکم بینی لە خەودا کە پۆشاکی سەوزی پۆشی بوو، وە زەنگێکی پێبو و، ئنجا چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هاوەڵەکەتان خەونی بینیوە، بڕۆ بۆ مزگەوت لەگەڵ بیلال وە ئەوەی (لە خەودا بینیوتە) پێی بڵێ و با بیلال بانگی پێبدات (بەو وشانە) چونکە بیلال دەنگی لەتۆ بەرزترە، دەڵێ منیش چووم ئەو شتانەم بە بیلال دەگوت و بیلالیش بانگی پێدەدا، جا عومەری کوڕی خەتتاب گوێی لەو دەنگە بوو، بۆیە ڕۆیشت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەخوا ئەوەی ئەو بینیویەتی منیش بینیومە، ئەبو عوبەیدە دەڵێ: ئەبو بەکری حەکەمی بۆی گێڕامەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاڕی لە بارەیەوە گوتی:

أَحْمَدُ اللَّهَ ذَا الْجَلَالِ وَذَا الْإِكْرَامِ ... حَمْدًا عَلَى الْأَذَانِ كَثِيرَا

إِذْ أَتَانِي بِهِ الْبَشِيرُ مِنَ اللَّهِ ... فَأَكْرِمْ بِهِ لَدَيَّ بَشِيرَا

فِي لَيَالٍ وَالَى بِهِنَّ ثَلَاثٍ ... كُلَّمَا جَاءَ زَادَنِي تَوْقِيرَا

٧٠٧- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَشَارَ النَّاسَ لِمَا يُهِمُّهُمْ إِلَى الصَّلَاةِ، فَذَكَرُوا الْبُوقَ، فَكَرِهَهُ مِنْ أَجْلِ الْيَهُودِ، ثُمَّ ذَكَرُوا النَّاقُوسَ، فَكَرِهَهُ مِنْ أَجْلِ النَّصَارَى، فَأُرِيَ النِّدَاءَ تِلْكَ اللَّيْلَةَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ، وَعُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَطَرَقَ الْأَنْصَارِيُّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَيْلًا، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «بِلَالًا بِهِ، فَأَذَّنَ» قَالَ: الزُّهْرِيُّ، وَزَادَ بِلَالٌ فِي نِدَاءِ صَلَاةِ الْغَدَاةِ: الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، فَأَقَرَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. قَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ الَّذِي رَأَى، وَلَكِنَّهُ سَبَقَنِي[١].

---

(١) ضعيف - وبعضه صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠٤، ومسلم: ٣٧٧، والنسائي: ٦٢٦.

واتە: سالیم لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە خەڵۆی کرد بۆ ئەو شتەی کە بۆی بە پەرۆش بوون بۆ نوێژ (کۆکردنەوە و ئاگادارکردنەوەی خەڵک بۆ کاتی نوێژ)خەڵکیش باسی کەڕەنایان بۆی کرد، پێغەمبەریش ﷺ بە دڵی نەبوو لەبەر ئەوەی جولەکە بەکاریان دەهێنا، پاشان باسی زەنگییان بۆکرد، ئەویشی بە دڵ نەبوو چونکە گاورەکان بەکاریان دەهێنا، جا لەو شەوەدا پیاوێک لە ئەنصارِ کە پێی دەگوترا عەبدوڵڵای کوڕی زەید و عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ خەوێکیان بینی بە بانگدانەوە، ئنجا پیاوە ئەنصارییەکە هەر بە شەو ڕۆیشت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ (دوای ئەوەی خەوەکەی بیست) فەرمانی بە بیلال ﷺ کرد بەو شێوە بانگ بدات. زوهری دەڵێ: بیلال ﷺ لە بانگی بەیانیدا «الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ»ی زیاد کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ جێگیری کرد. عومەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕاستیدا منیش هەمان خەونی ئەو پیاوەم بینی، بەڵام ئەو پێش من کەوت (بۆ خزمەتت).

## بابەت: دووبارەکردنەوە لە بانگدان

٧٠٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَيْرِيزٍ ﷺ، وَكَانَ يَتِيمًا فِي حِجْرِ أَبِي مَحْذُورَةَ بْنِ مِعْيَرٍ، حِينَ جَهَّزَهُ إِلَى الشَّامِ، فَقُلْتُ لِأَبِي مَحْذُورَةَ: أَيْ عَمِّ إِنِّي خَارِجٌ إِلَى الشَّامِ، وَإِنِّي أُسْأَلُ عَنْ تَأْذِينِكَ، فَأَخْبَرَنِي أَنَّ أَبَا مَحْذُورَةَ قَالَ: خَرَجْتُ فِي نَفَرٍ، فَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالصَّلَاةِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَمِعْنَا صَوْتَ الْمُؤَذِّنِ وَنَحْنُ عَنْهُ مُتَنَكِّبُونَ، فَصَرَخْنَا نَحْكِيهِ، نَهْزَأُ بِهِ، فَسَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَرْسَلَ إِلَيْنَا قَوْمًا، فَأَقْعَدُونَا بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ «أَيُّكُمُ الَّذِي سَمِعْتُ صَوْتَهُ قَدِ ارْتَفَعَ؟» فَأَشَارَ إِلَيَّ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ، وَصَدَقُوا، فَأَرْسَلَ كُلَّهُمْ وَحَبَسَنِي، وَقَالَ لِي: «قُمْ فَأَذِّنْ» فَقُمْتُ وَلَا شَيْءَ أَكْرَهُ إِلَيَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَا مِمَّا يَأْمُرُنِي بِهِ. فَقُمْتُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَلْقَى عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ التَّأْذِينَ هُوَ بِنَفْسِهِ، فَقَالَ: قُلِ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ «ثُمَّ قَالَ لِي» ارْفَعْ مِنْ صَوْتِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ دَعَانِي حِينَ قَضَيْتُ التَّأْذِينَ، فَأَعْطَانِي صُرَّةً فِيهَا

شَيْءٌ مِنْ فِضَّةٍ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ عَلَى نَاصِيَةِ أَبِي مَحْذُورَةَ، ثُمَّ أَمَرَّهَا عَلَى وَجْهِهِ، ثُمَّ عَلَى ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ عَلَى كَبِدِهِ، ثُمَّ بَلَغَتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سُرَّةَ أَبِي مَحْذُورَةَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بَارَكَ اللَّهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمَرْتَنِي بِالتَّأْذِينِ بِمَكَّةَ؟ قَالَ «نَعَمْ، قَدْ أَمَرْتُكَ» فَذَهَبَ كُلُّ شَيْءٍ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ كَرَاهِيَةٍ، وَعَادَ ذَلِكَ كُلُّهُ مَحَبَّةً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَدِمْتُ عَلَى عَتَّابِ بْنِ أَسِيدٍ، عَامِلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمَكَّةَ، فَأَذَّنْتُ مَعَهُ بِالصَّلَاةِ، عَنْ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَأَخْبَرَنِي ذَلِكَ مَنْ أَدْرَكَ أَبَا مَحْذُورَةَ، عَلَى مَا أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَيْرِيزٍ[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موحەیریز ﷺ دەگێڕێتەوە کە هەتیو بوو، لە ژێر سەرپەرشتی ئەبو مەحزوڕەی کوڕی میعیەر دابوو، کاتێک ئەبو مەحزوڕە عەبدوڵڵای ئامادە دەکرد بۆ شام، (عەبدوڵڵا دەڵێ:) بە ئەبو مەحزوڕەم گوت: ئەرێ مامە من دەردەچم بەرەو شام و پرسیاری بانگدانی تۆم لێدەکرێ، جا پێی ڕاگەیاندم کە ئەبو مەحزوڕە گوتوویەتی: لەگەڵ هەندێ کەس دەرچووین و لە ڕێگادا بووین، جا بانگ بێژەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی فەرموو، وە ئێمەش لەو کاتەدا خۆمان لێ لادان (وەک بڵێی پشتمان تێکردن) وە بە دەنگی بەرز و گاڵتە پێکردنەوە بانگەکەمان دووبارە دەگوتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێمان بوو، ئنجا کەسانێکی نارد بۆمان و بردیانین لەبەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ دایان نیشاندین، ئنجا فەرمووی: کامەتان بوو گوێم لە دەنگی بوو دەنگی بەرزکردبۆوە، خەڵکەکەش هەموویان ئاماژەیان بۆ من کرد، ڕاستیشیان دەکرد (من بووم)، ئنجا هەموانی ناردەوە و منی هێشتەوە، وە فەرمووی: هەڵسە بانگ بڵێ، منیش هەڵسام لەو کاتەشدا هیچ شتێک نەبوو کە بە ئەندازەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕقم لێی بێ، لە خۆی و لە فەرمانەکەشی، منیش هەڵسام لەبەر دەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی بانگەکەی بە گوێدادام، ئنجا فەرمووی: بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) ئنجا دوای ئەوەی لە بانگەکە بوومەوە، بانگی کردم و کیسەیەکی پێدام کە هەندێک زیوی تێدابوو، پاشان دەستی خستە سەر سەری ئەبو مەحزوڕە، پاشان دەستی هێنا بە ڕوخساریدا، پاشان بەسەر سینگیدا، پاشان بەسەر

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٧٩، وأبو داود: ٥٠٣ و ٥٠٥، والترمذي: ١٩١ مختصراً ١٩٢، والنسائي: ٦٣١.

جگەریدا دواتر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ناوکی ئەبو مەحزورە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پیرۆز و موبارەکت بێ، ئنجا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانم پێدەکەی بە بانگدان لە مەککە؟ فەرمووی: بەڵێ بە دڵنیایی فەرمانم پێکردی، لەوکاتەدا هەرچی ڕق و کینە بوو بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دڵم دەرچوو، هەمووی گۆڕا بەوپەڕی خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، چووم بۆ لای عەتتابی کوڕی ئەسید کە پێغەمبەر ﷺ بۆ کاروبار داینابوو لە مەککە، جا منیش لە ژێر فەرمانی ئەودا بۆ نوێژ بانگم دەدا لەبەر خاتری فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ.

عەبدولعەزیز دەڵێ: ئەوەی کە ئەبو مەحزورەی بینیوە بەهەمان شێوە لە ئەوەوە بۆی گێڕاوەمەتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی موحەیریز بۆی گێڕامەوە.

٧٠٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَيْرِيزٍ، حَدَّثَهُ أَنَّ أَبَا مَحْذُورَةَ، حَدَّثَهُ قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْأَذَانَ تِسْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً، وَالْإِقَامَةَ سَبْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً، الْأَذَانُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ «وَالْإِقَامَةُ سَبْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً» اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موحەیریز دەگێڕێتەوە، ئەبو مەحزورە بۆی گێڕاوەتەوەو گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری بانگی کردم کە نۆزدە وشەیە، وە قامەتی فێرکردوم کە حەڤدە وشەیە (مەبەست لە «كلمة» لێرەدا ڕستەیە)، بانگ بریتیە لە: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، قامەتیش کە پێکهاتووە لە

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٢، والترمذي: ١٩٢، والنسائي: ٦٣٠.

حەڤدە ڕستە بریتیە لە: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ).

## بابەت: سوننەتەکانی بانگدان

**٧١٠-** عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، مُؤَذِّنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِلَالًا أَنْ يَجْعَلَ إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ، وَقَالَ: «إِنَّهُ أَرْفَعُ لِصَوْتِكَ»[١].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی عەممارِی کوڕی سەعد ﷺ بانگبێژی پێغەمبەری خوا ﷺ گوتوویەتی: باوکم لە باوکییەوە، ئەویش لە باپیریەوە بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە بیلال کردوە (لە کاتی بانگداندا) پەنجەکانی بخاتە نێو گوێچکەکانی، وە فەرموویەتی: یارمەتیت دەدا کە دەنگت بەرزتربێ.

**٧١١-** عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: «أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِالْأَبْطَحِ، وَهُوَ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ، فَخَرَجَ بِلَالٌ فَأَذَّنَ، فَاسْتَدَارَ فِي أَذَانِهِ، وَجَعَلَ إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ»[٢].

واتە: عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە «الأبطح» بوو (شوێنێکە) لە ناو چادرێکی سووردا بوو، بیلال هاتەدەر بانگیدا، وە لە بانگەکەدا ڕووی دەسووڕاند (بە لای ڕاست و چەپیدا)، وە پەنجەکانی خستبووە نێو گوێچکەکانیەوە.

**٧١٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَصْلَتَانِ مُعَلَّقَتَانِ فِي أَعْنَاقِ الْمُؤَذِّنِينَ لِلْمُسْلِمِينَ، صَلَاتُهُمْ وَصِيَامُهُمْ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٧ دون ذكر الأذان، ومسلم: ٥٠٣، وأبو داود: ٥٢٠ و ٦٨٨، والترمذي: ١٩٧، والنسائي: ١٣٧ و ٤٧٠ و ٧٧٢ و ٥٣٧٨.

(٣) موضوع.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو تایبەتمەندی هەیە هەڵواسراوە بە گەردنی بانگ بێژانەوە کە بۆ مسوڵمانن، ئەوانیش نوێژەکانیان و ڕۆژووەکانیانن.

٧١٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: «كَانَ بِلَالٌ لَا يُؤَخِّرُ الْأَذَانَ عَنِ الْوَقْتِ، وَرُبَّمَا أَخَّرَ الْإِقَامَةَ شَيْئًا»[١].

واتە: جابیری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: بیلال بانگی لە کاتی خۆی دوانەدەخست، بەڵام هەندێ جار قامەتی کەمێک (لە کاتی خۆی) دوادەخست.

٧١٤- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﷺ، قَالَ: كَانَ آخِرُ مَا عَهِدَ إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ «أَنْ لَا أَتَّخِذَ مُؤَذِّنًا يَأْخُذُ عَلَى الْأَذَانِ أَجْرًا»[٢].

واتە: عوسمانی کوڕی ئەبو عاص ﷺ (کە پێشنوێژی گەلەکەی خۆی بووە) دەڵێ: کۆتا ڕاسپاردەی پێغەمبەر ﷺ کە لەلامە ئەوەیە کە کەسێک نەکەم بە بانگبێژ کە کرێی بانگدان وەربگرێ.

٧١٥- عَنْ بِلَالٍ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أُثَوِّبَ فِي الْفَجْرِ، وَنَهَانِي أَنْ أُثَوِّبَ فِي الْعِشَاءِ»[٣].

واتە: بیلال ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوم کە لە بانگی بەیانیاندا تەسویب بکەم (تەسویب ئەوەیە کە بانگبێژ دەڵێ: «الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ»، وە قەدەغەی کردوم کە لە نوێژی خەوتناندا (عیشا) ئەوە بڵێم.

٧١٦- عَنْ بِلَالٍ ﷺ، «أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ يُؤْذِنُهُ بِصَلَاةِ الْفَجْرِ» فَقِيلَ: هُوَ نَائِمٌ، فَقَالَ: «الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ» فَأُقِرَّتْ فِي تَأْذِينِ الْفَجْرِ، فَثَبَتَ الْأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ[٤].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٣١، والترمذي: ٢٠٩، والنسائي: ٦٧٢.

(٣) صحيح بطريقه وشواهده. أخرجه الترمذي: ١٩٨.

(٤) صحيح.

واتە: بیلال ﷺ دەگێڕێتەوە، چووە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی کاتی بانگی بەیانی پێی بڵێ، پێیان گوت: پێغەمبەری خوا ﷺ خەوتووە، ئەویش گوتی: «الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ»، (واتە: نوێژکردن باشترە لە خەوتن)، ئیتر لەو کاتەوە ئەو ڕستەیە لە بانگی بەیانیدا جێگیر بوو، وە بانگی بەیانی هەر بەو شێوەیە مایەوە.

٧١٧- عَنْ زِيَادِ بْنِ الْحَارِثِ الصُّدَائِيِّ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأَمَرَنِي فَأَذَّنْتُ، فَأَرَادَ بِلَالٌ أَنْ يُقِيمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَخَا صُدَاءٍ قَدْ أَذَّنَ، وَمَنْ أَذَّنَ، فَهُوَ يُقِيمُ»[١].

واتە: زیادی کوڕی حاریسی کوڕی صودائی ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە سەفەرێک، ئەویش فەرمانی پێکردم کە بانگ بڵێم و بانگم دا، جا بیلال ویستی قامەت بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان برای صوداء بانگی داوە، وە هەر کەس بانگی دا هەر ئەویش قامەت دەکات.

## بابەت: ئەوەی کە کاتێک بانگدەر بانگ دەدات دەبێ چۆن وەڵامی بدەینەوە و چی بڵێین

٧١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ، فَقُولُوا مِثْلَ قَوْلِهِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بانگبێژ بانگیدا، ئەوە ئەو چی گوت ئێوەش بیڵێنەوە.

٧١٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي عَمَّتِي أُمُّ حَبِيبَةَ، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا كَانَ عِنْدَهَا فِي يَوْمِهَا وَلَيْلَتِهَا، فَسَمِعَ الْمُؤَذِّنَ يُؤَذِّنُ، قَالَ كَمَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ دەڵێ: ئوممو حەبیبەی پورم بۆی گێڕامەوە کە لەو شەو و ڕۆژەی خۆی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای بووە، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە لە کاتی بانگداندا گوێبیستی بانگبێژ بووە، هەمان ئەوەی گوتۆتەوە کە بانگبێژەکە دەیگوت.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٥١٤، والترمذي: ١٩٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

**٧٢٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ، فَقُولُوا كَمَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ»[١].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گوێبیستی بانگ بوون، ئەوە بڵێنەوە کە بانگبێژ دەیڵێ.**

**٧٢١-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ»[٢].

**واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، کە فەرموویەتی: هەر کەس گوێبیستی بانگ دەبێ بڵێ: (وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا)، (واتە: منیش شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێک نیە جگە لە خوای تاک و تەنها هیچ هاوبەشی نیە، موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە. ڕازی بووم بەوەی خوا پەروەردگارم بێت، ئیسلامیش ئایینم بێت، موحەممەدیش پێغەمبەرم بێت). ئەوە لە گوناهی دەبوردرێ.**

**٧٢٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ، وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، إِلَّا حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس گوێبیستی بانگ بوو و گوتی: (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ، وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ)، واتە: ئەی پەروەردگاری خاوەن ئەم بانگەوازە تەواوەو ئەم نوێژە ڕاگیراوە کە دەکرێت، وەسیلەو فەزیلە ببەخشە بە موحەممەد ﷺ بیگەیەنەرە ئەو شوێنە سوپاسگوزارییە کە پەیمانت پێداوە. ئەوە بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا بەر شەفاعەتی من دەکەوێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١١، ومسلم: ٣٨٣، وأبو داود: ٥٢٢، والترمذي: ٢٠٨، والنسائي: ٦٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٨٦، وأبو داود: ٥٢٥، والترمذي: ٢١٠، والنسائي: ٦٧٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٤، وأبو داود: ٥٢٩، والترمذي: ٢١١، والنسائي: ٦٨٠.

## بابەت: گەورەیی بانگدان وە پاداشتی بانگدەران

**٧٢٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، وَكَانَ أَبُوهُ فِي حِجْرِ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ لِي أَبُو سَعِيدٍ: إِذَا كُنْتَ فِي الْبَوَادِي، فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالْأَذَانِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَسْمَعُهُ جِنٌّ، وَلَا إِنْسٌ، وَلَا شَجَرٌ، وَلَا حَجَرٌ، إِلَّا شَهِدَ لَهُ»[١].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو صەعصەعە لە باوکییەوە ﷺ کە لە ژێر سەرپەرشتی ئەبو سەعید دابوو، دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: ئەبو سەعید پێی گوتم: هەر کاتێک لە شیو و دۆڵەکاندا بوویت و بانگتدا دەنگت بەرز بکەوە، چونکە من لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستومە کە دەیفەرموو: هەر شتێک لە جن و مرۆڤ و داروبەرد کە گوێبیستی بانگ ببێ و ئەوە دەبێتە شاهید و گەواهیدەر بۆی (بۆ بانگبێژ).

**٧٢٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْمُؤَذِّنُ يُغْفَرُ لَهُ، مَدَى صَوْتِهِ، وَيَسْتَغْفِرُ لَهُ كُلُّ، رَطْبٍ، وَيَابِسٍ، وَشَاهِدُ الصَّلَاةِ، يُكْتَبُ لَهُ خَمْسٌ وَعِشْرُونَ حَسَنَةً، وَيُكَفَّرُ عَنْهُ مَا بَيْنَهُمَا»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بانگبێژ بە ئەندازەی ئەوەی کە دەنگی دەڕوات لێخۆشبوونی خوا دەیگرێتەوە (مەبەست لە فراوانی لێخۆشبونی خوایە)، وە هەرچی تەڕ و وشکە داوای لێخۆشبوونی بۆ لە خوا دەکەن، وە ئەوەی ئامادەی نوێژی بە کۆمەڵ دەبێ، ئەوە بیست و پێنج چاکەی بۆ دەنوسرێ و دەبێتە کەفارەتی نێوان ئەو بانگە و بانگی داهاتوو (یان ئەو نوێژە و نوێژی داهاتوو).

**٧٢٥-** عَنْ عِيسَى بْنِ طَلْحَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠٩ و ٣٢٩٦ و ٧٥٤٨، والنسائي: ٦٤٤ كلاهما دون قوله: «وَلاَ حَجَرٌ وَلاَ شَجَرٌ».

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥١٥، والنسائي: ٦٤٥.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٨٧.

واتە: عیسای كوڕی تەڵحە دەڵێ: گوێم لە موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان ﷺ بوو گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بانگبێژەكان لە ڕۆژی قیامەتدا گەردنیان لە هەموو كەس درێژتر و بەرزترە (مەبەست پێی سەربەرزی و بەختەوەرییە).

**٧٢٦**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِيُؤَذِّنْ لَكُمْ خِيَارُكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ قُرَّاؤُكُمْ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با بانگبێژەكەتان باشترین كەستان بێ (یان مەبەستی پێ ئەوەیە كە ئەوەی باشتر پارێزگاری دەكات بۆ كاتەكانی نوێژ)، وە فەرمووی: با كامەتان قوڕئان خوێنترەو قوڕئانی زیاتر لەبەرە ئەو پێشنوێژیتان بۆ بكات.

**٧٢٧**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَذَّنَ مُحْتَسِبًا سَبْعَ سِنِينَ، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بَرَاءَةً مِنَ النَّارِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس لەبەر ڕەزامەندی خوا حەوت ساڵ بانگ بدات، ئەوە خوا بەری بوونی لە ئاگری دۆزەخ بۆ دەنوسێ (واتە: ئاگری دۆزەخ نابینێ).

**٧٢٨**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ أَذَّنَ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَكُتِبَ لَهُ بِتَأْذِينِهِ فِي كُلِّ يَوْمٍ سِتُّونَ حَسَنَةً، وَلِكُلِّ إِقَامَةٍ ثَلَاثُونَ حَسَنَةً»[٣].

واتە: ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک دوازدە ساڵ بانگ بدات، ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێ، وە بۆ بانگدانی هەر ڕۆژێكی شەست چاكەی بۆ دەنوسرێ، وە بۆ هەر قامەتێک سی چاكەی بۆ دەنوسرێ.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٥٩٠.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٠٦.

(٣) حسن.

## بابەت: ئەوەی کە ڕستەکانی قامەت کردن تاک تاکن (وەکو بانگدان جووت نین)

**٧٢٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: الْتَمَسُوا شَيْئًا يُؤْذِنُونَ بِهِ عَلَمًا لِلصَّلَاةِ، «فَأُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ، وَيُوتِرَ الْإِقَامَةَ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گەڕان بەدوای شتێکدا کە وەک بانگدان بەکاری بێنن بۆ ئەوەی کاتی نوێژەکانی پێبزانن، (ئیتر ڕێککەوتن و) فەرمان بە بیلال کرا کە بۆ بانگدان ڕستەکان بە جووت بڵێ، وە بۆ قامەت کردن بە تاک بیانڵێ.

**٧٣٠-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: «أُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ، وَيُوتِرَ الْإِقَامَةَ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: فەرمان بە بیلال کرا کە ڕستەکانی بانگ بە جووت بڵێ و بۆ قامەت کردن بە تاک بیانڵێ.

**٧٣١-** عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ مُؤَذِّنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ «أَذَانَ بِلَالٍ كَانَ مَثْنَى مَثْنَى، وَإِقَامَتَهُ مُفْرَدَةٌ»[٣].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی عەممارِی کوڕی سەعد ﷺ کە بانگبێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: باوکم لە باوکییەوە لە باپیریەوە بۆی گێڕامەوە کە بانگدانی بیلال ڕستەکانی دوو دوو بوون، وە قامەت کردنەکەشی تاک تاک بوو.

**٧٣٢-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَثْنَى مَثْنَى، وَيُقِيمُ وَاحِدَةً»[٤].

واتە: ئەبو ڕافیع ﷺ دەڵێ: بیلالم بینیوە کە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی دەداو دووجار دووجار (ڕستەکانی دەگوت)، وە بۆ قامەت یەک جار دەیگوت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠٣ و ٦٠٦، ومسلم: ٣٧٨، وأبو داود: ٥٠٨ و ٥٠٩، والترمذي: ١٩٣، والنسائي: ٦٢٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠٣ و ٦٠٦، ومسلم: ٣٧٨، وأبو داود: ٥٠٨ و ٥٠٩، والترمذي: ١٩٣، والنسائي: ٦٢٧.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح لغيره.

## بابەت: ئەوەی کە کاتێک بانگ درا و لەناو مزگەوت بووی نابێ لە مزگەوت دەرچی تا نوێژ دەکەی

**٧٣٣-** عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ، قَالَ: كُنَّا قُعُودًا فِي الْمَسْجِدِ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، فَأَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الْمَسْجِدِ يَمْشِي، فَأَتْبَعَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ بَصَرَهُ حَتَّى خَرَجَ مِنَ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: «أَمَّا هَذَا، فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ»[١].

واتە: ئەبو شەعساء دەڵێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرە ﷺ لە مزگەوت دانیشتبووین لەو کاتەی کە بانگبێژ بانگیدا، پیاوێک لە ناو مزگەوت هەڵساو دەڕۆیشت، ئەبو هورەیرەش ﷺ چاوی لەسەر بوو تا لە مزگەوت دەرچوو، ئنجا ئەبو هورەیرە گوتی: بەڕاستی ئا ئەو پیاوە سەرپێچی (فەرمانەکانی) ئەبو قاسم (واتە: پێغەمبەری ﷺ) کرد.

**٧٣٤-** عَنْ عُثْمَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَدْرَكَهُ الْأَذَانُ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ خَرَجَ، لَمْ يَخْرُجْ لِحَاجَةٍ، وَهُوَ لَا يُرِيدُ الرَّجْعَةَ، فَهُوَ مُنَافِقٌ»[٢].

واتە: عوسمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە کاتی بانگدان لە ناو مزگەوت بێ و پاشان بێ ئەوەی هیچ کارێکی هەبێ و دەرچێ، نەشیەوێ بگەڕێتەوە، ئەوە دووڕووە (واتە: کارێکی مونافیقانەی کردوە).



---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٥٥، وأبو داود: ٥٣٦، والترمذي: ٢٠٤، والنسائي: ٦٨٣ و ٦٨٤.

(٢) صحيح لغيره.



# پەرتووکی

# مزگەوتەکان و جەماعەت (نوێژی بە کۆمەڵ) کردن



## بابەت: ئەو كەسەی كە مزگەوتێک لەپێناوی خوادا دروست دەكات

**٧٣٥-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ بَنَى مَسْجِدًا يُذْكَرُ فِيهِ اسْمُ اللَّهُ، بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ»[١].

**واتە: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر كەسێک مزگەوتێک دروست بكات و ناوی خوای تێدا بهێنرێ، ئەوە خوا خانوویەكی بۆ دروست دەكات لە بەهەشتدا.**

**٧٣٦-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ بَنَى لِلَّهِ مَسْجِدًا، بَنَى اللَّهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الْجَنَّةِ»[٢].

**واتە: عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر كەسێک لە پێناو خوادا مزگەوتێک دروست بكات، ئەوە خوا لە بەهەشتدا ماڵێكی لە وێنەی ئەو مزگەوتە بۆ دروست دەكات.**

**٧٣٧-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ بَنَى مَسْجِدًا مِنْ مَالِهِ لِلَّهِ، بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ»[٣].

**واتە: عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک بە ماڵ و سامانی خۆی مزگەوتێک لە پێناو خوادا دروست بكات، ئەوە خوا لە بەهەشتدا ماڵێكی بۆ دروست دەكات.**

**٧٣٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ بَنَى مَسْجِدًا لِلَّهِ كَمَفْحَصِ قَطَاةٍ، أَوْ أَصْغَرَ، بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٠، ومسلم: ٥٣٣، والترمذي: ٣١٨.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە پێناو خوادا مزگەوتێک دروست بکات، وەکو هێلانەی کۆترێک، یان گچکەتریش بێ، ئەوە خوا لە بەهەشتداماڵێکی بۆ دروست دەکات.

**قطاة:** جۆرە کۆترێکە.

## بابەت: بەرزکردنی مزگەوتەکان زیاد لە پێویست

**٧٣٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قیامەت نایەت تاکو وای لێنەیەت کە خەڵکی خۆی بە مزگەوت ڕازاندنەوە هەڵدەکێشێ (واتە: هەر کەسەو بە ڕازاندنەوەی مزگەوتی خۆی دەنازێ و خۆی پێوە هەڵدەکێشێ).

**٧٤٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَرَاكُمْ سَتُشَرِّفُونَ مَسَاجِدَكُمْ بَعْدِي، كَمَا شَرَّفَتِ الْيَهُودُ كَنَائِسَهَا، وَكَمَا شَرَّفَتِ النَّصَارَى بِيَعَهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەتانبینم کە لە دوای من مزگەوتەکان بەرزدەکەنەوە (دەیانڕازێننەوە) هەر وەکو چۆن جولەکەکان کەنیسەکانیان (ڕازاندەوەو) بەرزیان کردنەوە، وە هەروەکو چۆن گاورەکان پەرستگاکانیان (ڕازاندەوەو) بەرزیان کردنەوە.

**٧٤١-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا سَاءَ عَمَلُ قَوْمٍ قَطُّ، إِلَّا زَخْرَفُوا مَسَاجِدَهُمْ»[٣].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ گەلێک کردەوەکانیان شێواو و خراپ نەبووە، مەگەر کاتێک کە مزگەوتەکانیان ڕازاندبێتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٩، والنسائي: ٦٨٩.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف جداً.

## بابەت: دروستكردنی مزگەوت لە كوێ ڕێگەپێدراوە

**٧٤٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: كَانَ مَوْضِعُ مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ لِبَنِي النَّجَّارِ، وَكَانَ فِيهِ نَخْلٌ، وَمَقَابِرُ لِلْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ «ثَامِنُونِي بِهِ» قَالُوا: لَا نَأْخُذُ لَهُ ثَمَنًا أَبَدًا، قَالَ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَبْنِيهِ وَهُمْ يُنَاوِلُونَهُ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «أَلَا إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الْآخِرَهْ، فَاغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ، وَالْمُهَاجِرَهْ» قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي قَبْلَ أَنْ يَبْنِيَ الْمَسْجِدَ حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ[1].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: شوێنی مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ هی بەنو نەجار بوو، وە ئەو شوێنە هەم دارخورما و هەم گۆڕی هاوبەشدانەرانی تێدابوو، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: لە جیاتی ئەم شوێنە پارەم لێوەربگرن، ئەوانیش گوتیان: بە هیچ شێوەیەک نرخەكەی وەرناگرین (لە ڕێگەی خوا پێشكەشی دەكەین)، ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بیناكەی دروست دەكرد و ئەوانیش كاریان لەگەڵ دەكرد، وە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئاگاداربن بەڕاستی خۆشی و ژیان تەنها خۆشی دواڕۆژە، خوایە خۆشبی لە ئەنصار و موهاجیرەكان. ڕاوی دەڵێ: پێش ئەوەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ مزگەوت دروست بكات، لە هەر شوێنەک كاتی نوێژ هەتبایە، ئەوە هەر لەو شوێنە نوێژەكەی دەكرد.

**٧٤٣-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَمَرَهُ أَنْ يَجْعَلَ مَسْجِدَ الطَّائِفِ حَيْثُ كَانَ طَاغِيَتُهُمْ»[2].

واتە: عوسمانی كوڕی ئەبو عاص ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێكرد كە پەرستگای (الطائف)یان بۆ بكات بە مزگەوت بۆ خواپەرستی كە پێشتر بتیان تێدا دەپەرست.

**٧٤٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ وَسُئِلَ عَنِ الْحِيطَانِ تُلْقَى فِيهَا الْعَذِرَاتُ، فَقَالَ «إِذَا سُقِيَتْ مِرَارًا، فَصَلُّوا فِيهَا» يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢٨ و ٢٣٤، ومسلم: ٥٢٤، وأبو داود: ٤٥٣ و ٤٥٤، والنسائي: ٧٠٢.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٥٠.

(٣) ضعيف.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پرسیاری لێكرا دەربارەی باغ و بێستانێک كە شتگەلێكی پیسی لێ فڕێ دەدەن (ئایا پاكە بۆ نوێژكردن، یان حوكمەكەی چیە؟) ئەویش گوتی: هەر كاتێک چەند جارێک ئەو باغە ئاودرا، ئەوە نوێژی تێدا بكەن، وە ئیبنو عومەر ئەو بڕیارەی (حوكمەی) بۆ پێغەمبەر ﷺ بەرزكردەوە (واتە: دەیگوت پێغەمبەر ﷺ ئاوای بڕیار داوە).

## بابەت: ئەو شوێنانەی كە نوێژكردن تێیدا ناپەسەندە (مكروە)

**٧٤٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ، إِلَّا الْمَقْبَرَةَ، وَالْحَمَّامَ»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەوی هەمووی مزگەوتە (واتە: گونجاوە بۆ نوێژ تێداكردن) تەنها گۆڕستان و گەرماو (حەمام) نەبێ.

**٧٤٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُصَلَّى فِي سَبْعِ مَوَاطِنَ: فِي الْمَزْبَلَةِ، وَالْمَجْزَرَةِ، وَالْمَقْبَرَةِ، وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ، وَالْحَمَّامِ، وَمَعَاطِنِ الْإِبِلِ، وَفَوْقَ الْكَعْبَةِ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە كە لە حەوت شوێندا نوێژ بكرێ: لە زبڵدان، وە لە شوێنی ئاژەڵ سەربڕین، وە لە گۆڕستان، وە لە چەقی ڕێگەدا (كە قەرەباڵغ بێ)، وە لە گەرماودا، وە لە مۆڵگەی حوشتر، وە لەسەر كەعبە (ئەم حەوت شوێنە هەندێكیان نوێژ تێیاندا دروست نیە لەبەر پیسی، هەندێكیش نوێژ تێیاندا ناپەسندە).

**٧٤٧-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «سَبْعُ مَوَاطِنَ لَا تَجُوزُ فِيهَا الصَّلَاةُ: ظَاهِرُ بَيْتِ اللَّهِ، وَالْمَقْبَرَةُ، وَالْمَزْبَلَةُ، وَالْمَجْزَرَةُ، وَالْحَمَّامُ، وَعَطَنُ الْإِبِلِ، وَمَحَجَّةُ الطَّرِيقِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٩٢، والترمذي: ٣١٧.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣٤٦.

(٣) ضعيف.

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەوت شوێن هەیە نوێژکردن تێیاندا دروست نیە: سەربانیماڵی خوا (کەعبە)، وە گۆڕستان، وە زبڵدان، وە کوشتارگەی ئاژەڵ، وە گەرماو، وە مۆڵگەی حوشتر، وە ناو ڕێگا (لەبەر قەرەباڵغی).

## بابەت: ئەو شتانەی کە ناپەسەندە لەناو مزگەوتدا

٧٤٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خِصَالٌ لَا تَنْبَغِي فِي الْمَسْجِدِ: لَا يُتَّخَذُ طَرِيقًا، وَلَا يُشْهَرُ فِيهِ سِلَاحٌ، وَلَا يُنْبَضُ فِيهِ بِقَوْسٍ، وَلَا يُنْشَرُ فِيهِ نَبْلٌ، وَلَا يُمَرُّ فِيهِ بِلَحْمٍ نِيِّءٍ، وَلَا يُضْرَبُ فِيهِ حَدٌّ، وَلَا يُقْتَصُّ فِيهِ مِنْ أَحَدٍ، وَلَا يُتَّخَذُ سُوقًا»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چەند شتێک هەیە شایستە نیە بۆ ناو مزگەوت: نابێ بکرێتە ڕێگای هاتووچۆ کردن، نابێ چەکی تێدا دەربهێندرێ، وە نابێ تیر و پەیکان یاریان پێبکرێ (لە ناو مزگەوتدا، چونکە شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکە)، وە نابێ گۆشتی نەکوڵاوی پێدا تێپەڕبێ (بەڵام گۆشتی کوڵاو و لێنراو دروستە، چونکە خواردن لە مزگەوتدا دروست و ڕێپێدراوە)، وە نابێ لە ناو مزگەوتدا تاوانبار حەددی لێ دەربکرێ، وە نابێ تۆڵەی تێدا بکرێتەوە لە هیچ کەسێک، وە نابێ بکرێتە بازاڕ (نابێ کڕین و فرۆشتنی تێدا بکرێ).

٧٤٩- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْبَيْعِ وَالِابْتِيَاعِ وَعَنْ تَنَاشُدِ الْأَشْعَارِ فِي الْمَسَاجِدِ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە لە ناو مزگەوتدا کڕین و فرۆشتن بکرێ و، شیعری تێدا بخوێنرێتەوە. (بۆ مەبەستی شانازی و پیاهەڵدان شیعر بخوێنرێتەوە دروست نیە نەک بە ڕەهایی، چونکە حەسانی کوڕی سابیت ﷺ شاعیری پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندویەتیەوە).

---

(١) ضعيف إلا الخصلة الأولى منه صحيحة فقط.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ١٠٧٩، والترمذي: ٣٢٢، والنسائي: ٧١٤ و ٧١٥ مختصراً.

**٧٥٠-** عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «جَنِّبُوا مَسَاجِدَكُمْ صِبْيَانَكُمْ، وَمَجَانِينَكُمْ، وَشِرَاءَكُمْ، وَبَيْعَكُمْ، وَخُصُومَاتِكُمْ، وَرَفْعَ أَصْوَاتِكُمْ، وَإِقَامَةَ حُدُودِكُمْ، وَسَلَّ سُيُوفِكُمْ، وَاتَّخِذُوا عَلَى أَبْوَابِهَا الْمَطَاهِرَ، وَجَمِّرُوهَا فِي الْجُمَعِ»[١].

واتە: واسیلەی کوڕی ئەسقەع ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مزگەوتەکانتان بپارێزن و بەدووریان بگرن لە منداڵەکانتان و (منداڵێک کە پیسبێ و خاوێن نەبێ، ئەگەرنا پاک و ژیر بێ دروست نیە دەربکرێ) لە شێتەکانتان و لە کڕین و فرۆشتنەکانتان و لە دەمەقاڵێتان و لە دەنگ بەرز کردنەوەتان و لە حەد دەرکردنەکانتان و لە دەرهێنانی شمشێرەکانتان، وە لە دەرگای مزگەوتەکان شوێنی پاککردنەوە دروست بکەن، وە لە ڕۆژانی جومعەدا بۆن خۆشی بکەن.

## بابەت: نوستن لەناو مزگەوتدا

**٧٥١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نَنَامُ فِي الْمَسْجِدِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە ناو مزگەوت دەخەوتین.

**٧٥٢-** عَنْ يَعِيش بْن قَيْسِ بْنِ طِخْفَةَ، حَدَّثَهُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «انْطَلِقُوا» فَانْطَلَقْنَا إِلَى بَيْتِ عَائِشَةَ، وَأَكَلْنَا وَشَرِبْنَا، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنْ شِئْتُمْ نِمْتُمْ هَاهُنَا، وَإِنْ شِئْتُمْ انْطَلَقْتُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ» قَالَ: فَقُلْنَا: بَلْ نَنْطَلِقُ إِلَى الْمَسْجِدِ[٣].

واتە: یەعیشی کوڕی قەیسی تیخفە لە باوکیەوە ﷺ کە لە هاوەڵانی صوففە بوو، دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو: بڕۆن (دیارە بۆ نان خواردن و پشوودان بووە)، دەڵێ: ئێمەش ڕۆیشتین بۆ ماڵی عائیشە خواردنمان خوارد و خواردنەوەمان خواردەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو: ئەگەر حەزتان لێیە لێرە بخەون، ئەگەر حەزیشتان لێیە بچنە مزگەوت، دەڵێ: ئێمەش گوتمان: بەڵکو دەچینە مزگەوت.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٠، ومسلم: ٢٤٧٩، والترمذي: ٣٢١، والنسائي: ٧٢٢.

(٣) ضعيف ومضطرب. أخرجه أبو داود: ٥٠٤٠.

## بابەت: کامە مزگەوت یەکەم جار بنیات نرا

٧٥٣- عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغِفَارِيِّ ﷺ، قَالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ أَوَّلُ؟ قَالَ: «الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ» قَالَ قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ الْمَسْجِدُ الْأَقْصَى» قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: «أَرْبَعُونَ عَامًا، ثُمَّ الْأَرْضُ لَكَ مُصَلًّى، فَصَلِّ حَيْثُ مَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلَاةُ»[١].

واتە: ئەبو زەڕی غیفارییەوە ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ مزگەوتێک یەکەم جار بنیات نرا؟ فەرمووی: مزگەوتی حەڕام، گوتم: ئەی دوای ئەو؟ فەرمووی: مزگەوتی ئەقصا، گوتم: نێوانیان چەند بووە؟ فەرمووی: چل ساڵ، پاشان زەوی هەمووی بۆ تۆ شوێنی نوێژکردنە، لە هەر شوێنێک کاتی نوێژ هات، هەر لەو شوێنە نوێژەکەت ئەنجام بدە.

## بابەت: بە مزگەوت کردنی ماڵ

٧٥٤- عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، وَكَانَ قَدْ عَقَلَ مَجَّةً مَجَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي دَلْوٍ فِي بِئْرٍ لَهُمْ، عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ السَّالِمِيِّ ﷺ وَكَانَ إِمَامَ قَوْمِهِ بَنِي سَالِمٍ، وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: جِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ أَنْكَرْتُ مِنْ بَصَرِي، وَإِنَّ السَّيْلَ يَأْتِي، فَيَحُولُ بَيْنِي وَبَيْنَ مَسْجِدِ قَوْمِي، وَيَشُقُّ عَلَيَّ اجْتِيَازُهُ، فَإِنْ رَأَيْتَ أَنْ تَأْتِيَنِي، فَتُصَلِّيَ فِي بَيْتِي مَكَانًا أَتَّخِذُهُ مُصَلًّى، فَافْعَلْ، قَالَ: «أَفْعَلُ» فَغَدَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ بَعْدَمَا اشْتَدَّ النَّهَارُ، وَاسْتَأْذَنَ، فَأَذِنْتُ لَهُ، وَلَمْ يَجْلِسْ، حَتَّى قَالَ: «أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ لَكَ مِنْ بَيْتِكَ؟» فَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي أُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ فِيهِ «فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَصَفَفْنَا خَلْفَهُ، فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ احْتَبَسْتُهُ عَلَى خَزِيرَةٍ تُصْنَعُ لَهُمْ»[٢].

واتە: مەحمودی کوڕی ڕەبیع ئەنصاریی ﷺ ئەوەی کە لای خۆی پاراستویەتی و بیری ماوە دەگێڕێتەوە کە جارێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئاوی دۆڵچەیەک لە بیرەکەی خۆیان بە دەمی دەپرژێنێتە ڕوخساری، عیتبانی کوڕی مالیکی سالیمیی ﷺ کە پێشنوێژی هۆزەکەی بەنو سالیم بووە، وە ئامادەی بەدر بووە لەگەڵ پێغەمبەری

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٦٦ و ٣٤٢٥، ومسلم: ٥٢٠، والنسائي: ٦٩٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٤٠، ومسلم: ٤٥٥/١ رقم ٣٣/٢٦٣، والنسائي: ١٣٢٧ مطولًا.

خوا ﷺ، دەگێڕێتەوە دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بینایم لە دەست داوە، وە ئەو لافاو و سێلاوە (کاتی باران بارین) دەبێتە ڕێگر لە نێوانی من و مزگەوتی هۆزەکەم ناتوانم تێیپەڕێنم (بچم بۆ مزگەوت)و سەختە بۆم، جا ئەگەر پێت باشە بێی بۆ لام وە لەناو ماڵەکەی خۆمدا لە شوێنێک نوێژ بکەی (بۆ پیرۆزی) بۆ ئەوەی من بیکەم بە نوێژگەی خۆم (ئەگەر پێت باشە) ئەو کارەم بۆ بکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو کارەت بۆ دەکەم، بۆ ڕۆژی دواتر کاتی گەرمای نیوەڕۆ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبو بەکر ﷺ هاتن مۆڵەتیان وەرگرت بۆ هاتنە ژوورەوە، منیش مۆڵەتم دان، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دانەنیشت هەتاکو فەرمووی: حەز دەکەی لە کوێی ماڵەکەت نوێژ بکەم؟ منیش ئاماژەم بەو شوێنە کرد کە پێم خۆش بوو بیکەم بە نوێژگەی خۆم، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو ئێمەش لەدوای ئەو ڕیزمان بەست و دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین، پاشان ڕێگەم نەدا بگەڕێتەوەو دەعوەتم کرد لە لای خۆم بە خواردنی «خزیرة» کە بۆ ئەوانم لێنابوو.

خَزِيرَة: چێشتێکە کە بە گۆشت و ئاو و ئارد لێدەنرێ.

٧٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ أَرْسَلَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَعَالَ فَخُطَّ لِي مَسْجِدًا فِي دَارِي أُصَلِّي فِيهِ، وَذَلِكَ بَعْدَ مَا عَمِيَ، «فَجَاءَ، فَفَعَلَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێک لە ئەنصار (کەسێکی) نارد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە بێت شوێنێکم لە ناو ماڵەکەمدا بۆ نیشان بکات تاکو نوێژی لێبکەم، ئەوەش دوای ئەوەی کە بینایی لە دەست دابوو، پێغەمبەریش ﷺ هات و ئەو کارەی بۆ ئەنجام بدا.

٧٥٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: صَنَعَ بَعْضُ عُمُومَتِي لِلنَّبِيِّ ﷺ طَعَامًا، فَقَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: «إِنِّي أُحِبُّ أَنْ تَأْكُلَ فِي بَيْتِي، وَتُصَلِّيَ فِيهِ» قَالَ: فَأَتَاهُ، وَفِي الْبَيْتِ فَحْلٌ مِنْ هَذِهِ الْفُحُولِ، فَأَمَرَ بِنَاحِيَةٍ مِنْهُ، فَكُنِسَ وَرُشَّ، «فَصَلَّى، وَصَلَّيْنَا مَعَهُ» قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَاجَةَ: الْفَحْلُ: هُوَ الْحَصِيرُ الَّذِي قَدِ اسْوَدَّ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. تخريجه انفرد به ابن ماجه, وأصله في البخاري: ٦٧٠ و ١١٧٩ و ٦٠٨٠.




واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: یەکێ لە مامەکانم خواردنێکی سازکردبوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا بە پێغەمبەری ﷺ گوت: بەڕاستی پێمخۆشە کە لە ماڵی من نان بخۆی و نوێژی تێدا بکەی، جا (پێغەمبەریش ﷺ) هات بۆ ماڵی، حەسیرێک لە ماڵەکە دابوو، ئنجا فەرمانی کرد کە پاک بکرێتەوە، ئنجا ماڵدراو ئاوی بەسەردا پرژێنرا، دواتر نوێژی (لەسەر) کردو، ئێمەش نوێژمان لەگەڵی کرد. ئەبو عەبدوڵڵا ئیبنو ماجە دەڵێ: «الفحل» بە حەسیرێک دەگوترێ کە ڕەش بووبێ (لەبەر کۆنی).

## بابەت: پاک کردنەوەی مزگەوتەکان و بۆن خۆش کردنیان

٧٥٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَخْرَجَ أَذًى مِنَ الْمَسْجِدِ، بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پیسی و ئازارێک لە مزگەوت دەربهێنێ، ئەوە خوا ماڵێکی بۆ لە بەهەشتدا دروست دەکات.

٧٥٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «أَمَرَ بِالْمَسَاجِدِ أَنْ تُبْنَى فِي الدُّورِ، وَأَنْ تُطَهَّرَ وَتُطَيَّبَ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە لە ناو هۆزو ماڵەکاندا مزگەوت دروست بکرێ و هەروەها پاک بکرێنەوە و بۆن خۆش بکرێن.

٧٥٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَنْ تُتَّخَذَ الْمَسَاجِدُ فِي الدُّورِ، وَأَنْ تُطَهَّرَ، وَتُطَيَّبَ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە لەناو هۆز و ماڵەکاندا مزگەوت دروست بکرێ و هەروەها پاک بکرێنەوە و بۆن خۆش بکرێن.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٥، والترمذي: ٥٩٤.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٥، والترمذي: ٥٩٤.

**٧٦٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: «أَوَّلُ مَنْ أَسْرَجَ فِي الْمَسَاجِدِ تَمِيمٌ الدَّارِيُّ»[١].

**واتە:** ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: یەکەم کەس کە مزگەوتی ڕازاندەوە، تەمیمی داری بوو.

## بابەت: ناپەسەندی بەڵغەم و تف فڕێدان لەناو مزگەوت

**٧٦١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُمَا أَخْبَرَاهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى نُخَامَةً فِي جِدَارِ الْمَسْجِدِ، فَتَنَاوَلَ حَصَاةً، فَحَكَّهَا، ثُمَّ قَالَ: «إِذَا تَنَخَّمَ أَحَدُكُمْ، فَلَا يَتَنَخَّمَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ، وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْزُقْ عَنْ شِمَالِهِ، أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى»[٢].

**واتە:** ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دیواری مزگەوتەوە بەڵغەمی بینی، ئنجا بەردێکی هێنا پێی کڕاندو لێی کردەوە، پاشان فەرمووی: هەر یەکێک لە ئێوە ئەگەر بەڵغەمی فڕێدا با بەرەو ڕووی پێشەوە (واتە: ڕوو بە قیبلە) فڕێی نەدات و بە لای ڕاستیشدا فڕێی نەدات، با بەلای چەپدا فڕێی بدات، یان بیخاتە ژێر پێی چەپی.

**تێبینی:** لە ناو مزگەوتدا بە هەموو ڕووێکدا قەدەغەکراوە، ئەوەی لەم فەرموودەدا هاتووە بۆ دەرەوەی مزگەوتە.

**٧٦٢-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، رَأَى نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَحَكَّتْهَا، وَجَعَلَتْ مَكَانَهَا خَلُوقاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَحْسَنَ هَذَا»[٣].

**واتە:** ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە جارێک پێغەمبەر ﷺ لە ڕووگەی مزگەوتەکەدا بەڵغەمی بینی، ئەویش زۆر تووڕەبوو بە جۆرێک ڕەنگی ڕوخساری سوور بۆوە (لە تورەییدا)، لەوکاتەدا ئافرەتێک لە ئەنصار هات و کڕاندی و لێیکردەوەو شوێنەکەشی بۆن خۆش کرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چەند کارێکی جوانە ئەو کارە.

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٨ و ٤٠٩ و ٤١٠ و ٤١١ و ٤١٤ و ٤١٦، ومسلم: ٥٤٨، والنسائي: ٧٢٥.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٧٢٨. وانظر البخاري: ٤٠٥، ومسلم: ٥٥١.

**٧٦٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، وَهُوَ يُصَلِّي بَيْنَ يَدَيِ النَّاسِ، فَحَتَّهَا، ثُمَّ قَالَ حِينَ انْصَرَفَ مِنَ الصَّلَاةِ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا كَانَ فِي الصَّلَاةِ، كَانَ اللَّهُ قِبَلَ وَجْهِهِ، فَلَا يَتَنَخَّمَنَّ أَحَدُكُمْ قِبَلَ وَجْهِهِ فِي الصَّلَاةِ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووگەی مزگەوتدا بەڵغەمی بینی ئەویش لە ناو خەڵكیدا نوێژی دەكرد، ئنجا بە شتێك كڕاندی، پاشان كاتێك لە نوێژ بۆوە فەرمووی: هەر یەكێك لە ئێوە ئەگەر لە نوێژدا بوو، ئەوە بەرەو ڕووی خوا وەستاوە، بۆیە هیچ یەكێكتان هیچ كات لە نوێژدا بەڵغەم بەرەو ڕووگەكەی فڕێنەدات.

**٧٦٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «حَكَّ بُزَاقًا فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ تف و بەڵغەمی كڕاندووە (سڕیوەتەوە) لە ڕووگەی مزگەوتدا.

## بابەت: قەدەغەكردنی
## بانگەواز بۆ شتی ونبوو لەناو مزگەوتدا

**٧٦٥-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَجُلٌ: مَنْ دَعَا إِلَى الْجَمَلِ الْأَحْمَرِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا وَجَدْتَهُ، إِنَّمَا بُنِيَتِ الْمَسَاجِدُ لِمَا بُنِيَتْ لَهُ»[3].

واتە: سولەیمانی كوڕی بوڕەیدە لە باوكییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی كرد، لەو كاتەدا پیاوێك گوتی: چ كەسێك حوشترێكی سووری بینیوە؟ (مەبەستی هەر كەسێك دیتیەوە با بیگەڕێنێتەوە بۆم)، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەیبینیەوە، (وەكو سەرزەنشتكردنێك ئەوەی پێ فەرموو) وە فەرمووی: بێگومان مزگەوت بۆ ئەوە بەكاردێ كە بۆی دروستكراوە (واتە: بۆ پەرستش دروستكراوە نەك بۆ ئەوەی بانگەوازی شتی ونبووی تێدا بكرێ).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٦، ومسلم: ٥٤٧، وأبو داود: ٤٧٩، والنسائي: ٧٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٧، ومسلم: ٥٤٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٦٩.

٧٦٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «نَهَى عَنْ إِنْشَادِ الضَّالَّةِ فِي الْمَسْجِدِ»[١].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە لە ناو مزگەوتدا بانگەواز بۆ شتی ونبوو بکرێ (بۆ بینینەوەی).

٧٦٧- عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ، مَوْلَى شَدَّادِ بْنِ الْهَادِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ سَمِعَ رَجُلًا يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ، فَلْيَقُلْ: لَا رَدَّ اللَّهُ عَلَيْكَ، فَإِنَّ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا»[٢].

واتە: ئەبو عەبدوڵڵا خزمەتکاری شەددادی کوڕی هاد دەگێڕێتەوە کە گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بووە کە دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک بیستی پیاوێک لە ناو مزگەوتدا بانگەوازی کرد بۆ شتێکی ونبوو، ئەوە با بڵێ: خوا بۆت نەگێڕێتەوە، چونکە بێگومان مزگەوت بۆ ئەوە دروست نەکراوە.

## بابەت: نوێژکردن لە مۆڵگەی حوشتر و مەڕدا

٧٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنْ لَمْ تَجِدُوا إِلَّا مَرَابِضَ الْغَنَمِ، وَأَعْطَانَ الْإِبِلِ، فَصَلُّوا فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ، وَلَا تُصَلُّوا فِي أَعْطَانِ الْإِبِلِ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هیچ شوێنێکتان چنگ نەکەوت بۆ نوێژکردن جگە لە مۆڵگەی مەڕو حوشتر، ئەوە لە مۆڵگەی مەڕ نوێژ بکەن، بەڵام لە شوێن مۆڵگەی حوشتر نوێژ مەکەن.

٧٦٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صَلُّوا فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ، وَلَا تُصَلُّوا فِي أَعْطَانِ الْإِبِلِ، فَإِنَّهَا خُلِقَتْ مِنَ الشَّيَاطِينِ»[٤].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٦٨، وأبو داود: ٤٧٣، والترمذي: ١٣٢١.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٤٨ و ٣٤٩.

(٤) صحيح. أخرجه النسائي: ٧٣٥.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلی موزەنیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە مۆڵگەی مەڕ نوێژ بکەن، بەڵام لە دەراوو مۆڵگەی حوشتر نوێژ مەکەن، چونکە ئەوان لە شەیتانەکان دروستکراون (چونکە چۆن شەیتانەکان کاریان تێکدانە ئاوەهاش حوشتر هەڵاتن و یاخیبوونی هەیە، جا بۆ ئەوەی لە نوێژدا سەرقاڵ نەبن لە مۆڵگەی حوشتر نوێژ مەکەن).

٧٧٠- عَنْ عَبْدُ الْمَلِكِ بْن رَبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ بْنِ مَعْبَدٍ الْجُهَنِيُّ ﷺ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يُصَلَّى فِي أَعْطَانِ الْإِبِلِ، وَيُصَلَّى فِي مُرَاحِ الْغَنَمِ»[١].

واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی ڕەبیعی کوڕی سەبرەی کوڕی مەعبەدی جوهەنیی ﷺ دەڵێ: باوکم لە باوکییەوە بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دەراوو مۆڵگەی حوشتر نوێژ ناکرێ، بەڵام لە مۆڵگەی مەڕ و بزن نوێژ دەکرێ (ڕێگەپێدراوەو دروستە).

## بابەت: دوعای چوونە ناو مزگەوت

٧٧١- عَنْ فَاطِمَةَ ﷺ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ يَقُولُ: «بِسْمِ اللَّهِ، وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ» وَإِذَا خَرَجَ قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ، وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ فَضْلِكَ»[٢].

واتە: فاتیمە ﷺ کچی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەچووە ناو مزگەوت دەیفەرموو: بە ناوی خوا، سڵاو لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ، خوایە لە گوناهەکانم خۆشبە و دەرگاکانی بەزەیی خۆتم بە ڕوودا بکەیتەوە، وە کاتێکیش لە مزگەوت دەردەچوو دەیفەرموو: بە ناوی خوا، سڵاو لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ، خوایە لە گوناهەکانم خۆش بە، وە دەرگاکانی چاکەی خۆتم بۆ بکەیتەوە.

---

(١) حسن.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٣١٤.

٧٧٢- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ لِيَقُلْ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ»[١].

واتە: ئەبو حومەیدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لەئێوە چووە ناو مزگەوت با سەلام و درود بنێرێ بۆ پێغەمبەر ﷺ، پاشان با بڵێ: خوایە دەرگاکانی ڕەحمەت و بەزەییتم بۆ بکەیتەوە، وە کاتێکیش هاتەدەر لە مزگەوت با بڵێ: خوایە داوای فەزڵ و چاکەی تۆ دەکەم.

٧٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ اعْصِمْنِي مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک هەر یەکێکتان دەچێتە ناو مزگەوت با سڵاو بنێرێ بۆ پێغەمبەر ﷺ وە بڵێ: خوایە دەرگاکانی ڕەحمەت و بەزەییتم بۆ بکەیتەوە، وە کاتێکیش دەرچوو لە مزگەوت با سڵاو بنێرێ بۆ پێغەمبەر ﷺ وە بڵێ: خوایە چەپاڵەم بدە لە شەیتانی دوورخراوە لە بەزەیی خۆت.

## بابەت: ڕۆیشتن بۆ نوێژ

٧٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ، لَا يَنْهَزُهُ إِلَّا الصَّلَاةُ، لَا يُرِيدُ إِلَّا الصَّلَاةَ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً، حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ، كَانَ فِي صَلَاةٍ مَا كَانَتِ الصَّلَاةُ تَحْبِسُهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧١٣، وأبو داود: ٤٦٥، والنسائي: ٧٢٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٧، ومسلم بإثر: ٦٦١، وأبو داود: ٥٥٩، والترمذي: ٦٠٣.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە دەستنوێژێکی جوان و تەواوی شۆرد، پاشان هاتە مزگەوت کە تەنها نوێژ پاڵی ناوە کە لە ماڵ دەربچێ و بە مەبەستی نوێژ هاتبێ، ئەوە بە هەر هەنگاوێک کە دەینێ بەرەو مزگەوت خوا پلەیەکی بەرز دەکاتەوەو گوناهێکی لێ دەسڕێتەوە تاکو دەچێتە ناو مزگەوت، ئنجا کە چووە ناو مزگەوت وەکو ئەوە وایە کە بەردەوام لە نوێژدایە مادام تەنها لەبەر نوێژ ماوەتەوە (وە چاوەڕێی نوێژکردن دەکات).

٧٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَلَا تَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَسْعَوْنَ، وَأْتُوهَا تَمْشُونَ وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک قامەت کرا بۆ نوێژ بە پەلەپەل ڕامەکەن، بەڵکو بە ئاسایی بڕۆن، وە هێمن و لەسەرخۆبن، چەندی فریاکەوتن نوێژەکە بکەن، ئەوەشی کە فریای نەکەوتن تەواوی بکەن (بۆ خۆتان).

٧٧٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يُكَفِّرُ اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَزِيدُ بِهِ فِي الْحَسَنَاتِ؟» قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عِنْدَ الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَى إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: ئایا ڕێنماییتان نەکەم بۆ شتێک کە خوا دەیکاتە کەفارەتی گوناهەکانتان و چاکەکانیشی پێ زیاد دەبێ؟ گوتیان: بـا، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ڕێنمونیمان بکە)، فەرمووی: دەستنوێژ هەڵگرتنێکی باش و تەواو لەکاتی ناخۆشیەکاندا وە زۆر هەنگاونان بەرەو مزگەوتەکان، وە چاوەڕوانکردنی نوێژ لە دوای نوێژ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٦، ومسلم: ٦٠٢، وأبو داود: ٥٧٢ و ٥٧٣، والترمذي: ٣٢٧، والنسائي: ٨٦٢.

(٢) صحيح.

**٧٧٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَلْقَى اللَّهَ غَدًا مُسْلِمًا، فَلْيُحَافِظْ عَلَى هَؤُلَاءِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ حَيْثُ يُنَادَى بِهِنَّ، فَإِنَّهُنَّ مِنْ سُنَنِ الْهُدَى، وَإِنَّ اللَّهَ شَرَعَ لِنَبِيِّكُمْ ﷺ سُنَنَ الْهُدَى، وَلَعَمْرِي، لَوْ أَنَّ كُلَّكُمْ صَلَّى فِي بَيْتِهِ، لَتَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ، وَلَوْ تَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ لَضَلَلْتُمْ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا يَتَخَلَّفُ عَنْهَا إِلَّا مُنَافِقٌ مَعْلُومُ النِّفَاقِ، وَلَقَدْ رَأَيْتُ الرَّجُلَ يُهَادَى بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ حَتَّى يَدْخُلَ فِي الصَّفِّ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ يَتَطَهَّرُ، فَيُحْسِنُ الطُّهُورَ، فَيَعْمِدُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَيُصَلِّي فِيهِ، فَمَا يَخْطُو خَطْوَةً، إِلَّا رَفَعَ اللَّهُ لَهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً»[١].

واته: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: هەر کەسێک خۆشحاڵە بەوەی کە بەیانی بە مسوڵمانی بە خزمەتی خوا بگاتەوە، ئەوە با ئاگای لەو پێنج نوێژە فەرزانە بێ کاتێ بانگیان بۆ دەدرێ، ئەو نوێژانە لە ڕێبازە ڕوون و ڕاستەکەن، وە بێگومان خوا ڕێگای هیدایەت و سەرفرازی بۆ پێغەمبەرەکەتان ﷺ کردوە بە شەریعەت، وە سوێندبێ ئەگەر هەر هەمووتان لە ماڵەوە نوێژ بکەن ئەوە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرەکەتان ﷺ واز لێهێناوە، خۆ ئەگەر وازیشتان لە ڕێبازی پێغەمبەرەکەتان ﷺ هێنا (بێگومان) گومڕادەبن، وە بەڕاستی ئێمە وامان بینیوە کە تەنها ئەو دووڕووانەی کە دیارو ئاشکرابوون دوا دەکەوتن لە نوێژی بە کۆمەڵ، وە پیاوم بینیوە کە دوو پیاوی تر دەچوونە ئەملاولای (ژێر باڵەکانی) تاکو بیهێننە ناو ڕیزی بە کۆمەڵ، وە هیچ پیاوێک نیە دەستنوێژێکی پاک و چاک بگرێ وە بە مەبەستی مزگەوت بچێ و نوێژی پێبکات (ئەوە) هیچ هەنگاوێک نانێ مەگەر بە هۆیەوە خوا پلەیەک بەرزی دەکاتەوە، وە گوناهێکیشی لێ دەسڕێتەوە.

**٧٧٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ إِلَى الصَّلَاةِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِحَقِّ السَّائِلِينَ عَلَيْكَ، وَأَسْأَلُكَ بِحَقِّ مَمْشَايَ هَذَا، فَإِنِّي لَمْ أَخْرُجْ أَشَرًا، وَلَا بَطَرًا، وَلَا رِيَاءً، وَلَا سُمْعَةً، وَخَرَجْتُ اتِّقَاءَ سُخْطِكَ، وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِكَ، فَأَسْأَلُكَ أَنْ تُعِيذَنِي مِنَ النَّارِ، وَأَنْ تَغْفِرَ لِي ذُنُوبِي، إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، أَقْبَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ بِوَجْهِهِ، وَاسْتَغْفَرَ لَهُ سَبْعُونَ أَلْفِ مَلَكٍ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٥٤، وأبو داود: ٥٥٠.

(٢) ضعيف.




واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە ماڵەوە دەرچێت بۆ نوێژ، ئنجا بڵێ: خوایە داوات لێدەکەم بەو شتانەی (مافانەی) کە دەیدەیتە ئەو کەسانەی داوات لێدەکەن، وە داوات لێدەکەم بەو ڕۆیشتنەی خۆم (بۆ نوێژ)، بێگومان من بە خراپەکاری و بە خۆبەگەورە زانین و بە ڕیا (ڕووپامایی) و بۆ ناوبانگ دەرکردن لە ماڵ نەهاتوومەتە دەر، وە بۆ پارێزگاری لە تووڕەیی تۆ و بۆ مەبەستی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی تۆ دەرچووم، جا داوات لێدەکەم کە لە ئاگر بمپارێزی و لە گوناهەکانم خۆشبی، چونکە بەڕاستی هیچ کەس نیە لە گوناهەکان خۆشبێ جگە لە تۆ، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: خوا ڕووی تێدەکات و حەفتا هەزار فریشتە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن.

٧٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَشَّاءُونَ إِلَى الْمَسَاجِدِ فِي الظُّلَمِ، أُولَئِكَ الْخَوَّاضُونَ فِي رَحْمَةِ اللَّهِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوانەی کە عادەتیان گرتووەو زۆر هاموشۆی مزگەوتەکان دەکەن بە تاریکی (نوێژی بەیانی و عیشا دەگرێتەوە) ئا ئەوانە تایبەتکراون کە هەردەم لە ناو بەزەیی خوادان.

٧٨٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لِيَبْشَرِ الْمَشَّاءُونَ فِي الظُّلَمِ، بِنُورٍ تَامٍّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٢].

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مژدەبێ لەوانەی کە هاموشۆی مزگەوت دەکەن لە تاریکیدا بە نورو ڕۆشناییەکی تێر و تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا.

٧٨١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَشِّرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ، بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٦١ من حديث بريدة الأسلمي، والترمذي: ٢٢٣.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مژدە بدە بەوانەی کە زۆر هاموشۆی مزگەوتەکان دەکەن لە تاریکیدا (مژدەیان پێبدە بە) ڕووناکی و ڕۆشناییەکی تێرو تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا.

## بابەت: ئەوەی کە تا دوورتر بێ لە مزگەوت و هاموشۆی مزگەوت بکەی خێر و پاداشتی زیاترە

**٧٨٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأَبْعَدُ فَالْأَبْعَدُ مِنَ الْمَسْجِدِ أَعْظَمُ أَجْرًا»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی کە دوورترینە لە مزگەوت (وە هاموشۆی مزگەوت دەکات) ئەوە پاداشتی زیاترە.

**٧٨٣-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷛، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، بَيْتُهُ أَقْصَى بَيْتٍ بِالْمَدِينَةِ، وَكَانَ لَا تُخْطِئُهُ الصَّلَاةُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَتَوَجَّعْتُ لَهُ، فَقُلْتُ: يَا فُلَانُ لَوْ أَنَّكَ اشْتَرَيْتَ حِمَارًا يَقِيكَ الرَّمَضَ، وَيَرْفَعُكَ مِنَ الْوَقَعِ، وَيَقِيكَ هَوَامَّ الْأَرْضِ فَقَالَ: وَاللَّهِ، مَا أُحِبُّ أَنَّ بَيْتِي بِطُنُبِ بَيْتِ مُحَمَّدٍ ﷺ، قَالَ: فَحَمَلْتُ بِهِ حِمْلًا، حَتَّى أَتَيْتُ بَيْتَ النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَدَعَاهُ، فَسَأَلَهُ، فَذَكَرَ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، وَذَكَرَ أَنَّهُ يَرْجُو فِي أَثَرِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لَكَ مَا احْتَسَبْتَ»[٢].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷛ دەڵێ: پیاوێک هەبوو لە ئەنصار ماڵەکەی لە ئەوپەڕی مەدینە بوو، هیچ نوێژێکی نەدەچوواند لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: هەموو نوێژەکانی لەگەڵ ئەودا دەکرد بە کۆمەڵ)، دەڵێ: منیش بۆی بە پەرۆش بووم، جا پێمگوت: ئەی فڵانە کەس ئەگەر گوێدرێژێکت بکڕیبا (سواری بووبای) بۆ ئەوەی لە گەرمای بەتین پارێزراو بوویتایە، وە لە پێداکەوتنی دارو بەرد لایدابای، وە لە جڕوجانەوەری ناو زەوی بیپاراستبای، (ئەنصارییەکە) گوتی: سوێند بە خوا هیچ حەزناکەم ماڵەکەم بە تەنیشت ماڵەکەی موحەممەد ﷺ بووایە، (ڕاوی فەرموودەکە) دەڵێ: ئەو قسەیە قورس بوو لەسەر دڵم، بۆیە هێنام بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺو ئەوانەم هەموو بۆ گێڕایەوە، ئنجا بانگی کردو پرسیاری لێکرد، پیاوەکەش ئەو شتەی بۆ

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٥٥٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٦٣، وأبو داود: ٥٥٧.

باسکردەوە، وە باسی ئەوەشی کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ کە دەیەوێ بەو هاتنەی لە دوورەوە پاداشت وەربگرێ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەو پاداشتەی کە چاوەڕێی بووی بۆت نووسراوە.

٧٨٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: أَرَادَتْ بَنُو سَلِمَةَ أَنْ يَتَحَوَّلُوا مِنْ دِيَارِهِمْ إِلَى قُرْبِ الْمَسْجِدِ، فَكَرِهَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُعْرُوا الْمَدِينَةَ، فَقَالَ: «يَا بَنِي سَلِمَةَ، أَلَا تَحْتَسِبُونَ آثَارَكُمْ؟» فَأَقَامُوا[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: نەوەکانی سەلەمە ویستیان کە لە دەوری شار ماڵەکانیان بگوازنەوە بۆ نزیک مزگەوت، پێغەمبەریش ﷺ پێی خۆش نەبوو دەوری مەدینە چۆڵ بێت، بۆیە فەرمووی: ئەی نەوەکانی سەلەمە بەتەمای پاداشتی هەنگاوەکانتان نین لای خوا؟ ئیتر ئەوانیش مانەوە (پێشنیارەکەی پێغەمبەریان ﷺ قبووڵ کرد).

٧٨٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَتِ الْأَنْصَارُ بَعِيدَةً مَنَازِلُهُمْ مِنَ الْمَسْجِدِ، فَأَرَادُوا أَنْ يَقْرُبُوا، فَنَزَلَتْ ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ﴿١٢﴾﴾ يس، قَالَ: «فَثَبَتُوا»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ماڵی ئەنصاریەکان لە مزگەوت دوور بوو، ویستیان نزیک بکەونەوە (ماڵیان بێنن بۆ نزیک مزگەوت) ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ﴿١٢﴾﴾ یس، واتە: هەرچی پێشتر کردویانەو شوێنەواری پاش خۆشیان دەنوسین، دەڵێ: ئەوانیش لە شوێنی خۆیان مانەوە.

## بابەت: گەورەیی نوێژی بە جەماعەت (بە کۆمەڵ)

٧٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي جَمَاعَةٍ، تَزِيدُ عَلَى صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ وَصَلَاتِهِ فِي سُوقِهِ بِضْعًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٥ و ٦٥٦ و ١٨٨٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٧، ومسلم: ٦٤٩، والترمذي: ٢١٦، والنسائي: ٨٣٨.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژێک کە پیاو بە کۆمەڵ بیکات، بیست و ئەوەندە جار پلەو پاداشتی زیاترە لەو نوێژەی کە لە ماڵەوە، یان لە بازاڕ بە تەنیا دەیکات.

**بِضْع:** بە مانای: بەینی سێ تاکو نۆ دێت.

**٧٨٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «فَضْلُ الْجَمَاعَةِ عَلَى صَلَاةِ أَحَدِكُمْ وَحْدَهُ خَمْسٌ وَعِشْرُونَ جُزْءًا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەیی و پاداشتی نوێژی بە کۆمەڵ بیست و پێنج جار لە نوێژی هەر یەکێکتان کە بە تەنیا دەیکات زیاترە.

**٧٨٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي جَمَاعَةٍ تَزِيدُ عَلَى صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاو کە نوێژ بە کۆمەڵ دەکات، بیست و پێنج جار پلەو پاداشتی زیاترە لە نوێژێک کە لە ماڵەوە بە تەنیا دەیکات.

**٧٨٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي جَمَاعَةٍ تَفْضُلُ عَلَى صَلَاةِ الرَّجُلِ وَحْدَهُ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی پیاو کە بە کۆمەڵ دەیکات لە چاو ئەو کەسەی کە نوێژ بە تەنیا دەکات بیست و حەوت جار پلەو پاداشتەکەی زیاترە.

**٧٩٠-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي جَمَاعَةٍ، تَزِيدُ عَلَى صَلَاةِ الرَّجُلِ وَحْدَهُ أَرْبَعًا وَعِشْرِينَ، أَوْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٧، ومسلم: ٦٤٩، والترمذي: ٢١٦، والنسائي: ٨٣٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٦، وأبو داود: ٥٦٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٥، ومسلم: ٦٥٠، والترمذي: ٢١٥، والنسائي: ٨٣٧.

(٤) صحيح دون قوله: «أَوْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً». أخرجه أبو داود: ٥٥٤، والنسائي: ٨٤٣ كلاهما مطولًا.

واتە: ثوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی پیاوێک کە بە کۆمەڵ نوێژەکەی دەکات لە چاو ئەو کەسەی کە بە تەنیا نوێژ دەکات پلەو پاداشتەکەی بیست و چوار، یان بیست و پێنج، جار زیاترە.

## بابەت: هەڕەشەکردن لە دواکەوتن لە نوێژی بە کۆمەڵ

٧٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلَاةِ، فَتُقَامَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا، فَيُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، ثُمَّ أَنْطَلِقَ بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إِلَى قَوْمٍ لَا يَشْهَدُونَ الصَّلَاةَ، فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ بِالنَّارِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاتە دڵمەوە کە فەرمان بکەم بە قامەت کردن بۆ نوێژ و پیاوێک ڕاسپێرم کە پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات، پاشان هەندێ پیاو بە دەستێک دارەوە لەگەڵ خۆم ببەم و بچم خانووەکانیان بەسەر ئەو کەسانەدا بسوتێنم کە ئامادەی نوێژی بە کۆمەڵ نابن.

٧٩٢- عَنِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنِّي كَبِيرٌ ضَرِيرٌ، شَاسِعُ الدَّارِ وَلَيْسَ لِي قَائِدٌ يُلَاوِمُنِي، فَهَلْ تَجِدُ لِي مِنْ رُخْصَةٍ قَالَ: «هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «مَا أَجِدُ لَكَ رُخْصَةً»[2].

واتە: ئیبنو ئوممو مەکتوم ﷺ دەڵێ: بە پێغەمبەرم ﷺ گوت: من بەساڵاچووم و نابیناشم و ماڵیشم دوورە، وە هیچ کەسیشم نیە هاوکاریم بکات (بۆ مزگەوت) ئایا هیچ مۆڵەتێکم بۆ هەیە؟ فەرمووی: ئایا گوێت لە دەنگی بانگە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: کەواتە هیچ مۆڵەتێکت بۆ نیە.

٧٩٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَمْ يَأْتِهِ، فَلَا صَلَاةَ لَهُ، إِلَّا مِنْ عُذْرٍ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٤، ومسلم: ٦٥١، وأبو داود: ٥٤٨ و ٥٤٩، والترمذي: ٢١٧، والنسائي: ٨٤٨.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٥٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٥١.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک گوێی لە دەنگی بانگ بێت و نەیەت بۆ نوێژ (ی بە کۆمەڵ) نوێژەکەی تەواو نیە، مەگەر بیانوویەکی (شەرعی) هەبێ.

**٧٩٤- عَنِ الْحَكَمِ بْنِ مِينَاءَ ﷺ، قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ، وَابْنُ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُمَا سَمِعَا النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: عَلَى أَعْوَادِهِ «لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجَمَاعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ»[١].**

واتە: حەکەمی کوڕی میناء ﷺ دەڵێ: ئیبنو عەبباس و ئیبنو عومەر ﷺ بۆیان گێڕامەوە کە گوێیان لە پێغەمبەر ﷺ بووە لەسەر مینبەرەکەی دەیفەرموو: خەڵکی یان دەبێ وازبێنن لە نەکردنی نوێژی بە کۆمەڵ، یان خوا دڵیان مۆر دەکات، پاشان دەبنە یەکێک لەوانەی کە بێئاگان (لە دین).

**٧٩٥- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَنْتَهِيَنَّ رِجَالٌ عَنْ تَرْكِ الْجَمَاعَةِ، أَوْ لَأُحَرِّقَنَّ بُيُوتَهُمْ»[٢].**

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو پیاوانەی وازیان لە نوێژی بە کۆمەڵ هێناوە، یان دەبێ کۆتایی بێنن بەو وازهێنانە، یان ماڵەکانیان دەسوتێنم.

## بابەت: نوێژی عیشا و بەیانی بە کۆمەڵ

**٧٩٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي صَلَاةِ الْعِشَاءِ، وَصَلَاةِ الْفَجْرِ، لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا»[٣].**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵکی گەورەیی و پاداشتی نوێژی خەوتنان و بەیانیان بزانیبایە، ئەوە ئەگەر بە گاگۆڵکەش بووایە دەهاتن بۆ ئەنجامدانی.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٦٥، والنسائي: ١٣٧٠.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.




٧٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَثْقَلَ الصَّلَاةِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ صَلَاةُ الْعِشَاءِ، وَصَلَاةُ الْفَجْرِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان قورسترین نوێژ لەسەر دوو ڕووەکان نوێژی خەوتنان و نوێژی بەیانییە، خۆ ئەگەر بزانن چ پلەو پاداشتێک لەو دوو نوێژەدا هەیە، ئەوە ئەگەر بە گاگۆڵکەش بووایە دەهاتن بۆ کردنی ئەو دوو نوێژە بە کۆمەڵ.

٧٩٨- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: «مَنْ صَلَّى فِي مَسْجِدٍ جَمَاعَةً أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، لَا تَفُوتُهُ الرَّكْعَةُ الْأُولَى مِنْ صَلَاةِ الْعِشَاءِ، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِهَا عِتْقاً مِنَ النَّارِ»[٢].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێک چل شەو نوێژی خەوتنان لە مزگەوتدا بە کۆمەڵ بکات و ڕکاتی یەکەمی نەفەوتێ بە کۆمەڵ، ئەوە خوا بەهۆیەوە ئازاد بوونی لە ئاگر بۆ دەنوسێ.

## بابەت: پابەندبون بە مزگەوتەوە، وە چاوەڕوانی کردنی نوێژ

٧٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ، كَانَ فِي صَلَاةٍ، مَا كَانَتِ الصَّلَاةُ تَحْبِسُهُ، وَالْمَلَائِكَةُ يُصَلُّونَ عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مَجْلِسِهِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ، يَقُولُونَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، اللَّهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ، مَا لَمْ يُحْدِثْ فِيهِ، مَا لَمْ يُؤْذِ فِيهِ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان کاتێک هەر یەکێک لە ئێوە چووە ناو مزگەوت، ئەوە وەک ئەوە وایە کە لە نوێژدابێ مادام نوێژ ئەو کەسەی هێشتبێتەوە لە مزگەوتدا (واتە: هیچ ئیشی دیکەی نەبێ جگە لە چاوەڕوانی نوێژ)و، فریشتەکان دوعای بۆ دەکەن مادام لەو شوێنە دابێ کە نوێژی تێدا کردوە، دەڵێن: خوایە لێی خۆشبە، خوایە لەگەڵی بە بەزەیی بە، خوایە تۆبەی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٧، ومسلم: ٦٥١/٢٥٢.

(٢) حسن دون قوله: «لاَ تَفُوتُهُ الرَّكْعَةُ الأُولَى مِنْ صَلَاةِ الْعِشَاءِ».

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٦ و ٤٤٥، ومسلم بإثر: ٦٤٩/٢٧٤، وأبو داود: ٤٦٩ و ٤٧٠، والترمذي: ٣٣٠، والنسائي: ٧٣٣.

قبووڵ بكە (هەر بەو شێوە دوعای بۆ دەكەن، مادام ئەو ئەو كەسە) بێ دەستنوێژ نەبێ و، كەسیش ئەزیەت نەدات.

٨٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا تَوَطَّنَ رَجُلٌ مُسْلِمٌ الْمَسَاجِدَ لِلصَّلَاةِ وَالذِّكْرِ، إِلَّا تَبَشْبَشَ اللَّهُ لَهُ، كَمَا يَتَبَشْبَشُ أَهْلُ الْغَائِبِ بِغَائِبِهِمْ إِذَا قَدِمَ عَلَيْهِمْ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێک مسوڵمان پابەندی مزگەوت بێ و زۆر لە مزگەوت بمێنێتەوە بۆ نوێژو یادی خوا، ئەوە خوا بە خۆشییەوە ڕێزی لێدەگرێ و لێی ڕازی دەبێ، وەكو چۆن ئەگەر كەسێک ون بێ و دواتر بێتەوە ناو خزم و خێشی خۆی، (واتە: ئەو كەسە ونبووە چەند ڕێزی لێدەگیرێ و پێی دڵخۆش دەبن كاتێک دەگەڕێتەوە).

٨٠١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْمَغْرِبَ، فَرَجَعَ مَنْ رَجَعَ، وَعَقَّبَ مَنْ عَقَّبَ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُسْرِعاً، قَدْ حَفَزَهُ النَّفَسُ، وَقَدْ حَسَرَ عَنْ رُكْبَتَيْهِ، فَقَالَ: أَبْشِرُوا، هَذَا رَبُّكُمْ قَدْ فَتَحَ بَابًا مِنْ أَبْوَابِ السَّمَاءِ، يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلَائِكَةَ، يَقُولُ: انْظُرُوا إِلَى عِبَادِي قَدْ قَضَوْا فَرِيضَةً، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَ أُخْرَى»[2].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی شێوانمان كرد، پاشان ئەوەی ڕۆیشتەوە ڕۆیشتەوە، ئەوەشی كە مایەوە مایەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێرایی هات، هەناسەكانی بە خێرایی لێدەدا و ئەژنۆكانی دەركەوتن، جا فەرمووی: موژدەتان لێبێ ئەوە خوای پەروەردگارتان دەرگایەک لە دەرگاكانی ئاسمانی كردۆتەوە لای فریشتەكان ڕاتاندەنوێنێ و شانازیتان پێوە دەكات، دەفەرمووێ: تەماشای بەندەكانم بكەن یەكێک لە (نوێژە) فەرزەكانیان جێبەجێ كردوە و ئەوان چاوەڕێی فەرزێكی دیكە دەكەن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

٨٠٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَعْتَادُ الْمَسَاجِدَ، فَاشْهَدُوا لَهُ بِالْإِيمَانِ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ ﴿١٨﴾﴾ التوبة، الْآيَةَ[1].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێکتان بینی هۆگری مزگەوتە، ئەوە شایەدی بۆ بدەن کە بڕوادارە، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ ﴿١٨﴾﴾ التوبة، واتە: بەڕاستی مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکاتەوە کەسێک کە بڕوای هێنابێت بە خوا.

* * *

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٦١٧ و ٣٠٩٣.

## بابەت: دەسپێکی نوێژ

٨٠٣- عَنْ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حُمَيْدٍ السَّاعِدِيَّ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ، اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ»(١).

واتە: موحەممەدی کوڕی عەمڕی کوڕی عەتاء دەڵێ: گوێم لە ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ بوو دەیگوت: هەر کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسابایە بۆ نوێژ، ئەوە ڕووی دەکردە قیبلە، وە دەستەکانی بەرز دەکردەوەو دەیفەرموو: «اللَّهُ أَكْبَر».

٨٠٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَسْتَفْتِحُ صَلَاتَهُ يَقُولُ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ»(٢).

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستپێکی نوێژی بەوە بوو کە دەیفەرموو: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ»، واتە: پاک و بێگەردی بۆ تۆ خودایە، وە سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ناوت بەرزو پیرۆزە، وە خاوەنی بەرزی و شکۆی، وە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە تۆ.

٨٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِذَا كَبَّرَ سَكَتَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ، قَالَ: فَقُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، أَرَأَيْتَ سُكُوتَكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ، فَأَخْبِرْنِي مَا تَقُولُ، قَالَ: أَقُولُ: اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ، كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ، كَالثَّوْبِ الْأَبْيَضِ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ»(٣).

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دادەبەست، لە نێوانی «اللَّهُ أَكْبَر»ـی نوێژدابەستن و خوێندنی سووڕەتی فاتیحە بێدەنگ دەبوو، (ئەبو هوڕەیرە ﷺ) دەڵێ: گوتم: بە دایک و باوکەوە بە فیداتبم ئەگەر پێت گوتبام لە نێوانی «اللَّهُ أَكْبَر»ـی نوێژدابەستن و خوێندنی سووڕەتی فاتیحە چی دەڵێی؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: دەڵێم: خوایە بە ئەندازەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا نێوان بخە بەینی من و

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٧٧٥، والترمذي: ٣٤٢، والنسائي: ٨٩٩ و ٩٠٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٤٤، ومسلم: ٥٩٨، وأبو داود: ٧٨١، والنسائي: ٦٠ و ٣٣٤ و ٨٩٤ و ٨٩٥.




گوناهەکانم، خودایە لە گوناهەکانم پاکم بکەوە هەروەک پاکبوونەوەی پۆشاکی سپی لە چڵک و پیسی، خودایە لە گوناهەکانم دامشۆرە بە ئاو و بەفر و تەرزە (مەبەست پێی: لێخۆشبونە لە تەواوی گوناهەکان بە هەموو جۆرەکانی بەزەیی).

٨٠٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ قَالَ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، تَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک دەستی دەکرد بە نوێژ، دەیفەرموو: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، تَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ»، واتە: پاک و بێگەردی بۆ تۆ خودایە، وە سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ناوت بەرزو پیرۆزە، وە خاوەنی بەرزی و شکۆی، وە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە تۆ.

## بابەت: گوتنی: "أعوذ بالله من الشيطان الرجيم" لە نوێژدا

٨٠٧- عَنِ ابْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ، قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا» ثَلَاثًا، «الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا» ثَلَاثًا، «سُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ، وَنَفْخِهِ، وَنَفْثِهِ» قَالَ عَمْرٌو: هَمْزُهُ: الْمُوتَةُ، وَنَفْثُهُ: الشِّعْرُ، وَنَفْخُهُ: الْكِبْرُ[2].

واتە: ئیبنو جوبەیری کوڕی موتعیم لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کاتێ چوویە ناو نوێژ سێ جار فەرمووی: «اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا»، واتە: خوا لە هەموو شتێک گەورەترە، سێ جار فەرمووی: «الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا»، سوپاس و ستایشی زۆر و بێپایەن بۆ خوا، سێ جار فەرمووی: «سُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا»، واتە: خوا بە پاک و بێگەرد دەگرین بەیانیان و ئێواران (واتە: هەموو کات)، پاشان فەرمووی: خودایە پەنات پێدەگرم لە شەیتانی نەفرین لێکراو و دوور خراوە لە ڕەحمەتی خوا، لە شێتی و کابوس و هاندان بۆ گوتنی شیعری خراپ و خۆبەزل زانین. عەمرِ دەڵێ: «همزه» واتە: شێتی و کابوس. «نفثه» واتە: هاندان بۆ گوتنی بۆ شیعری خراپ. «نفخه» واتە: خۆبەزل زانین.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٧٧٦، والترمذي: ٣٤٣.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٧٦٤ و ٧٦٥.




٨٠٨- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، وَهَمْزِهِ، وَنَفْخِهِ، وَنَفْثِهِ» قَالَ: هَمْزُهُ: الْمُوتَةُ، وَنَفْثُهُ: الشِّعْرُ، وَنَفْخُهُ: الْكِبْرُ[1].

واتە: ئیبنو مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە شەیتانی نەفرین لێکراو و دوور خراوە لە بەزەیی تۆ، لە شێتی و خۆبەزل زانین و هاندان بۆ گوتنی شیعری خراپ. ڕاوی دەڵێ: «همزه» واتە: شێتی و کابوس. «نفثه» واتە: هاندان بۆ گوتنی بۆ شیعری خراپ. «نفخه» واتە: خۆبەزل زانین.

## بابەت: دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لە نوێژدا

٨٠٩- عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هُلْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يَؤُمُّنَا فَيَأْخُذُ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ»[2].

واتە: قەبیصەی کوڕی هولب لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی بۆ دەکردین، جا دەستی چەپی بە دەستی ڕاستی دەگرت.

٨١٠- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ «يُصَلِّي، فَأَخَذَ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ»[3].

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی نوێژی دەکرد، جا دەستی چەپی بە دەستی ڕاستی گرتبوو.

٨١١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا وَاضِعٌ يَدِي الْيُسْرَى عَلَى الْيُمْنَى «فَأَخَذَ بِيَدِي الْيُمْنَى فَوَضَعَهَا عَلَى الْيُسْرَى»[4].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە لامدا تێپەڕی، وە من لەوکاتەدا دەستی چەپم لەسەر دەستی ڕاستم دانابوو، ئنجا (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەستی ڕاستمی گرت و لەسەر دەستی چەپمی دانا.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٥٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٠١، والنسائي: ٨٨٧.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٧٥٥، والنسائي: ٨٨٨.

## بابەت: دەسپێكی خوێندنی فاتیحە

٨١٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَفْتَتِحُ الْقِرَاءَةَ بِـ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة»(١).

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة، دەستی بە خوێندنی فاتیحە دەكرد (لە نوێژدا).

٨١٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ يَفْتَتِحُونَ الْقِرَاءَةَ بِـ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة»(٢).

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیک ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺو، ئەبو بەكرو، عومەریش بە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة، دەستیان دەكرد بە خوێندنی فاتیحە.

٨١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يَفْتَتِحُ الْقِرَاءَةَ بِـ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة، دەستی دەكرد بە خوێندنی فاتیحە.

٨١٥- عَنِ ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُغَفَّلِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: وَقَلَّمَا رَأَيْتُ رَجُلًا أَشَدَّ عَلَيْهِ فِي الْإِسْلَامِ حَدَثًا مِنْهُ، فَسَمِعَنِي وَأَنَا أَقْرَأُ ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾ الفاتحة، فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ إِيَّاكَ وَالْحَدَثَ، «فَإِنِّي صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ، وَمَعَ عُمَرَ، وَمَعَ عُثْمَانَ، فَلَمْ أَسْمَعْ رَجُلًا مِنْهُمْ يَقُولُهُ، فَإِذَا قَرَأْتَ، فَقُلِ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٩٨، وأبو داود: ٧٨٣ أخرجاه مطولًا.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٤٣، ومسلم: ٣٩٩، وأبو داود: ٧٨٢، والترمذي: ٢٤٦، والنسائي: ٩٠٢ و ٩٠٣ و ٩٠٦ و ٩٠٧.

(٣) حسن لغيره.

(٤) ضعيف والمرفوع منه صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٤٤، والنسائي: ٩٠٨.




واتە: ئیبنو عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: کەم کەسم بینیوە وەکو ئەو (واتە: وەکو عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل) توندبێ لەسەر شتی داهێنراو و زیادە لە ئیسلامدا، بۆیە جارێکیان گوێی لە من بوو کاتێک فاتیحەم خوێند (لە پێش نوێژیدا) بە: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ①﴾ الفاتحة، دەستم پێکرد، ئنجا گوتی: کوڕی خۆم وریابە لە شتی داهێنراو و خۆتی لێ بپارێزە، بەڕاستی من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺو، لەگەڵ ئەبو بەکرو، لەگەڵ عومەرو، لەگەڵ عوسمان نوێژم کردوە، لە هیچ یەکێک لەو پیاوانە گوێم لێ نەبووە کە بە ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ①﴾ دەستی پێبکەن و بیڵێن، هەرکات ویستت فاتیحە بخوێنی بڵێ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ②﴾ الفاتحة.

## بابەت: خوێندنی قورئان لە نوێژی بەیانیدا

٨١٦- عَنْ قُطْبَةَ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ «يَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ ﴿وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ⑩﴾ ق»[1].

واتە: قوتبەی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە لە نوێژی بەیانیدا ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ⑩﴾ ق، واتە: هەروەها دارخورمای بەرزو بڵند بە هێشووی تێک پەستراوەوە.

٨١٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ ﷺ، قَالَ: «صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَهُوَ يَقْرَأُ فِي الْفَجْرِ، كَأَنِّي أَسْمَعُ قِرَاءَتَهُ: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ ⑮ الْجَوَارِ الْكُنَّسِ ⑯﴾ التكوير»[2].

واتە: عەمری کوڕی حورەیس ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژم کردوە، لە نوێژی بەیانیدا قورئانی دەخوێند وەکو ئەوەی گوێم لە قورئان خوێندنەکەی بێ کە ئەو ئایەتەی دەخوێند: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ ⑮ الْجَوَارِ الْكُنَّسِ ⑯﴾ التكوير، واتە: سوێند بەو (ئەستێرە گەڕۆکانەی) دەگەڕێنەوە ⑮ بەو ئەستێرانەی کە پەنا دەگرن ودیار نامێنن ⑯.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٥٧، والترمذي: ٣٠٦، والنسائي: ٩٥٠.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٨١٧، والنسائي: ٩٥١. وانظر مسلم: ٤٥٦.

٨١٨- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ» يَقْرَأُ فِي الْفَجْرِ مَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ»[١].

واتە: ئەبو بەرزە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانیدا لە نێوان شەست بۆ سەد ئایەتی دەخوێند.

٨١٩- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُصَلِّي بِنَا، فَيُطِيلُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مِنَ الظُّهْرِ، وَيُقْصِرُ فِي الثَّانِيَةِ، وَكَذَلِكَ فِي الصُّبْحِ»[٢].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆمان دەکرد، جا لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ درێژەی بە خوێندنی قوڕئان دەدا، وە لە ڕکاتی دووەمدا کورتی دەکردەوە، بە هەمان شێوەش بۆ نوێژی بەیانی (واتە: لە نوێژی بەیانیشدا ڕکاتی یەکەمی درێژتر بوو لە ڕکاتی دووەم).

٨٢٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ قَالَ: «قَرَأَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ: بِالْمُؤْمِنُونَ فَلَمَّا أَتَى عَلَى ذِكْرِ عِيسَى، أَصَابَتْهُ شَرْقَةٌ، فَرَكَعَ» يَعْنِي سَعْلَةً[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانیدا سووڕەتی «المؤمنون»ـی خوێند، جا کاتێ گەیشتە باسی عیسا ﷺ کۆکەی هات و تەواوی نەکرد، یەکسەر چوو بۆ ڕکووع.

## بابەت: خوێندنی قورئان لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا

٨٢١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: ﴿ الٓمٓ ① تَنزِيلُ ② ﴾ السَّجْدَةَ، وَ ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ ① ﴾»[٤].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا سووڕەتی: ﴿ الٓمٓ ① تَنزِيلُ ② ﴾ السَّجْدَةَ، و ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ ① ﴾ـی دەخوێند. (واتە: سووڕەتەکانی: السجدة و الإنسان).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤١، ومسلم: ٤٦١، وأبو داود: ٣٩٨، والنسائي: ٩٤٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥٩، ومسلم: ٤٥١، وأبو داود: ٧٩٨ و ٩٧٤_٩٧٨.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٥٥، وأبو داود: ٦٤٩، والنسائي: ١٠٠٧.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٧٩، وأبو داود: ١٠٧٤ و ١٠٧٥، والترمذي: ٥٢٠، والنسائي: ٩٥٦ و ١٤٢١.

٨٢٢- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: الم تَنْزِيلُ، وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ»[1].

واتە: موصعەبی کوڕی سەعد لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا سووڕەتی: «الم تَنْزِيلُ السَّجْدَةَ» و «وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ»ـی دەخوێند.

٨٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: ﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢ ﴾ وَ ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ۝١ ﴾[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا سووڕەتی: ﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢ ﴾ و ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ۝١ ﴾ی دەخوێند.

٨٢٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: ﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢ ﴾ وَ ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ۝١ ﴾، قَالَ إِسْحَاقُ: هَكَذَا حَدَّثَنَا عَمْرٌو، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، لَا أَشُكُّ فِيهِ[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا سووڕەتی: ﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢ ﴾ و ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ۝١ ﴾ـی دەخوێند. ئیسحاق دەڵێ: هیچ گومانم نیە (زۆر دڵنیام) لەوەی کە عەمرٍ لە عەبدوڵڵاوە بە هەمان شێوە بۆی گێڕاینەوە.

## بابەت: خوێندنی قورئان لە نوێژی نیوەڕۆ و عەصردا

٨٢٥- عَنْ قَزَعَةَ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: لَيْسَ لَكَ فِي ذَلِكَ خَيْرٌ، قُلْتُ: بَيِّنْ، رَحِمَكَ اللَّهُ، قَالَ: «كَانَتِ الصَّلَاةُ تُقَامُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ، فَيَخْرُجُ أَحَدُنَا إِلَى الْبَقِيعِ، فَيَقْضِي حَاجَتَهُ، فَيَجِيءُ فَيَتَوَضَّأُ، فَيَجِدُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مِنَ الظُّهْرِ»[4].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٩١ و ١٠٦٨، ومسلم: ٨٨٠، والنسائي: ٩٥٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٥٤، والنسائي: ٩٧٣.

واتە: قەزەعە ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو سەعیدی خودری کرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش گوتی: (لە وەڵامی ئەو پرسیارە) هیچ چاکەیەکت بۆ نیە (چونکە دەیزانی کە پێشی بڵێ ناتوانێ جێبەجێی بکات، بۆیە گوتی خێری لێناکەی)، قەزەعە دەڵێ: گوتم: بۆم ڕوونکەوە ڕەحمەتی خوات لێبێ، گوتی: قامەتی نوێژ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرا بۆ نوێژی نیوەڕۆ، یەکێک لە ئێمە (دەیتوانی) دەربچێ و بڕوات بۆ بەقیع لەوێ پێویستیەکەی جێبەجێ بکات و بێتەوە دەستنوێژ بگرێ، ئەو جاریش دەیبینی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ دایە.

**تێبینی:** مەبەست لەو درێژکردنەوەی نوێژە تەنیا ڕکاتی یەکەمە، ئەویش بە مەبەستی ئەوەی خەڵک بە نوێژی بە کۆمەڵ ڕابگەن، بۆیە ڕکاتی یەکەمی نوێژەکەی درێژ دەکردەوە، ئەمە تێگەیشتن و قسەی هەندێک لە هاوەڵانە، هەندێکیش گوتوویانە ڕکاتی یەکەم و دووەمی درێژ دەکردەوە ﷺ.

**٨٢٦-** عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ لِخَبَّابٍ: بِأَيِّ شَيْءٍ كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ قِرَاءَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ؟ قَالَ: بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ»[1].

واتە: ئەبو مەعمەر ﷺ دەڵێ: بە خەببابم گوت: بە چی شتێک دەتانزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەصردا قوڕئان دەخوێنێ؟ گوتی: بە جووڵە جووڵی ڕیشی.

**٨٢٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَشْبَهَ صَلَاةً بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مِنْ فُلَانٍ، قَالَ: وَكَانَ يُطِيلُ الْأُولَيَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ، وَيُخَفِّفُ الْأُخْرَيَيْنِ، وَيُخَفِّفُ الْعَصْرَ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: هیچ کەسێکم نەبینیوە لە نوێژکردنەکەی هێندە بە پێغەمبەری خوا ﷺ بچێ وەکو فلانە کەس، کە دوو ڕکاتی یەکەمی لە نوێژی نیوەڕۆ درێژ دەکردەوە، وە دوو ڕکاتەی کۆتایی کەمتر، یان کورتتر دەکردەوە، هەروەها نوێژی عەصریشی کورت و پوخت بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٤٦ و ٧٦٠ و ٧٦١، وأبو داود: ٨٠١.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٩٨٢ و ٩٨٣.

٨٢٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: اجْتَمَعَ ثَلَاثُونَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: تَعَالَوْا حَتَّى نَقِيسَ قِرَاءَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فِيمَا لَمْ يَجْهَرْ فِيهِ مِنَ الصَّلَاةِ، فَمَا اخْتَلَفَ مِنْهُمْ رَجُلَانِ، فَقَاسُوا قِرَاءَتَهُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مِنَ الظُّهْرِ، بِقَدْرِ ثَلَاثِينَ آيَةً، وَفِي الرَّكْعَةِ الْأُخْرَى قَدْرَ النِّصْفِ مِنْ ذَلِكَ، وَقَاسُوا ذَلِكَ فِي الْعَصْرِ، عَلَى قَدْرِ النِّصْفِ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ الْأُخْرَيَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: سی کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەوە و گوتیان: وەرن با ئەندازەی قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری بکەین لەو نوێژانەدا کە قورئان خوێندن تێیاندا بە دەنگی بەرز نیە (نیوەڕۆ و عەصر)، لە ناو ئەوانەدا دوو کەسیش ڕاجیاییان نەبوو، ئەندازەی قورئان خوێندنیان لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ بە ئەندازەی سی ئایەت دیاری کرد، وە لە ڕکاتەکەی تردا بە ئەندازەی نیوەی ئەوە، وە بە هەمان شێوە ئەندازەی قورئان خوێندنیان بۆ نوێژی عەصر بە ئەندازەی نیوەی دوو ڕکاتی کۆتایی نیوەڕۆ خەمڵاند.

## بابەت: بە دەنگی بەرز خوێندنی ئایەتەکان هەندێ جار لە نوێژی نیوەڕۆ و عەصردا

٨٢٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ بِنَا فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ مِنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ، وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ أَحْيَانًا»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا قورئانی بۆ دەخوێندین، وە هەندێ جار گوێبیستی ئایەتەکان دەکردین.

٨٣٠- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِنَا الظُّهْرَ، فَنَسْمَعُ مِنْهُ الْآيَةَ بَعْدَ الْآيَاتِ، مِنْ سُورَةِ لُقْمَانَ، وَالذَّارِيَاتِ»[3].

---

(١) ضعيف لكن المرفوع منه له طريق آخر عند مسلم ٤٥٢ دون لفظة القياس.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥٩، ومسلم: ٤٥١، وأبو داود: ٧٩٨ و ٧٩٩، والنسائي: ٩٧٤_٩٨٧.

(٣) ضعيف. أخرجه النسائي: ٩٧١.

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ دەکردین، ئێمەش ئایەت لە دوای ئایەت گوێ بیستی دەبووین لە سوورەتی «لقمان» و «الذاريات».

## بابەت: قورئان خوێندن لە نوێژی شێواندا

**٨٣١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنْ أُمِّهِ - قَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ هِيَ لُبَابَةُ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ لە دایکییەوە - ئەبو بەکری کوڕی شەیبە دەڵێ: (ناوی دایکی) لوبابە بووە - دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نوێژی شێواندا سوورەتی «بِالْمُرْسَلَاتِ عُرْفَاً»ی خوێند.

**٨٣٢-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ «يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ» قَالَ جُبَيْرٌ فِي غَيْرِ هَذَا الْحَدِيثِ: فَلَمَّا سَمِعْتُهُ يَقْرَأُ: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الطور، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ الطور، كَادَ قَلْبِي يَطِيرُ[2].

واتە: موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ لە باوکییەوە، دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە لە نوێژی شێواندا سوورەتی «الطور»ـی دەخوێند. جوبەیر جگە لەم فەرموودەیەدا، دەڵێ: کاتێک گوێم لێبوو کە (پێغەمبەر ﷺ) ئەم ئایەتانەی دەخوێند: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الطور، واتە: ئایا ئەوان (بێ خالقێک) لە خۆیانەوە دروست بوون یان خۆیان (خالق) و دروستکەری خۆیانن، تا دەگاتە ئەوەی: ﴿ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ الطور، واتە: جا (ئەگەر ڕاست ئەکەن) با گوێ گرەکەیان بەڵگەیەکی ڕوون بهێنێت. نزیک بوو (خەریک بوو) کە دڵم بفڕێ (لەبەر ڕوون و ئاشکرایی هەق و دەرکەوتنی باتڵ بۆم).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٦٣ و ٤٤٢٩، ومسلم: ٤٦٢، وأبو داود: ٨١٠، والترمذي: ٣٠٨، والنسائي: ٩٨٥ و ٩٨٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٦٥، ومسلم: ٤٦٣، وأبو داود: ٨١١، والنسائي: ٩٨٧.




**٨٣٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی شێواندا ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ـی دەخوێند. (واتە: سوورەتی الكافرون و الإخلاص).

## بابەت: قورئان خوێندن لە نوێژی خەوتناندا

**٨٣٤-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁، أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ، قَالَ: فَسَمِعْتُهُ «يَقْرَأُ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ»[2].

واتە: بەرائی کوڕی عازیب ﵁ کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی خەوتنانی کردوە دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: گوێ بیستی (پێغەمبەری خوا ﷺ) بووم کە سوورەتی «التين»ـی دەخوێند.

**٨٣٥-** عَنِ الْبَرَاءِ ﵁، مِثْلَهُ قَالَ: فَمَا سَمِعْتُ إِنْسَانًا أَحْسَنَ صَوْتًا، - أَوْ قِرَاءَةً مِنْهُ -[3].

واتە: بەڕاء ﵁ بەهەمان شێوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوێبیستی هیچ مرۆڤێک نەبووم کە دەنگی، یان خوێندنەوەی لەو (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ) جوانتر بووبێ.

**٨٣٦-** عَنْ جَابِرٍ ﵁، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ صَلَّى بِأَصْحَابِهِ الْعِشَاءَ، فَطَوَّلَ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «اقْرَأْ بِالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ۝١﴾ وَ ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١﴾»[4].

---

(١) شاذ والمحفوظ أنه كان يقرأ بهما في سنة المغرب.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٦٧، ومسلم: ٤٦٤، وأبو داود: ١٢٢١، والترمذي: ٣١٠، والنسائي: ١٠٠٠ و ١٠٠١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٦٧، ومسلم: ٤٦٤، وأبو داود: ١٢٢١، والترمذي: ٣١٠، والنسائي: ١٠٠٠ و ١٠٠١.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٠ و ٦١٠٦، ومسلم: ٤٦٥، وأبو داود: ٧٩٠، والنسائي: ٩٨٤ و٩٩٧ و ٩٩٨.

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە موعازی کوڕی جەبەل نوێژی خەوتنانی بۆ هاوەڵانی کرد، لەسەری درێژکردنەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوورەتی ﴿ وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ۝١ ﴾ وە ﴿ سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١ ﴾ وە ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ۝١ ﴾ وە ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ ﴾ بخوێنە.

## بابەت: قورئان خوێندن لە دوای ئیمام (لە نوێژدا)

٨٣٧- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ»[١].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە نوێژدا فاتیحە نەخوێنێ نوێژەکەی بەرناکەوێ.

٨٣٨- عَنْ أَنَّ أَبَا السَّائِبِ، أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى صَلَاةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ، فَهِيَ خِدَاجٌ غَيْرُ تَمَامٍ» فَقُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، فَإِنِّي أَكُونُ أَحْيَانًا وَرَاءَ الْإِمَامِ، فَغَمَزَ ذِرَاعِي وَقَالَ: يَا فَارِسِيُّ، اقْرَأْ بِهَا فِي نَفْسِكَ[٢].

واتە: ئەبو سائیب دەگێڕێتەوە کە گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بووە کە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژ بکات و سوورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێ، ئەوە نوێژەکەی کەموکورەو تەواو نیە، ئەبو سائیب دەڵێ: گوتم: ئەی ئەبو هورەیرە! من هەندێ جار لە دوای ئیمامم چۆن بیخوێنم؟ ئەویش باسکی گرتم و گوتی: ئەی فارسی بە هێواشی و نهێنی بۆ خۆتی بخوێنە.

٨٣٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بِالْحَمْدُ لِلَّهِ وَسُورَةٍ، فِي فَرِيضَةٍ أَوْ غَيْرِهَا»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥٦، ومسلم: ٣٩٤، وأبو داود: ٨٢٢ و ٨٢٣، والترمذي: ٢٤٧ و ٣١١، والنسائي: ٩١٠ و ٩١١ و ٩٢٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٩٥، وأبو داود: ٨٢١، والترمذي: ٢٩٥٣، والنسائي: ٩٠٩.

(٣) صحيح لبغره. أخرجه الترمذي: ٢٣٨.




واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە هەر ڕکاتێکدا سوورەتی فاتیحە نەخوێنێ لەگەڵ سوورەتێکی دیکەدا نوێژەکەی تەواو نیە، جا چ فەرز، بێ یان جگە لە فەرز بێ (واتە سوننەت).

٨٤٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّ صَلَاةٍ لَا يُقْرَأُ فِيهَا بِأُمِّ الْكِتَابِ فَهِيَ خِدَاجٌ»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر نوێژێک سوورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنرێ، نوێژێکی ناتەواوە.

٨٤١- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّ صَلَاةٍ لَا يُقْرَأُ فِيهَا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فَهِيَ خِدَاجٌ، فَهِيَ خِدَاجٌ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب ﷺ لە باوکییەوە، لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر نوێژێک کە سوورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنرێ، ئەو نوێژە ناتەواوە، ناتەواوە.

٨٤٢- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: سَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: أَقْرَأُ وَالْإِمَامُ يَقْرَأُ؟ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ: أَفِي كُلِّ صَلَاةٍ قِرَاءَةٌ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَعَمْ» فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: وَجَبَ هَذَا»[٣].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پیاوێک پرسیاری لێکردوە گوتوویەتی: ئایا منیش (قورئان) بخوێنم کاتێک ئیمامیش دەیخوێنێ؟ ئەویش گوتوویەتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد و گوتی: ئایا لە هەموو نوێژێکدا خوێندنی واجبە؟ جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئیتر پیاوێک لە خەڵکەکە گوتی: ئەو حوکمە واجب بوو.

٨٤٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ خَلْفَ الْإِمَامِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ، بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَسُورَةٍ وَفِي الْأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) ضعيف الإسناد. أخرجه النسائي: ٩٢٣.

(٤) صحيح.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە نوێژی نیوەڕۆ و عەصردا فاتیحە و سوورەتێکی دیکەمان لە دوو ڕکاتی یەکەمدا لە دوای ئیام دەخوێند، وە لە دوو ڕکاتەکەی کۆتاییدا تەنها فاتیحەمان دەخوێند.

## بابەت: دوو وەستان و بێدەنگ بوونی کەم لەلایەن ئیمامەوە

٨٤٤- عَنْ سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ ﷺ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ ، قَالَ: «سَكْتَتَانِ حَفِظْتُهُمَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ» فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عِمْرَانُ بْنُ الْحُصَيْنِ ﷺ، فَكَتَبْنَا إِلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ بِالْمَدِينَةِ، فَكَتَبَ أَنَّ سَمُرَةَ قَدْ حَفِظَ. قَالَ سَعِيدٌ: فَقُلْنَا لِقَتَادَةَ: مَا هَاتَانِ السَّكْتَتَانِ؟ قَالَ: إِذَا دَخَلَ فِي صَلَاتِهِ، وَإِذَا فَرَغَ مِنَ الْقِرَاءَةِ، ثُمَّ قَالَ بَعْدُ: وَإِذَا قَرَأَ ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، قَالَ: وَكَانَ يُعْجِبُهُمْ: إِذَا فَرَغَ مِنَ الْقِرَاءَةِ أَنْ يَسْكُتَ، حَتَّى يَتَرَادَّ إِلَيْهِ نَفَسُهُ[١].

واتە: سەعیدو قەتادە لە حەسەنەوە، لە سەمورەی کوڕی جوندەبەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: دوو وەستانی کەم هەیە کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە یادم ماوە، جا عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ نکووڵی کرد، بۆیە ئێمەش نامەمان نووسی بۆ ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ، کە لە مەدینە بوو، ئەویش نووسی کە بێگومان سەمورە ﷺ ڕاست دەکات. سەعید گوتی: بە قەتادەمان گوت: ئەو دوو وەستانە کامانەن؟ گوتی: کاتێک سەرەتا دەچووە ناو نوێژەکەیەوە، وە کاتێک کە لە خوێندنی فاتیحە دەبوویەوە، پاش ئەمە گوتی: وە کاتێک ئەوەی دەخوێندەوە: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، واتە: نەک (ڕێگای) ئەوانەی خەشمی (تۆیان) لێگیراوە (وەک جولەکە وهاوکردەوەکانیان) وە نەک (ڕێگای) گومڕایان وەک (گاورەکان وهاوکردەوەکانیان)، گوتی: ئەوانیش پێی سەرسام بوون، کە کاتێک لە خوێندنی فاتیحە تەواو دەبوو، ئنجا کەمێ دەوەستا تاکو هەناسەی دەهاتەوە بەر.

٨٤٥- عَنِ الْحَسَنِ ﷺ، قَالَ: قَالَ سَمُرَةُ ﷺ: «حَفِظْتُ سَكْتَتَيْنِ فِي الصَّلَاةِ، سَكْتَةً قَبْلَ الْقِرَاءَةِ، وَسَكْتَةً عِنْدَ الرُّكُوعِ» فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهِ عِمْرَانُ بْنُ الْحُصَيْنِ ﷺ فَكَتَبُوا إِلَى الْمَدِينَةِ إِلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، فَصَدَّقَ سَمُرَةَ[٢].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٧٧٧ و ٧٨٠، والترمذي: ٢٥١.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٧٧٧ و ٧٨٠، والترمذي: ٢٥١.

واتە: حەسەن دەڵێ: سەمورە ﷺ گوتی: لە ناو نوێژدا دوو وەستانی کەم هەیە کە لە یادم ماون، وەستانێک پێش دەستپێکردن بە خوێندنی فاتیحە، وە وەستانێک کاتی ڕکووع، عیمرانی کوڕی حوصەینیش ﷺ نکووڵی لەوە کرد، ئنجا نوسییان بۆ ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ کە لە مەدینە بوو، ئەویش سەمورەی بەڕاست دانا.

## بابەت: بێدەنگ بوون کاتێک ئیمام قورئان دەخوێنێ (لە نوێژدا)

**٨٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا، وَإِذَا قَالَ: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، فَقُولُوا: آمِينَ، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا، فَصَلُّوا جُلُوسًا أَجْمَعِينَ»[1].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێشنوێژ بۆ ئەوەیە کە پەیڕەوی بکەون (پێشی مەکەون)، هەرکات تەکبیری کردو نوێژی دابەستا، ئێوەش تەکبیر بکەن (نوێژەکەتان دابەستن) وە هەرکات قورئانی خوێند ئێوە بێدەنگ بن (لەگەڵی مەڵێنەوە)، وە کاتێک گوتی: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، واتە: نەک (ڕێگای) ئەوانەی خەشمی (تۆیان) لێگیراوە (وەک جولەکە وهاوکردەوەکانیان) وە نەک (ڕێگای) گومڕایان وەک (گاورەکان وهاوکردەوەکانیان)، ئێوە بڵێن: ئامین، وە کاتێک ڕۆیشتە ڕکووع ئێوەش ڕکووع بەرن، وە کاتێ گوتی: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ»، ئێوەش بڵێن: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»، وە کاتێک چووە سوجدە ئێوەش لەگەڵیدا سوجدە بەرن، وە کاتێک (پێشنوێژ) نوێژی بە دانیشتنەوە کرد، ئێوەش هەمووتان بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن.

**٨٤٧- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَرَأَ الإِمَامُ فَأَنْصِتُوا، فَإِذَا كَانَ عِنْدَ الْقَعْدَةِ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ ذِكْرِ أَحَدِكُمُ التَّشَهُّدُ»[2].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٢٢ و ٧٣٤، ومسلم: ٤١٤ و ٤١٥ و ٤١٦ و ٤١٧، وأبو داود: ٦٠٤، والنسائي: ٩٢١ و ٩٢٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٠٤، وأبو داود: ٩٧٢ و ٩٧٣، والنسائي: ٨٣٠ و ١٠٦٤ و ١١٧٢.

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک ئیمام (پێشنوێژ) قورئانی خوێند ئەوە ئێوە بدەنگ بن (لەگەڵیدا مەیڵێنەوە)، وە کاتێک کە ئیمام لە دانیشتنی تەحییاتدا بوو، ئەوە ئێوەش یەکەم جار لەوێوە دەست پێبکەن (واتە: ئەگەر لە تەحییاتدا بوو ئێوەش بە تەحییات دەست پێبکەن ڕاستەوخۆ).

**٨٤٨-** عَنِ ابْنِ أُكَيْمَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ بِأَصْحَابِهِ صَلَاةً، نَظُنُّ أَنَّهَا الصُّبْحُ، فَقَالَ: «هَلْ قَرَأَ مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ؟» قَالَ رَجُلٌ: أَنَا، قَالَ «إِنِّي أَقُولُ مَا لِي أُنَازَعُ الْقُرْآنَ»[١].

واتە: ئیبنو ئوکەیمە ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ بەر نوێژی بۆ هاوەڵانی کرد لە یەکێک لە نوێژەکان کە پێم وایە نوێژی بەیانی بوو، ئنجا فەرمووی: ئایا هیچ یەکێک لە ئێوە (لەگەڵ مندا) قورئانی خوێند؟ پیاوێک گوتی: من بووم، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەوە بۆیە دەمگوت (لە دڵی خۆمدا) دەبێ بۆ بەر بەرەکانیم بکرێ (لە قورئان خوێندندا).

**تێبینی:** پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕێگایەوە ویستوویەتی تێیان بگەیەنێ کە ئەو کارە نەکەن، تاکو پێشنوێژ، نوێژەکەی لێ تێکنەچێ.

**٨٤٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَزَادَ فِيهِ: قَالَ: فَسَكَتُوا بَعْدُ فِيمَا جَهَرَ فِيهِ الْإِمَامُ[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەرنوێژی بۆ کردین، ئیتر وەک فەرموودەی پێشوو دەیگێڕێتەوە، بەڵام ئەوەی لێ زیاد کرد کە دەڵێ: خەڵکی لەمەودوا بێدەنگ دەبوون (لەگەڵ ئیمام قورئانیان نەدەخوێند لە نوێژدا) لەو نوێژانەی کە ئیمام بە دەنگ قورئان دەخوێنێ.

**٨٥٠-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ لَهُ إِمَامٌ، فَقِرَاءَةُ الْإِمَامِ لَهُ قِرَاءَةٌ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٢٦ و ٨٢٧، والترمذي: ٣١٢، والنسائي: ٩١٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٢٦ و ٨٢٧، والترمذي: ٣١٢، والنسائي: ٩١٩.

(٣) حسن.




واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە نوێژدا ئیمامی (پێش نوێژی) هەبوو، ئەوە قورئان خوێندنی ئیمام بۆی بە خوێندنی قورئان هەژمار دەکرێ.

## بابەت: بە دەنگی بەرز
## گوتنی "آمین" لەکاتی خوێندنی فاتیحەدا

٨٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَمَّنَ الْقَارِئُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تُؤَمِّنُ، فَمَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک قورئان خوێن (ئیمام) گوتی: ئامین، ئێوەش بڵێن: ئامین، چونکە بەڕاستی فریشتەکانیش دەڵێن: ئامین، جا هەر کەسێک ئامین گوتنەکەی یەکانگیر (هاوکات) بێ لەگەڵ هی فریشتەکان، لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبوردرێ.

٨٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَمَّنَ الْقَارِئُ فَأَمِّنُوا، فَمَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک قورئان خوێن (ئیمام) گوتی: ئامین، ئێوەش بڵێن: ئامین، (چونکە فریشتەکانیش دەڵێن:) ئامین، جا هەر کەسێک ئامین گوتنەکەی یەکانگیر (هاوکات) بێ لەگەڵ هی فریشتەکان، لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبوردرێ.

٨٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: تَرَكَ النَّاسُ التَّأْمِينَ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَالَ: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، قَالَ: «آمِينَ» حَتَّى يَسْمَعَهَا أَهْلُ الصَّفِّ الْأَوَّلِ، فَيَرْتَجُّ بِهَا الْمَسْجِدُ[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٨٠، ومسلم: ٤١٠، وأبو داود: ٩٣٤ و ٩٣٦، والترمذي: ٢٥٠، والنسائي: ٩٢٥ و ٩٣٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٨٠، ومسلم: ٤١٠، وأبو داود: ٩٣٤ و ٩٣٦، والترمذي: ٢٥٠، والنسائي: ٩٢٥ و ٩٣٠.

(٣) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٩٣٤.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: خەڵکی وازیان لە گوتنی: ئامین هێنابوو، (لە نوێژدا)، وە کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، واتە: نەک (ڕێگای) ئەوانەی خەشمی (تۆیان) لێگیراوە (وەک جولەکە وهاوکردەوەکانیان) وە نەک (ڕێگای) گومڕایان وەک (گاورەکان وهاوکردەوەکانیان)، ئەوە دەیفەرموو: ئامین، بە جۆرێک کە ڕیزی یەکەمی نوێژ خوێنان گوێیان لێدەبوو، پاشان مزگەوت دەهەژا بە گوتنی وشەی: ئامین.

**٨٥٤- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَالَ: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ قَالَ: «آمِينَ»[١].**

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کاتێک دەیفەرموو: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ دەیفەرموو: ئامین.

**٨٥٥- عَنْ عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا قَالَ: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ قَالَ: «آمِينَ» فَسَمِعْنَاهَا[٢].**

واتە: عەبدولجەبباری کوڕی وائیل لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: نوێژم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد، جا کاتێک فەرمووی: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ فەرمووی: ئامین، بە جۆرێک ئێمەش گوێمان لێبوو.

**٨٥٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا حَسَدَتْكُمُ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ، مَا حَسَدَتْكُمْ عَلَى السَّلَامِ وَالتَّأْمِينِ»[٣].**

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جوولەکە لە هیچ شتێک هێندە حەسودیتان پێنابەن وەکو لە سەلام کردن و گوتنی: ئامین، حەسودیتان پێدەبەن.

**٨٥٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا حَسَدَتْكُمُ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ، مَا حَسَدَتْكُمْ عَلَى آمِينَ، فَأَكْثِرُوا مِنْ قَوْلِ آمِينَ»[٤].**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٩٣٢، والترمذي: ٢٤٨ و ٢٤٩، والنسائي: ٨٧٩ و ٩٣٢.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف جداً.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جوولەکە لە هیچ شتێکدا بە ئەندازەی گوتنی: ئامین، حەسودیتان پێنابەن، بۆیە زۆر وشەی ئامین، بڵێن.

## بابەت: دەست بەرزکردنەوە لەکاتی ڕکووع بردن وە کاتی هەستانەوەش لە ڕکووع

٨٥٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَلَا يَرْفَعُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە کاتێک دەستی دەکرد بە نوێژ دەستەکانی بەرز دەکردەوە تاکو ئاستی شانەکانی، وە هەروەها لە کاتی ڕکووع و هەڵسانەوەش لە ڕکووع (بە هەمان شێوە دەستی بەرز دەکردەوە)، بەڵام لە نێوان دوو سەجدەکاندا دەستی بەرز نەدەکردەوە.

٨٥٩- عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ إِذَا كَبَّرَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يَجْعَلَهُمَا قَرِيبًا مِنْ أُذُنَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ صَنَعَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ صَنَعَ مِثْلَ ذَلِكَ»[٢].

واتە: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەگێڕێتەوە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دادەبەست دەستەکانی بەرز دەکردەوە، وە تاکو نزیک گوێیەکانی دەهێنان، وە کاتێک ڕکووعی دەبرد هەمان کاری دەکرد، وە کاتێک لە ڕکووع هەڵدەستاوە هەمان کاری دەکرد.

٨٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي الصَّلَاةِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ حِينَ يَفْتَتِحُ الصَّلَاةَ، وَحِينَ يَرْكَعُ، وَحِينَ يَسْجُدُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٣٥، ومسلم: ٣٩٠، وأبو داود: ٧٢١ و ٧٢٢، والترمذي: ٢٥٥، والنسائي: ٨٧٦ و ٨٧٨ و ١٠٢٥ و ١٠٥٩ و ١٠٨٨ و ١١٤٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٣٧، ومسلم: ٣٩١، وأبو داود: ٧٤٥، والنسائي: ٨٨٠ و ٨٨١ و ١٠٢٤ و ١٠٨٥ و ١١٤٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٨٥، ومسلم: ٣٩٢، وأبو داود: ٨٣٦، والترمذي: ٢٥٤، والنسائي: ١٠٢٣ و ١١٥٥ و ١١٥٦.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە کە لە نوێژدا دەستی بەرزکردەوە تاکو ئاستی شانەکانی کاتێک کە دەستی دەکرد بە نوێژ کردن، وە لە کاتی ڕکووع و چوونە سوجدەشدا (هەمان کاری دەکرد).

**٨٦١-** عَنْ عُمَيْرِ بْنِ حَبِيبٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَرْفَعُ يَدَيْهِ مَعَ كُلِّ تَكْبِيرَةٍ فِي الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ»[1].

واتە: عومەیری کوڕی حەبیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هەر «الله أكبر»ێک دەستەکانی بەرز دەکردەوە لە نوێژە فەڕزەکاندا.

**٨٦٢-** عَنْ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُهُ، وَهُوَ فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَحَدُهُمْ أَبُو قَتَادَةَ بْنُ رِبْعِيٍّ، قَالَ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، «كَانَ إِذَا قَامَ فِي الصَّلَاةِ، اعْتَدَلَ قَائِمًا، وَرَفَعَ يَدَيْهِ، حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ» ثُمَّ قَالَ «اللَّهُ أَكْبَرُ» وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، رَفَعَ يَدَيْهِ، حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، فَإِذَا قَالَ «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ» رَفَعَ يَدَيْهِ، فَاعْتَدَلَ، فَإِذَا قَامَ مِنَ الثِّنْتَيْنِ، كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، حَتَّى يُحَاذِيَ مَنْكِبَيْهِ، كَمَا صَنَعَ، حِينَ افْتَتَحَ الصَّلَاةَ»[2].

واتە: موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عەتاء لە ئەبو حومەیدی ساعیدیی ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: گوێم لە ئەبو حومەید بوو کە لە ناو دە هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دابوو کە یەکێکیان ئەبو قەتادەی کوڕی ڕیبعی ﷺ بوو، گوتی: من لە هەمووتان باشتر دەزانم و شارەزاترم بە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێ هەڵدەستا بۆ نوێژ کردن بە پێوە ڕێک دەوەستا، وە دەستەکانی بەرز دەکردەوە تاکو لای شانی، پاشان دەیفەرموو: «الله أكبر» (بۆ نوێژ دابەستن)، وە کاتێک کە دەیویست بچێتە ڕکووع دەستەکانی تاکو لای شانی بەرز دەکردەوە، وە کاتێک دەیفەرموو: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ»، (کە لە ڕکووع هەڵدەستاوە) دەستەکانی بەرز دەکردەوە، ڕێک دەبۆوە (بە پێوە)، کاتێک لە دووەم ڕکات هەڵدەستاوە (بۆ ئەوانیتر) «الله أكبر»ـی دەکردو دەستەکانی تاکو ئاستی شانی بەرز دەکردەوە، هەروەکو سەرەتای نوێژ دەستی بەرز دەکردەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ٨٢٨، وأبو داود: ٧٣٠ و ٩٦٣، والترمذي: ٢٧٠ و ٣٠٤، والنسائي: ١٠٣٩ و ١١٠١ و ١١٨١ و ١٢٦٢ مختصراً.

٨٦٣- عَنْ عَبَّاسُ بْنُ سَهْلٍ السَّاعِدِيُّ، قَالَ: اجْتَمَعَ أَبُو حُمَيْدٍ، وَأَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَسَهْلُ بْنُ سَعْدٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، فَذَكَرُوا صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ ﷺ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «قَامَ، فَكَبَّرَ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ، ثُمَّ رَفَعَ حِينَ كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ، ثُمَّ قَامَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَاسْتَوَى حَتَّى رَجَعَ كُلُّ عَظْمٍ إِلَى مَوْضِعِهِ»[١].

واتە: عەبباسی کوڕی سەهلی ساعیدیی دەڵێ: ئەبو حومەید و ئەبو ئوسەیدی ساعیدیی کۆبوونەوە، وە سەهلی کوڕی سەعد و موحەممەدی کوڕی سەلەمەیان لەگەڵدا بوو، جا باسیان لە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەبو حومەید ﷺ گوتی: من لە هەمووتان شارەزاترم بە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا نوێژی دابەست، جا تەکبیری کرد و دەستی بەرز کردەوە، وە کاتێکیش ڕکووعی برد دەستی بەرزکردنەوە، پاشان کە ڕاست بۆوە لە ڕکووع دەستی بەرز کردنەوە، وە ڕێک ڕاوەستا و تاکو هەموو (جومگەی) ئێسقانەکانی چوونەوە شوێنی خۆیان.

٨٦٤- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يَكُونَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ»[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێک هەڵسابا بۆ نوێژی فەڕز تەکبیری دەکردو دەستەکانی بەرز دەکردنەوە تا ئاستی شانەکانی، وە کاتێک بیویستبا بچێتە ڕکووع بە هەمان شێوەی دەکرد (دەستەکانی تا شانی بەرز دەکردنەوە)، وە کاتێک سەری لە ڕکووع بەرز دەکردەوە هەمان کاری دەکرد، وە کاتێک لە دوو سوجدەکان هەڵدەستاوە هەمان کاری دەکرد.

٨٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ عِنْدَ كُلِّ تَكْبِيرَةٍ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هەموو «الله أكبر»ێک دەستەکانی بەرز دەکردەوە.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ٨٢٨، وأبو داود: ٧٣٠ و ٩٦٣، والترمذي: ٢٧٠ و ٣٠٤، والنسائي: ١٠٣٩ و ١١٠١ و ١١٨١ و ١٢٦٢ مختصراً.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٧١، وأبو داود: ٧٤٤، والترمذي: ٣٤٢٣، والنسائي: ٨٩٧.

(٣) صحيح لغيره.

**٨٦٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ، وَإِذَا رَكَعَ»[١].**

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەچووە ناو نوێژ و، نوێژی دادەبەست دەستەکانی بەرز دەکردەوە، وە هەروەها کاتێک ڕکووعیشی دەبرد.**

**٨٦٧- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: لَأَنْظُرَنَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ يُصَلِّي، «فَقَامَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى حَاذَتَا أُذُنَيْهِ، فَلَمَّا رَكَعَ رَفَعَهُمَا مِثْلَ ذَلِكَ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا مِثْلَ ذَلِكَ»[٢].**

**واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: گوتم: تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەم بزانم چۆن نوێژ دەکات، ئەویش هەڵسا و ڕووی کردە قیبلە و دەستەکانی بەرز کردەوە تا ئاستی گوێیەکانی (نوێژی دابەست)، وە کاتێک ڕکووعی برد بە هەمان شێوە دەستەکانی بەرز کردەوە، وە کاتێکیش لە ڕکووع سەری بەرزکردەوە بە هەمان شێوە دەستەکانی بەرز کردەوە.**

**٨٦٨- عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ رَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَيَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَرَفَعَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ يَدَيْهِ إِلَى أُذُنَيْهِ[٣].**

**واتە: ئەبو زوبەیر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ کاتێک دەستی بە نوێژ دەکرد دەستەکانی بەرز دەکردەوە، وە هەروەها کە دەچووە ڕکووعیش، وە هەروەها کاتێکیش سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکووع بە هەمان شێوە (دەستی بەرز دەکردەوە) وە دەیگوت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە کە بەم شێوەیە (نوێژ)ی دەکرد. ئیبراهیمی کوڕی تەهمان (کە ڕاوی فەرموودەکەیە) دەستەکانی تاکو گوێیەکانی بەرز دەکردەوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٠١، وأبو داود: ٧٢٦، والنسائي: ٨٨٩.

(٣) صحيح.

## بابەت: ڕکووع لەناو نوێژدا

٨٦٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا رَكَعَ لَمْ يَشْخَصْ رَأْسَهُ، وَلَمْ يُصَوِّبْهُ، وَلَكِنْ بَيْنَ ذَلِكَ»(١).

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ڕکووعی دەبرد نە سەری بەرز دەکردەوە، نە نزمیش، بەڵکو لەو نێوانە دابوو.

٨٧٠- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُجْزِئُ صَلَاةٌ لَا يُقِيمُ الرَّجُلُ فِيهَا صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ»(٢).

واتە: ئەبو مەسعوود ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە نوێژدا لەکاتی ڕکووع و سوجدەدا پشتیتێدا ڕێک نەکات نوێژەکەی دروست نیە.

٨٧١- عَنْ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ ﵁، وَكَانَ مِنَ الْوَفْدِ، قَالَ: خَرَجْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَبَايَعْنَاهُ وَصَلَّيْنَا خَلْفَهُ، فَلَمَحَ بِمُؤْخِرِ عَيْنِهِ رَجُلًا، لَا يُقِيمُ صَلَاتَهُ، - يَعْنِي صُلْبَهُ - فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ ﷺ الصَّلَاةَ، قَالَ: «يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ»(٣).

واتە: عەلی کوڕی شەیبان﵁ کە لەگەڵ وەفدێک بووە، دەڵێ: دەرچووین تاکو هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، دەڵێ: ئێمەش پەیمانمان پێدا و نوێژمان لە دوایەوە کرد، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) بە نیگای چاوەکانی پیاوێکی بینی لەدواوە کە لە نوێژدا تەواو پشتی ڕاست ناکاتەوە لە ڕکووع و سوجدەدا، جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەی تەواوبوو فەرمووی: ئەی کۆمەڵی مسوڵمانان هەر کەسێک لە ڕکووع و سوجدەدا پشتی ڕاست نەکاتەوە نوێژەکەی دروست نیە.

٨٧٢- عَنْ رَاشِدٍ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ وَابِصَةَ بْنَ مَعْبَدٍ، يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي، «فَكَانَ إِذَا رَكَعَ سَوَّى ظَهْرَهُ، حَتَّى لَوْ صُبَّ عَلَيْهِ الْمَاءُ لَاسْتَقَرَّ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٩٨، وأبو داود: ٧٨٣ أخرجاه مطولًا.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٥٥، والترمذي: ٢٦٥، والنسائي: ١٠٢٧ و ١١١١.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح لغيره.

واتە: ڕاشید ﷺ دەڵێ: گوێم لە وابیصەی کوڕی مەعبەد بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە نوێژی دەکرد، جا کاتێک ڕکووعی دەبرد پشتی ڕێک دەکرد، بە شێوەیەک هەتاکو ئەگەر ئاوت بڕشتبایەتە سەر پشتی ئەوە ئاوەکە ڕادەوەستا (هێندە بە تەواوی پشتی ڕێک دەکرد).

## بابەت: دەست لەسەر ئەژنۆ دانان

٨٧٣- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: رَكَعْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي، فَطَبَّقْتُ، فَضَرَبَ يَدِي وَقَالَ: «قَدْ كُنَّا نَفْعَلُ هَذَا، ثُمَّ أُمِرْنَا أَنْ نَرْفَعَ إِلَى الرُّكَبِ»[1].

واتە: موصعەبی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: لە تەنیشت باوکم ڕکووعم برد، جا دەستەکانم لێکدا (پەنجەی دەستەکانم بەیەکەوە کۆکردەوە)و خستمنە نێوان ئەژنۆکانم، باوکیشم لە دەستەکانمی دا (وەک ئاماژە) وە گوتی: بەڕاستی ئێمەش سەرەتا ئاوامان دەکرد، پاشان فەرمانمان پێکرا کە بیانخەینە سەر ئەژنۆکانمان (لە ڕکووعدا).

٨٧٤- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَرْكَعُ، فَيَضَعُ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَيُجَافِي بِعَضُدَيْهِ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک ڕکووعی دەبرد دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دادەنا، وە باڵەکانی لە کەلەکەی جیادەکردەوە.

## بابەت: ئەوەی کە لەدوای هەستانەوە لە ڕکووع دەگوترێ

٨٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، قَالَ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[3].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەیفەرموو: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ»، دەیفەرموو: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ».

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٩٠، ومسلم: ٥٣٥، وأبو داود: ٨٦٧، والترمذي: ٢٥٩، والنسائي: ١٠٣٢ و ١٠٣٣.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٩٦، ومسلم: ٤٠٩، وأبو داود: ٨٤٨، والترمذي: ٢٦٧، والنسائي: ١٠٦٣.



٨٧٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا قَالَ الْإِمَامُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک پێشنوێژ (ئیمام) گوتی: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ»، ئەوە ئێوەش بڵێن: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ».

٨٧٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا قَالَ الْإِمَامُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: هەرکات پێشنوێژ (ئیمام) گوتی: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ»، ئێوەش بڵێن: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ».

٨٧٨- عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ، وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ»[٣].

واتە: ئیبنو ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لە ڕکووع سەری بەرز دەکردەوە دەیفەرموو: خوا سوپاس و ستایشی ئەو کەسەی بیست کە ستایشی کرد، ئەی خوای پەروەردگارمان سوپاس و ستایش بۆ تۆیە، پڕ بە ئاسمانەکان و پڕ بە زەوی، وە لە دوای ئەوە پڕ بەو شتەی کە ویستت لەسەریەتی.

٨٧٩- عَنْ أَبِي عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا جُحَيْفَةَ ﷺ يَقُولُ: ذُكِرَتِ الْجُدُودُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ رَجُلٌ: جَدُّ فُلَانٍ فِي الْخَيْلِ، وَقَالَ آخَرُ: جَدُّ فُلَانٍ فِي الْإِبِلِ، وَقَالَ آخَرُ: جَدُّ فُلَانٍ فِي الْغَنَمِ، وَقَالَ آخَرُ: جَدُّ فُلَانٍ فِي الرَّقِيقِ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاتَهُ، وَرَفَعَ رَأْسَهُ، مِنْ آخِرِ الرَّكْعَةِ، قَالَ: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ، وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ، مِنْكَ الْجَدُّ» وَطَوَّلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَوْتَهُ بِالْجَدِّ، لِيَعْلَمُوا أَنَّهُ لَيْسَ كَمَا يَقُولُونَ[٤].

---

(١) صحيح لغيره. تخريجه انفرد به ابن ماجه. وانظر البخاري: ٨٠٥، ومسلم: ٤١١.

(٢) صحيح. انفرد به ابن ماجه. وانظر مسلم: ٤٧٧. وراجع: ابن ماجه: ٤٢٧ و ٧٧٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٧٦، وأبو داود: ٨٤٦.

(٤) ضعيف.

واتە: ئەبو عومەر دەڵێ: گوێم لە ئەبو جوحەیفە ﷺ بوو دەیگوت: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باسی بەخت و شانس کرا، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا بوو، ئنجا پیاوێک گوتی: فڵان کەس لە ئەسپدا بەختی هەیە، ئەویتر گوتی: فڵان لە حوشتردا بەختی هەیە، ئەویتر گوتی: فڵان لە مەڕو ماڵات بەختی هەیە، یەکێکی تر گوتی: فڵان لە بەندەدا بەختی هەیە، جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی بەجێ گەیاند، لە کۆتا ڕکات سەری بەزر کردەوەو فەرمووی: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ، وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ، مِنْكَ الْجَدّ»، پێغەمبەری خوا ﷺ لە وشەی «الجد» دەنگی درێژ کردەوە بۆ ئەوەی بزانن کە ئەوەی ئەوان باسی دەکەن (لە بەخت و شانس) هیچی بەو شێوەیە نیە کە دەیڵێن.

## بابەت: سوجدەبردن

٨٨٠- عَنْ مَيْمُونَةَ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا سَجَدَ جَافَى يَدَيْهِ، فَلَوْ أَنَّ بَهْمَةً أَرَادَتْ أَنْ تَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ لَمَرَّتْ»[١].

واتە: مەیمونە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک سوجدەی دەبرد دەستەکانی لە تەنیشتەکانی جیادەکردەوە (دووری دەخستنەوە)، بە جۆرێک ئەگەر بێچوی مەڕ (بەرخ) بیویستبا بە بن دەست و قۆڵی دا گوزەر بکا، دەیتوانی گوزەر بکات.

٨٨١- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَقْرَمَ الْخُزَاعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ أَبِي بِالْقَاعِ مِنْ نَمِرَةَ، فَمَرَّ بِنَا رَكْبٌ، فَأَنَاخُوا بِنَاحِيَةِ الطَّرِيقِ، فَقَالَ لِي أَبِي: كُنْ فِي بَهْمِكَ حَتَّى آتِيَ هَؤُلَاءِ الْقَوْمَ فَأُسَائِلَهُمْ، قَالَ: فَخَرَجَ، وَجِئْتُ، يَعْنِي دَنَوْتُ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَحَضَرْتُ الصَّلَاةَ، فَصَلَّيْتُ مَعَهُمْ، فَكُنْتُ أَنْظُرُ إِلَى عُفْرَتَيْ إِبْطَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كُلَّمَا سَجَدَ»[٢].

واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەقرەمی خوزاعیی لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: لەگەڵ باوکم لە شوێنێکی تەختانی و دەشتدا بووین لە نەمیرە (شوێنێکە نزیک لە عەرەفات) کاروانێک بەلاماندا تێپەڕی و لە کەناری ڕێگا

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٩٦، وأبو داود: ٨٩٨، والنسائي: ١١٠٩.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٧٤، والنسائي: ١١٠٨.

بارگەیان خست، باوکم پێی گوتم: تۆ لای ماڵاتەکەبە هەتا دەچمە لای ئەو خەڵکەو پرسیاریان لێدەکەم، وتی: ئەو ڕۆیشت و منیش نزیک بوومەوە لێیان، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێبوو، منیش ئامادەی نوێژکردنەکە بووم لە گەڵیاندا، جا هەر کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ سوجدەی دەبرد، من تەماشای سپیاتی بن باڵی ئەوم دەکرد (واتە: دەست و قۆڵ و باسکەکانی لە کەلەکە و تەنیشتەکانی دوور دەخستەوە).

**٨٨١م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، وَصَفْوَانُ بْنُ عِيسَى، وَأَبُو دَاوُدَ، قَالُوا: حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ قَيْسٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَقْرَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ.**

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٨٨٢- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ إِذَا سَجَدَ وَضَعَ رُكْبَتَيْهِ قَبْلَ يَدَيْهِ، وَإِذَا قَامَ مِنَ السُّجُودِ رَفَعَ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ»[1].**

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە کە کاتێک سوجدەی دەبرد ئەژنۆکانی پێش دەستەکانی لەسەر زەوی دادەنا، وە کاتێک لە سوجدە هەڵدەستاوە دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی بەرز دەکردنەوە لە زەوی.

**٨٨٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ»[2].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە کە لەسەر حەوت ئێسقان سوجدە بەرم.

**٨٨٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعٍ، وَلَا أَكُفَّ شَعَرًا، وَلَا ثَوْبًا» قَالَ ابْنُ طَاوُسٍ: فَكَانَ أَبِي يَقُولُ: الْيَدَيْنِ وَالرُّكْبَتَيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ، وَكَانَ يَعُدُّ الْجَبْهَةَ وَالْأَنْفَ وَاحِدًا[3].**

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٨٣٨، والترمذي: ٢٦٨، والنسائي: ١٠٨٩ و ١١٥٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٠٩، ومسلم: ٤٩٠، وأبو داود: ٨٨٩ و ٨٩٠، والترمذي: ٢٧٣، والنسائي: ١٠٩٣ و ١٠٩٦ و ١٠٩٨ و ١١١٣ و ١١١٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٠٩، ومسلم: ٤٩٠، وأبو داود: ٨٨٩ و ٨٩٠، والترمذي: ٢٧٣، والنسائي: ١٠٩٣ و ١٠٩٦ و ١٠٩٨ و ١١١٣ و ١١١٥.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە، کە لەسەر حەوت (ئەندامی جەستە) سوجدە بەرم، وە (لە کاتی نوێژدا) نە پرچ و نە پۆشاکم نەپێچمەوەو خڕیان نەکەمەوە، ئیبنو تاوس دەڵێ: باوکم دەیگوت حەوتەکان بریتین لە: دوو دەستەکان و، دوو ئەژنۆکان و، هەردوو پێیەکان، وە نێوچاوان و لوتی بەیەک دادەنا.

٨٨٥- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا سَجَدَ الْعَبْدُ، سَجَدَ مَعَهُ سَبْعَةُ آرَابٍ: وَجْهُهُ، وَكَفَّاهُ، وَرُكْبَتَاهُ، وَقَدَمَاهُ»[1].

واتە: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە کە دەیفەرموو: هەر کاتێک بەندە سوجدە دەبات، ئەوە حەوت ئەندام سوجدەی لەگەڵ دەبەن: ڕوخساری و لەپە دەستەکانی و ئەژنۆکانی و پێیەکانی.

٨٨٦- عَنِ الْحَسَنِ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَرُ صَاحِبُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنْ كُنَّا لَنَأْوِي لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مِمَّا يُجَافِي بِيَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ إِذَا سَجَدَ»[2].

واتە: حەسەن ﷺ دەڵێ: ئەحمەری هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداین، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک سوجدەی دەبرد ئەوەندە دەستەکانی دوور دەخستەوە لە کەلەکە و تەنیشتەکانی کە ئێمە دڵمان بۆی دەسوتا.

## بابەت: زیکری ناو ڕکووع و سوجدە

٨٨٧- عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ الْجُهَنِيَّ ﷺ، يَقُولُ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾ الواقعة، قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اجْعَلُوهَا فِي رُكُوعِكُمْ» فَلَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ﴾ الأعلى، قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «اجْعَلُوهَا فِي سُجُودِكُمْ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٩١، وأبو داود: ٨٩١، والترمذي: ٢٧٢، والنسائي: ١٠٩٤ و ١٠٩٩.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٩٠٠.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٨٦٩.

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﷺ گوتوویەتی: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾ الواقعة، واتە: جا کەواتە یادو تەسبیحاتی پەروەردگاری گەورەی خۆت بەپاکی بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: (ئەو زیکرە) لە ناو ڕکووعەکانتاندا دابنێن و بیڵێن، وە کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ﴾ الأعلى، واتە: تەسبیحاتی پەروەردگاری هەرە بڵندت بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: (ئەو زیکرە) لە ناو سوجدەکانتاندا دابنێن و بیڵێن.

٨٨٨- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ إِذَا رَكَعَ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَإِذَا سَجَدَ قَالَ «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ[(١)].

واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە کاتێک ڕکووعی دەبرد سێ جار دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»، وە کاتێک سوجدەی دەبرد سێ جار دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى».

٨٨٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ، سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ»[(٢)].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەزۆری لە ڕکووع و سوجدەدا دەیفەرموو: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي»، واتە: پاکی و بێگەردی هەر بۆ تۆیە خودایە، وە سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، ئەی پەروەردگارە لێم خۆشبە. ئەو زیکرانەی لە قورئان وەردەگرت.

٨٩٠- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا رَكَعَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَقُلْ فِي رُكُوعِهِ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ ثَلَاثًا، فَإِذَا فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ تَمَّ رُكُوعُهُ، وَإِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَقُلْ فِي سُجُودِهِ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى ثَلَاثًا، فَإِذَا فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ تَمَّ سُجُودُهُ، وَذَلِكَ أَدْنَاهُ»[(٣)].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٧٢، وأبو داود: ٨٧١ و ٨٧٤، والترمذي: ٢٦٢ و ٢٦٣، والنسائي: ١٠٠٨ و ١٠٠٩ و ١٠٤٦ و ١١٣٣ و ١٦٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨١٧، ومسلم: ٤٨٤، وأبو داود: ٨٧٧، والنسائي: ١٠٤٧.

(٣) صحيح لغيره دون قوله: «وَذَلِكَ أَدْنَاهُ». أخرجه أبو داود: ٨٨٦، والترمذي: ٢٦١.





واتە: ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان ڕکووعی برد با لە ڕکووعەکەیدا بڵێ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ» سێ جار، جا کاتێک ئەوەی کرد ڕکووعەکەی تەواوە، وە ئەگەر یەکێکتان سوجدەی برد با لە سوجدەکەیدا بڵێ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى» سێ جار، جا هەرکات ئەوەی کرد ئەوە سوجدەکەی تەواوە، ئەوەش کەمترینیەتی.

## بابەت: ڕێک و ڕاستبوون لە سوجدەدا

**٨٩١-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَعْتَدِلْ، وَلَا يَفْتَرِشْ ذِرَاعَيْهِ افْتِرَاشَ الْكَلْبِ»[(١)].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان سوجدەی برد با میانگیرو نێوەندگیر بێت (لە بەینی ڕاخستن و دانانی دەست و باسک لەسەر زەوی و لەنێوان جیاکردنەوەی دەست و باسک لە تەنیشتەکانی و لکاندنیان)، وە دەستەکانی بە شێوەیەک ڕانەکێشێ لەسەر زەوی هەر وەکو چۆن سەگ ڕایان دەکێشێ.

**٨٩٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، وَلَا يَسْجُدْ أَحَدُكُمْ وَهُوَ بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ كَالْكَلْبِ»[(٢)].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە کە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە سوجدەدا میانگیربن، هیچ یەکێکتان بەو جۆرە سوجدە نەبات کە دەستەکانی لەسەر زەوی ڕابخات وەکو ئەوەی سەگ ڕایاندەخات.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٧٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٢ و ٨٢٢، ومسلم: ٤٩٣، وأبو داود: ٨٩٧، والترمذي: ٢٧٦، والنسائي: ١٠٢٨ و ١١٠٣ و ١١١٠.

## بابەت: دانیشتن لە نێوان دوو سوجدەدا

**٨٩٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِمًا، فَإِذَا سَجَدَ فَرَفَعَ رَأْسَهُ، لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ جَالِسًا، وَكَانَ يَفْتَرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى»[١].**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لە ڕکووع سەری بەرزدەکردەوە (هەڵدەستایەوە) نەدەچوویە سوجدە تاکو تەواو بە پێوە ڕێک نەبایەوە (ئەوجار سوجدەی دەبرد)، وە کاتێک سوجدەی دەبردو سەری لە سوجدە بەرز دەکردەوە نەدەچووە سوجدە تاکو بە دانیشتنەوە (پشتی) ڕێک نەبووبایەوە (ئنجا دەچووە سوجدە) وە لە دانیشتنی نێوان سوجدەکاندا لاقی چەپی ڕادەخست.

**٨٩٤- عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُقْعِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ»[٢].**

واتە: عەلی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: لە بەینی دوو سوجدەکاندا بە شێوەی «إقعاء» دامەنیشە.

**إقعاء:** ئەو دانیشتنەیە کە پێیەکانت بچەقێنی و، لە نێوانی هەردوو پێیەکانت تەختی زەوی دانیشی، یان: پێیەکانت بچەقێنی واتە: هیچیان ڕانەخەی لەسەر زەوی و بە چەقێنراوی لەسەر خودی پێیەکانت دابنیشی، ئەوەش نەهی لێکراوە.

**٨٩٥- عَنْ عَلِيٍّ ﵁، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا عَلِيُّ لَا تُقْعِ إِقْعَاءَ الْكَلْبِ»[٣].**

واتە: عەلی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەی عەلی دانیشتنێک دامەنیشە کە وەک دانیشتنی سەگ وایە (واتە: پێیەکانت بچەقێنی و لە یەکتر دووریان بخەیتەوەو، لە نێوان هەردوو پێیەکانت دابنیشی).

**٨٩٦- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﵁، يَقُولُ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا رَفَعْتَ رَأْسَكَ مِنَ السُّجُودِ، فَلَا تُقْعِ كَمَا يُقْعِي الْكَلْبُ، ضَعْ أَلْيَتَيْكَ بَيْنَ قَدَمَيْكَ، وَأَلْزِقْ ظَاهِرَ قَدَمَيْكَ بِالْأَرْضِ»[٤].**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٩٨، وأبو داود: ٧٨٣.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٨٢.

(٣) حسن من حديث أبي موسى. وضعيف من حديث أبي إسحاق. أخرجه الترمذي: ٢٨٢.

(٤) موضوع.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ئەگەر لە سوجدە سەری بەرزدەکردەوە وەکو دانیشتنی سەگ دامەنیشە، بە جۆرێک کە لە نێوان هەردوو پێیەکاندا دابنیشی و پشتی پێیەکان بە زەویەوە بنوسێنی (ئەو دانیشتنە نەهی لێکراوە).

## بابەت: زیکری نێوان سوجدەکان

٨٩٧- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي»[1].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەنێوان سوجدەکاندا دوو جار دەیفەرموو: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي»، واتە: پەروەردگارە لێم خۆشبە.

٨٩٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ «رَبِّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاجْبُرْنِي، وَارْزُقْنِي، وَارْفَعْنِي»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەونوێژدا لە نێوان دوو سوجدەکەدا دەیفەرموو: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاجْبُرْنِي، وَارْزُقْنِي، وَارْفَعْنِي»، واتە: پەروەردگارە لێم خۆشبە و بەزەییت پێمدابێتەوە و حاڵم باش بکە و ڕزق و ڕۆزیم بدە و پلەم بەرز بکەوە.

## بابەت: ئەوەی کە هاتووە دەربارەی زیکری تەحییات

٨٩٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ قُلْنَا: السَّلَامُ عَلَى اللَّهِ قَبْلَ عِبَادِهِ، السَّلَامُ عَلَى جِبْرَائِيلَ، وَمِيكَائِيلَ، وَعَلَى فُلَانٍ وَفُلَانٍ، يَعْنُونَ الْمَلَائِكَةَ، فَسَمِعَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «لَا تَقُولُوا: السَّلَامُ عَلَى اللَّهِ، فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلَامُ، فَإِذَا جَلَسْتُمْ، فَقُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، فَإِنَّهُ إِذَا قَالَ ذَلِكَ، أَصَابَتْ كُلَّ عَبْدٍ صَالِحٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»[3].

---

(١) صحيح. تخريجه انفرد به ابن ماجه. وانظر بهذا السياق مسلم: ٧٧٢، وأبو داود: ٨٧٤، والترمذي: ٢٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٥٠، والترمذي: ٢٨٤ و ٢٨٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٣١، ومسلم: ٤٠٢، وأبو داود: ٩٦٨ و ٩٦٩، والترمذي: ٢٨٩، والنسائي: ١١٦٢_١١٦٤ و ١١٦٦_١١٧١ و ١٢٩٨.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: کاتێک ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژمان دەکرد دەمانگوت: سەلام لەسەر خوا پێش بەندەکانی، سەلام لەسەر جیبریل و میکائیل و فڵان و فڵان کە مەبەستیان لە فریشتەکان بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێمان بوو، بۆیە فەرمووی: مەڵێن: سەلام لەسەر خوابێ، چونکە بێگومان خوا خۆی (یەکێک لە سیفەتەکانی) سەلامە، جا کاتێک کە دانیشتن (بۆ تەحییات) بڵێن: هەرچی قەدرو ڕێزە چ گوفتار، چ کردار وە هەرچی سەرچاوەی پاکی و خاوێنییە ئەوانە لە ڕاستییدا هەموویان شایستەی خوای پەروەردگارن، دروودی خوا لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا، درود و سەلام لەسەر ئێمەش وە لەسەر هەموو بەندە باشەکانی خوا، شایەتی و گەواهی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد ﷺ بەندە و نێردراوی خوایە، خۆ ئەگەر بەم جۆرە سەلام بکەن، ئەوە هەرچی بەندەی چاکە چ لە ئاسمان، چ لە زەوی هەموویان دەگرێتەوە.

**٨٩٩ (م١)**- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَنْبَأَنَا الثَّوْرِيُّ، عَنْ مَنْصُورٍ، وَالْأَعْمَشِ، وَحُصَيْنٍ، وَأَبِي هَاشِمٍ، وَحَمَّادٌ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، وَعَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْأَسْوَدِ، وَأَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ.[١].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٨٩٩ (م٢)**- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، أَنْبَأَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الْأَعْمَشِ، وَمَنْصُورٍ، وَحُصَيْنٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، ح قَالَ: وحَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، وَالْأَسْوَدِ، وَأَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُعَلِّمُهُمُ التَّشَهُّدَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ[٢].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

٩٠٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، فَكَانَ يَقُولُ: «التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندنی تەحیاتی فێردەکردین هەروەک چۆن سوورەتێکی قوڕئانی فێر دەکردین، جا دەیفەرموو: هەرچی قەدر و ڕێزە چ گوفتار، چ کردار وە هەرچی سەرچاوەی پاکی و خاوێنییە ئەوانە لە ڕاستییدا هەموویان شایستەی خوان، دروودی خوا لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا، درود و سەلام لەسەر ئێمەش وە لەسەر هەموو بەندە باشەکانی خوا، شایەتی و گەواهی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد ﷺ بەندە و نێردراوی خوایە.

٩٠١- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَنَا، وَبَيَّنَ لَنَا سُنَّتَنَا، وَعَلَّمَنَا صَلَاتَنَا، فَقَالَ: إِذَا صَلَّيْتُمْ، فَكَانَ عِنْدَ الْقَعْدَةِ، فَلْيَكُنْ مِنْ أَوَّلِ قَوْلِ أَحَدِكُمْ: التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ، الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، سَبْعُ كَلِمَاتٍ هُنَّ تَحِيَّةُ الصَّلَاةِ»[٢].

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆداین و ڕێبازەکەمانی بۆ ڕوون کردینەوە و نوێژی فێرکردین و فەرمووی: هەر کاتێک نوێژتان کرد کاتێک کە دانیشتن (بۆ تەحییات) یەکەم وتەیەک کە دەیڵێن با ئەوە بێت: «التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ، الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، سَبْعُ كَلِمَاتٍ هُنَّ تَحِيَّةُ الصَّلَاةِ»، حەوت ڕستەن کە ئەوانە لە تەحییاتدا دەخوێندرێن.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٠٣، وأبو داود: ٩٧٤، والترمذي: ٢٩٠، والنسائي: ١١٧٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٠٤، وأبو داود: ٩٧٢ و ٩٧٣، والنسائي: ٨٣٠ و ١٠٦٤ و ١١٧٢.




٩٠٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ، كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ «بِاسْمِ اللَّهِ وَبِاللَّهِ، التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، أَسْأَلُ اللَّهَ الْجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەکو چۆن سوورەتێکی قورئانی فێردەکردین ئاواش تەحییاتی فێردەکردین: واتە: بە ناوی خوا، یارمەتی و سەرکەوتن هەر بە دەست خوایە، هەرچی قەدر و ڕێزە چ گوفتار، چ کردار وە هەرچی سەرچاوەی پاکی و خاوێنییە ئەوانە لە ڕاستییدا هەموویان شایستەی خوان، دروودی خوا لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا، درود و سەلام لەسەر ئێمەش وە لەسەر هەموو بەندە باشەکانی خوا، شایەتی و گەواهی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد ﷺ بەندە و نێردراوی خوایە، داوای بەهەشت لە خوا دەکەم، وە پەنا دەگرم بە خوا لە ئاگری دۆزەخ.

## بابەت: صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ

٩٠٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا السَّلَامُ عَلَيْكَ قَدْ عَرَفْنَاهُ، فَكَيْفَ الصَّلَاةُ؟ قَالَ: «قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﵁ دەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە سەلام ناردنمان زانی کە چۆن سەلامت لێبکەین، بەڵام صەڵاواتدان چۆنە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بڵێن: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ».

---

(١) ضعيف. أخرجه النسائي: ١١٧٥ و ١٢٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٩٨ و ٦٣٥٨، والنسائي: ١٢٩٣.

٩٠٤- عَنِ الْحَكَمِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي لَيْلَى، قَالَ: لَقِيَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ، فَقَالَ: أَلَا أُهْدِي لَكَ هَدِيَّةً؟ خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْنَا: قَدْ عَرَفْنَا السَّلَامَ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ الصَّلَاةُ عَلَيْكَ؟ قَالَ «قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»[١].

واتە: حەکەم ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەبو لەیلا بوو گوتی: کەعبی کوڕی عوجرە هاتە لام و گوتی: ئایا دیاریەکت پێ نەدەم؟ (جا گوتی:) پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان، ئێمەش پێیان گوت: لە ڕاستیدا ئێمە فێربووین کە چۆن سەلامت لێبکەین، ئەی صەڵاواتدان لەسەر جەنابت چۆنە و چۆن دەبێ؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: بڵێن: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ».

٩٠٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ، عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، أَنَّهُمْ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُمِرْنَا بِالصَّلَاةِ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ فَقَالَ: قُولُوا: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَأَزْوَاجِهِ، وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَأَزْوَاجِهِ، وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْعَالَمِينَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمڕی کوڕی حەزمەوە لە باوکییەوە لە عەمڕی کوڕی سولەیمی زوڕەقییەوە لە ئەبو حومەیدی ساعیدییەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویانە: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانمان پێکراوە کە صەڵاواتت لەسەر لێبدەین، جا ئایا صەڵاواتدان لەسەر جەنابت چۆنە؟ ئەویش فەرمووی: بڵێن: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَأَزْوَاجِهِ، وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَأَزْوَاجِهِ، وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْعَالَمِينَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ».

٩٠٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَحْسِنُوا الصَّلَاةَ عَلَيْهِ، فَإِنَّكُمْ لَا تَدْرُونَ، لَعَلَّ ذَلِكَ يُعْرَضُ عَلَيْهِ، قَالَ: فَقَالُوا لَهُ: فَعَلِّمْنَا، قَالَ، قُولُوا: «اللَّهُمَّ اجْعَلْ صَلَاتَكَ، وَرَحْمَتَكَ، وَبَرَكَاتِكَ عَلَى سَيِّدِ الْمُرْسَلِينَ، وَإِمَامِ الْمُتَّقِينَ، وَخَاتَمِ النَّبِيِّينَ، مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ، إِمَامِ الْخَيْرِ، وَقَائِدِ الْخَيْرِ، وَرَسُولِ الرَّحْمَةِ، اللَّهُمَّ ابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا، يَغْبِطُهُ بِهِ الْأَوَّلُونَ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٧٠، ومسلم: ٤٠٦، وأبو داود: ٩٧٦، والترمذي: ٤٨٣، والنسائي: ١٢٨٧_١٢٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٦٩، ومسلم: ٤٠٧، وأبو داود: ٩٧٩.

وَالْآخِرُونَ، اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»[(١)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ گوتوویەتی: هەرکات صەڵاواتتاندا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە بە جوانترین شێوە صەڵاواتی لەسەر لێبدەن، چونکە بەڕاستی ئێوە نازانن بەڵکو ئەو صەڵاواتەی ئێوەی پێبگات، دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: پێیان گوت: کەواتە فێرمان بکە (چۆن صەڵاوات لێبدەین؟)، فەرمووی: بڵێن: خوایە ڕەحمەت و سۆز و بەرەکەتت بڕێژە بەسەر گەورەی پێغەمبەران و پێشەوای پارێزکاران و کۆتایی پێغەمبەران کە موحەممەدە ﷺ، بەندە و نێردراوی تۆیە و پێشەوای چاکە و خێرە، وە سەرکردە و سەرمەشقی چاکە و خێرە، وە پێغەمبەری ڕەحمەت و سۆزە، خوای میهرەبان ئەو شوێنەی پێ ببەخشە کە لە یەکەم تا کۆتا کەس خۆزگەی بۆ دەخوازێ، کە بریتیە لە مەقامی مەحمود لە ڕۆژی دواییدا، خوایە ڕەحمەت و سۆزت بڕێژی بەسەر موحەممەددا ﷺ وە بەسەر ئال و بەیتی موحەممەددا ﷺ، هەروەک چۆن ڕەحمەتت ڕژاندووە بەسەر ئیبڕاهیمدا و بەسەر ئال و بەیتی ئیبراهیمدا، وە هەر تۆ سوپاسکراو و شایستەی سوپاسی، وە گەورەیی و بەرزی هەر بۆ تۆیە، خودایە بەرەکەتی خۆت بڕێژە بەسەر موحەممەد ﷺ و ئالی موحەممەددا ﷺ وەک چۆن بەرەکەتت ڕژاندووە بەسەر ئیبڕاهیم و ئالی ئیبڕاهیمدا، وە هەر تۆ سوپاسکرا و خاوەنی گەورەیی و بەرزیت.

٩٠٧- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصَلِّي عَلَيَّ، إِلَّا صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ مَا صَلَّى عَلَيَّ، فَلْيُقِلَّ الْعَبْدُ مِنْ ذَلِكَ أَوْ لِيُكْثِرْ»[(٢)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیعە ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێک صەڵاوات لەسەر من لێبدا، ئەوە بێگومان فریشتەکانیش بە ئەندازەی ئەو صەڵاواتەی کە لەسەر منی لێداوە صەڵاواتی لەسەر لێدەدەن، جا ئەگەر بەندە کەم صەڵاوات لێبدات یان زۆر.

---

(١) صحیح.

(٢) حسن.

٩٠٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَسِيَ الصَّلَاةَ عَلَيَّ، خَطِئَ طَرِيقَ الْجَنَّةِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک واز لە صەڵاواتدان لەسەر من بهێنێ ئەوە ڕێگای بەهەشتی هەڵە کردوە.

## بابەت: ئەوەی کە لە تەحییاتدا دەگوترێ وە صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ

٩٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا فَرَغَ أَحَدُكُمْ مِنَ التَّشَهُّدِ الْأَخِيرِ، فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێکتان کاتێک لە خوێندنی تەحییاتی ئاخر بۆوە با پەناگری بە خوا بکات لە چوار (شت): لە سزای دۆزەخ و لە سزای ناوگۆڕ و لە فیتنەو ئاشووبی ژیان و مردن وە لە فیتنەی دەجال.

٩١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لِرَجُلٍ «مَا تَقُولُ فِي الصَّلَاةِ؟» قَالَ: أَتَشَهَّدُ، ثُمَّ أَسْأَلُ اللَّهَ الْجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِهِ مِنَ النَّارِ، أَمَا وَاللَّهِ مَا أُحْسِنُ دَنْدَنَتَكَ، وَلَا دَنْدَنَةَ مُعَاذٍ، فَقَالَ: «حَوْلَهَا نُدَنْدِنُ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: لە نوێژدا چی دەڵێی؟ (پیاوەکە) گوتی: تەحییات دەخوێنم، پاشان داوای بەهەشت لە خوا دەکەم و، پەنادەگرم بە خوا لە دۆزەخ، بەڵام سوێند بە خوا ئەوەی ئەتۆ و مەعاز دەیڵێن: من بەجوانی نازانم بیڵێم (واتە: نازانم وەک ئێوە بیڵێم)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئێمەش هەر لە دەوری بەهەشت دەدوێین (لە نوێژدا).

**الدندنة:** ئەوەیە کە ئەو کەسەی لای تۆیە گوێی لە دەنگتە، بەڵام لە قسەکانت تێناگات، نازانی چی دەڵێی.

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٧٧، ومسلم: ٥٨٨، وأبو داود: ٩٨٣، والنسائي: ١٣١٠ و ٥٥١٢_٥٥١٨ و ٥٥٢٠.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٧٩٢ عن بعض أصحاب النبي ﷺ. وانظر: رقم: ٣٨٤٧.




## بابەت: ئاماژەی (پەنجەی شایەتمان) لە تەحییاتدا

**٩١١-** عَنْ مَالِكِ بْنِ نُمَيْرٍ الْخُزَاعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، وَاضِعًا يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى فِي الصَّلَاةِ، وَيُشِيرُ بِإِصْبَعِهِ»[1].

واتە: مالیکی کوڕی نومەیری خوزاعیی لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە لە نوێژدا کە دەستی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دادەنا، وە بە پەنجەی ئاماژەی دەکرد (یان ئاماژەی بە پەنجە دەکرد لە تەحییاتدا).

**٩١٢-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ حَلَّقَ بِالْإِبْهَامِ وَالْوُسْطَى، وَرَفَعَ الَّتِي تَلِيهِمَا، يَدْعُو بِهَا فِي التَّشَهُّدِ»[2].

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە کە پەنجە گەورەو پەنجەی ناوەڕاستی دەکردە ئاڵقە (بە یەکی دەگەیاندن) وە ئەو پەنجەی نێوان ئەوانی بەرز دەکردەوە (پەنجەی شایەتمان) لە تەحییاتدا دوعای پێدەکرد (واتە: لە کاتی دوعاکردنەکەدا بەرزی دەکردەوە).

**٩١٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ، وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَرَفَعَ إِصْبَعَهُ الْيُمْنَى الَّتِي تَلِي الْإِبْهَامَ، فَيَدْعُو بِهَا، وَالْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ بَاسِطَهَا عَلَيْهَا»[3].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە هەرکات پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنیشت لە نوێژدا، ئەوا دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دادەناو پەنجەی (شایەتمانی) دەستی ڕاستی کە لەدوای پەنجە گەورەیە بەرزی دەکردەوە و دوعای پێدەکرد، وە (دەستی) چەپیشی لەسەر ئەژنۆی (چەپی) دادەناو درێژی دەکردو ڕایدەخست.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٩٩١، والنسائي: ١٢٧١ و ١٢٧٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٠، والترمذي: ٢٩٤، والنسائي: ١١٦٠ و ١٢٦٦ و ١٢٦٧ و ١٢٦٩.

## بابەت: سەلام دانەوەی نوێژ

**٩١٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ «يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ»[1].

**واتە:** عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای ڕاست و چەپدا سەلامی دەدایەوە (بەجۆرێک سەلامی دەدایەوە کە) سپییەتی ڕوومەتی دەبینرا، (وە وتەی سەلام دانەوەکەی ئاوا بوو کە دەیفەرموو:) «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ».

**٩١٥-** عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ يَسَارِهِ»[2].

**واتە:** عامیری کوڕی سەعد لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ڕاست و چەپدا سەلامی دەدایەوە.

**٩١٦-** عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ يَسَارِهِ، حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ»[3].

**واتە:** عەممارى کوڕی یاسر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ڕاست و چەپدا سەلامی دەدایەوە، بە جۆرێک کە سپییەتی ڕومەتی دەبینرا، (دەیفەرموو:) «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ».

**٩١٧-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: «صَلَّى بِنَا عَلِيٌّ، يَوْمَ الْجَمَلِ، صَلَاةً ذَكَّرَنَا صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَإِمَّا أَنْ نَكُونَ نَسِينَاهَا، وَإِمَّا أَنْ نَكُونَ تَرَكْنَاهَا، فَسَلَّمَ عَلَى يَمِينِهِ وَعَلَى شِمَالِهِ»[4].

**واتە:** ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی (جەنگی) جەمەلدا عەلی نوێژی بۆ کردین کە نوێژی پێغەمبەری خوای ﷺ بیرخستینەوە، جا یان ئێمە لەبیرمان چووبۆوە یان تەرکمان کردبوو (سەلامدانەوەی دووەم لە دوای نوێژ) ئنجا عەلی بەلای ڕاست و چەپدا سەلامی دایەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٩٩٦، والترمذي: ٢٩٥، والنسائي: ١٣١٩ و ١٣٢٤ و ١٣٢٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٢، والنسائي: ١٣١٦ و ١٣١٧.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) منكر. وأما السلام يميناً ويساراً فصحيح ليغره.

## بابەت: یەک سەلام دانەوە لە نوێژدا

**٩١٨-** عَنْ عَبْدُ الْمُهَيْمِنِ بْنُ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَلَّمَ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً تِلْقَاءَ وَجْهِهِ»[١].

واتە: عەبدولموهەیمینی کوڕی عەبباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی لە باوکییەوە، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووبەڕووی خۆی سەلامی داوەتەوە بە یەک سەلام دانەوە.

**٩١٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً تِلْقَاءَ وَجْهِهِ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووە و ڕووی خۆی سەلامی داوەتەوە بە یەک سەلام دانەوە.

**٩٢٠-** عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى، فَسَلَّمَ مَرَّةً وَاحِدَةً»[٣].

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی نوێژی کرد، کە یەک جار سەلامی دایەوە.

## بابەت: وەڵامدانەوەی سەلامی ئیمام (پێشنوێژ)

**٩٢١-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَلَّمَ الْإِمَامُ، فَرُدُّوا عَلَيْهِ»[٤].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکات پێشنوێژ (ئیمام) سەلامی دایەوە، وەڵامی سەلامەکەی بدەنەوە.

**٩٢٢-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُسَلِّمَ عَلَى أَئِمَّتِنَا، وَأَنْ يُسَلِّمَ بَعْضُنَا عَلَى بَعْضٍ»[٥].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٩٦.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٠٠١.

(٥) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٠٠١.

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین کە سەلام لە ئیمام و پێشنوێژەکانمان بکەین، وە لە نێوان خۆشماندا سەلام لە یەکتر بکەین.

## بابەت: ئەوەی کە نابێ ئیمام تەنها دوعا بۆخۆی بکات

٩٢٣- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَؤُمُّ عَبْدٌ فَيَخُصَّ نَفْسَهُ بِدَعْوَةٍ دُونَهُمْ، فَإِنْ فَعَلَ فَقَدْ خَانَهُمْ»[١].

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەک کە پێشنوێژی بکات و تەنها دوعای تایبەت بە خۆی بکات و بۆ ئەوانیتر دوعا نەکات، جا ئەگەر وای کرد ئەوە بەدڵنیایی ناپاکی لەگەڵ کردوون.

## بابەت: ئەوەی کە لەدوای سەلام دانەوە دەگوترێ

٩٢٤- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَلَّمَ لَمْ يَقْعُدْ إِلَّا مِقْدَارَ مَا يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک سەلامی دەدایەوە تەنها بە ئەندازەی ئەوەندە (بەرامبەر قیبلە) دادەنیشت کە بڵێ: خوایە تۆ خۆت خاوەنی ئاشتی و هێمنی، وە ئاشتی هەر لە تۆوەیە، بەرز و پیرۆزیت خاوەنی شکۆ و ڕێزی.

٩٢٥- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ إِذَا صَلَّى الصُّبْحَ حِينَ يُسَلِّمُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا، وَرِزْقًا طَيِّبًا، وَعَمَلًا مُتَقَبَّلًا»[٣].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کە نوێژی بەیانی دەکرد و سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: خوایە داوای زانستێکت لێدەکەم کە سوودبەخش بێ (بۆ دونیا و قیامەت) وە (داوای) ڕۆزی حەڵاڵ و پاکت لێدەکەم، وە کردەوەیەک کە وەرگیراو بێ.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٩٠، والترمذي: ٣٥٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٩٢، وأبو داود: ١٥١٢، والترمذي: ٢٩٨ و ٢٩٩، والنسائي: ١٣٣٨.

(٣) حسن.

٩٢٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «خَصْلَتَانِ لَا يُحْصِيهِمَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَهُمَا يَسِيرٌ، وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ، يُسَبِّحُ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ عَشْرًا، وَيُكَبِّرُ عَشْرًا، وَيَحْمَدُ عَشْرًا» فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَعْقِدُهَا بِيَدِهِ، «فَذَلِكَ خَمْسُونَ وَمِائَةٌ بِاللِّسَانِ، وَأَلْفٌ وَخَمْسُمِائَةٍ فِي الْمِيزَانِ، وَإِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ، سَبَّحَ، وَحَمِدَ، وَكَبَّرَ مِائَةً، فَتِلْكَ مِائَةٌ بِاللِّسَانِ، وَأَلْفٌ فِي الْمِيزَانِ، فَأَيُّكُمْ يَعْمَلُ فِي الْيَوْمِ أَلْفَيْنِ وَخَمْسَمِائَةِ سَيِّئَةٍ» قَالُوا: وَكَيْفَ لَا يُحْصِيهِمَا؟ قَالَ «يَأْتِي أَحَدَكُمُ الشَّيْطَانُ، وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ، فَيَقُولُ: اذْكُرْ كَذَا وَكَذَا، حَتَّى يَنْفَكَّ الْعَبْدُ لَا يَعْقِلُ، وَيَأْتِيهِ وَهُوَ فِي مَضْجَعِهِ، فَلَا يَزَالُ يُنَوِّمُهُ حَتَّى يَنَامَ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو خەسڵەت هەن ئەگەر مسوڵمان لەسەری بەردەوام بێ ئەوە دەچێتە بەهەشت، ئەو دووانەش ئاسانن و ئەوانەی کاریان پێدەکەن کەمن، (یەکەم ئەوەیە کە) لە دوای هەر نوێژێک دە جار بڵێ: «سبحان الله»، دە جار بڵێ: «الله أكبر»، دە جار بڵێ: «الحمد لله»، (عەبدوڵڵا گوتی:) جا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە دەستی حیسابی دەکرد کە ئەوە دەکاتە: سەد و پەنجا بە زوبان و هەزار و پێنج سەد لە تەرازوودا، وە کاتێک هاتە ناو جێگا لە «سبحان الله» و «الحمد لله» و «الله أكبر» (بە هەموویان) سەد تەواو بکات، ئەوەش سەد دەکات بە زوبان و لە تەرازووشدا دەکاتە هەزار (چاکە)، جا باشە کێ لە ئێوە لە ڕۆژێکدا دوو هەزار و پێنج سەد خراپە دەکات؟ (ئەوانەی کە ئامادەبوون) گوتیان: جا چۆن دەبێ (مسوڵمان) پارێزگاریيان لێنەکات؟ ئەویش فەرمووی: شەیتان دێتە لای یەکێکتان لە کاتێکدا کە لە نوێژدایە، جا پێی دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: ئەوە و ئەوەت لەبیر بێ (شتی بیردەخاتەوە و سەرقاڵی دەکات) تا وای لێدێ ئەو کەسە واز دێنێ و هۆشی لێنامێنێ (کە ئەو زیکرانە بکات)، وە هەروەها شەیتان دێتە لای لەو کاتەی کە لەسەر جێگایە، (خەوی لێ دەخات) وای لێدەکات کە تەنها خەیاڵی لەلای خەوەکە بێت بەردەوام تاکو خەوی لێدەکەوێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٦٥، والترمذي: ٣٤١٠، والنسائي: ١٣٤٨.

٩٢٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ - وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ - ذَهَبَ أَهْلُ الْأَمْوَالِ وَالدُّثُورِ بِالْأَجْرِ، يَقُولُونَ كَمَا نَقُولُ، وَيُنْفِقُونَ وَلَا نُنْفِقُ، قَالَ لِي «أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَمْرٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ أَدْرَكْتُمْ مَنْ قَبْلَكُمْ، وَفُتُّمْ مَنْ بَعْدَكُمْ، تَحْمَدُونَ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ، وَتُسَبِّحُونَهُ، وَتُكَبِّرُونَهُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَأَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ» قَالَ سُفْيَانُ: «لَا أَدْرِي أَيَّتُهُنَّ أَرْبَعٌ»[١].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: بە پێغەمبەر ﷺ گوترا، - وە پێم وایە ئەبو سوفیان گوتی: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ - ئەوانەی خاوەنی سەروەت و سامانن پاداشتیان زۆرترە، (چونکە) ئەوەی ئێمە دەیڵێین ئەوانیش دەیڵێن، وە ماڵیش دەبەخشن لە کاتێکدا کە ئێمە نایبەخشین (چونکە نەدارین)، پێغەمبەریش ﷺ پێمی فەرموو: هەواڵی شتێکتان پێبدەم کە ئەگەر ئەنجامی بدەن بەوانەی پێش خۆتان دەگەنەوە (لە پاداشتدا) وە ئەوانەی دوای خۆتان بەئێوە ناگەنەوە؟ لە دوای هەموو نوێژێک بڵێن: «سبحان الله»، بڵێن: «الحمد لله»، بڵێن: «الله أكبر» سی و سێ جار سی و سێ جار سی و چوار جار، سوفیان گوتی: نازانم چوارەکە بۆ کامیان بوو.

٩٢٨- عَنْ أَبُو أَسْمَاءَ الرَّحَبِيُّ ﷺ، قَالَ: قَالَ ثَوْبَانُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلَاتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ»[٢].

واتە: ئەبو ئەسمائی ڕەحەبیی ﷺ دەڵێ: سەوبان گوتی: بێگومان کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژ تەواو دەبوو سێ جار «أستغفر الله»ی دەکرد (داوای لێخۆشبون لە خوا) پاشان دەیفەرموو: خودایە! خۆت سەلامی و سەلام و هێمنیش هەر لە تۆوەیە، بەڕاستی گەورە و پیرۆز و بەرزیت و خاوەن شکۆ و ڕێزیت.

## بابەت: تەواو بوون و کۆتایی هێنان بە نوێژ

٩٢٩- عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هُلْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: «أَمَّنَا النَّبِيُّ ﷺ، فَكَانَ يَنْصَرِفُ عَنْ جَانِبَيْهِ جَمِيعًا»[٣].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٩١، وأبو داود: ١٥١٣، والترمذي: ٣٠٠، والنسائي: ١٣٣٧.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ١٠٤١، والترمذي: ٣٠١.




واتە: قەبیصەی كوڕی هولب لە باوكی ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی بۆ دەكردین و بە هەردوو لادا (لای ڕاست و لای چەپ) ڕووی دەسوڕاندو دەڕۆیشت.

تێبینی: لە دوای تەواو بوونی نوێژ، بیویستبایە بڕوات جیاوازی نەدەكرد بە هەر لایەكدا ڕۆیشتبایە، لای ئاسایی بوو.

٩٣٠- عَنِ الْأَسْوَدِ ﷺ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: «لَا يَجْعَلَنَّ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطَانِ فِي نَفْسِهِ جُزْءًا، يَرَى أَنَّ حَقًّا لِلَّهِ عَلَيْهِ أَنْ لَا يَنْصَرِفَ إِلَّا عَنْ يَمِينِهِ، قَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَكْثَرُ انْصِرَافِهِ عَنْ يَسَارِهِ»[١].

واتە: ئەسوەد ﷺ دەڵێ: عەبدوڵلا گوتوویەتی: هیچ یەكێكتان لە دەروونیدا شتێكی بچوكیش بۆ شەیتان دانەنێ (بەهۆی بیر و بڕوای بەتاڵ و بێجێ) كە پێی وابێ واجبی خوایە لەسەری كە كاتێک لە نوێژ دەبێتەوە تەنها بۆی هەیە بەلای ڕاستدا بڕوات و جێگای نوێژ بەجێ بێڵێ (نەخێر وانیە، چونكە) لە ڕاستییدا من پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە بە زۆری بەلای چەپدا دەڕۆیشت و لە جێگای نوێژ دەردەچوو.

٩٣١- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، «يَنْفَتِلُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ فِي الصَّلَاةِ»[٢].

واتە: عەمری كوڕی شوعەیب لە باوكییەوە، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لە نوێژ و جێگای نوێژ دەردەچوو، بە هەردوو لای ڕاست و چەپدا دەردەچوو.

٩٣٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «إِذَا سَلَّمَ قَامَ النِّسَاءُ حِينَ يَقْضِي تَسْلِيمَهُ، ثُمَّ يَلْبَثُ فِي مَكَانِهِ يَسِيرًا قَبْلَ أَنْ يَقُومَ»[٣].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێک سەلامی دەدایەوە لە نوێژ ئافرەتان هەڵدەستان كاتێ سەلامدانەوەكەی تەواو دەبوو، پاشان (پێغەمبەر ﷺ) كەمێک لە شوێنەكەی خۆی دەمایەوە، پێش ئەوەی كە هەڵسێ (بڕوات).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٥٢، ومسلم: ٧٠٧، وأبو داود: ١٠٤٢، والنسائي: ١٣٦٠.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٣٧، وأبو داود: ١٠٤٠، والنسائي: ١٣٣٣.

## بابەت: کاتێک کاتی نوێژ دێت و نانی ئێوارەش دانراوە

**٩٣٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا وُضِعَ الْعَشَاءُ، وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک نانی ئێوارە دانرا و قامەتی نوێژ کرا، سەرەتا دەست بە نان خواردنەکە بکەن.

**٩٣٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وُضِعَ الْعَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ» قَالَ: فَتَعَشَّى ابْنُ عُمَرَ لَيْلَةً، وَهُوَ يَسْمَعُ الْإِقَامَةَ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکات نانی ئێوارە دانرا و قامەت بۆ نوێژ کرا، ئەوە سەرەتا نان بخۆن، ڕاوی دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ شەوێک نانی دەخوارد و گوێشی لە قامەتی نوێژکردن بوو.

**٩٣٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا حَضَرَ الْعَشَاءُ، وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر نانی ئێوارە ئامادەبوو لەو کاتەشدا قامەتی نوێژ کرا، ئەوە دەست بە نان خواردنەکە بکەن.

## بابەت: نوێژی جەماعەت لە شەوی باراناویدا

**٩٣٦-** عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ ﷺ، قَالَ: خَرَجْتُ فِي لَيْلَةٍ مَطِيرَةٍ، فَلَمَّا رَجَعْتُ اسْتَفْتَحْتُ، فَقَالَ أَبِي: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: أَبُو الْمَلِيحِ، قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَأَصَابَتْنَا سَمَاءٌ، لَمْ تَبُلَّ أَسَافِلَ نِعَالِنَا، فَنَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ «صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٢، ومسلم: ٥٥٧، والترمذي: ٣٥٣، والنسائي: ٨٥٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٣، ومسلم: ٥٥٩، وأبو داود: ٣٧٥٧، والترمذي: ٣٥٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧١، ومسلم: ٥٥٨.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٥٩، والنسائي: ٨٥٤.

واتە: ئەبو مەلیحە ﷺ دەڵێ: شەوێکی باراناوی لە ماڵ دەرچووم، جا کاتێک گەڕامەوە داوای دەرگا کردنەوەم کرد (لە دەرگامدا)، جا باوکم گوتی: ئەوە کێیە؟ گوتم: ئەبو مەلیحم، گوتی: لە ڕۆژی حودەیبییە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین و بارانمان بەسەردا باری (بارانێک) کە ژێر نەعلەکانمانی تەڕ نەکرد، (واتە: بارانێکی زۆر کەم)، بانگبێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی ڕاهێشت (گوتی): لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن.

**٩٣٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُنَادِي مُنَادِيهِ فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ، أَوِ اللَّيْلَةِ الْبَارِدَةِ ذَاتِ الرِّيحِ «صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لە شەوی باراناویدا، یان لە شەوێکدا کە سارد بووایە و بای هاتبایە، ئەوە بانگ بێژەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی ڕادەهێشت کە لە شوێن و ماڵەکانی خۆتاندا نوێژ بکەن.

**٩٣٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ، يَوْمِ مَطَرٍ، «صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژێکی باراناوی جومعەدا فەرمووی: لە شوێن و ماڵەکانی خۆتان نوێژ بکەن.

**٩٣٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ ﷺ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ، أَمَرَ الْمُؤَذِّنَ أَنْ يُؤَذِّنَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَذَلِكَ يَوْمٌ مَطِيرٌ، فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: نَادِ فِي النَّاسِ فَلْيُصَلُّوا فِي بُيُوتِهِمْ فَقَالَ لَهُ النَّاسُ: مَا هَذَا الَّذِي صَنَعْتَ؟ قَالَ: «قَدْ فَعَلَ هَذَا مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي، تَأْمُرُنِي أَنْ أُخْرِجَ النَّاسَ مِنْ بُيُوتِهِمْ، فَيَأْتُونِي يَدُوسُونَ الطِّينَ إِلَى رُكَبِهِمْ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی نەوفەل ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئیبنو عەبباس لە ڕۆژی جومعەدا فەرمانی بە بانگبێژ کرد کە بانگ بڵێ، وە ئەو ڕۆژە باراناوی بوو، ئنجا (بانگبێژ) گوتی: «أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ»، پاشان بانگی ڕاهێشت لە ناو خەڵکدا کە نوێژەکەتان لە ماڵەکانتان بکەن، ئنجا خەڵکی پێیان

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٢، ومسلم: ٦٧٩، وأبو داود: ١٠٦٠_١٠٦٣، والنسائي: ٦٥٤.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ٦١٦ و ٦٦٨ و ٩٠١، ومسلم: ٦٩٩.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ٦١٦ و ٦٦٨ و ٩٠١، ومسلم: ٦٩٩.

گوت: ئەوە چ کارێک بوو کردت؟ گوتی: ئەو کارە کەسێک کردوویەتی (پێش من) کە زۆر لە من باشتر بووە (مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە) فەرمانم پێدەکەی کە خەڵکی لەماڵەکانیان بێنمەدەر (بۆ نوێژ) جا بێن و تاکو ئەژنۆیان بە قوڕ و لیتەوە بن.

## بابەت: ئەو شتەی کە گونجاوە بۆ بەربەستی نوێژ خوێن

**٩٤٠-** عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي وَالدَّوَابُّ تَمُرُّ بَيْنَ أَيْدِينَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مِثْلُ مُؤَخَّرَةِ الرَّحْلِ، تَكُونُ بَيْنَ يَدَيْ أَحَدِكُمْ، فَلَا يَضُرُّهُ مَنْ مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ»[١].

واتە: موسای کوڕی تەڵحە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئێمە نوێژمان دەکردو ماڵات و ئاژەڵیش بە بەردەمماندا هاتوچۆی دەکرد، جا ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، فەرمووی: شتێکی بەرز بە ئەندازەی قوتکەی دواوەی کۆپانەی حوشتر (کە پاڵی پێوە دەدرێ لە کاتی دانیشتن لەسەری) لە پێش خۆتان دابنێن (لە کاتی نوێژ کردندا) ئەوکاتە هاتوچۆی ئەو کەسەی بە بەردەمتان دێ و دەچێ، هیچ زیانێک بە نوێژەکەتان ناگەیەنێ.

**سُتْرَة:** ئەو شتەیە کە نوێژ خوێن لە بەردەم خۆی دایدەنێ، تاکو خەڵکی بە پێشی دانەیەن لە کاتی نوێژ کردندا.

**٩٤١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، تُخْرَجُ لَهُ حَرْبَةٌ فِي السَّفَرِ، فَيَنْصِبُهَا، فَيُصَلِّي إِلَيْهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە لە سەفەر بووایە، ئەوە حەڕبەیەکیان بۆ دەهێنا (وەکو بەربەستێک) دەیانچەقاند، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) لە بەرانبەری نوێژی دەکرد.

**٩٤٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، حَصِيرٌ، يُبْسَطُ بِالنَّهَارِ، وَيَحْتَجِرُهُ بِاللَّيْلِ يُصَلِّي إِلَيْهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٩٩، وأبو داود: ٦٨٥، والترمذي: ٣٣٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٧٢، ومسلم: ٥٠١، وأبو داود: ٦٨٧، والنسائي: ٧٤٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٣٠، ومسلم: ٧٨٢/٢١٥، والنسائي: ٧٦٢.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەسیرێکی هەبوو کە ڕۆژانە ڕایدەخست و شەوانەش دەیکرد بە بەربەست بۆ شەونوێژ (بۆ ئەوەی کەس بە دەوروبەریدا نەڕوات و خشوعی نوێژەکەی لێ تێک نەدەن).

**٩٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ، فَلْيَجْعَلْ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ شَيْئًا، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ، فَلْيَنْصِبْ عَصًا، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ، فَلْيَخُطَّ خَطًّا، ثُمَّ لَا يَضُرُّهُ مَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد با شتێک (وەک بەربەست) لە بەردەم خۆی دابنێ، ئەگەر هیچی دەست نەکەوت با داردەستەکەی دەستی بچەقێنێ، ئەگەر ئەویش نەبوو، با خەتێک بکێشێ، پاشان هەر شتێک بە بەردەمیدا هاتوچۆ بکات زیان لە نوێژەکەی نادات.

## بابەت: هاتوچۆکردن بە بەردەم نوێژ خوێندا

**٩٤٤-** عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ ﵁، قَالَ: أَرْسَلُونِي إِلَى زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ أَسْأَلُهُ عَنِ الْمُرُورِ، بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، فَأَخْبَرَنِي عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَأَنْ يَقُومَ أَرْبَعِينَ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ» قَالَ سُفْيَانُ: فَلَا أَدْرِي أَرْبَعِينَ سَنَةً، أَوْ شَهْرًا، أَوْ صَبَاحًا، أَوْ سَاعَةً[2].

واتە: بوسری کوڕی سەعید ﵁ دەڵێ: ناردیانم بۆ لای زەیدی کوڕی خالید تاکو پرسیاری حوکمی هاتوچۆکردن بە بەردەم نوێژخوێندا لێبکەم، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر (کەسێک) چل ڕابوەستێ بۆی باشترە لەوەی بە بەردەم نوێژخوێندا تێپەڕێ، سوفیان دەڵێ: جا نازانم (مەبەستی لە چلەکە) چل ساڵ بوو، یان چل مانگ بوو، یان چل ڕۆژ بوو، یان چل سەعات بوو.

**٩٤٥-** عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ ﵁، أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ، أَرْسَلَ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ الْأَنْصَارِيِّ يَسْأَلُهُ: مَا سَمِعْتَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيِ الرَّجُلِ وَهُوَ يُصَلِّي؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُكُمْ مَا لَهُ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْ أَخِيهِ وَهُوَ يُصَلِّي، كَانَ لَأَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ» قَالَ: لَا أَدْرِي أَرْبَعِينَ عَامًا، أَوْ أَرْبَعِينَ شَهْرًا، أَوْ أَرْبَعِينَ يَوْمًا «خَيْرٌ لَهُ مِنْ ذَلِكَ»[3].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٦٨٩ و ٦٩٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٠، ومسلم: ٥٠٧، وأبو داود: ٧٠١، والترمذي: ٣٣٦، والنسائي: ٧٥٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٠، ومسلم: ٥٠٧، وأبو داود: ٧٠١، والترمذي: ٣٣٦، والنسائي: ٧٥٦.

واتە: بوسری کوڕی سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە کە زەیدی کوڕی خالید ناردوویەتی بۆ لای ئەبو جوهەیمی ئەنصاری تاکو پرسیاری لێبکات کە چی بیستووە لە پێغەمبەرﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کە بە بەردەمی نوێژ خوێندا تێپەڕدەبێ کاتێک نوێژ دەکات، ئەویش گوتی: لە پێغەمبەرمﷺ بیستووە دەیفەرموو: ئەگەر هەر یەکێکتان بیزانیبایە چەند گوناهی دەگاتێ کە لە کاتی نوێژکردندا بە بەردەمی براکەیدا تێپەڕدەبێ، ئەوە ئەگەر چل ڕابوەستایە، ڕاوی دەڵێ: نازانم فەرمووی: چل ساڵ، یان چل مانگ، یان چل ڕۆژ، ڕابوەستایە زۆر بۆی باشتر بوو لەوە (کە بە بەردەمیدا تێپەڕێ).

**٩٤٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُكُمْ مَا لَهُ فِي أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْ أَخِيهِ، مُعْتَرِضًا فِي الصَّلَاةِ، كَانَ لَأَنْ يُقِيمَ مِائَةَ عَامٍ، خَيْرٌ لَهُ مِنَ الْخَطْوَةِ الَّتِي خَطَاهَا»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرەﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێکتان بزانێ چ تاوانێک دەکات کە لە نوێژدا بە بەردەمی براکەیدا تێپەڕدەبێ، ئەوە ئەگەر سەد ساڵ ڕابوەستێ بۆی باشترە لەو هەنگاوەی کە هەنگاوی نا.

## بابەت: ئەو شتانەی کە نوێژ دەبڕن

**٩٤٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي بِعَرَفَةَ، فَجِئْتُ أَنَا وَالْفَضْلُ عَلَى أَتَانٍ، فَمَرَرْنَا عَلَى بَعْضِ الصَّفِّ، فَنَزَلْنَا عَنْهَا وَتَرَكْنَاهَا، ثُمَّ دَخَلْنَا فِي الصَّفِّ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباسﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ لە عەرەفە نوێژی دەکرد، جا من و فەزڵ بە سواری ماکەرێک هاتین، جا بە بەردەم هەندێک ڕیزدا تێپەڕین، ئنجا دابەزین و ماکەرەکەمان بەرهەڵدا (تا بلەوەڕێ) پاشان بۆ خۆمان چووینە ناو ڕیزەکەوە (ڕیزی نوێژخوێنان).

**٩٤٨-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، «يُصَلِّي فِي حُجْرَةِ أُمِّ سَلَمَةَ» فَمَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ، أَوْ عُمَرُ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، فَقَالَ بِيَدِهِ، فَرَجَعَ، فَمَرَّتْ زَيْنَبُ بِنْتُ أُمِّ سَلَمَةَ، فَقَالَ: بِيَدِهِ هَكَذَا، فَمَضَتْ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «هُنَّ أَغْلَبُ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٦، ومسلم: ٥٠٤، وأبو داود: ٧١٥ و ٧١٦، والترمذي: ٣٣٧، والنسائي: ٧٥٢ و ٧٥٤.

(٣) ضعيف.




واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ژوورەکەی ئوممو سەلەمەدا نوێژی دەکرد، جا بە بەردەمیدا عەبدوڵڵا یان عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ڕابردن، ئەویش بە دەستی پێی فەرموو: بگەڕێوە، ئەویش گەڕایەوە، ئنجا زەینەبی کچی ئوممو سەلەمە هات ڕابیرێ بە بەردەمیدا، بە هەمان شێوە بە دەستی ئاماژەی بۆ کرد بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە، بەڵام زەینەب نەگەڕایەوە و ڕابرد، ئنجا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی تەواو بوو، فەرمووی: ئافرەتان زاڵترن (بەسەر پیاواندا).

**تێبینی:** کەواتە: ئافرەت نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، ئەگەر بە بەردەمی نوێژ خوێندا تێپەڕی، وەکو هەندێ کەس وای تێگەیشتووە لە هەندێ فەرموودە.

**٩٤٩- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْكَلْبُ الْأَسْوَدُ، وَالْمَرْأَةُ الْحَائِضُ»[1].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتی باڵغ و سەگی ڕەش نوێژ دەبڕن.

**٩٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْمَرْأَةُ، وَالْكَلْبُ، وَالْحِمَارُ»[2].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت و سەگ و گوێدرێژ نوێژ دەبڕن.

**٩٥١- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُغَفَّلٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْمَرْأَةُ، وَالْكَلْبُ، وَالْحِمَارُ»[3].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت و سەگ و گوێدرێژ نوێژ دەبڕن.

**تێبینی:** مەبەست لە (القطع): بریتی نیە لەوەی کە نوێژ بەتاڵ دەبێ!! بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە نوێژە ناتەواو دەبێ بە هۆی ئەوەی کە ئەوانە مرۆڤ مەشغوڵ دەکەن، کاتێک بە بەردەمیدا تێدەپەڕن، واتە: خشوعی نامێنێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٧٠٣، والنسائي: ٧٥١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥١١.

(٣) صحيح.

٩٥٢- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَقْطَعُ الصَّلَاةَ إِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيِ الرَّجُلِ مِثْلُ مُؤَخِّرَةِ الرَّحْلِ، الْمَرْأَةُ، وَالْحِمَارُ، وَالْكَلْبُ، الْأَسْوَدُ» قَالَ: قُلْتُ: مَا بَالُ الْأَسْوَدِ مِنَ الْأَحْمَرِ؟ فَقَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَمَا سَأَلْتَنِي، فَقَالَ: «الْكَلْبُ الْأَسْوَدِ شَيْطَانٌ»[1].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بە ئەندازەی قوتکەی کۆپانی دواوەی حوشتر لە پێش نوێژخوێن نەبێ وەکو بەربەست، ئەوە ئافرەت و گوێدرێژ و سەگی ڕەش نوێژەکەی دەبڕن (ئەگەر بە بەردەمیدا تێپەڕن)، ڕاوی فەرموودەکە دەڵێ: لە ئەبو زەڕم پرسی: سەگی ڕەش چییەتی لە چاو سەگی سوور؟ (واتە: جیاوازی چییە؟)، ئەویش گوتی: منیش ئەو پرسیارەی تۆم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، وەکو چۆن تۆ پرسیارت لێکردم، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: سەگی ڕەش شەیتانە.

## بابەت: پێشگیری کردنی تێپەڕبوون بەپێی توانا

٩٥٣- عَنِ الْحَسَنِ الْعُرَنِيِّ ﷺ، قَالَ ذُكِرَ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، مَا يَقْطَعُ الصَّلَاةَ، فَذَكَرُوا الْكَلْبَ، وَالْحِمَارَ، وَالْمَرْأَةَ، فَقَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي الْجَدْيِ؟ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُصَلِّي يَوْمًا، فَذَهَبَ جَدْيٌ يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَبَادَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْقِبْلَةَ»[2].

واتە: حەسەنی عوڕەنیی ﷺ دەڵێ: لە لای ئیبنو عەبباس ﷺ باسی ئەو شتانەیان دەکرد کە نوێژ دەبڕن، جا باسی سەگ و گوێدرێژ و ئافرەتیان کرد، ئەویش گوتی: ئەی چی دەڵێن: دەربارەی کاریلە (بێچووی بزن)؟ بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک نوێژی دەکرد، جا کاریلەیەک خەریک بوو کە بە پێش نوێژەکەیدا ڕەت ببێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێرایی لە ڕووی قیبلەوە پێشگیری لێکرد (نەیهێشت کە بە بەردەمیدا تێپەڕ بێ).

٩٥٤- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ، فَلْيُصَلِّ إِلَى سُتْرَةٍ، وَلْيَدْنُ مِنْهَا، وَلَا يَدَعْ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَإِنْ جَاءَ أَحَدٌ يَمُرُّ فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّهُ شَيْطَانٌ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥١٠، وأبو داود: ٧٠٢، والترمذي: ٣٣٨، والنسائي: ٧٥٠.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٩، ومسلم: ٥٠٥، وأبو داود: ٦٩٧ و ٦٩٨، والنسائي: ٧٥٧.

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعید لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد با بەربەستێک (لە پێش خۆی) دابنێ، وە لێی نزیک بێ، وە نەهێڵێ کەس بە بەردەمیدا تێپەڕ بێ، خۆ ئەگەر کەسێک ویستی تێپەڕی (نەگەڕایەوە) با بەرگری توندی لێ بکات، چونکە ئەوە شەیتان ئەو کارەی پێدەکات.

**فَلْيُقَاتِلْهُ:** واتە زۆر سوربێت لە گێڕانەوەی ئەو کەسەی کە دەیەوێ تێپەڕێ، نەک شەڕی تەواوی لەگەڵ بکات.

٩٥٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي، فَلَا يَدَعْ أَحَدًا، يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَإِنْ أَبَى، فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّ مَعَهُ الْقَرِينَ» وَقَالَ الْمُنْكَدِرِيُّ، فَإِنَّ مَعَهُ الْعُزَّى[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێکتان کاتێ نوێژ دەکات، با نەهێڵێ کەس بە بەردەمیدا تێپەڕێ، خۆ ئەگەر ئەو کەسە نکوڵی کرد، ئەوە با بەتوندی بەرگری بکات و نەهێڵێ بڕوات، چونکە لەو کاتەدا شەیتان لەگەڵیەتی ئەو کارەی پێدەکات. مونکەدیر دەڵێ: بێگومان عوززای لەگەڵە (بۆیە وا دەکات).

## بابەت: ئەو کەسەی لەکاتی نوێژکردندا شتێک لە پێشیەتی لە بەینی ئەو و قیبلە

٩٥٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، وَأَنَا مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، كَاعْتِرَاضِ الْجِنَازَةِ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ شەونوێژی دەکرد وەکو جەنازە دەکەوتمە نێوان پێغەمبەر ﷺو قیبلە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٠٦ دون قول المنكدري.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٣، ومسلم: ٥١٢، وأبو داود: ٧١١_٧١٤، والنسائي: ١٦٧ و ٧٥٩.

**٩٥٧-** عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّهَا ﷺ، قَالَتْ: «كَانَ فِرَاشُهَا بِحِيَالِ مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[١].

واتە: زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە لە دایکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: کە جێگاکەی لە بەرانبەری (ڕووبەڕووی) شوێنی سوجدەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە (یان لە بەرانبەر جێگای نوێژ کردنەکەی بووە).

**٩٥٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي مَيْمُونَةُ، زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يُصَلِّي وَأَنَا بِحِذَائِهِ، وَرُبَّمَا أَصَابَنِي ثَوْبُهُ إِذَا سَجَدَ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەدداد ﷺ دەڵێ: مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕامەوە و گوتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکردو منیش لە ڕووی ئەو بووم (بەرانبەری بووم) وە جار هەبوو لەگەڵ سوجدە بردندا پۆشاکەکەی بەر من دەکەوت.

**٩٥٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُصَلَّى خَلْفَ الْمُتَحَدِّثِ وَالنَّائِمِ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە نوێژ بکرێ بەرەو کەسێک کە قسەدەکات، یان خەوتووە (واتە: ئەو کەسانە نەکەونە پێشت کە نوێژ دەکەی، چونکە سەرقاڵ دەبی بە قسەکردنەکەیان، یان پرخەپرخی خەوتوو، یان قسەکردنی لە خەودا ... هتد).

## بابەت: قەدەغەکردنی پێشکەوتنی پێشنوێژ (ئیمام) لە سوجدە و ڕکووعدا

**٩٦٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَلِّمُنَا أَنْ «لَا نُبَادِرَ الْإِمَامَ بِالرُّكُوعِ، وَالسُّجُودِ، وَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٤٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٣ و ٣٧٩، ومسلم: ٥١٣، وأبو داود: ٦٥٦.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٦٩٤.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٢٢ و ٧٣٤، ومسلم: ٤١٤ و ٤١٥ و ٤١٦ و ٤١٧، وأبو داود: ٦٠٤، والنسائي: ٩٢١ و ٩٢٢.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فێری دەکردین کە لە سوجدە و ڕکووعدا پێش ئیمام نەکەوین، وە (دەیفەرموو) کە ئیمام «الله أکبر»ـی کرد ئێوەش بیکەن، وە ئەگەر ڕۆیشتە سوجدە ئێوەش سوجدە بەرن، (واتە: پێشی مەکەون هەمیشە لە دوای ئەو بن).

٩٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا يَخْشَى الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ الْإِمَامِ، أَنْ يُحَوِّلَ اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا ئەو کەسەی کە لە پێش ئیمامدا سەری بەرز دەکاتەوە (لە ڕکووع و سەجدە) ناترسێ کە خوا سەری بکاتە سەری گوێدرێژ!!

٩٦٢- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي قَدْ بَدَّنْتُ، فَإِذَا رَكَعْتُ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعْتُ فَارْفَعُوا، وَإِذَا سَجَدْتُ فَاسْجُدُوا، وَلَا أُلْفِيَنَّ رَجُلًا يَسْبِقُنِي إِلَى الرُّكُوعِ، وَلَا إِلَى السُّجُودِ»[2].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕاستیدا من بەساڵاچووم و قوڕس بووم، بۆیە کاتێک ڕکووعم برد ئەوکات ئێوەش ڕکووع بەرن، وە کاتێ هەڵسامەوە لە ڕکووع ئەوکات ئێوەش هەڵسنەوە، وە کاتێک چوومە سوجدە ئەوکات ئێوەش سوجدە بەرن، نەبینم یەکێکتان نە لە ڕکووع، نە لە سوجدە پێشم بکەوێ.

٩٦٣- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنُ أَبِي سُفْيَانُ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُبَادِرُونِي بِالرُّكُوعِ، وَلَا بِالسُّجُودِ، فَمَهْمَا أَسْبِقْكُمْ بِهِ إِذَا رَكَعْتُ تُدْرِكُونِي بِهِ إِذَا رَفَعْتُ، وَمَهْمَا أَسْبِقْكُمْ بِهِ إِذَا سَجَدْتُ تُدْرِكُونِي بِهِ إِذَا رَفَعْتُ، إِنِّي قَدْ بَدَّنْتُ»[3].

واتە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕکووع و لە سوجدەدا پێشم مەکەون، هەرچەند پێشتان بکەوم کاتێ ڕکووع دەبەم، ئەوە بە من دەگەنەوە کاتێ (کەمێک پێش ئێوە) لە ڕکووع هەڵدەستمەوە، وە کاتێک (کەمێک) پێش ئێوە دەچمە سوجدە، ئەوە دەگەنەوە بە من کاتێک (کەمێک) پێش ئێوە لە سوجدە هەڵدەستمەوە، چونکە بەڕاستی من بەساڵاچووم و قوڕس بووم.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٩١، ومسلم: ٤٢٧، وأبو داود: ٦٢٣، والترمذي: ٥٨٢، والنسائي: ٨٢٨.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٦١٩.

**تێبینی:** مانای ئەو فەرموودەیە ئاوایە: ئەگەر کەمێک دوای ئیمام بچیە ڕکووع، ئەوە ئەو کەمە قەرەبوو دەبێتەوە کاتێک کە ئیماميش کەمێک پێشتر لە تۆ لە ڕکووع هەڵدەستێتەوە، لە سوجدەش بە هەمان شێوە.

## بابەت: ئەو شتانەی کە لە نوێژدا ناپەسەندن

**٩٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنَ الْجَفَاءِ أَنْ يُكْثِرَ الرَّجُلُ مَسْحَ جَبْهَتِهِ قَبْلَ الْفَرَاغِ مِنْ صَلَاتِهِ»[١].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی لە وشکی و زێدەڕۆییە کە مرۆڤ زۆر دەستی بە نێو چاوانی دابێنێ لە نوێژدا پێش ئەوەی لە نوێژ تەواوبێ (واتە: چونکە ئەوکاتە مزگەوتەکان وەکو ئێستا ڕاخەری تێدا نەبووە، بۆیە لەگەڵ هەر سوجدە بردنێکدا ناوچەوانیان بە خۆڵ بووە).

**٩٦٥- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تُفَقِّعْ أَصَابِعَكَ وَأَنْتَ فِي الصَّلَاةِ»[٢].**

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ناو نوێژدا پەنجەکانت مەتەقێنە (مەقرچێنە).

**٩٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فَاهُ فِي الصَّلَاةِ»[٣].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە پیاو لە نوێژدا دەمی داپۆشێ (لە ناو عەرەبدا باو بووە کە پیاو بە لایەکی، یان پارچەکی لەو پۆشاک و قوماشەی کە لەسەری بووە دەمیشی پێداپۆشیوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بۆ ناو نوێژ قەدەغەی کرد).

**٩٦٧- عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «رَأَى رَجُلًا قَدْ شَبَّكَ أَصَابِعَهُ فِي الصَّلَاةِ، فَفَرَّجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَصَابِعِهِ»[٤].**

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) حسن.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٥٦٢، والترمذي: ٣٨٦.

واتە: كەعبی كوڕی عوجرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێكی بینی لە نوێژدا پەنجەی دەستەكانی خستبووە ناو یەک، پێغەمبەریش ﷺ دەستەكانی لە یەک بڵاوكردن و پەنجەكانی لە یەک جیاكردنەوە.

٩٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَضَعْ يَدَهُ عَلَى فِيهِ، وَلَا يَعْوِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَضْحَكُ مِنْهُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێكتان باوێشكی هات، با دەستی لەسەر دەمی دابنێ و هاوار نەكات (واتە: باوێشكەكە دەنگی دەرنەچێ)، چونكە بێگومان ئەو كات شەیتان پێی پێدەكەنێ.

٩٦٩- عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْبُزَاقُ، وَالْمُخَاطُ، وَالْحَيْضُ، وَالنُّعَاسُ فِي الصَّلَاةِ، مِنَ الشَّيْطَانِ»[٢].

واتە: عەددیی كوڕی سابیت لە باوكییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تف هاتن و بەڵغەم و حەیز و وەنەوز (خەوچكە) لە نوێژدا ئەوانە هەمووی لە شەیتانەوەیە (واتە: هەرچەند كارێكی كەمیشە، بەڵام شەیتان هەر پێی ڕازییە و، پێی خۆشە تا نوێژخوێن بێئاگا بكات).

## بابەت: ئەو كەسەی كە بەرنوێژی بۆ خەڵک دەكات و خەڵكیش پێیان خۆش نیە

٩٧٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا تُقْبَلُ لَهُمْ صَلَاةٌ، الرَّجُلُ يَؤُمُّ الْقَوْمَ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، وَالرَّجُلُ لَا يَأْتِي الصَّلَاةَ إِلَّا دِبَارًا - يَعْنِي بَعْدَ مَا يَفُوتُهُ الْوَقْتُ - وَمَنْ اعْتَبَدَ، مُحَرَّرًا»[٣].

---

(١) موضوع بزيادة «وَلاَ يَعْوِي» صحيح بدونها. تخريجه انفرد به ابن ماجه. وانظر البخاري: ٣٢٨٩ و ٦٢٢٦، ومسلم: ٢٩٩٤، وأبو داود: ٥٠٢٨، والترمذي: ٣٧٠.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٧٤٨.

(٣) ضعيف إلا الجملة الأولى منه فصحيحة. أخرجه أبو داود: ٥٩٣.

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ (کەس، یان سێ کۆمەڵ) هەن کە نوێژیان وەرناگیرێ، ئەو پیاوەی کە پێشنوێژی بۆ خەڵکانێک بکات کە پێیان خۆش نەبێ، وە ئەو پیاوەی کە نوێژ (بە ئەنقەست) دوادەخات و لە کاتی خۆیدا نایکات تاکو کاتی نوێژەکە دەڕوات، وە ئەو کەسەشی کە مرۆڤی ئازاد بکاتە کۆیلە (وەک ئەوەی بە زۆر و ستەم بیکاتە کۆیلە، یان توانای خۆ ئازاد کردنی هەبێ، بەڵام ڕێگای پێنەدات).

**٩٧١- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ثَلَاثَةٌ لَا تُرْفَعُ صَلَاتُهُمْ فَوْقَ رُءُوسِهِمْ شِبْرًا: رَجُلٌ أَمَّ قَوْمًا وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، وَامْرَأَةٌ بَاتَتْ وَزَوْجُهَا عَلَيْهَا سَاخِطٌ، وَأَخَوَانِ مُتَصَارِمَانِ»[1].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ (کەس، یان سێ کۆمەڵ) هەن کە نوێژەکانیان بستێک لەسەر سەریان بەرز نابێتەوە (واتە: لێیان وەرناگیرێ) ئەو پیاوەی کە پێشنوێژی بۆ خەڵکانێک بکات کە پێیان خۆش نەبێ، وە ئافرەتێک کە شەو بکاتەوە و مێردەکەی لێی توڕەبێ، وە دوو برا (دینی یان برای پشتێ بن) کە لە یەک توڕەبن و قسە لەگەڵ یەک نەکەن (لە سێ ڕۆژ زیاتر).

## بابەت: ئەوەی کە دوو کەس بە جەماعەت هەژمار دەکرێن

**٩٧٢- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اثْنَانِ فَمَا فَوْقَهُمَا جَمَاعَةٌ»[2].**

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو کەس و سەرووی دوو کەس بە کۆمەڵ هەژمار دەکرێن.

**٩٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ «يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ بِيَدِي، فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ»[3].**

---

(١) ضعيف بهذا اللفظ. وحسن بلفظ «الْعَبْدُ الْآبِقُ» بدل «أَخَوَانِ مُتَصَارِمَانِ».

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٧، ومسلم: ٧٦٣، وأبو داود: ٦١٠ و ٦١١ و ١٣٥٧ و ١٣٦٥ و ١٣٦٧، والترمذي: ٢٣٢، والنسائي: ٤٤٢ و ٨٠٦.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: شەو لەلای مەیمونەی پورم مامەوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ شەو هەڵسایەوە بۆ شەونوێژ، منیش لەلای چەپی ئەودا وەستام (بۆ نوێژ، پێغەمبەریش ﷺ) دەستی گرتم و لەلای ڕاستی خۆی داینام.

٩٧٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُصَلِّي الْمَغْرِبَ، فَجِئْتُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریبی دەکرد، منیش هاتم لەلای چەپیدا وەستام (بۆ نوێژکردن) ئەویش منی بردە لای ڕاستی خۆی.

٩٧٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ «صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِامْرَأَةٍ مِنْ أَهْلِهِ وَبِي، فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ، وَصَلَّتِ الْمَرْأَةُ خَلْفَنَا»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی کرد بۆ من و یەکێک لە هاوسەرەکانی، جا منی لەلای ڕاستی خۆی دانا و، هاوسەرەکەش لە دوای ئێمەوە وەستا (بۆ نوێژکردن).

## بابەت: ئەوانەی کە سوننەتە ڕاستەوخۆ لەدوای ئیمام بن

٩٧٦- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ مَنَاكِبَنَا فِي الصَّلَاةِ وَيَقُولُ «لَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، لِيَلِيَنِّي مِنْكُمْ أُولُو الْأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ»[٣].

واتە: ئەبو مەسعوودی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە شانماندا دەهێنا لە کاتی نوێژدا (بە کۆمەڵ، بۆ ئەوەی ڕێکیان بکات لە ڕیزی نوێژدا) وە دەیفەرموو: ڕیزەکە تێکمەدەن (بە جۆرێک یەکێک بێتە پێش و یەکێک بچێتە دواوە)، چونکە (تێکدانی ڕیزی نوێژ دەبێتە هۆی) جیاوازی و لێکترازانی دڵەکانتان، ئنجا

---

(١) صحيح. تخريجه انفرد به ابن ماجه. وانظر مسلم: ٧٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٦٠، وأبو داود: ٦٠٩، والنسائي: ٨٠٣ و ٨٠٥.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٣٢، وأبو داود: ٦٧٤، والنسائي: ٨٠٧ و ٨١٢.

با ئەوانەی پێگەیشتوو و ئەقڵ کامڵن لە دوای منەوە بن (لە ڕیزی یەکەم) ئەوجار ئەوانەی لەو تایبەتمەندییە لەوان نزیکن (واتە: تازە پێگەیشتو و گەنجەکان) ئەوجار ئەوانەی دوای ئەوان (واتە: منداڵەکان).

**٩٧٧- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُحِبُّ أَنْ يَلِيَهُ الْمُهَاجِرُونَ وَالْأَنْصَارُ لِيَأْخُذُوا عَنْهُ»**[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش بوو (هەمیشە) کۆچبەرەکان و پشتیوانان لە پشتیەوە بوەستن (لە نوێژدا) بۆ ئەوەی لێیەوە فێربن و لێی وەربگرن.

**٩٧٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى فِي أَصْحَابِهِ تَأَخُّرًا فَقَالَ: «تَقَدَّمُوا فَأْتَمُّوا بِي، وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ، لَا يَزَالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ حَتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللَّهُ»**[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای کرد کە هەندێ لە هاوەڵان (کە خاوەن پلە و پایە بوون) لە ڕیزی نوێژدا چوونەتە دواوە، (پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرموون: وەرنە ڕیزی پێشەوە، شوێنی من بکەون (پەیڕەوەی لە من بکەن)، وە با ئەوانەشی کە لە دوای ئێوەن شوێنی ئێوە بکەون، کۆمەڵێک بەردەوام دوا دەکەون، تاکو خوا لە پاداشتدا دوایان دەخات.

## بابەت: ئەوەی کە کێ شایستەترە ببێتە ئیمام (پێشنوێژ)

**٩٧٩- عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ، قَالَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَنَا وَصَاحِبٌ لِي، فَلَمَّا أَرَدْنَا الِانْصِرَافَ، قَالَ لَنَا «إِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَأَذِّنَا وَأَقِيمَا، وَلْيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا»**[٣].

واتە: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەڵێ: من و هاوەڵێکم هاتین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، جا کاتێک ویستمان هەڵسین و بڕۆین پێمانی فەرموو: ئەگەر کاتی نوێژ هات، بانگ ببێژن و قامەت بکەن و کامەتان گەورەترە با ئەو پێشنوێژی بکات.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي تعليقاً بإثر: ٢٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٣٨، وأبو داود: ٦٨٠، والنسائي: ٧٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٨، ومسلم: ٦٧٤، وأبو داود: ٥٨٩، والترمذي: ٢٠٥، والنسائي: ٦٣٤ و ٦٣٥ و ٦٦٩ و ٧٨١.

٩٨٠- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ كَانَتْ قِرَاءَتُهُمْ سَوَاءً، فَلْيَؤُمَّهُمْ أَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانَتِ الْهِجْرَةُ سَوَاءً، فَلْيَؤُمَّهُمْ أَكْبَرُهُمْ سِنًّا، وَلَا يُؤَمُّ الرَّجُلُ فِي أَهْلِهِ، وَلَا فِي سُلْطَانِهِ، وَلَا يُجْلَسْ عَلَى تَكْرِمَتِهِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا بِإِذْنٍ، أَوْ بِإِذْنِهِ»[١].

واتە: ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسە پێشنوێژی بۆ خەڵکەکەی دەکات کە شارەزاترینە لە خوێندنەوەی قورئان (یان بە مانا و خوێندنی قورئان)، خۆ ئەگەر لە جوان خوێندنی قورئاندا وەکو یەک بوون، ئەوە کامیان زووتر کۆچی کردوە (بۆ مەدینە) با ئەو پێش بکەوێ، جا ئەگەر لە کۆچکردنیشدا وەکو یەک بوون، با کامیان گەورەترە، ئەویان پێش بکەوێ، با هیچ پیاوێک پێش نوێژی بۆ کەس نەکات کە خاوەن ماڵە، یان خاوەن دەسەڵاتی ئەم شوێنەیە، با لەو شوێنەی کە خاوەن ماڵ بۆ خۆی لێی دادەنیشێ و، تایبەتە بە خۆی لێی دانەنیشێ، مەگەر بە مۆڵەتی کەسەکە خۆی نەبێ.

## بابەت: ئەو شتەی کە لەسەر ئیمام پێویستە

٩٨١- عَنْ أَبُو حَازِمٍ ﷺ، قَالَ كَانَ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ السَّاعِدِيُّ يُقَدِّمُ فِتْيَانَ قَوْمِهِ، يُصَلُّونَ بِهِمْ، فَقِيلَ لَهُ: تَفْعَلُ وَلَكَ مِنَ الْقِدَمِ مَا لَكَ، قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْإِمَامُ ضَامِنٌ، فَإِنْ أَحْسَنَ فَلَهُ وَلَهُمْ، وَإِنْ أَسَاءَ، يَعْنِي، فَعَلَيْهِ، وَلَا عَلَيْهِمْ»[٢].

واتە: ئەبو حازیم ﷺ دەڵێ: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی بۆ پێشنوێژی لە ناو خەڵکەکەی گەنجەکانی پێش دەخست، جا پێی گوترا: بۆچی وا دەکەی لە کاتێکدا خۆت لەوان لە پێشتری؟ گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئیمام زامن و دەستەبەری (خەڵکەکەیەتی بۆ نوێژ) خۆ ئەگەر بەجوانترین شێوە (ئەرکەکەی) جێبەجێکرد، ئەوە (پاداشتەکەی) هەم بۆ خۆیەتی هەمیش بۆ خەڵکەکە، خۆ ئەگەر بە خراپی (جێبەجێی بکات)، ئەوە لەسەر خۆی هەژمار دەکرێ و خەڵکەکە هیچی لەسەر نیە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٧٣، وأبو داود: ٥٨٢ و ٥٨٤، والترمذي: ٢٣٥ و ٢٧٧٢ مختصراً، والنسائي: ٧٨٠.

(٢) صحيح.

**٩٨٢-** عَنْ سَلَامَةَ بِنْتِ الْحُرِّ ﷺ، أُخْتِ خَرَشَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَقُومُونَ سَاعَةً، لَا يَجِدُونَ إِمَامًا يُصَلِّي بِهِمْ»(١).

واتە: سەلامەی کچی حوڕی خوشکی خەڕەشە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: زەمانێک دێ خەڵکی سەعاتێک (یان بە سەعات) دەوەستن، کەسێکیان دەست ناکەوێ پێشنوێژییان بۆ بکات.

**٩٨٣-** عَنْ أَبِي عَلِيٍّ الْهَمْدَانِيِّ ﷺ، أَنَّهُ خَرَجَ فِي سَفِينَةٍ فِيهَا عُقْبَةُ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيُّ فَحَانَتْ صَلَاةٌ مِنَ الصَّلَوَاتِ، فَأَمَرْنَاهُ أَنْ يَؤُمَّنَا، وَقُلْنَا لَهُ: إِنَّكَ أَحَقُّنَا بِذَلِكَ، أَنْتَ صَاحِبُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَبَى، فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَمَّ النَّاسَ فَأَصَابَ، فَالصَّلَاةُ لَهُ وَلَهُمْ، وَمَنِ انْتَقَصَ مَنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَعَلَيْهِ، وَلَا عَلَيْهِمْ»(٢).

واتە: ئەبو عەلی هەمەدانیی ﷺ دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ کەشتییەک دەرچوو عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی تێدابوو، جا کاتی نوێژێک لە نوێژەکان هات و ئێمەش داوامان لێکرد کە پێشنوێژیمان بۆ بکات، پێمان گوت: تۆ لە ئێمە شایستەتری، تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوای ﷺ، ئەویش نەیکرد و گوتی: من لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێم لێبووە کە دەیفەرموو: هەر کەسێک پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات و بە تەواوی جێبەجێی بکات بێ کەم و کوڕی، ئەوە پاداشتەکەی بۆ خۆیی و بۆ خەڵکەکەیە، وە کەسێک بە ناتەواوی و کەم و کورتی بیکات، ئەوە تاوانەکەی لەسەر خۆیەتی و خەڵکەکە هیچی لەسەر نیە.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٥٨١..

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٥٨٠.

## بابەت: ئەوەی کە هەر کەسێ پێشنوێژی بۆ خەڵک دەکات با ئاسانکاری بکات

**٩٨٤- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي لَأَتَأَخَّرُ فِي صَلَاةِ الْغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلَانٍ لِمَا يُطِيلُ بِنَا فِيهَا، قَالَ: فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَطُّ فِي مَوْعِظَةٍ أَشَدَّ غَضَبًا مِنْهُ يَوْمَئِذٍ، فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ، فَلْيُجَوِّزْ؛ فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ، وَالْكَبِيرَ، وَذَا الْحَاجَةِ»[١].**

واتە: ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من لە نوێژی بەیانی خۆم دوادەخەم لەبەر فڵانە کەس، چونکە نوێژەکەمان زۆر لەسەر درێژ دەکاتەوە، (ئەبو مەسعوود) گوتی: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە بەم شێوەیە لە کاتی ئامۆژگاری کردندا توڕەبێت وەک ئەو ڕۆژە، ئنجا فەرمووی: ئەی خەڵکینە! بەڕاستی ئێوە هەندێکتان تێدایە کە خەڵکی دوور دەخەنەوە (لە دین)، با هەر کەسێکتان کە پێشنوێژی بۆ خەڵک دەکات نوێژەکەی کورت بێ، چونکە بەڕاستی خەڵکی کەم توانا و بە تەمەن و خاوەن کارتان لە ناو دایە.

**٩٨٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُوجِزُ، وَيُتِمُّ الصَّلَاةَ»[٢].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکانی کورت و تەواوبوون (واتە: زۆر درێژی نەدەکردەوە، وە هەموو واجبەکانیشی بە تەواوی جێبەجێ دەکرد).

**٩٨٦- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: صَلَّى مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ الْأَنْصَارِيُّ ﷺ بِأَصْحَابِهِ صَلَاةَ الْعِشَاءِ، فَطَوَّلَ عَلَيْهِمْ، فَانْصَرَفَ رَجُلٌ مِنَّا فَصَلَّى، فَأُخْبِرَ مُعَاذٌ عَنْهُ، فَقَالَ: إِنَّهُ مُنَافِقٌ، فَلَمَّا بَلَغَ ذَلِكَ الرَّجُلَ، دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ مَا قَالَ لَهُ مُعَاذٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَتُرِيدُ أَنْ تَكُونَ فَتَّانًا يَا مُعَاذُ؟ إِذَا صَلَّيْتَ بِالنَّاسِ، فَاقْرَأْ بِالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ١﴾ وَ ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ١﴾ وَ ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ١﴾»[٣].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٠ و ٧٠٢ و ٧٠٤ و ٦١١٠ و ٧١٥٩، ومسلم: ٤٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٦، ومسلم: ٤٦٩، والترمذي: ٢٣٧، والنسائي: ٨٢٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٠ و ٦١٠٦، ومسلم: ٤٦٥، وأبو داود: ٧٩٠، والنسائي: ٩٨٤ و٩٩٧ و ٩٩٨.

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: موعازی کوڕی جەبەلی ئەنصاری ﷺ نوێژی عیشای بۆ هاوەڵانی کرد و لەسەری درێژکردنەوە، پیاوێکیش لە ئێمە نوێژەکەی بەجێهێشت و چوو بە تەنیا نوێژی کرد، جا هەواڵی ئەو پیاوەیان بە موعازدا، ئەویش گوتی: بەڕاستی ئەو دووڕووە، جا کاتێک قسەکە گەیشتەوە بەو پیاوە، چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺو هەواڵی ئەوەی پێدا کە موعاز پێی گوتبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی موعاز! دەتەوێ ببیە مایەی فیتنە و ئاشووب؟! هەرکات نوێژت بۆ خەڵک کرد ئەوە (ئەو سووڕەتانە) بخوێنە: ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ۝١﴾ و ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ و ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ۝١﴾ و ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ۝١﴾.

٩٨٧- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﷺ، يَقُولُ: كَانَ آخِرُ مَا عَهِدَ إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ حِينَ أَمَّرَنِي عَلَى الطَّائِفِ قَالَ لِي «يَا عُثْمَانُ تَجَاوَزْ فِي الصَّلَاةِ، وَاقْدِرِ النَّاسَ بِأَضْعَفِهِمْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الْكَبِيرَ، وَالصَّغِيرَ، وَالسَّقِيمَ، وَالْبَعِيدَ، وَذَا الْحَاجَةِ»[1].

واتە: عوسمانی کوڕی ئەبو عاص ﷺ دەگێڕێتەوە: کۆتا شتێک کە پێغەمبەر ﷺ ڕایسپاردم کە بیکەم کاتێک کاروباری تائیفم لە ئەستۆ بوو، پێی فەرمووم: ئەی عوسمان، نوێژەکان بە کورتی بکە (درێژیان مەکەوە)، وە خەڵکەکە بخەملێنە بەو کەسەیان کە لە هەمووان بێ هێزترە (واتە: کامە لە هەمووان کەم تواناترە بۆ ڕاوەستان بۆ نوێژ، ئەوە هەموو خەڵکەکە وەکو ئەو ڕەفتاریان لەگەڵ بکە بۆ نوێژکردن، با نوێژەکەت درێژ نەبێ)، چونکە بەڕاستی ئەو خەڵکە بە تەمەن و منداڵ و نەخۆش و خەڵکی لە دوورەوە هاتوو و خاوەن کارو پێویستی تێدایە.

٩٨٨- عَنْ عُثْمَانُ بْنُ أَبِي الْعَاصِ ﷺ، أَنَّ آخِرَ مَا قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَمَمْتَ قَوْمًا فَأَخِفَّ بِهِمْ»[2].

واتە: عوسمانی کوڕی ئەبو عاص ﷺ دەگێڕێتەوە کە کۆتا شتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە منی فەرموو: ئەگەر پێشنوێژیت بۆ خەڵکێک کرد، ئەوە لەسەریان سووک و ئاسان بکە (درێژی مەکەوە).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٦٨/١٨٦ بنحوه، وأبو داود: ٥٣١، والنسائي: ٦٧٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٦٨/١٨٧.

## بابەت: هەرکات شتێک ڕویدا ئیمام نوێژەکەی کورت و تەواو بکات و درێژی نەکاتەوە

٩٨٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَدْخُلُ فِي الصَّلَاةِ، وَإِنِّي أُرِيدُ إِطَالَتَهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلَاتِي، مِمَّا أَعْلَمُ لِوَجْدِ أُمِّهِ بِبُكَائِهِ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕاستیدا کاتێ دەچمە ناو نوێژ و دەمەوێ نوێژەکە درێژ بکەمەوە، لەو کاتەدا گریانی منداڵ دەبیستم، بۆیە نوێژەکە کورت دەکەمەوە، چونکە دەزانم کە دایک چەند ناڕەحەت دەبێ کاتێ گوێی لە دەنگی گریانی منداڵەکەیەتی.

٩٩٠- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ فِي الصَّلَاةِ»(٢).

واتە: عوسمانی کوڕی ئەبو عاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕاستیدا کاتێک گوێم لە دەنگی گریانی منداڵە، نوێژەکەم کورت دەکەمەوە.

٩٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَقُومُ فِي الصَّلَاةِ، وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فِيهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ؛ كَرَاهِيَةَ أَنْ يَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ»(٣).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من لە نوێژەکەمدا ڕادەوەستم و دەمەوێ کە درێژی بکەمەوە لەو کاتەدا کە گریانی منداڵێک دەبیستم کورت و پوختی دەکەمەوە، (بۆ ئەوەی) ناخۆش و ناڕەحەت نەکەوێ لەسەر دایکی (منداڵەکە).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٩، ومسلم: ٤٧٠، والترمذي: ٣٧٦.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٧، وأبو داود: ٧٨٩، والنسائي: ٨٢٥.

## بابەت: ڕێکخستنی ڕیزی نوێژخوێنان

٩٩٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ السُّوَائِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا تَصُفُّونَ كَمَا تَصُفُّ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا؟» قَالَ، قُلْنَا: وَكَيْفَ تَصُفُّ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا؟ قَالَ: «يُتِمُّونَ الصُّفُوفَ الْأُوَلَ، وَيَتَرَاصُّونَ فِي الصَّفِّ»[١].

واتە: جابیری کوڕی سەموڕەی سوائیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا ڕیزنابن هەر وەکو چۆن فریشتەکان لەلای پەروەردگاریان ڕیز دەبن؟ دەڵێ: گوتمان: فریشتەکان چۆن ڕیزدەبن؟ فەرمووی: ڕیزەکانی پێشەوە تەواو دەکەن و پاڵ لێکدەدەن لە ڕیزدا.

٩٩٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ تَمَامِ الصَّلَاةِ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕیزەکانتان ڕێکبخەن، چونکە بەڕاستی ڕێک و پێکی ڕیزەکان لە تەواوی نوێژەکەیە.

٩٩٤- عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، أَنَّهُ سَمِعَ النُّعْمَانَ بْنُ بَشِيرٍ ﷺ، يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يُسَوِّي الصَّفَّ، حَتَّى يَجْعَلَهُ مِثْلَ الرُّمْحِ أَوِ الْقِدْحِ قَالَ، فَرَأَى صَدْرَ رَجُلٍ نَاتِئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ»[٣].

واتە: سیماکی کوڕی حەڕب دەگێڕێتەوە کە گوێی لە نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ بووە، کە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕیزی نوێژ خوێنانی ڕێکدەخست تاکو وەکو ڕم، یان داری تیری لێدەکردن (واتە: ڕێک و ڕاست وەک ئەو دارەی کە تیری بە سەرەکەوە دەنرێ)، دەڵێ: (جارێک) پیاوێکی بینی کە سنگی دەرپەڕاندبوو لە ڕیزەکە دەرچوو بوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕیزەکانتان ڕێک و پێک بکەن، ئەگەرنا خوا ڕووتان لە یەکتر وەردەگێڕێ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٣٠، وأبو داود: ٦٦١، والنسائي: ٨١٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٢٣، ومسلم: ٤٣٣، وأبو داود: ٦٦٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١٧، ومسلم: ٤٣٦، وأبو داود: ٦٦٢ و ٦٦٣ و ٦٦٥، والترمذي: ٢٢٧، والنسائي: ٨١٠.

**٩٩٥-** عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الَّذِينَ يَصِلُونَ الصُّفُوفَ، وَمَنْ سَدَّ فُرْجَةً رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً»[١].

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا و فریشتەکان صەڵاوات دەنێرن بۆ ئەوانەی کە ڕیزەکانیان بەیەک دەگەیەنن و ڕێکیان دەخەن، وە هەر کەسێک کەلێنێکی ڕیز پڕبکاتەوە، خوا پلەیەک بەرزی دەکاتەوە.

**تێبینی:** صەڵاوات: ئەگەر لەلایەن خواوە بێ، بە مانای ڕەحمەت و بەزەییە، ئەگەر لەلای فریشتەکانەوە بێ، بە مانای ئەوەیە دوعا دەکەن بۆ ئەو کەسە.

## بابەت: ڕێز و گەورەیی ڕیزی پێشەوە (ڕیزی یەکەم)

**٩٩٦-** عَنْ عِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «يَسْتَغْفِرُ لِلصَّفِّ الْمُقَدَّمِ ثَلَاثًا وَلِلثَّانِي مَرَّةً»[٢].

واتە: عیربازی کوڕی ساریە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ڕیزی یەکەم سێ جار داوای لێخۆشبونی بۆ لە خوا دەکردن، وە بۆ ڕیزی دووەم یەکجار.

**٩٩٧-** عَنْ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ رضي الله عنه، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الْأَوَّلِ»[٣].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب رضي الله عنه دەگێڕێتەوە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی خوا و فریشتەکان صەڵاوات دەدەن لەسەر ڕیزی یەکەمی نوێژ.

**٩٩٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الصَّفِّ الْأَوَّلِ لَكَانَتْ قُرْعَةٌ»[٤].

واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دەتانزانی ڕیزی یەکەم چ پاداشتێکی لەسەرە، ئەوە تیروپشکتان بۆ دەکرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي بإثر: ٢٢٤ تعليقاً، والنسائي: ٨١٧.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦٦٤، والنسائي: ٦٤٦ و ٨١١ كلاهما مطولًا.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٥، ومسلم: ٤٣٧ و ٤٣٩، والترمذي: ٢٢٥ و ٢٢٦، والنسائي: ٥٤٠ و ٦٧١.





**٩٩٩- عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الْأَوَّلِ»[١].**

واتە: ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا و فریشتەکان صەڵاوات دەدەن لەسەر ڕیزی یەکەم.

## بابەت: ڕیزەکانی ئافرەتان لە نوێژدا

**١٠٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا»[٢].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین ڕیزەکانی ئافرەتان ڕیزی کۆتاییە، وە خراپترینیان ڕیزی یەکەمە، وە باشترین ڕیزەکانی پیاوان ڕیزی یەکەمە، وە خراپترینیان ڕیزی کۆتاییە.

**تێبینی:** چونکە لە دوای ڕیزی کۆتایی پیاوان، ڕیزی یەکەمی ئافرەتان دەست پێدەکات، ئەوکات زۆر لێک نزیک دەبنەوە، بۆی هەیە ببێتە هۆی ئەوەی نوێژەکە نوێژێکی پڕ خشوع و تەواو و کامڵ نەبێ، ئەوە لە کاتێکدایە کە ئافرەتان و پیاوان بەیەکەوە لە یەک شوێن و لە یەک کاتدا نوێژی بە کۆمەڵ بکەن بەبێ بوونی پەردەیەک لەنێوانیاندا).

**١٠٠١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ مُقَدَّمُهَا، وَشَرُّهَا مُؤَخَّرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ مُؤَخَّرُهَا، وَشَرُّهَا مُقَدَّمُهَا»[٣].**

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین ڕیزەکانی پیاوان ڕیزی پێشەوەیە، وە خراپترینیان ڕیزی دواوەیە، وە باشترین ڕیزەکانی ئافرەتان ڕیزی دواوەیە، وە خراپترینیان ڕیزی پێشەوەیە.

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٤٠، وأبو داود: ٦٧٨، والترمذي: ٢٢٤، والنسائي: ٨٢٠.

(٣) حسن صحيح.




## بابەت: نوێژکردن لە نێوان ئەو پایە و کۆڵەکانەی دەکەونە ناو ڕیزی نوێژەوە

١٠٠٢- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: «كُنَّا نُنْهَى أَنْ نَصُفَّ بَيْنَ السَّوَارِي عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَنُطْرَدُ عَنْهَا طَرْدًا»[1].

واتە: موعاویەی کوڕی قوڕڕە ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لێمان قەدەغەکرا بوو کە لە نێوان پایە و کۆڵەکەکان ڕیز ببەستین (چونکە پایەکان ڕیزەکە دەپچڕێنن)، وە لەسەر ئەوە زۆر بە توندی سەرزەنشت دەکراین و دەردەکراین لە نێوانیاندا.

## بابەت: ئەو کەسەی کە بە تەنیا لەدوای ڕیزەوە ڕادەوەستێ

١٠٠٣- عَنْ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ وَكَانَ مِنَ الْوَفْدِ، قَالَ: خَرَجْنَا حَتَّى قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَبَايَعْنَاهُ، وَصَلَّيْنَا خَلْفَهُ، ثُمَّ صَلَّيْنَا وَرَاءَهُ صَلَاةً أُخْرَى، فَقَضَى الصَّلَاةَ، فَرَأَى رَجُلًا فَرْدًا يُصَلِّي خَلْفَ الصَّفِّ، قَالَ: فَوَقَفَ عَلَيْهِ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ حِينَ انْصَرَفَ قَالَ: «اسْتَقْبِلْ صَلَاتَكَ، لَا صَلَاةَ لِلَّذِي خَلْفَ الصَّفِّ»[2].

واتە: عەلی کوڕی شەیبان ﷺ دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ وەفدێک بووە، دەڵێ: دەرچووین تاکو گەیشتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا پەیمانمان (بەیعەتمان) پێدا و نوێژمان لە پشتییەوە کرد، پاشان نوێژێکی تریشمان لە پشتییەوە کرد، جا لە نوێژەکەی تەواو بوو، تەماشای کرد پیاوێک بە تەنیا لە دوای ڕیزەکەوە نوێژ دەکات، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوەستا، کاتێک (ئەو پیاوە) لە نوێژەکەی تەواو بووە، پێی فەرموو: نوێژەکەت بکەوە، ئەو کەسەی کە لە دوای ڕیزەوە (بە تەنیا) نوێژ دەکات نوێژەکەی بەرناکەوێ (نوێژەکەی تەواو نیە لە پاداشتدا).

١٠٠٤- عَنْ هِلَالِ بْنِ يَسَافٍ ﷺ، قَالَ: أَخَذَ بِيَدِي زِيَادُ بْنُ أَبِي الْجَعْدِ فَأَوْقَفَنِي عَلَى شَيْخٍ بِالرَّقَّةِ يُقَالُ لَهُ وَابِصَةُ بْنُ مَعْبَدٍ، فَقَالَ: «صَلَّى رَجُلٌ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُعِيدَ»[3].

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦٨٢، والترمذي: ٢٣٠ و ٢٣١.

واتە: هیلالی کوڕی یەساف ﷺ دەڵێ: زیادی کوڕی ئەبو جەعد دەستی گرتم و بردمی بۆ لای پیاوێک و ڕایگرتم، (کە ئەو پیاوە) پێیان دەگوت: وابیصەی کوڕی مەعبەد، (ئنجا وابیصە) گوتی: پیاوێک بە تەنیا لە دوای ڕیزی (نوێژ خوێنان) نوێژی کرد، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد کە نوێژەکە دووبارە بکاتەوە.

## بابەت: ڕێز و گەورەیی لای ڕاستی ئیمام لە ڕیزی نوێژدا

١٠٠٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى مَيَامِنِ الصُّفُوفِ»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا و فریشتەکان صەڵاوەت دەدەن لەسەر ئەوانەی لە لای ڕاستی ڕیزەکانن.

١٠٠٦- عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ - قَالَ مِسْعَرٌ - مِمَّا نُحِبُّ أَوْ مِمَّا أُحِبُّ أَنْ نَقُومَ عَنْ يَمِينِهِ»[٢].

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: ئێمە کە لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژمان دەکرد، -میسعەر گوتی: - ئەوەی کە پێمان خۆشبوو، یان ئەوەی کە پێم خۆشبوو ئەوە بوو کە لەلای ڕاستی (پێغەمبەر ﷺ) بوەستین (بۆ نوێژ).

١٠٠٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ مَيْسَرَةَ الْمَسْجِدِ تَعَطَّلَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ عَمَّرَ مَيْسَرَةَ الْمَسْجِدِ كُتِبَ لَهُ كِفْلَانِ مِنَ الْأَجْرِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: بە پێغەمبەریان ﷺ گوت: لای چەپی مزگەوت لە نوێژدا چۆڵ دەبێ (کەس ناچێ لەبەر گەورەیی و فەزڵی لای ڕاستی ئیمام)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک لای چەپی مزگەوت ئاوەدان بکاتەوە (لە نوێژدا)، ئەوە دوو بەش پاداشتی بۆ دەنوسرێ.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٦٧٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٠٩، وأبو داود: ٦١٥، والنسائي: ٨٢٢.

(٣) ضعيف.

**تێبینی:** کەواتە: کاتێک پاداشتی لای ڕاست زیاترە کە هەردوو لای ئیمام ڕاست و چەپ وەکویەک بن، خۆ ئەگەر لای ڕاست پڕ بوو، بەڵام لای چەپ چۆڵ بوو، ئەوە ئاوەدان کردنەوەی لای چەپ دوو جار پاداشتی هەیە.

## بابەت: قیبلە (ڕووگەی نوێژ)

**١٠٠٨- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «لَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ طَوَافِ الْبَيْتِ، أَتَى مَقَامَ إِبْرَاهِيمَ» فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا مَقَامُ أَبِينَا إِبْرَاهِيمَ، الَّذِي قَالَ اللَّهُ: ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۝١٢٥﴾ البقرة، قَالَ الْوَلِيدُ: فَقُلْتُ لِمَالِكٍ: أَهَكَذَا قَرَأَ: ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ ۝١٢٥﴾ البقرة، ؟ قَالَ: نَعَمْ**[1].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەوافی ماڵی خوا تەواو بوو، هات (بۆ ئەو شوێنە کە پێی دەڵێن:) مەقامی ئیبراهیم، ئنجا عومەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو شوێنە مەقامی باوکمان ئیبراهیمە، کە خوا دەربارەی فەرموویەتی: ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۝١٢٥﴾ البقرة، واتە: شوێنی ئەو بەردەی ئیبراهیم ﷺ لە سەری ڕادەوەستا (کاتی دروست کردنی کەعبە) بکەنە جێگای نوێژ، وەلید گوتی: بە مالیکم گوت: ئا بەو شێوەیە خوێندیەوە: ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ ۝١٢٥﴾ البقرة، گوتی: بەڵێ.

**١٠٠٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ «لَوِ اتَّخَذْتَ مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى؟» فَنَزَلَتْ: ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۝١٢٥﴾ البقرة**[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: عومەر گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بریا مەقامی ئیبراهیمت بکردایە نوێژگە (جێی نوێژکردن)، جا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۝١٢٥﴾ البقرة، واتە: شوێنی ئەو بەردەی ئیبراهیم ﷺ لە سەری ڕادەوەستا (کاتی دروست کردنی کەعبە) بکەنە جێگای نوێژ.

---

(١) ضعيف منكر بهذا اللفظ، والمعروف الذي بعده. وانظر: مسلم: ١٢١٨، وأبو داود: ١٩٠٥، وابن ماجه: ٢٩٥١، والنسائي: ٢٩٣٩ و ٢٩٤٤ و ٢٩٦١_٢٩٧٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٢، والترمذي: ٢٩٥٩ و ٢٩٦٠.





١٠١٠- عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ، قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ شَهْرًا، وَصُرِفَتِ الْقِبْلَةُ إِلَى الْكَعْبَةِ بَعْدَ دُخُولِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ بِشَهْرَيْنِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِذَا صَلَّى إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ أَكْثَرَ تَقَلُّبَ وَجْهِهِ فِي السَّمَاءِ، وَعَلِمَ اللَّهُ مِنْ قَلْبِ نَبِيِّهِ ﷺ أَنَّهُ يَهْوَى الْكَعْبَةَ، فَصَعِدَ جِبْرِيلُ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُتْبِعُهُ بَصَرَهُ وَهُوَ يَصْعَدُ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، يَنْظُرُ مَا يَأْتِيهِ بِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿١٤٤﴾ ﴾ البقرة، الْآيَةَ، فَأَتَانَا آتٍ، فَقَالَ: إِنَّ الْقِبْلَةَ قَدْ صُرِفَتْ إِلَى الْكَعْبَةِ، وَقَدْ صَلَّيْنَا رَكْعَتَيْنِ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ وَنَحْنُ رُكُوعٌ فَتَحَوَّلْنَا، فَبَنَيْنَا عَلَى مَا مَضَى مِنْ صَلَاتِنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا جِبْرِيلُ كَيْفَ حَالُنَا فِي صَلَاتِنَا إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ؟» فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة[١].

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هەژدە مانگ بەرەو بەیتولمەقدیس نوێژمان کرد، وە دوو مانگ دوای ئەوەی چوو بۆ ناو مەدینە ڕووی کردە کەعبە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی بەرەو بەیتولمەقدیس دەکرد زۆر ڕووی دەکردە ئاسمان (بۆ ئەوەی خوا قیبلەی بۆ بگۆڕێ)، وە خوا دەیزانی کە پێغەمبەرەکەی ﷺ پێی خۆشە کەعبە ببێتە قیبلەی، ئنجا جبریل بەرز بووەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە چاوەکانی شوێنی کەوت و ئەویش بەرز دەبوویەوە بۆ بەینی ئاسمان و زەوی چاوەڕێی ئەوەی دەکرد کە ئەوەی بۆی دێ (لەلایەن خواوە) بیهێنێ (بۆ پێغەمبەر ﷺ)، ئیتر خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿١٤٤﴾ ﴾ البقرة، واتە: بەڕاستی ئێمە گەڕانی ڕووخسارت ڕوو بەئاسمان دەبینین. لەوکاتەدا یەکێک هاتە لامان و گوتی: قیبلە گۆڕاوە بۆ کەعبە، ئێمەش دوو ڕکاتمان بەرەو بەیتولمەقدیس کردبوو، وە لە ڕکووع دابووین، جا ڕوومان وەرگێڕا بەرەو کەعبە و ئەوەی کە لە نوێژەکەمان مابوو بەرەو ئەوێ تەواومان کرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی جیبریل ئەی حاڵی ئەو نوێژانەمان چی لێدێ کە بەرەو بەیتولمەقدیس کردوومانە، ئنجا خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: وە خوای گەورە بڕوا (و نوێژەکانی جاران)تانی بەفیڕۆ نەداوە.

١٠١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ قِبْلَةٌ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٩، ومسلم: ٥٢٥، والترمذي: ٣٤٠، والنسائي: ٤٨٨ و ٤٨٩ و ٧٤٢.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٤٢ و ٣٤٤.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نێوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا قیبلەیە.

## بابەت: ئەو کەسەی کە دەچێتە ناو مزگەوت دانەنیشێ تاکو دوو ڕکات نوێژ نەکات

١٠١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان چووە نێو مزگەوت با دانەنیشێ، تاکو دوو ڕکات نوێژ دەکات.

١٠١٣- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ»[٢].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان چووە نێو مزگەوت با دوو ڕکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دابنیشێ.

## بابەت: ئەو کەسەی کە سیر دەخوات با نەیەتە ناو مزگەوت

١٠١٤- عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ الْيَعْمُرِيِّ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، قَامَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ خَطِيبًا - أَوْ خَطَبَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ - فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ تَأْكُلُونَ شَجَرَتَيْنِ لَا أُرَاهُمَا إِلَّا خَبِيثَتَيْنِ، هَذَا الثُّومُ وَهَذَا الْبَصَلُ، وَلَقَدْ كُنْتُ أَرَى الرَّجُلَ، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يُوجَدُ رِيحُهُ مِنْهُ، فَيُؤْخَذُ بِيَدِهِ حَتَّى يُخْرَجَ إِلَى الْبَقِيعِ، فَمَنْ كَانَ آكِلَهَا لَا بُدَّ فَلْيُمِتْهَا طَبْخًا»[٣].

واتە: مەعدانی کوڕی ئەبو تەڵحەی یەعموریی ﷺ دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ڕۆژی جومعە ڕاوەستا بۆ وتاردان -یان وتاریدا لە ڕۆژی جومعەدا- و سوپاس و ستایشی خوای کرد و، پاشان گوتی: ئەی خەڵکینە! ئێوە لەو دوو

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٤، ومسلم: ٧١٤، وأبو داود: ٤٦٧ و ٤٦٨، والترمذي: ٣١٦، والنسائي: ٧٣٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٦٧، والنسائي: ٧٠٨.




ڕووەکە دەخۆن بەڕاستی من بۆنەکەیان بە پیس و قێزەون دەبینم، ئەو سیر و پیازە، وە بەڕاستی من لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دەمبینی کە پیاوێک بۆنی سیری لێهاتبا دەستیان دەگرت و دەیان بردە دەرێ تاکو بەقیع، خۆ ئەگەر کەسێک هەر دەیخوات با بۆنەکەی بە کوڵاندن نەهێڵێ (ئنجا بیخوات).

١٠١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ، الثُّومِ، فَلَا يُؤْذِينَا بِهَا فِي مَسْجِدِنَا هَذَا» قَالَ إِبْرَاهِيمُ: وَكَانَ أَبِي يَزِيدُ فِيهِ: الْكُرَّاثَ وَالْبَصَلَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، يَعْنِي أَنَّهُ يَزِيدُ عَلَى حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي الثُّومِ[١].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لەو ڕووەکە (سیر)ی خوارد با بە بۆنەکەی ئەزیەتمان نەدات لە ناو مزگەوتدا، ئیبڕاهیم (کە ڕاوی فەرموودەکەیە) گوتی: وە باوکم کەوەر و پیازیشی لێ زیاد کردوە و لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، واتە: ئەو لەو فەرموودەیەی ئەبو هوڕەیڕە ﷺ ئەوانەشی زیاد کردوە (کەوەر و پیاز).

١٠١٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ شَيْئًا فَلَا يَأْتِيَنَّ الْمَسْجِدَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شتێکی لەو ڕووەکە (سیر) خوارد با نەیەتە مزگەوتەوە.

## بابەت: ئەوەی کە ئەگەر نوێژخوێن سەلامی لێکرا چۆن وەڵام دەداتەوە؟

١٠١٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَسْجِدَ قُبَاءَ يُصَلِّي فِيهِ، فَجَاءَتْ رِجَالٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يُسَلِّمُونَ عَلَيْهِ، فَسَأَلْتُ صُهَيْبًا، وَكَانَ مَعَهُ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَرُدُّ عَلَيْهِمْ؟ قَالَ: «كَانَ يُشِيرُ بِيَدِهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٦٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٥٣، ومسلم: ٥٦١، وأبو داود: ٣٨٢٥.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ١١٨٧. وانظر أبو داود: ٩٢٥، والترمذي: ٣٦٧، والنسائي: ١١٨٦.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مزگەوتی قوباء بۆ ئەوەی نوێژی تێدا بکات، هەندێ پیاو لە ئەنصارِ هاتن و سەلامیان لێکرد، جا منیش پرسیارم کرد لە صوهەیب کە ئەو ڕۆژە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووە ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن وەڵامی سەلامەکەی دەدانەوە؟ (صوهەیبیش) گوتی: بە دەستی ئاماژەی دەکرد (بە دەست وەڵامی دەدانەوە).

**١٠١٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنِي النَّبِيُّ ﷺ لِحَاجَةٍ، ثُمَّ أَدْرَكْتُهُ وَهُوَ يُصَلِّي، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَأَشَارَ إِلَيَّ، فَلَمَّا فَرَغَ دَعَانِي، فَقَالَ: «إِنَّكَ سَلَّمْتَ عَلَيَّ آنِفًا وَأَنَا أُصَلِّي»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پێویستیەک منی نارد، پاشان کە هاتمەوە بینیم کە نوێژ دەکات، منیش سەلامم لێکرد، ئەویش ئاماژەی بۆ کردم، جا کاتێک لە نوێژەکە تەواو، بانگی کردم و فەرمووی: ئێستا کە تۆ سەلامت لێکردم منیش نوێژم دەکرد (مەبەستی ئەوە بوو کە لەبەر نوێژەکە وەڵامی نەداوەتەوە، نەک لەبەر شتێکی دیکە).

**١٠١٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نُسَلِّمُ فِي الصَّلَاةِ، فَقِيلَ لَنَا: إِنَّ فِي الصَّلَاةِ لَشُغْلًا»[٢].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە نوێژدا سەلاممان (لە یەکتر) دەکرد، جا پێمان گوترا: نوێژ سەرقاڵ بوونی شایستە بە خۆی هەیە (نابێ جگە لە نوێژ بە هیچی دیکەوە سەرقاڵ بین لە نوێژدا).

## بابەت: ئەو کەسەی کە لە نوێژدا ڕووی لە قیبلە نیە و ناشزانێ کە ڕووی لە قیبلە نیە

**١٠٢٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، «فَتَغَيَّمَتِ السَّمَاءُ وَأَشْكَلَتْ عَلَيْنَا الْقِبْلَةُ، فَصَلَّيْنَا، وَأَعْلَمْنَا، فَلَمَّا طَلَعَتِ الشَّمْسُ إِذَا نَحْنُ قَدْ صَلَّيْنَا لِغَيْرِ الْقِبْلَةِ» فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ﴿١١٥﴾﴾ البقرة»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢١٧، ومسلم: ٥٤٠، وأبو داود: ٩٢٦ و ١٢٢٧، والترمذي: ٣٥١، والنسائي: ١١٨٩ و ١١٩٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٩٩، ومسلم: ٥٣٨، وأبو داود: ٩٢٣ و ٩٢٤، والنسائي: ١٢٢٠ و ١٢٢١.

(٣) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٤٥ و ٢٩٥٧.



واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیعە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە گەشتێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، جا ئاسمان بوو بە تەم و مژ و قیبلەمان لێ تێکچوو (نەمانزانی کوێ قیبلەیە بە هۆی ئەو تەم و مژەی بەری ئاسمانی گرتبوو)، ئێمەش نوێژمان کردو، شتێکمان کردە نیشانە (کە بۆ نوێژ ڕوومان لەو شوێنە کردبوو تا بزانین قیبلە بووە، یان نا)، جا کاتێک خۆر دەرکەوتەوە تەماشامان کرد بەرەو، قیبلە نوێژمان نەکردوە، ئێمەش ئەوەمان بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرد، ئنجا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ ﴿١١٥﴾﴾ البقرة، واتە: کەواتە ڕووبکەنە هەرلایەک (لە نوێژ کردندا بەفەرمانی خودا) ئەوە ڕووگەیە و ڕووتان لە خودا کردوە.

## بابەت: نوێژ خوێن کاتێ (لە نوێژدا) تف و بەڵغەم فڕێ دەدات

**١٠٢١-** عَنْ طَارِقِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُحَارِبِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا صَلَّيْتَ فَلَا تَبْزُقَنَّ بَيْنَ يَدَيْكَ، وَلَا عَنْ يَمِينِكَ، وَلَكِنِ ابْزُقْ عَنْ يَسَارِكَ، أَوْ تَحْتَ قَدَمِكَ»[1].

واتە: تاریقی کوڕی عەبدوڵڵای موحاریبیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر نوێژت کرد تف فڕێ مەدە پێش خۆت، وە بۆ لای ڕاستیشت فڕێ مەدە، بەڵکو بۆ لای چەپت، یان بۆ ژێر پێت تف بکە.

**١٠٢٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَأَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: «مَا بَالُ أَحَدِكُمْ يَقُومُ مُسْتَقْبِلَهُ -يَعْنِي رَبَّهُ- فَيَتَنَخَّعُ أَمَامَهُ؟ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يُسْتَقْبَلَ فَيُتَنَخَّعَ فِي وَجْهِهِ؟ إِذَا بَزَقَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْزُقَنَّ عَنْ شِمَالِهِ، أَوْ لِيَقُلْ هَكَذَا فِي ثَوْبِهِ» ثُمَّ أَرَانِي إِسْمَاعِيلَ يَبْزُقُ فِي ثَوْبِهِ ثُمَّ يَدْلُكُهُ[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە قیبلەی مزگەوت بەڵغەمی بینی، ئنجا ڕووی کردە خەڵکی و فەرمووی: ئەوە چیتانە کە یەکێکتان بەرەو ڕووی خوا ڕادەوەستێ کەچی بۆ پێشی خۆی تف دەکات؟ ئایا هەر یەکێک لە ئێوە پێی خۆشە بەرەو ڕووی بوەستن و بەرەو ڕووشی تف بکرێ؟ (بۆیە) هەر کاتێک یەکێکتان

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٧٨، والترمذي: ٥٧١، والنسائي: ٧٢٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤١٦، ومسلم: ٥٥٠، وأبو داود: ٤٧٧، والنسائي: ٣٠٩.

تفی کرد با بەرەو لای چەپی تف بکات یان بەو شێوە بیکاتە ناو پۆشاکەکەی (ئەگەر هەر ناچار بوو)، ڕاوی گوتی: پاشان ئیسماعیل نیشانی دام چۆن لە ناو پۆشاک تف دەکرێ و لێک دەخشێنرێ.

**١٠٢٣- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى شَبَثَ بْنَ رِبْعِيٍّ بَزَقَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: يَا شَبَثُ لَا تَبْزُقْ بَيْنَ يَدَيْكَ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَنْهَى عَنْ ذَلِكَ، وَقَالَ: «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا قَامَ يُصَلِّي أَقْبَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ بِوَجْهِهِ، حَتَّى يَنْقَلِبَ أَوْ يُحْدِثَ حَدَثَ سُوءٍ»[١].**

واتە: حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە کە شەبەسەی کوڕی ڕیبعی بینی بەرەو پێش خۆی تفی کرد، ئەویش گوتی: ئەی شەبەس بۆ بەردەمت تف مەکە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارەی قەدەغە کردوە و فەرموویەتی: کاتێک کەسێک هەڵدەستێ نوێژ دەکات خوا ڕووبەڕوویەتی، هەتا کەسەکە ڕوو وەردەگێڕێ (لێدەبێتەوە لە نوێژ)، یان کارێکی خراپ و ناشایستە ئەنجام دەدات (وەکو دەستنوێژ شکاندنی بێ هۆکار، یان هەر کارێکی دیکەی خراپی ناشایستە).

**١٠٢٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «بَزَقَ فِي ثَوْبِهِ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ ثُمَّ دَلَكَهُ»[٢].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژدا تفی کردە ناو پۆشاکەکەی، پاشان لێکی خشکاند (واتە: پۆشاکەکەی خستە سەر یەک تاکو دیار نەبێ).

## بابەت: سڕینەوە و پاککردنەوەی بەرد و چەو لەناو نوێژدا

**١٠٢٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ مَسَّ الْحَصَى فَقَدْ لَغَا»[٣].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەرد و چەوی بەردەمی لە نوێژدا بسڕێتەوە، ئەوا کارێکی نەشیاوی کردوە (خۆی سەرقاڵ کردوە).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح دون قوله: «وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ». أخرجه البخاري: ٢٤١، وأبو داود: ٣٩٠.

(٣) صحيح.

**١٠٢٦-** عَنْ مُعَيْقِيبٌ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَسْحِ الْحَصَى فِي الصَّلَاةِ: «إِنْ كُنْتَ فَاعِلًا فَمَرَّةً وَاحِدَةً»[1].

واتە: موعەیقیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی دەست لێدان لە بەرد لە ناو نوێژدا فەرموویەتی: ئەگەر هەر دەبێ بیکەیی و دەیکەی ئەوە تەنها یەک جار ئەوە بکە.

**تێبینی:** ئەو بەرد سڕینەوە، مەبەستی ئەو کاتەیە، کە لە دەشت، یان لەسەر زەوی ڕووت، نوێژ دەکەی، کەواتە: ئەگەر هەر پێویست بوو بیکەی، ئەوە یەک جار بۆ ڕێکخستنی جێگای سوجدەکەت بیکە و تەواو، ئەگەرنا لە نوێژەکەت بێئاگات دەکات.

**١٠٢٧-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَإِنَّ الرَّحْمَةَ تُوَاجِهُهُ، فَلَا يَمْسَحْ بِالْحَصَى»[2].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان هەڵسا بۆ نوێژ کردن، ئەوە بێگومان بەزەیی (خوا) بەرەو ڕووی دێ (بۆیە با خۆی خەریک نەکات بە هیچ شتێک)، جا بۆیە با بەرد و چەو نەسڕێتەوە (واتە: نیعمەتی ڕوو تێکردنی ڕەحمەتەکە زۆر لەوە گەورەترە کە خۆت بە شتی دیکە سەرقاڵ بکەی).

## بابەت: نوێژ کردن لەسەر بەرماڵ (خومرە)

**١٠٢٨-** عَنْ مَيْمُونَةُ ﷺ، زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُصَلِّي عَلَى الْخُمْرَةِ»[3].

واتە: مەیمونەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر خومرە نوێژی دەکرد.

**الْخُمْرَة:** بەرماڵێکی بچوکە لە گەڵای دارخورما دروست دەکرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٠٧، ومسلم: ٥٤٦، وأبو داود: ٩٤٦، والترمذي: ٣٨٠، والنسائي: ١١٩٢

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٩٤٥، والترمذي: ٣٧٩، والنسائي: ١١٩١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٣ و ٣٧٩، ومسلم: ٥١٣، وأبو داود: ٦٥٦، والترمذي: ٣٣٢، والنسائي: ٧٣٨.

١٠٢٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: «صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى حَصِيرٍ»[١].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر حەسیر نوێژی کرد.

**حَصِير:** ڕاخەرێکە کە لە پەلک و گەڵای دارخورما دروست دەکرێ بۆ لەسەر دانیشتن.

١٠٣٠- عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ ﷺ، قَالَ: صَلَّى ابْنُ عَبَّاسٍ، وَهُوَ بِالْبَصْرَةِ عَلَى بِسَاطِهِ، ثُمَّ حَدَّثَ أَصْحَابَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «يُصَلِّي عَلَى بِسَاطٍ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی دینار ﷺ دەڵێ: ئیبنو عەبباس کە لە بەصرە بوو لەسەر ڕاخەرەکەی خۆی نوێژی کرد، پاشان بە هاوەڵەکانی ڕاگەیاند کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر ڕاخەر دەکرد.

## بابەت: سوجدە بردن لەسەر پۆشاک لە گەرما و سەرمادا

١٠٣١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، قَالَ: جَاءَنَا النَّبِيُّ ﷺ «فَصَلَّى بِنَا فِي مَسْجِدِ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ، فَرَأَيْتُهُ وَاضِعًا يَدَيْهِ فِي ثَوْبِهِ إِذَا سَجَدَ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان و لە مزگەوتی بەنو عەبدولئەشهەل نوێژی بۆمان کرد، جا بینیم کە دەستەکانی لەسەر پۆشاکەکەی دانابوو کاتێک سوجدەی دەبرد.

١٠٣٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَابِتِ بْنِ الصَّامِتِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «صَلَّى فِي بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ وَعَلَيْهِ كِسَاءٌ مُتَلَفِّفٌ بِهِ، يَضَعُ يَدَيْهِ عَلَيْهِ، يَقِيهِ بَرْدَ الْحَصَى»[٤].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سابیتی کوڕی صامیت لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو بەنو عەبدولئەشهەل نوێژی کرد، وە پۆشاکێکی لەبەر بوو کە لە خۆیەوە پێچابوو، دەستەکانی لەسەر دادەنا (لە کاتی سوجدەدا) بۆ ئەوەی خۆی لە ساردی بەردەکان بپارێزێ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥١٩ و ٦٦١، والترمذي: ٣٣٢.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٣١.

(٣) ضعيف.

(٤) ضعيف.

**١٠٣٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي شِدَّةِ الْحَرِّ، فَإِذَا لَمْ يَقْدِرْ أَحَدُنَا أَنْ يُمَكِّنَ جَبْهَتَهُ، بَسَطَ ثَوْبَهُ فَسَجَدَ عَلَيْهِ»[1].

**واتە:** ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئێمە لە گەرمای زۆر بە تیندا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژمان دەکرد، خۆ ئەگەر یەکێکمان نەیتوانیبا بە تەواوی ناو چەوانی لەسەر زەوی دابنێ (لەبەر گەرمی جێگای سوجدە)، ئەوە پۆشاکەکەی ڕادەخست و ئنجا سوجدەی لەسەر دەبرد.

## بابەت: چۆنیەتی ئاگادارکردنەوەی دەور وبەر لەناو نوێژدا

**١٠٣٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ»[2].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گوتنی «سبحان الله» (لە نوێژدا) بۆ پیاوانە و چەپڵە لێدان (بە بەری دەستی ڕاست لە پشتی دەستی چەپ) بۆ ئافرەتانە (لە کاتی ئاگادارکردنەوەی دەوروبەر لە ڕوودانی هەر ڕووداوێک).

**١٠٣٥-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ»[3].

**واتە:** سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گوتنی «سبحان الله» بۆ پیاوانەو، چەپڵە لێدان بۆ ئافرەتانە.

**١٠٣٦-** عَنْ نَافِعٍ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلنِّسَاءِ فِي التَّصْفِيقِ، وَلِلرِّجَالِ فِي التَّسْبِيحِ[4].

**واتە:** نافیع لە ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە چەپڵە لێدان بۆ ئافرەتان و گوتنی «سبحان الله» بۆ پیاوان.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٥، ومسلم: ٦٢٠، وأبو داود: ٦٦٠، والترمذي: ٥٨٤، والنسائي: ١١١٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٠٣، ومسلم: ٤٢٢، وأبو داود: ٩٣٩ و ٩٤٤، والترمذي: ٣٦٩، والنسائي: ١٢٠٧_١٢١٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٤، ومسلم: ٤٢١، وأبو داود: ٩٤٠، والنسائي: ٧٨٤ و ٧٩٣ و ١١٨٣ و ٥٤١٣.

(٤) صحيح لغيره.

## بابەت: نوێژ کردن بە نەعلەوە

١٠٣٧- عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ جَدِّي أَوْسٌ، أَحْيَانًا يُصَلِّي، فَيُشِيرُ إِلَيَّ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ، فَأُعْطِيهِ نَعْلَيْهِ، وَيَقُولُ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ»(١).

واتە: ئیبنو ئەبو ئەوس ﷺ دەڵێ: ئەوسی باپیرم هەندێ جار کە نوێژی دەکرد لە ناو نوێژدا ئاماژەی بۆ دەکردم، منیش نەعلەکانم پێدەدا، دەیگوت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە بە نەعلەوە نوێژی دەکرد.

١٠٣٨- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي حَافِيًا وَمُنْتَعِلًا»(٢).

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بە پێخواسی و بە نەعلەوە بینیوە نوێژی دەکرد.

١٠٣٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ لَقَدْ رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «يُصَلِّي فِي النَّعْلَيْنِ وَالْخُفَّيْنِ»(٣).

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: بێگومان بینیومانە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە نەعل و بە خوف نوێژی دەکرد.

## بابەت: پێچانی (کۆکردنەوەی) پرچ و پۆشاک لە نوێژدا

١٠٤٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ لَا أَكُفَّ شَعَرًا وَلَا ثَوْبًا»(٤).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە کە نە پرچ و نە پۆشاکم نەپێچمەوە (لە نوێژدا).

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٦٥٣.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٠٩، ومسلم: ٤٩٠، وأبو داود: ٨٨٩ و ٨٩٠، والترمذي: ٢٧٣، والنسائي: ١٠٩٣ و ١٠٩٦ و ١٠٩٨ و ١١١٣ و ١١١٥.

**١٠٤١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «أُمِرْنَا أَلَّا نَكُفَّ شَعَرًا وَلَا ثَوْبًا وَلَا نَتَوَضَّأَ مِنْ مَوْطَإٍ»[١].**

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: فەرمانمان پێکراوە کە نە پرچ و نە پۆشاکمان کۆنەکەینەوە، وە دەستنوێژ نەگرینەوە لەو پیسیەی کە لە ڕێگا بەرمان دەکەوێ (بەڵام شۆردنەوە و لابردنی خودی پیسییەکە پێویستە).

**١٠٤٢- عَنْ شُعْبَةَ ﷺ، أَخْبَرَنِي مُخَوَّلٌ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعْدٍ، رَجُلًا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ يَقُولُ: رَأَيْتُ أَبَا رَافِعٍ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَأَى الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ وَهُوَ يُصَلِّي وَقَدْ عَقَصَ شَعْرَهُ، فَأَطْلَقَهُ أَوْ نَهَى عَنْهُ، وَقَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ وَهُوَ عَاقِصٌ شَعَرَهُ»[٢].**

واتە: شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە کە موخەوەل هەواڵی پێداوە و گوتوویەتی: گوێم لە ئەبو سەعد بوو کە پیاوێکی خەڵکی مەدینە بوو دەیگوت: ئەبو ڕافیعی خزمەتکاری پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە حەسەنی کوڕی عەلی نوێژی دەکرد و پرچی لە ناوەڕاستی سەریدا کۆکردبۆوە، منیش بینیم کە (ئەبو ڕافیع) پرچی بۆ کردەوە، یان لەو کارە قەدەغەی کرد و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە پیاو لە کاتی نوێژکردندا پرچی کۆبکاتەوە.

## بابەت: خشوع لە نوێژدا

**١٠٤٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَرْفَعُوا أَبْصَارَكُمْ إِلَى السَّمَاءِ أَنْ تَلْتَمِعَ» يَعْنِي فِي الصَّلَاةِ[٣].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاوەکانتان بەرەو ئاسمان بەرز مەکەنەوە نەوەک لە ناکاو کوێر بن، واتە: لەناو نوێژدا.

**١٠٤٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا بِأَصْحَابِهِ فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ أَقْبَلَ عَلَى الْقَوْمِ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ» حَتَّى اشْتَدَّ قَوْلُهُ فِي ذَلِكَ «لَيَنْتَهُنَّ عَنْ ذَلِكَ أَوْ لَيَخْطَفَنَّ اللَّهُ أَبْصَارَهُمْ»[٤].**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٤، والترمذي بإثر: ١٤٣ تعليقاً.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٦٤٦، والترمذي: ٣٨٤.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥٠، وأبو داود: ٩١٣، والنسائي: ١١٩٣.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک نوێژی بۆ هاوەڵانی کرد، جا کاتێک نوێژەکەی کرد ڕووی کردە خەڵکەکە بەرەو ڕوو، ئنجا فەرمووی: باشە ئەوە چییانە هەندێ کەس چاویان بەرەو ئاسمان بەرز دەکەنەوە (لە نوێژدا)؟ تا وای لێهات لەوبارەوە زۆر بە توندی هەڕەشەی کرد (فەرمووی): یان ئەوەتا واز دێنن لەو کارەیان، یان ئەوەتا خوا چاویان کوێر دەکات.

**١٠٤٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ، أَوْ لَا تَرْجِعُ أَبْصَارُهُمْ»[١].

واتە: جابیری کوڕی سەموڕە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەسانێک هەن، یان دەبێ واز لەوە بێنن کە (لە نوێژدا) چاویان بەرز دەکەنەوە بەرەو ئاسمان، یان چاویان (بە ساغی) بۆ ناگەڕێتەوە (کوێر دەبن).

**١٠٤٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَتِ امْرَأَةٌ تُصَلِّي خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ حَسْنَاءُ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ، فَكَانَ بَعْضُ الْقَوْمِ يَسْتَقْدِمُ فِي الصَّفِّ الْأَوَّلِ لِئَلَّا يَرَاهَا، وَيَسْتَأْخِرُ بَعْضُهُمْ حَتَّى يَكُونَ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ، فَإِذَا رَكَعَ قَالَ هَكَذَا، يَنْظُرُ مِنْ تَحْتِ إِبْطِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الحجر، فِي شَأْنِهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک لە دوای پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد، کە لە هەرە جوانەکان بوو لە ناو خەڵکدا، جا هەندێ کەس پەلەیان دەکرد و، دەچوونە ڕیزی پێشەوە بۆ ئەوەی نەیبینن، وە هەندێکیشیان خۆیان دوادەخست تاکو بڕۆنە ڕیزی کۆتایی، جا کاتێ (ئەو کەسەی لە دواوە بوو) ڕکووعی دەبرد ئا بەو شێوەیە، لە ژێر باڵیەوە تەماشای دەکرد، ئنجا لەوبارەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الحجر، واتە: سوێند بە خوا ئێمە ئاگادارین بەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون و سوێند بە خوا بێگومان ئەوانەش دەناسین کە پاش ئێوە دێن.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٢٨، وأبو داود: ٩١٢.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣١٢٢، والنسائي: ٨٧٠.

## بابەت: نوێژ کردن لە یەک پارچە پۆشاکدا

١٠٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أَتَى رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَدُنَا يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوَكُلُّكُمْ يَجِدُ ثَوْبَيْنِ؟»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەسی وامان هەیە کە لە یەک کراسدا نوێژ دەکات، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: جا ئایا هەر یەک لە ئێوە دوو پارچە پۆشاکی چنگ دەکەوێ؟!

١٠٤٨- عَنْ أَبُو سَعِيدِ الْخُدْرِيُّ ﷺ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ «يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، مُتَوَشِّحًا بِهِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە کە چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا نوێژی دەکرد لە یەک پارچە پۆشاکدا کە ئەملاولای پۆشاکەکەی هەڵدابوونەوە لەسەر شانی، لای ڕاستی بۆ شانی چەپی و لای چەپیش بۆ شانی ڕاستی لە ملیدا گرێی دابوون ئەوە مانای «متوشحا»ـە.

١٠٤٩- عَنْ عُمَر بْنِ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، مُتَوَشِّحًا بِهِ، وَاضِعًا طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ»[٣].

واتە: عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﷺ دەڵێ: بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە یەک پارچە پۆشاکدا نوێژی دەکرد و ئەملا ولای بە پێچەوانەوە هەڵدابوونەوە سەر شان و ملی.

١٠٥٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «يُصَلِّي بِالْبِئْرِ الْعُلْيَا فِي ثَوْبٍ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٨، ومسلم: ٥١٥، وأبو داود: ٦٢٥، والنسائي: ٧٦٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥١٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٤ و ٣٥٦، ومسلم: ٥١٧، وأبو داود: ٦٢٨، والترمذي: ٣٣٩.

(٤) حسن.





واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی کەیسان لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای بیری عولیا (شوێنێکە) نوێژی دەکرد لە یەک پارچە پۆشاکدا.

**١٠٥١-** ابْنُ كَيْسَانَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ: «يُصَلِّي الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُتَلَبِّبًا بِهِ»[١].

واتە: ئیبنو کەیسان لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەصری دەکرد لە یەک پارچە پۆشاکدا، کە لەسەر سنگی کۆی کردبۆوە (واتە: لەسەر سنگی ئەملاولای خستبوویە سەر یەکتر).

## بابەت: سوجدەکانی قورئان

**١٠٥٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ، اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي، يَقُولُ: يَا وَيْلَهُ أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِيَ النَّارُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکات ئادەمیزاد سوجدە دەخوێنێ (ئەو ئایەتەی کە سوجدەی تێدایە) پاشان سوجدە دەبات، ئەوە شەیتان دوور دەکەوێتەوە و کەنارگیر دەبێ و دەگریێ، دەڵێ: ئەی هاوار بۆ خۆم، وەچەی ئادەم فەرمانی پێکرا بە سوجدە بردن و سوجدەی برد و شایستەی بەهەشت بوو، وە منیش فەرمانم پێکرا بە سوجدە بردن سەرپێچیم کرد دۆزەخم بۆ هەیە.

**١٠٥٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ الْبَارِحَةَ، فِيمَا يَرَى النَّائِمُ، كَأَنِّي أُصَلِّي إِلَى أَصْلِ شَجَرَةٍ، فَقَرَأْتُ السَّجْدَةَ فَسَجَدْتُ، فَسَجَدَتِ الشَّجَرَةُ لِسُجُودِي، فَسَمِعْتُهَا تَقُولُ: «اللَّهُمَّ احْطُطْ عَنِّي بِهَا وِزْرًا، وَاكْتُبْ لِي بِهَا أَجْرًا، وَاجْعَلْهَا لِي عِنْدَكَ ذُخْرًا» قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: «فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَرَأَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ فِي سُجُودِهِ مِثْلَ الَّذِي أَخْبَرَهُ الرَّجُلُ عَنْ قَوْلِ الشَّجَرَةِ»[٣].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨١.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٥٧٩ و ٣٤٢٤.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووم، پیاوێک هاتە خزمەتی و گوتی: بەڕاستی من شەوی ڕابردوو ئەوەم بینی کە مرۆڤی خەوتوو لە خەودا دەیبینێ، (بینیم) وەکو ئەوەی کە بەرەو قەدی دارێک نوێژ دەکەم، منیش ئەو سوورەتەم خوێند کە سوجدەی تێدایە و سوجدەم برد، ئنجا درەختەکەش لەگەڵ سوجدەی من سوجدەی برد و گوێم لێبوو دەیگوت: خوایە بە چاکەی ئەو سوجدەیە تاوانم لێ بسڕەوە، وە بە هۆی ئەو سوجدەیە پاداشتم بۆ بنووسە، وە لەلای خۆت بۆم بکە توێشووی دواڕۆژ، ئیبنو عەبباس گوتی: (دوای ئەوە) بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ سوجدەی خوێند و سوجدەی برد، وە گوێم لێبوو لە سوجدەکەیدا هەمان ئەو شتەی دەگوت کە درەختەکە گوتویەتی و پیاوەکە بۆی گێڕایەوە.

١٠٥٤- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا سَجَدَ قَالَ: «اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، أَنْتَ رَبِّي، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي شَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ»[1].

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ سوجدەی دەبرد دەیفەرموو: خوایە سوجدەم بۆ تۆ بردووە بڕوام بە تۆ هێناوە ملکەچی تۆ بووم، تۆ پەروەردگاری منی، ڕووخسارم سوجدەی برد بۆ ئەو زاتەی کە بیستن و بینینی بۆ داڕشتووە، وە گەورە و پیرۆزە ئەو خوایەی کە باشترین و چاکترینی دروستکارو بەدیهێنەرانە.

## بابەت: ژمارەی سوجدەکانی قورئان

١٠٥٥- عَنْ أَبُو الدَّرْدَاءِ ﷺ، أَنَّهُ «سَجَدَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ إِحْدَى عَشْرَةَ سَجْدَةً، مِنْهُنَّ النَّجْمُ»[2].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو یازدە سوجدەی بردووە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، یەکێک لەو سوجدانە هی سوورەتی نەجم بووە (مەبەستی لەو سوجدانەیە کە لە قورئاندا هاتووە).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٧١، وأبو داود: ٧٦٠ و ١٥٠٩، والترمذي: ٢٦٦ و ٣٤٢١ مطولًا، والنسائي: ٨٩٧ و ١١٢٦.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود بإثر: ١٤٠١ تعليقاً، والترمذي: ٥٦٨ و ٥٦٩.

١٠٥٦- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: سَجَدْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ إِحْدَى عَشْرَةَ سَجْدَةً، لَيْسَ فِيهَا مِنَ الْمُفَصَّلِ شَيْءٌ: الْأَعْرَافُ، وَالرَّعْدُ، وَالنَّحْلُ، وَبَنِي إِسْرَائِيلَ، وَمَرْيَمُ، وَالْحَجُّ، وَسَجْدَةُ الْفُرْقَانِ، وَسُلَيْمَانُ سُورَةِ النَّمْلِ، وَالسَّجْدَةُ، وَفِي ص، وَسَجْدَةُ الْحَوَامِيمِ»[1].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: یازدە سوجدەم لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بردووە، لە سوورەتە موفەصەڵەکان هیچ سوجدەی تێدا نەبووە، (ئەو سوورەتانەی سوجدەیان تێدابوو): ئەعراف و ڕەعد و نەحل و بنی ئیسرائیل و مەریم و حەج و سوجدەی فورقان و سولەیمان سوورەتی نەمل و سوورەتی سەجدە و ص و سوجدەی حامیمەکان.

١٠٥٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «أَقْرَأَهُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَجْدَةً فِي الْقُرْآنِ مِنْهَا ثَلَاثٌ فِي الْمُفَصَّلِ وَفِي الْحَجِّ سَجْدَتَيْنِ»[2].

واتە: عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پازدە سوجدەی لە قوڕئاندا بۆ خوێندۆتەوە، کە سێ دانەیان لە سوورەتە موفەصەڵەکاندا هاتوون، وە سوورەتی حەج دوو دانەی تێدا هاتووە.

١٠٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَجَدْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١﴾ وَ ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ۝١﴾[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: سوجدەمان برد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١﴾ و ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ۝١﴾.

١٠٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَجَدَ فِي ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١﴾، قَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ: هَذَا الْحَدِيثُ مِنْ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، مَا سَمِعْتُ أَحَدًا يَذْكُرُهُ غَيْرَهُ[4].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٤٠١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٦٦، ومسلم: ٥٧٨، وأبو داود: ١٤٠٧ و ١٤٠٨، والترمذي: ٥٧٣ و ٥٧٤، والنسائي: ٩٦١_٩٦٣ و ٩٦٥_٩٦٨.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٦٦، ومسلم: ٥٧٨، وأبو داود: ١٤٠٧ و ١٤٠٨، والترمذي: ٥٧٣ و ٥٧٤، والنسائي: ٩٦١_٩٦٣ و ٩٦٥_٩٦٨.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە سوورەتی ئینشیقاق سوجدەی بردوە، ئەبو بەکری کوڕی ئەبو شەیبە گوتوویەتی: ئەو فەرموودەیە لە فەرموودەکانی یەحیای کوڕی سەعیدە، گوێم لێنەبووە هیچ کەسێکی تر باسی بکات جگە لەو.

## بابەت: تەواویەتی نوێژ

١٠٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي نَاحِيَةٍ مِنَ الْمَسْجِدِ، فَجَاءَ فَسَلَّمَ، فَقَالَ: «وَعَلَيْكَ، فَارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ» فَرَجَعَ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «وَعَلَيْكَ، فَارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ بَعْدُ» قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: فَعَلِّمْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَسْبِغِ الْوُضُوءَ، ثُمَّ اسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ حَتَّى تَسْتَوِيَ قَاعِدًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلَاتِكَ كُلِّهَا»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێک هاتە ناو مزگەوت نوێژی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەکی مزگەوت بوو، ئنجا ئەو پیاوە هات و سەلامی کرد، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: سەلام لەسەر تۆش، (وە پێی فەرموو) بگەڕێوە نوێژەکەت دووبارە بکەوە، چونکە (بەو جۆرەی کە داوات لێکراوە) نوێژت نەکرد، جا گەڕایەوە و نوێژەکەی کردەوە، پاشان هاتەوە سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، (پێغەمبەریش ﷺ) وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و (فەرمووی:) بگەڕێوە نوێژەکەت بکەوە ئەوە نوێژ نەبوو کردت، لە جاری سێیەمدا (کابرا) گوتی: تۆ فێرم بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەگەر ویستت نوێژ بکەی دەست نوێژێکی تەواو بشۆرە، پاشان ڕوو بکە قیبلە و نوێژ دابەستە، پاشان چی لە قورئان دەزانی بیخوێنە، پاشان بچۆ ڕکووع و لە ڕکووعدا ئارام بگرە، دواتر لە ڕکووع هەڵسەوە تا بە پێوە ئارام دەگری، پاشان بچۆ سوجدە تا بە تەواوی ئارام دەگری لە سوجدەدا، پاشان هەڵسەوە تا ڕێک دەبی بە دانیشتنەوە، ئنجا ئەوە بکە لە هەموو نوێژەکەتدا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥٧، ومسلم: ٣٩٧، وأبو داود: ٨٥٦، والترمذي: ٣٠٣ و ٢٦٩٢، والنسائي: ٨٨٤.

**١٠٦١-** عَنْ مُحَمَّد بْن عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حُمَيْدٍ السَّاعِدِيَّ، فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فِيهِمْ أَبُو قَتَادَةَ، فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالُوا: لِمَ؟ فَوَاللَّهِ مَا كُنْتَ بِأَكْثَرِنَا لَهُ تَبَعَةً، وَلَا أَقْدَمَنَا لَهُ صُحْبَةً، قَالَ: بَلَى، قَالُوا: فَاعْرِضْ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ كَبَّرَ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، وَيَقِرَّ كُلُّ عُضْوٍ مِنْهُ فِي مَوْضِعِهِ، ثُمَّ يَقْرَأُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ، وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ يَرْكَعُ وَيَضَعُ رَاحَتَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ مُعْتَمِدًا، لَا يَصُبُّ رَأْسَهُ وَلَا يُقْنِعُ مُعْتَدِلًا، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، حَتَّى يَقِرَّ كُلُّ عَظْمٍ إِلَى مَوْضِعِهِ، ثُمَّ يَهْوِي إِلَى الْأَرْضِ وَيُجَافِي بَيْنَ يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ وَيَثْنِي رِجْلَهُ الْيُسْرَى فَيَقْعُدُ عَلَيْهَا وَيَفْتَخُ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ إِذَا سَجَدَ، ثُمَّ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ وَيَجْلِسُ عَلَى رِجْلِهِ الْيُسْرَى حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ مِنْهُ إِلَى مَوْضِعِهِ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَصْنَعُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ إِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، كَمَا صَنَعَ عِنْدَ افْتِتَاحِ الصَّلَاةِ، ثُمَّ يُصَلِّي بَقِيَّةَ صَلَاتِهِ هَكَذَا، حَتَّى إِذَا كَانَتِ السَّجْدَةُ الَّتِي يَنْقَضِي فِيهَا التَّسْلِيمُ أَخَّرَ إِحْدَى رِجْلَيْهِ وَجَلَسَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْسَرِ، مُتَوَرِّكًا، قَالُوا: صَدَقْتَ، هَكَذَا كَانَ يُصَلِّي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ(١).

واتە: موحەممەدی کوڕی عەمڕی کوڕی عەتاء  دەڵێ: گوێم لە ئەبو حومەیدی ساعیدی بوو کە لە ناو دە هاوەڵی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو، کە ئەبو قەتادەشیان لە ناو بوو، ئنجا ئەبو حومەید گوتی: من لە هەمووتان شارەزاترم بە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، (ئەوانیش) گوتیان: بۆچی؟ خۆ سوێند بە خوا تۆ لە ئێمە زیاتر شوێنکەوتەی نەبووی، وە لە پێش ئێمەشدا نەبوویتە هاوەڵی، گوتی: بەڵێ وایە، گوتیان: ئادەی نیشانمان بدە، گوتی: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ویستبای نوێژ بکات تەکبیری دەکرد، پاشان دەستەکانی تاکو ئاستی شانەکانی بەرز دەکردەوە، بە جۆرێک کە هەموو ئەندامەکانی جەستەی دەچۆوە شوێنی خۆی، پاشان فاتیحەی دەخوێند، پاشان «الله أكبر»ی دەکرد و دەستەکانی تاکو ئاستی شانەکانی بەرز دەکردەوە، پاشان دەڕۆیشتە ڕکووع و دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دادەنا و خۆی دەدانە سەر، وە نە سەری نزم دەکردەوە وە نە سەری زۆر بەرز دەکردەوە، بەڵکو ڕێک دەوەستا، پاشان دەیفەرموو: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ» وە دەستەکانی تاکو ئاستی شانەکانی بەرز

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ٨٢٨، وأبو داود: ٧٣٠ و ٩٦٣، والترمذي: ٢٧٠ و ٣٠٤، والنسائي: ١٠٣٩ و ١١٠١ و ١١٨١ و ١٢٦٢ مختصراً.

دەکردەوە، بە جۆرێک تاکو هەموو ئێسک و جومگەیەک دەهاتەوە شوێنی خۆی، پاشان دەهاتە خوارێ بۆ سەر زەوی (بۆ سوجدە) وە بۆشایی دەخستە نێوان قۆڵ و باسکی لەگەڵ کەلەکە و تەنیشتەکانی، پاشان سەری (لە سوجدە) بەرز دەکردەوە و پێی چەپی ڕادەخست و لەسەری دادەنیشت، لە کاتی سوجدەدا پەنجەی پێیەکانی ڕوو دەکردە قیبلە، پاشان سوجدەی دەبرد، پاشان «الله أكبر»ی دەکرد و لەسەر پێی چەپی دادەنیشت، بە جۆرێک تاکو هەموو جومگەکانی دەهاتنەوە شوێنی خۆیان، پاشان هەڵدەستایەوەو لە ڕکاتەکەی تریش هەر ئاوای دەکرد، وە کاتێک لە ڕکاتی دووەم هەڵدەستاوە دەستەکانی تاکو ئاستی شانەکانی بەرز دەکردەوە هەر وەک ئەوەی کە لە سەرەتای نوێژ کردی، پاشان هەموو نوێژەکەی بەوجۆرە ئەنجام دەدا، تاکو لە سوجدەی کۆتایی کە سەلامدانەوەی لەدوا دێ لەو دانیشتنە لاقی چەپی ڕادەخست و لەسەر بەشێکی پێی چەپی دادەنیشت بە (تورُّك)، ئەوانیش (ئەو هاوەڵانەی کە لە دەوری ئەبو حومەید بوون) گوتیان: ڕاستت گوت، پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە بەو شێوەیە نوێژی دەکرد.

**تورُّك:** ئەوەیە کە لاقی چەپ لەبن لاقی ڕاست دێنیە دەر و لەسەری دادەنیشی وە لاقی ڕاست بچەقێنێ.

١٠٦٢- عَنْ عَمْرَةَ قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂، كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «إِذَا تَوَضَّأَ فَوَضَعَ يَدَيْهِ فِي الْإِنَاءِ سَمَّى اللَّهَ، وَيُسْبِغُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُومُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، فَيُكَبِّرُ وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ حِذَاءَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ يَرْكَعُ فَيَضَعُ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَيُجَافِي بِعَضُدَيْهِ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيُقِيمُ صُلْبَهُ، وَيَقُومُ قِيَامًا هُوَ أَطْوَلُ مِنْ قِيَامِكُمْ قَلِيلًا، ثُمَّ يَسْجُدُ فَيَضَعُ يَدَيْهِ تُجَاهَ الْقِبْلَةِ، وَيُجَافِي بِعَضُدَيْهِ مَا اسْتَطَاعَ فِيمَا رَأَيْتُ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيَجْلِسُ عَلَى قَدَمِهِ الْيُسْرَى، وَيَنْصِبُ الْيُمْنَى، وَيَكْرَهُ أَنْ يَسْقُطَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْسَرِ»[1].

واتە: عەمرە دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂، دەربارەی چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ گوتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێک دەستنوێژی دەگرت دەستی دەخستە ناو دەفری ئاوەکە و ناوی خوای دەهێنا، وە دەستنوێژێکی تەواوی دەگرت، پاشان بەرەو قیبلە

---

(١) ضعيف جداً، وأكثره ثابت في أحاديث.




ڕادەوەستا و تەکبیری دەکردو، دەستەکانی تاکو ئاستی شانەکانی بەرز دەکردەوە، پاشان دەڕۆیشتە ڕکووع و دەستەکانی دەخستە سەر ئەژنۆکانی و قۆڵەکانی جیادەکردەوە لە کەلەکەی، پاشان سەری بەرز دەکردەوە و پشتی ڕاست دەکردەوە و بە پێوە ڕادەوەستا، ڕاوەستانەکەی کەمێک لە هی ئێوە درێژتر بوو، پاشان دەڕۆیشتە سوجدە و دەستەکانی ڕووە و قیبلە دادەنا و، قۆڵەکانی بە پێی توانا لە تەنیشتەکانی جیادەکردەوە و، بڵاوی دەکردن ئەوەندەی من بینیومە، پاشان هەڵدەستایەوە و لەسەر پێی چەپی دادەنیشت، پێی ڕاستیشی دەچەقاند، وە پێی ناخۆش بوو کە خۆی بەلای چەپدا خوار بکاتەوە.

## بابەت: نوێژ کورت کردنەوە لە سەفەردا

**١٠٦٣-** عَنْ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «صَلَاةُ السَّفَرِ رَكْعَتَانِ، وَالْجُمُعَةُ رَكْعَتَانِ، وَالْعِيدُ رَكْعَتَانِ، تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ» عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ ﷺ[1].

واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: نوێژ لە سەفەردا دوو ڕکاتە (جگە لە مەغریب)، وە نوێژی جومعەش دوو ڕکاتە، وە نوێژی جەژن دوو ڕکاتە (ئەوەشی کە دەڵێ دوو ڕکاتە، واتە: ئەو نوێژانە بە دوو ڕکات واجب بوون و کورت کراوە نین، بۆیە دەڵێ:) کورت کراوە نین و تەواون کە لەسەر زمانی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بەو جۆرە هاتووە.

**١٠٦٤-** عَنْ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «صَلَاةُ السَّفَرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، وَالْفِطْرُ وَالْأَضْحَى رَكْعَتَانِ، تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ» عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ ﷺ[2].

واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: نوێژ لە سەفەردا دوو ڕکاتە وە نوێژی جومعە دوو ڕکاتە وە (نوێژی) جەژنی ڕەمەزان دوو ڕکاتە، وە (نوێژی) جەژنی قوربان دوو ڕکاتە، تەواون و کورت کراوە نین لەسەر زمانی (پێغەمبەر) موحەممەد ﷺ وا هاتوون.

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ١٤٢٠ و ١٤٤٠ و ١٥٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ١٤٢٠ و ١٤٤٠ و ١٥٦٦.

١٠٦٥- عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، قَالَ: سَأَلْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قُلْتُ: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ ﴿١٠١﴾﴾ النساء، أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا، وَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ؟ فَقَالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ»[1].

واتە: یەعلای کوڕی ئومەییە ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، گوتم (کە خوا دەفەرموێ): ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ ﴿١٠١﴾﴾ النساء، واتە: هیچ گوناهێکتان لەسەر نیە (دروستە بۆتان)، کە نوێژە چوار ڕکاتییەکان کورت بکەنەوە، ئەگەر ترستان بوو بێبڕوایەکان تووشی بەڵایەکتان بکەن: (بتانکوژن، بتانگرن ئازارتان بدەن). بەڵام ئێستا خۆ خەڵکی لە ئارامی و ئاسایشدان؟! عومەر ﷺ گوتی: منیش سەرم سووڕما لەوەی کە تۆ سەرت لێی سووڕماوە، بۆیە پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە، ئەویش فەرمووی: چاکەو خێرێکی خوایە بۆ ئێوە، ئێوەش ئەو چاکەیەی خوا وەر بگرن و کاری پێ بکەن.

١٠٦٦- عَنْ أُمَيَّةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَالِدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: إِنَّا نَجِدُ صَلَاةَ الْحَضَرِ وَصَلَاةَ الْخَوْفِ فِي الْقُرْآنِ، وَلَا نَجِدُ صَلَاةَ السَّفَرِ؟ فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ: «إِنَّ اللَّهَ بَعَثَ إِلَيْنَا مُحَمَّدًا ﷺ وَلَا نَعْلَمُ شَيْئًا، فَإِنَّمَا نَفْعَلُ كَمَا رَأَيْنَا مُحَمَّدًا ﷺ يَفْعَلُ»[2].

واتە: ئومەییەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی خالید ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ﷺ گوت: نوێژ کە لە ماڵەوە دەکرێ و نوێژی کاتی ترس لە قوڕئاندا باسکراوە و دەبینین، بەڵام باسی نوێژی کاتی سەفەر نابینین لە قوڕئاندا! عەبدوڵڵا پێی گوت: خوا موحەممەدی ﷺ بۆ ئێمە نارد (بە پێغەمبەر)و، هیچمان نە دەزانی، بۆیە ئەو شتانە جێبەجێ دەکەین کە بینیومانە موحەممەد ﷺ کردوویەتی و جێبەجێی کردوە (واتە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی کورت کردۆتەوە، ئێمەش کورتی دەکەینەوە وەکو ئەو).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٨٦، وأبو داود: ١١٩٩ و ١٢٠٠، والترمذي: ٣٠٣٤، والنسائي: ١٤٣٣.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٥٧ و ١٤٣٤.

**١٠٦٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا خَرَجَ مِنْ هَذِهِ الْمَدِينَةِ لَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَيْهَا»[١].**

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لە مەدینە دەردەچوو لە دوو ڕکات زیاتری نەدەکرد (جگە لە شێوان)، تاکو دەگەڕایەوە بۆ مەدینە.**

**١٠٦٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «افْتَرَضَ اللَّهُ الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ»[٢].**

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: خوا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان ﷺ چوار ڕکات نوێژی لە ماڵەوە لەسەر پێویست کردوون، وە لە گەشتیش دوو ڕکات.**

## بابەت: کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە سەفەردا

**١٠٦٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ «يَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي السَّفَرِ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يُعْجِلَهُ شَيْءٌ، وَلَا يَطْلُبَهُ عَدُوٌّ، وَلَا يَخَافَ شَيْئًا»[٣].**

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ مەغریب و عیشای بەیەکەوە کۆکردۆتەوە لە گەشتدا، بێ ئەوەی کاری بەپەلەی هەبووبێ، یان دوژمن بەدوایەوە بووبێ، یان ترسی شتێکی هەبووبێ.**

**١٠٧٠- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ فِي السَّفَرِ»[٤].**

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە گەشتدا لە جەنگی تەبووک نوێژی نیوەڕۆ و عەصری بەیەکەوە و مەغریب و عیشای بەیەکەوە کۆکردۆتەوە.**

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٨٧، وأبو داود: ١٢٤٧، والنسائي: ٤٥٦ و ١٤٤١ و ١٤٤٢ و ١٥٣٢.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم بنحوه: ٧٠٦ وبإثر ٢٢٨١، وأبو داود: ١٢٠٦ و ١٢٠٨، والترمذي بإثر: ٥٥٤، والنسائي: ٥٨٧.

## بابەت: نوێژی سوننەت لە سەفەردا

**١٠٧١-** عَنْ عِيسَى بْنِ حَفْصِ بْنِ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: كُنَّا مَعَ ابْنِ عُمَرَ فِي سَفَرٍ فَصَلَّى بِنَا، ثُمَّ انْصَرَفْنَا مَعَهُ وَانْصَرَفَ، قَالَ: فَالْتَفَتَ فَرَأَى أُنَاسًا يُصَلُّونَ، فَقَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلَاءِ؟ قُلْتُ يُسَبِّحُونَ، قَالَ: لَوْ كُنْتُ مُسَبِّحًا لَأَتْمَمْتُ صَلَاتِي، يَا ابْنَ أَخِي «إِنِّي صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ فِي السَّفَرِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ» ثُمَّ صَحِبْتُ أَبَا بَكْرٍ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ صَحِبْتُ عُمَرَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ صَحِبْتُ عُثْمَانَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُمُ اللَّهُ، وَاللَّهُ يَقُولُ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب[1].

واتە: عیسای کوڕی حەفصی کوڕی عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە و گوتی: لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بووین لە گەشتێکدا، نوێژی بۆ کردین، پاشان بەیەکەوە شوێنی نوێژمان بەجێهێشت، لەو کاتەدا ئاوڕی دایەوە بینی هەندێ کەس نوێژ دەکەن، (لە دوای نوێژە فەڕزەکە) ئەویش گوتی: ئەوانە چی دەکەن؟ دەڵێ: گوتم: نوێژی سوننەت دەکەن، گوتی: خۆ ئەگەر هەر نوێژی سوننەت بکەم، ئەوە نوێژە فەڕزەکەم بە تەواوی دەکرد و کورتم نەدەکردەوە، ئەی برازای خۆم من لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە گەشتێکدا لە دوو ڕکات زیاتری نەدەکرد تاکو خوا بردیەوە بۆ لای خۆی، پاشان هاوەڵیەتی ئەبو بەکرم کردوە لە دوو ڕکات زیاتری نەدەکرد، پاشان هاوەڵیەتی عومەرم کردوە لە دوو ڕکات زیاتری نەدەکرد، پاشان هاوەڵیەتی عوسمانم کردوە لە دوو ڕکات زیاتری نەدەکرد، تاکو خوا بردنیەوە بۆلای خۆی، وە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقی و پێشەوایەتی چاک.

**١٠٧٢-** عَنِ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ يَقُولُ: «فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْحَضَرِ وَصَلَاةَ السَّفَرِ، فَكُنَّا نُصَلِّي فِي الْحَضَرِ قَبْلَهَا وَبَعْدَهَا، وَكُنَّا نُصَلِّي فِي السَّفَرِ قَبْلَهَا وَبَعْدَهَا»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٠١ و ١١٠٢، ومسلم: ٦٨٩ و ١٢٢٣، والترمذي: ٥٤٤، والنسائي: ١٤٥٧ و ١٤٥٨.

(٢) منكر مخالف الحديث الذي قبله في الصحيحين.

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ماڵەوە و سەفەری فەڕز کردوە، جا ئێمە لە ماڵەوە لە پێش نوێژە فەڕزەکە و لەدوای نوێژەکەش نوێژمان دەکرد (نوێژی سوننەت)، وە لە سەفەریشدا لە پێش نوێژدا و لە دوای نوێژیشدا نوێژمان دەکرد.

## بابەت: ژمارەی ئەو ڕۆژانەی کە نوێژیان تێدا کورت دەکرێتەوە کاتێک کە لە شارێک دەمێنیەوە

**١٠٧٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ ﷺ مَاذَا سَمِعْتَ فِي سُكْنَى مَكَّةَ؟ قَالَ: سَمِعْتُ الْعَلَاءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ، يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ثَلَاثًا لِلْمُهَاجِرِ بَعْدَ الصَّدَرِ»[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حومەیدی زوهریی دەڵێ: لە سائیبی کوڕی یەزیدم پرسی: چیت بیستووە دەربارەی مانەوە لە مەککەدا؟ گوتی: لە عەلائی کوڕی حەزڕەمیم ﷺ بیست دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مانەوە لە مەککە) بۆ کۆچکەران سێ ڕۆژە لە دوای تەواو کردنی فەڕزەکانی حەج (واتە: زیاتر مانەوە بە نیشتەجێ هەژمار دەکرێ و گەشتیار نامێنێ).

**١٠٧٤-** عَنْ عَطَاءٍ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، فِي أُنَاسٍ مَعِي، قَالَ: «قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ مَكَّةَ صُبْحَ رَابِعَةٍ مَضَتْ مِنْ شَهْرِ ذِي الْحِجَّةِ»[2].

واتە: عەتاء ﷺ دەڵێ: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ بۆی گێڕامەوە لە ناو خەڵکێکدا کە لەگەڵ من بوون، گوتی: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەککە بەیانی ڕۆژی چوارەم لە مانگی «ذي الحجة».

**١٠٧٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: «أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تِسْعَةَ عَشَرَ يَوْمًا، يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ» فَنَحْنُ إِذَا أَقَمْنَا تِسْعَةَ عَشَرَ يَوْمًا، نُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فَإِذَا أَقَمْنَا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، صَلَّيْنَا أَرْبَعًا[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٣٣، ومسلم: ١٣٥٢، وأبو داود: ٢٠٢٢، والترمذي: ٩٤٩، والنسائي: ١٤٥٤ و ١٤٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٠٦ و ٧٢٣٠ و ٧٣٦٧، وأبو داود: ١٧٨٧ و ١٧٨٨، والنسائي: ٢٨٧٢ و ٢٩٩٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٨٠، والترمذي: ٥٤٩. وانظر أبو داود: ١٢٣٠_١٢٣٢، والنسائي: ١٤٥٣.

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نۆزدە ڕۆژ مایەوە، دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی دەکرد، جا ئەگەر ئێمەش نۆزدە ڕۆژ مابایینەوە، ئەوە دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژمان دەکرد، خۆ ئەگەر زیاتر مابایینەوە بە چوار ڕکاتی دەمان کردن.

**١٠٧٦-** عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَقَامَ بِمَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ خَمْسَ عَشْرَةَ لَيْلَةً يَقْصُرُ الصَّلَاةَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ساڵی ڕزگارکردنی مەککە پازدە شەو لە مەککە مایەوە و نوێژەکانیشی کورت دەکردنەوە.

**١٠٧٧-** عَنْ أَنَسٍ ﵁، قَالَ: «خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى رَجَعْنَا» قُلْتُ: كَمْ أَقَامَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: «عَشْرًا»[٢].

واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە دەرچووین بەرەو مەککە، (پێغەمبەر ﷺ) دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژەکانی دەکرد تاکو گەڕاینەوە، (ڕاوی) دەڵێ: گوتم: چەند مایەوە لە مەککە؟ گوتی: دە (ڕۆژو شەو).

## بابەت: ئەوەی دەربارەی ئەو کەسە هاتووە کە وازی لە نوێژی هێناوە

**١٠٧٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَ الْعَبْدِ وَبَيْنَ الْكُفْرِ تَرْكُ الصَّلَاةِ»[٣].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نێوانی بەندەو نێوانی کوفر، وازهێنان لە نوێژە.

**١٠٧٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلَاةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ»[٤].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٢٣١، والنسائي: ١٤٥٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٨١، ومسلم: ٦٩٣، وأبو داود: ١٢٣٣، والترمذي: ٥٤٨، والنسائي: ١٤٣٨ و ١٤٥٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٢، وأبو داود: ٤٦٧٨، والترمذي: ٢٦١٨.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٦٢١، والنسائي: ٤٦٣.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەو ئەواندا (دوو ڕووەکان) هەیە نوێژە، جا هەر کەس وازی لە نوێژ هێنا، ئەوە بەڕاستی بێبڕوایی ئەنجامداوە.

١٠٨٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ بَيْنَ الْعَبْدِ وَالشِّرْكِ إِلَّا تَرْكُ الصَّلَاةِ، فَإِذَا تَرَكَهَا فَقَدْ أَشْرَكَ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نێوانی بەندەو هاوبەشدانان بۆ خوا تەنها وازهێنانە لە نوێژ، هەرکات نوێژی وازلێهێنا، ئەوە بێگومان هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوە.

١٠٨١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ تُوبُوا إِلَى اللَّهِ قَبْلَ أَنْ تَمُوتُوا، وَبَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ الصَّالِحَةِ قَبْلَ أَنْ تُشْغَلُوا، وَصِلُوا الَّذِي بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ رَبِّكُمْ بِكَثْرَةِ ذِكْرِكُمْ لَهُ، وَكَثْرَةِ الصَّدَقَةِ فِي السِّرِّ وَالْعَلَانِيَةِ، تُرْزَقُوا وَتُنْصَرُوا وَتُجْبَرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ قَدِ افْتَرَضَ عَلَيْكُمُ الْجُمُعَةَ فِي مَقَامِي هَذَا، فِي يَوْمِي هَذَا، فِي شَهْرِي هَذَا، مِنْ عَامِي هَذَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَمَنْ تَرَكَهَا فِي حَيَاتِي أَوْ بَعْدِي، وَلَهُ إِمَامٌ عَادِلٌ أَوْ جَائِرٌ، اسْتِخْفَافًا بِهَا، أَوْ جُحُودًا لَهَا، فَلَا جَمَعَ اللَّهُ لَهُ شَمْلَهُ، وَلَا بَارَكَ لَهُ فِي أَمْرِهِ، أَلَا وَلَا صَلَاةَ لَهُ، وَلَا زَكَاةَ لَهُ، وَلَا حَجَّ لَهُ، وَلَا صَوْمَ لَهُ، وَلَا بِرَّ لَهُ حَتَّى يَتُوبَ، فَمَنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، أَلَا لَا تَؤُمَّنَّ امْرَأَةٌ رَجُلًا، وَلَا يَؤُمَّ أَعْرَابِيٌّ مُهَاجِرًا، وَلَا يَؤُمَّ فَاجِرٌ مُؤْمِنًا، إِلَّا أَنْ يَقْهَرَهُ بِسُلْطَانٍ، يَخَافُ سَيْفَهُ وَسَوْطَهُ»(٢).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ دەخوێندینەوە جا فەرمووی: ئەی خەڵکینە! بگەڕێنەوە بۆ لای خوا پێش ئەوەی بمرن، وە پەلە بکەن و دەستپێشخەر بن بۆ کاری چاکە پێش ئەوەی سەرقاڵ ببن، وە ئەو ئەرکەی لەسەرتانە بەرانبەر خوا بەزۆر یادکردنی خوا بەجێی بێنن، وە بە چاکە و خێرکردنی زۆر بە پەنهانی و بە ئاشکرا، ئەو کات ڕۆزیتان زیاد دەبێ و سەرکەوتوو دەبن و چاکە و خێرتان دێتە پێش، وە بزانن خوا نوێژی جومعەی لە سەرتان فەرز کردوە لەو شوێنەی مندا و لەو ڕۆژەدا و لەو مانگەدا و لەو ساڵەدا هەتا ڕۆژی قیامەت،

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) ضعيف.



جا هەر کەس تەرکی بکات و نەیکات، چ لە ژیانی مندا، یان لە دوای من، لەگەڵ ئەوەی پێشەوایەکی دادپەروەری هەبێ، یان ستەمکار بە مەبەستی ئەوەی کە (نوێژی جومعە) بە کەم بزانێ، یان نکوڵی بکات، خوا کاروباری بۆ ڕێکنەخات و بەرەکەت نەخاتە کاروبارییەوە، وە ئاگاداربن! ئەو کەسە نە نوێژی هەیە، نە زەکاتی لەسەر لادەچێ، نە حەجی لێ وەردەگیرێ، نە ڕۆژووی لێ وەردەگیرێ، نە چاکەی بۆ دەنوسرێ، (واتە: کەسێک بە ئەنقەست نوێژی جومعە تەرک بکات و بڕوای پێنەبێ هیچی لێ وەرناگیرێ)، هەتاکو تەوبە دەکات، جا هەر کەس تەوبە بکات خوا تەوبەی وەردەگرێ، ئاگاداربن! ئافرەت نابێتە پێشنوێژ بۆ پیاو، وە دەشتەکی نابێتە ئیمام بۆ موهاجیرێک (لەبەر ئەوەنا کە نوێژەکە بەرناکەوێ، بەڵکو لەبەر گەورەیی ئەو کۆچکردنەیە کە لە پێناو خوا ئەنجامیانداوە)، وە گوناهبار نابێتە ئیمامی ئیماندار، مەگەر بە زەبری زۆری دەسەڵاتدارێک کە لە ئازاری شمشێرەکەی و قامچییەکەی بترسێن کرابێتە پێشنوێژ.

**١٠٨٢-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ قَائِدَ أَبِي حِينَ ذَهَبَ بَصَرُهُ، فَكُنْتُ إِذَا خَرَجْتُ بِهِ إِلَى الْجُمُعَةِ فَسَمِعَ الْأَذَانَ اسْتَغْفَرَ لِأَبِي أُمَامَةَ أَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ، وَدَعَا لَهُ، فَمَكَثْتُ حِينًا أَسْمَعُ ذَلِكَ مِنْهُ، ثُمَّ قُلْتُ فِي نَفْسِي: وَاللَّهِ إِنَّ ذَا لَعَجْزٌ، إِنِّي أَسْمَعُهُ كُلَّمَا سَمِعَ أَذَانَ الْجُمُعَةِ يَسْتَغْفِرُ لِأَبِي أُمَامَةَ وَيُصَلِّي عَلَيْهِ، وَلَا أَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ لِمَ هُوَ؟ فَخَرَجْتُ بِهِ كَمَا كُنْتُ أَخْرُجُ بِهِ إِلَى الْجُمُعَةِ، فَلَمَّا سَمِعَ الْأَذَانَ اسْتَغْفَرَ كَمَا كَانَ يَفْعَلُ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَتَاهُ، أَرَأَيْتَكَ صَلَاتَكَ عَلَى أَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ كُلَّمَا سَمِعْتَ النِّدَاءَ بِالْجُمُعَةِ لِمَ هُوَ؟ قَالَ: أَيْ بُنَيَّ، كَانَ أَوَّلَ مَنْ صَلَّى بِنَا صَلَاةَ الْجُمُعَةِ قَبْلَ مَقْدَمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ مَكَّةَ، فِي نَقِيعِ الْخَضَمَاتِ، فِي هَزْمٍ مِنْ حَرَّةِ بَنِي بَيَاضَةَ، قُلْتُ: كَمْ كُنْتُمْ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: أَرْبَعِينَ رَجُلًا [(١)].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: لەوکاتەوە باوکم چاوەکانی لە دەستدا (کوێر بوو) من چاوساغی بووم و دەمبرد بۆ نوێژی جومعە، جا کە گوێی لە بانگ دەبوو داوای لێ خۆشبوونی بۆ ئەبو ئومامەی ئەسعەدی کوڕی زوڕارە دەکرد و دوعای بۆ دەکرد، ماوەیەک بەو شێوەیە مامەوە کە ئەوەم لێ دەبیست (لەگەڵیدا باسی هۆکارەکەیم نەدەکرد)، پاشان بۆ خۆم بە خۆم گوت: سوێند بە خوا

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٠٦٩.

ئەوە دەستەپاچەیی منە کاتێک گوێم لێیە هەرکات (باوکم) گوێی لە بانگی جومعە دەبێ ئەوە داوای لێ خۆشبوون بۆ ئەبو ئومامە دەکات و دوعا و نزای بۆ دەکات و منیش لێی ناپرسم بۆ ئەوە دەکات، مەگەر ئەو (ئەبو ئومامە) کێیە، ئنجا وەک هەمیشە لەگەڵی دەرچووم بۆ نوێژی جومعە، جا کاتێک گوێی لە بانگ بوو دیسان داوای لێ خۆشبوونی بۆ کرد وەکو جاران، ئنجا گوتم: ئەی بابە گیان!! ئەگەر بمزانیبا کە تۆ بۆچی هەرکات گوێت لە بانگ بوو دوعا بۆ ئەسعەدی کوڕی زوڕارە دەکەی، مەگەر کێیە؟ گوتی: ئەی ڕۆڵەکەم یەکەم کەسێک بوو کە نوێژی جومعەی بۆ کردین، پێش هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە، لە «نقيع الخضمات» (شوێنێکە لە دەوروبەری مەدینە) لە دێی هەزم کە هەواری بەنو بەیازە، گوتم: ئەوکات ژمارەتان چەند بوو؟ گوتی: چل پیاو.

**١٠٨٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَضَلَّ اللَّهُ عَنِ الْجُمُعَةِ مَنْ كَانَ قَبْلَنَا، كَانَ لِلْيَهُودِ يَوْمُ السَّبْتِ، وَالْأَحَدُ لِلنَّصَارَى، فَهُمْ لَنَا تَبَعٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، نَحْنُ الْآخِرُونَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، وَالْأَوَّلُونَ الْمَقْضِيُّ لَهُمْ قَبْلَ الْخَلَائِقِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ئەوانەی پێش ئێمەی سەرلێشێواو کرد لە (هەڵبژاردنی ڕۆژی) جومعە، جوولەکەکان ڕۆژی شەممەیان هەیە و، گاورەکانیش ڕۆژی یەک شەممە، وە ئەوان لە دوای ئێمەن تا ڕۆژی قیامەت، ئێمە (هەرچەند) ئێمە کۆتا ئوممەتین لە خەڵکی دونیا، (بەڵام) یەکەم ئوممەتین لە ڕۆژی قیامەت و پێش هەموو دروستکراوان دەکەوین لە حیساب و کیتاب.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٥٦، والنسائي: ١٣٦٨.

## بابەت: فەزڵ و گەورەیی جومعە

١٠٨٤- عَنْ أَبِي لُبَابَةَ بْنِ عَبْدِ الْمُنْذِرِ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ سَيِّدُ الْأَيَّامِ، وَأَعْظَمُهَا عِنْدَ اللَّهِ، وَهُوَ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ يَوْمِ الْأَضْحَى وَيَوْمِ الْفِطْرِ، فِيهِ خَمْسُ خِلَالٍ، خَلَقَ اللَّهُ فِيهِ آدَمَ، وَأَهْبَطَ اللَّهُ فِيهِ آدَمَ إِلَى الْأَرْضِ، وَفِيهِ تَوَفَّى اللَّهُ آدَمَ، وَفِيهِ سَاعَةٌ لَا يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا الْعَبْدُ شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ، مَا لَمْ يَسْأَلْ حَرَامًا، وَفِيهِ تَقُومُ السَّاعَةُ، مَا مِنْ مَلَكٍ مُقَرَّبٍ، وَلَا سَمَاءٍ، وَلَا أَرْضٍ، وَلَا رِيَاحٍ، وَلَا جِبَالٍ، وَلَا بَحْرٍ، إِلَّا وَهُنَّ يُشْفِقْنَ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ»[١].

واتە: ئەبو لوبابەی کوڕی عەبدولمونزیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ڕۆژی جومعە گەورەی هەموو ڕۆژەکانی ترەو، لە لای خوا گەورەترە لە ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، پێنج تایبەتمەندی لەو ڕۆژەدا هەیە، خوا ئادەمی ﷺ لەو ڕۆژەدا دروست کرد، وە لەو ڕۆژەدا ناردییە خوارێ بۆ سەر زەوی، وە هەر لەم ڕۆژەدا ئادەم ﷺ مرد، وە ئەو ڕۆژە کاتێکی تێدایە کە هەر کەس لەو کاتەدا هەرچی داوابکات مادام حەڕام نەبێ، بێگومان خوا پێی دەدات، وە لەو ڕۆژەدا قیامەت هەڵدەستێ، هیچ فریشتەیەکی نزیک لە خوا نیە، وە هیچ ئاسمان و زەوییەک نیە، وە هیچ بایەک و کێوێک و دەریایەک نیە، کە لەو ڕۆژە نەترسێ و هەمووان دەترسێن لە ڕۆژی جومعە.

١٠٨٥- عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ» فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تُعْرَضُ صَلَاتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرَمْتَ؟ - يَعْنِي بَلِيتَ - فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ»[٢].

واتە: شەددادی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە باشترینی ڕۆژەکانتان ڕۆژی جومعەیە، لەو ڕۆژەدا ئادەم ﷺ دروستکرا، وە هەر لە ڕۆژەدا فوکردنی (نەفخەی) دونیا تێکچوون ڕوودەدات، وە لەو ڕۆژەدایە ئەو دەنگە بەرز و بەهێزەی کە مرۆڤ لێی دەترسێ ڕوودەدات، جا لە ڕۆژی جومعەدا ئێوە زۆر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

صەڵاوات لەسەر من لێبدەن، چونكە بێگومان صەڵاواتەكانتان بۆ من ڕادەنوێنرێن (دەیانبینم، یان دەیانبیستم)، ئنجا پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن صەڵاواتەكانمانت بۆ ڕادەنوێنرێ لەكاتێكدا لە ژیاندا نەماوی و لاشەت نەماوە؟ ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا قەدەغەی كردوە لەسەر زەوی كە لاشەی پێغەمبەران بخوات.

١٠٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «الْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ كَفَّارَةٌ مَا بَيْنَهُمَا مَا لَمْ تُغْشَ الْكَبَائِرُ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جومعەیەک بۆ جومعەیەكی دیكە، دەبێتە هۆی سڕینەوە گوناهەكانی نێوانیان مادام گوناهی گەورەی تێدا ئەنجامنەدرابێ.

## بابەت: ئەو فەرموودانەی هاتوون دەربارەی خۆشۆردنی ڕۆژی جومعە

١٠٨٧- عَنْ أَوْس بْن أَوْسٍ الثَّقَفِيُّ ﷺ، قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ، وَبَكَّرَ وَابْتَكَرَ، وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ، وَدَنَا مِنَ الْإِمَامِ، فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خَطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ، أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا»(٢).

واتە: ئەوسی كوڕی ئەوسی سەقەفیی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، دەیفەرموو: هەر كەس ڕۆژی جومعە دەستنوێژ بگرێت و خۆی بشوات و زوو بچێتە مزگەوت و بەشداری سەرەتای وتار بێ، وە بە پێ بچێ و بە سواری نەچێ، وە لە ئیمام نزیک ببێتەوە و گوێی بۆ بگرێ و كار و قسەی نەشیاو نەكات، ئەوە بۆ هەر هەنگاوێک پاداشتی كردەوەی یەک ساڵی بۆ دەنوسرێ كە بەڕۆژ ڕۆژووی گرتبێ و شەویش شەونوێژی كردبێ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٣٣، والترمذي: ٢١٤.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٥، والترمذي: ٤٩٦، والنسائي: ١٣٨١ و ١٣٨٤ و ١٣٩٨.

**١٠٨٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ، قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: «مَنْ أَتَى الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ»[١].**

**واتە: ئیبنو عومەر ﭭ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو لەسەر مینبەر دەیفەرموو: هەر کەس هات بۆ جومعە با خۆی بشۆرێ (واتە: پێش ئەوەی کاتی جومعە بێت خۆی بشۆرێ و خۆی ئامادە بکات).**

**١٠٨٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ»[٢].**

**واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﭬ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆ شۆردنی ڕۆژی جومعە واجبە (پێویستە) لەسەر هەموو کەسێکی (باڵغ) پێگەیشتوو.**

## بابەت: مۆڵەتی خۆنەشۆردن

**١٠٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ، فَدَنَا وَأَنْصَتَ وَاسْتَمَعَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى، وَزِيَادَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، وَمَنْ مَسَّ الْحَصَى فَقَدْ لَغَا»[٣].**

**واتە: ئەبو هورەیرە ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە باشترین شێوە دەستنوێژ بگرێ، پاشان بێت بۆ جومعە و نزیک بێتەوە (لە ئیمام) و بێدەنگ بێت و گوێ بگرێ، ئەوە لە گوناهی نێوان ئەو جومعە و جومعەی داهاتوو دەبوردرێ، وە سێ ڕۆژیش زیاتر، وە هەر کەس دەست لە چە و بەرد وەربدات ئەوە کاری نەشیاوی کردوە.**

**١٠٩١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﭬ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ، يُجْزِئُ عَنْهُ الْفَرِيضَةُ، وَمَنِ اغْتَسَلَ فَالْغُسْلُ أَفْضَلُ»[٤].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٧٧، ومسلم: ٨٤٤، والترمذي: ٤٩٢، والنسائي: ١٤٠٦ و ١٤٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٥٨، ومسلم: ٨٤٦، وأبو داود: ٣٤١، والنسائي: ١٣٧٧.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٥٧، وأبو داود: ١٠٥٠، والترمذي: ٤٩٨.

(٤) صحيح دون قوله «يُجْزِئُ عَنْهُ الْفَرِيضَةُ».

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە ڕۆژی جومعەدا دەستنوێژ بگرێ (جا بێت بۆ جومعە) ئەوە زۆر باشی کردوە، فەڕزەکەی بەجێ گەیاندووە، خۆ ئەگەر خۆی بشۆرێ، ئەوە خۆشۆردن باشترە.

## بابەت: ئەو فەرموودانەی دەربارەی زوو ڕۆیشتن بۆ جومعە هاتوون

**١٠٩٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ مَلَائِكَةٌ يَكْتُبُونَ النَّاسَ عَلَى قَدْرِ مَنَازِلِهِمْ، الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ، فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ طَوَوُا الصُّحُفَ، وَاسْتَمَعُوا الْخُطْبَةَ، فَالْمُهَجِّرُ إِلَى الصَّلَاةِ كَالْمُهْدِي بَدَنَةً، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ كَمُهْدِي بَقَرَةٍ، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ كَمُهْدِي كَبْشٍ - حَتَّى ذَكَرَ الدَّجَاجَةَ وَالْبَيْضَةَ، زَادَ سَهْلٌ فِي حَدِيثِهِ - فَمَنْ جَاءَ بَعْدَ ذَلِكَ فَإِنَّمَا يَجِيءُ بِحَقٍّ إِلَى الصَّلَاةِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ڕۆژی جومعە هات لەسەر هەر دەرگایەکی مزگەوت فریشتەیەک هەیە ناوی خەڵک دەنوسن بە گوێرەی پلەو پایەکانیان (لە پاداشتدا)، جا سەرەتا یەکەم ئەوجار دوای ئەو، جا کاتێک ئیمام دەرچوو (بۆ سەر مینبەر) ئەوە پەڕاوەکەیان دەپێچنەوە و گوێ بۆ وتار دەگرن، ئەوەی کە لە زووترین کاتدا دێت وەک ئەوە وایە حوشترێکی کردبێتە خێر، پاشان ئەوەی دوای ئەو وەکو ئەوە وایە مانگایەکی کردبێتە خێر، پاشان ئەوەی دوای ئەو وەکو ئەوەی بەرانێکی (نێرینەی مەڕی) کردبێتە خێر، هەتا باسی مریشک و هێلکەشی کرد (بۆ ئەوانەی دواتر دێن)، سەهل ئەوەشی لەم فەرموودەیە زیاد هێناوە: ئەوەی دوای ئەو کاتە بێ، ئەوە تەنها هاتووە فەڕزەکەی لەسەر خۆی لابات.

**١٠٩٣-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «ضَرَبَ مَثَلَ الْجُمُعَةِ، ثُمَّ التَّبْكِيرِ كَنَاحِرِ الْبَدَنَةِ، كَنَاحِرِ الْبَقَرَةِ، كَنَاحِرِ الشَّاةِ، حَتَّى ذَكَرَ الدَّجَاجَةَ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٨١، ومسلم: ٨٥٠، وأبو داود: ٣٥١، والترمذي: ٤٩٩، والنسائي: ٨٦٤ و ١٣٨٥_١٣٨٨.

(٢) حسن صحيح.

واتە: سەموڕەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ نمونەی هێنایەوە بۆ هاتن بۆ جومعە و پەلەکردن لە هاتن (بە ڕیزبەندی بەپێی زووتر هاتنیان، نمونەکەی ڕیزکردوە و فەرموویەتی:) وەکو کەسێک حوشترێک سەر ببڕێ، (دوای ئەو) وەکو مانگایەک سەر ببڕێ، (دوای ئەو) وەکو مەڕێک سەر ببڕێ، هەتا باسی مریشکیشی کرد.

**١٠٩٤-** عَنْ عَلْقَمَةَ ﷺ، قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ إِلَى الْجُمُعَةِ فَوَجَدَ ثَلَاثَةً وَقَدْ سَبَقُوهُ، فَقَالَ: رَابِعُ أَرْبَعَةٍ وَمَا رَابِعُ أَرْبَعَةٍ بِبَعِيدٍ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّ النَّاسَ يَجْلِسُونَ مِنَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى قَدْرِ رَوَاحِهِمْ إِلَى الْجُمُعَاتِ، الْأَوَّلَ وَالثَّانِيَ وَالثَّالِثَ» ثُمَّ قَالَ: «رَابِعُ أَرْبَعَةٍ، وَمَا رَابِعُ أَرْبَعَةٍ بِبَعِيدٍ»[١].

واتە: عەلقەمە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵڵا ڕۆیشتم بۆ جومعە، تەماشای کرد سێ کەس پێش ئەو کەوتونەوە (لەناو مزگەوتن)، ئنجا عەبدوڵڵا گوتی: چوارەمی چوارەکان (مەبەستی خۆی بوو) وە چوارەمی چوارەکان دوور نیە لە پاداشت (یان چوارەمی چوارەکان چەندە دوورە لە پاداشتەکە)، بەڕاستی من لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە کە دەیفەرموو: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا شوێنەکانیان نزیک دەبێ لە خوا بە پێی زوو ڕۆیشتنیان بۆ جومعەکان، یەکەم ئەوجار دووەم و ئەوجار سێیەم، پاشان گوتی: چوارەمی چوارەکان زۆر دوور نابێ.

## بابەت: خۆ ڕازاندنەوەی ڕۆژی جومعە

**١٠٩٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ: «مَا عَلَى أَحَدِكُمْ لَوِ اشْتَرَى ثَوْبَيْنِ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، سِوَى ثَوْبِ مِهْنَتِهِ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە لە ڕۆژی جومعەدا لەسەر مینبەر دەیفەرموو: هیچ نەنگییەک نابێ لەسەر هەر یەکێکتان ئەگەر (بتوانێ) دوو پۆشاک بکڕێ بۆ ڕۆژی جومعە جگە لە پۆشاکی کارکردنەکەی.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٧٨.




**١٠٩٥م-** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْخٌ لَنَا، عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ جَعْفَرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: خَطَبَنَا النَّبِيُّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ[1].

**واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرمووده گێڕدراوەتەوە.**

**١٠٩٦-** عَنْ عَائِشَةَ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ النَّاسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَرَأَى عَلَيْهِمْ ثِيَابَ النِّمَارِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا عَلَى أَحَدِكُمْ إِنْ وَجَدَ سَعَةً أَنْ يَتَّخِذَ ثَوْبَيْنِ لِجُمُعَتِهِ سِوَى ثَوْبَيْ مِهْنَتِهِ»[2].

**واتە: عائیشە  دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جومعەدا وتاری دەخوێندەوە بۆ خەڵک، ئنجا بینی پۆشاکی نیماریان لەبەردایە، جا فەرمووی: هیچ گوناهێکتان لەسەر نابێ هەر یەکێکتان ئەگەر بۆی بکرێ دوو پۆشاک پەیدا بکات بۆ جومعە، جگە لە پۆشاکی کارکردنەکەی.**

**النِّمَار: پۆشاکێکە دەشتەکییەکان بەسەر خۆیاندا دەدا.**

**١٠٩٧-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَأَحْسَنَ غُسْلَهُ، وَتَطَهَّرَ فَأَحْسَنَ طُهُورَهُ، وَلَبِسَ مِنْ أَحْسَنِ ثِيَابِهِ، وَمَسَّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ مِنْ طِيبِ أَهْلِهِ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ وَلَمْ يَلْغُ وَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ اثْنَيْنِ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى»[3].

**واتە: ئەبو زەڕ  دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە ڕۆژی جومعەدا بە جوانترین و باشترین شێوە خۆی بشۆرێ، وە بە باشترین شێوە دەستنوێژ بگرێ، وە لە جوانترینی پۆشاکەکانی بپۆشێ، وە چی خوا پێیداوە لە بۆنی خۆش لە خۆی بدات، پاشان بێتە جومعە و کاری نەشیاوی نەکات وە دوو کەس لێک جیا نەکاتەوە (نەیێتە نێوانیان بۆ دانیشتن و ئەزیەتیان نەدات)، ئەوە خوا لە گوناهەکانی نێوان ئەو جومعە و جومعەکەی تریشی دەبورێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٧٨.

(٢) صحيح.

(٣) حسن صحيح.

**١٠٩٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ هَذَا يَوْمُ عِيدٍ، جَعَلَهُ اللَّهُ لِلْمُسْلِمِينَ، فَمَنْ جَاءَ إِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ، وَإِنْ كَانَ طِيبٌ فَلْيَمَسَّ مِنْهُ، وَعَلَيْكُمْ بِالسِّوَاكِ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەوڕۆ (کە جومعەیە) ڕۆژی جەژنە ئەمڕۆ خوا بۆ مسوڵمانانی داناوە، جا هەر کەس هات بۆ جومعە با خۆی بشوات، وە ئەگەر بۆنی خۆشی هەبوو با لە خۆی بدات، وە بەردەوام بن لە سیواک (هەمیشە پێتان بێت و بەکاری بێنن).

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی کاتی جومعە هاتووە

**١٠٩٩-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﵁، قَالَ: «مَا كُنَّا نَقِيلُ وَلَا نَتَغَدَّى إِلَّا بَعْدَ الْجُمُعَةِ»(٢).

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﵁ دەڵێ: ئێمە نە خەوی نیوەڕۆمان (قەیولە) دەکرد و نەنانی نیوەڕۆمان دەخوارد هەتا دوای نوێژی جومعە.

**١١٠٠-** عَنْ إِيَاس بْن سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: «كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْجُمُعَةَ، ثُمَّ نَرْجِعُ فَلَا نَرَى لِلْحِيطَانِ فَيْئًا نَسْتَظِلُّ بِهِ»(٣).

واتە: ئیاسی کوڕی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژی جومعەمان دەکرد، پاشان دەگەڕاینەوە، لە کاتێکدا کە دیوارەکان هیچ سێبەرێکیان نەبوو لە ژێر سێبەرەکەیان ڕۆیشتباین.

**١١٠١-** عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ سَعْدٍ ﵁، مُؤَذِّنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّهُ كَانَ «يُؤَذِّنُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذَا كَانَ الْفَيْءُ مِثْلَ الشِّرَاكِ»(٤).

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٩، ومسلم: ٨٥٩، وأبو داود: ١٠٨٦، والترمذي: ٥٢٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤١٦٨، ومسلم: ٨٦٠، وأبو داود: ١٠٨٥، والنسائي: ١٣٩١.

(٤) ضعيف.

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی عەمماڕی کوڕی سەعد ﷺ بانگ بێژی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: باوکم لە باوکییەوە لە باپیریەوە بۆی گێڕامەوە کە کاتێک ڕۆژی جومعە بانگی دەگوت لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەو کاتە بوو کە سێبەر بە ئەندازەی قەیتانی نەعل لایدابایە.

**١١٠٢-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نُجَمِّعُ ثُمَّ نَرْجِعُ فَنَقِيلُ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئێمە جومعەمان دەکرد، ئەوجار دەگەڕاینەوە بۆ ماڵ و سەرخەوێکمان دەشکاند.

## بابەت: وتاری ڕۆژی جومعە

**١١٠٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ «يَخْطُبُ خُطْبَتَيْنِ، يَجْلِسُ بَيْنَهُمَا جَلْسَةً» زَادَ بِشْرٌ «وَهُوَ قَائِمٌ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ (لە ڕۆژی جومعەدا) دوو وتاری دەخوێندەوە، لە نێوان وتارەکان کەمێک دادەنیشت، بیشر (ڕاوی فەرموودەکە) ئەوەشی زیاد هێناوە کە دەڵێ: (لەکاتی وتارەکان) بە پێوە بوو.

**١١٠٤-** عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ «يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»[٣].

واتە: جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی حوڕەیس لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: بینیومە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر وتاری دەداو مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بوو.

**١١٠٥-** عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ، يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَخْطُبُ قَائِمًا غَيْرَ أَنَّهُ كَانَ يَقْعُدُ قَعْدَةً ثُمَّ يَقُومُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٠٥ و ٩٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٢٠، ومسلم: ٨٦١، وأبو داود: ١٠٩٢، والترمذي: ٥٠٦، والنسائي: ١٤١٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٥٩، وأبو داود: ٤٠٧٧ مطولًا، والنسائي: ٥٣٤٣ و ٥٣٤٦.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٦٢ و ٨٦٦، وأبو داود: ١٠٩٣، والنسائي: ١٤١٥ و ١٥٨٢ و ١٥٧٤.





واتە: سیماکی کوڕی حەڕب دەڵێ: گوێم لە جابیری کوڕی سەمورە ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێوە وتاری دەدا، بەڵام ئەوەندە هەبوو کە کەمێک دادەنیشت، پاشان هەڵدەستایەوە (دانیشتنی نێوان وتارەکانی مەبەستە).

١١٠٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يَخْطُبُ قَائِمًا، ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَقْرَأُ آيَاتٍ، وَيَذْكُرُ اللَّهَ، وَكَانَتْ خُطْبَتُهُ قَصْدًا، وَصَلَاتُهُ قَصْدًا»[١].

واتە: جابیری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە وەستان وتاری دەدا، پاشان دادەنیشت، پاشان هەڵدەستایەوە، هەندێک ئایەتی دەخوێند و یادی خوای دەکرد، وە وتارەکەی و نوێژەکەی نە زۆر کورت بوو، نە زۆر درێژ بوو، لە نێوان ئەو دووانەدا بوو.

١١٠٧- عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ «إِذَا خَطَبَ فِي الْحَرْبِ خَطَبَ عَلَى قَوْسٍ، وَإِذَا خَطَبَ فِي الْجُمُعَةِ خَطَبَ عَلَى عَصًا»[٢].

واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی عەمماری کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە لە باوکییەوە، ئەویش لە باوکییەوە، لە باپیریەوە گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک وتاری دەدا ئەگەر لە جەنگ بووایە ئەوە خۆی دەدایە سەر کەوانێک، ئەگەر لە وتاری جومعەشدا بووایە خۆی دەدایە سەر دارگۆچانێک.

١١٠٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ سُئِلَ: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ قَائِمًا أَوْ قَاعِدًا؟ قَالَ: أَوَمَا تَقْرَأُ: ﴿ وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ﴿١١﴾ ﴾ الجمعة؟ قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: غَرِيبٌ، لَا يُحَدِّثُ بِهِ إِلَّا ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ وَحْدَهُ[٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ پرسیاری لێکراوە دەربارەی ئەوەی ئایا پێغەمبەر ﷺ بە وەستانەوە وتاری دەدا، یان بە دانیشتنەوە؟ ئەویش گوتی: ئەوە ئەو ئایەتەت نەخوێندۆتەوە کە دەفەرمووێ: ﴿ وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ﴿١١﴾ ﴾ الجمعة، واتە: وە تۆ بەجێ دەهێڵن بە ڕاوەستاوی! ئەبو عەبدوڵڵا دەڵێ: (فەرموودەکە) غەریبە جگە لە ئیبنو ئەبو شەیبە کەسیتر نەیگێڕاوەتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٦٦، وأبو داود: ١١٠١ و ١١٠٧، والترمذي: ٥٠٧، والنسائي: ١٤١٨ و ١٥٨٢ و ١٥٨٤.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

١١٠٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ «إِذَا صَعِدَ الْمِنْبَرَ سَلَّمَ»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ کاتێک بەرز دەبوویەوە بۆ سەر مینبەر سەلامی دەکرد.

## بابەت: گوێگرتن و بێدەنگ بوون بۆ وتاری جومعە

١١١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ: أَنْصِتْ، يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ، فَقَدْ لَغَوْتَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک لە ڕۆژی جومعەدا ئیمام وتار دەدات، بە هاوەڵەکەت گوت: بێدەنگ بە، ئەوە کارێکی نەشیاوت کردوە.

١١١١- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «قَرَأَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ تَبَارَكَ، وَهُوَ قَائِمٌ، فَذَكَّرَنَا بِأَيَّامِ اللَّهِ» وَأَبُو الدَّرْدَاءِ أَوْ أَبُو ذَرٍّ يَغْمِزُنِي، فَقَالَ: مَتَى أُنْزِلَتْ هَذِهِ السُّورَةُ؟ إِنِّي لَمْ أَسْمَعْهَا إِلَّا الْآنَ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ، أَنِ اسْكُتْ، فَلَمَّا انْصَرَفُوا، قَالَ: سَأَلْتُكَ مَتَى أُنْزِلَتْ هَذِهِ السُّورَةُ فَلَمْ تُخْبِرْنِي؟ فَقَالَ أُبَيٌّ: لَيْسَ لَكَ مِنْ صَلَاتِكَ الْيَوْمَ إِلَّا مَا لَغَوْتَ، فَذَهَبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، وَأَخْبَرَهُ بِالَّذِي قَالَ أُبَيٌّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَدَقَ أُبَيٌّ»[٣].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جومعەدا بە پێوە سووڕەتی «تبارك»ی بۆ خوێندینەوە، باسی ڕووداوەکانی بۆ کردین، (جا دەڵێ:) ئەبو دەڕداء، یان ئەبو زەڕ نقورچەی لێ گرتم و گوتی: ئەو سووڕەتە کەی دابەزیوە؟ من تا ئێستا نەمبیستووە، (ئوبەی) لەو کاتەدا بە ئاماژە پێی گوت: بێدەنگ بە، جا کاتێک لە جومعە لێبوونەوە، گوتی: باشە من لێتم پرسی: ئەو سووڕەتە کەی دابەزیوە بۆ پێت نەگوتم! ئنجا ئوبەی گوتی: تۆ لە نوێژی ئەمڕۆدا شتی نەشیاوت (لەغوت)

---

(١) حسن لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٤، ومسلم: ٨٥١، وأبو داود: ١١١٢، والترمذي: ٥١٢، والنسائي: ١٤٠١ و ١٤٠٢ و ١٥٧٧.

(٣) صحيح.

کرد، تەنها نوێژەکەت بەرکەوتووە (پاداشتەکەت لە دەستچووە)، ئنجا ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و ئەو قسەیەی ئوبەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئوبەی ڕاست دەکات.

## بابەت: کەسێ کە دێتە ناو مزگەوت و لەوکاتەدا ئیمام لە وتاردایە

١١١٢- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﭭ، قَالَ: دَخَلَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ الْمَسْجِدَ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ: «أَصَلَّيْتَ» قَالَ: لَا، قَالَ «فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ» وَأَمَّا عَمْرٌو فَلَمْ يَذْكُرْ سُلَيْكًا[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﭭ دەڵێ: سولەیکی غەتەفانی هاتە ناو مزگەوت، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، ئنجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: نوێژت کردوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: دوو ڕکات نوێژ بکە. بەڵام عەمرِ (ڕاوی فەرموودەکە) باسی سولەیکی نەکرد.

١١١٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﭬ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ: «أَصَلَّيْتَ؟» قَالَ: لَا، قَالَ «فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﭬ دەڵێ: پیاوێک هات و لەوکاتەشدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، جا (بە پیاوەکەی) فەرموو: ئایا نوێژت کردوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: کەواتە دوو ڕکات نوێژ بکە.

١١١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، وَعَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرٍ ﭭ، قَالَا: جَاءَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أَصَلَّيْتَ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تَجِيءَ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ وَتَجَوَّزْ فِيهِمَا»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٠ و ٩٣١، ومسلم: ٤٥ و ٥٥ و ٨٧٥، وأبو داود: ١١١٥، والترمذي: ٥١٠، والنسائي: ١٣٩٥ و ١٤٠٠ و ١٣٠٩.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٥١١، والنسائي: ١٤٠٨.

(٣) صحيح دون لفظ «قَبْلَ أَنْ تَجِيءَ» فإنه شاذ. أخرجه مسلم: ٨٧٥/٥٨، وأبو داود: ١١١٦ دون لفظ «قَبْلَ أَنْ تَجِيءَ».





واتە: ئەبو هورەیرە و ئەبو سوفیان لە جابیر ﷺ گێڕاویانەتەوە، دەڵێن: سولەیکی غەتەفانی هات و لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: پێش ئەوەی بێی دوو ڕکات نوێژت کردوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: کەواتە دوو ڕکات نوێژی کورت بکە.

## بابەت: قەدەغەکردنی خەڵکی کە بەسەر خەڵکدا باز نەدەن لە ڕۆژی جومعەدا

**١١١٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ الْمَسْجِدَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَجَعَلَ يَتَخَطَّى النَّاسَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اجْلِسْ، فَقَدْ آذَيْتَ وَآنَيْتَ»**[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە لە ڕۆژی جومعەدا پیاوێک هاتە ناو مزگەوت و بەسەر خەڵکدا هاتووچۆی دەکرد (بۆ ئەوەی بێتە پێشەوە)، لەوکاتەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، جا پێی فەرموو: دابنیشە بەڕاستی خەڵکت ئەزیەتدا، وە دواشکەوتوو (لە هاتنە مزگەوت).

**١١١٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ اتُّخِذَ جِسْرًا إِلَى جَهَنَّمَ»**[2].

واتە: سەهلی کوڕی موعازی کوڕی ئەنەس لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەسەر شان و ملی خەڵکیدا هاتووچۆ بکات لە ڕۆژی جومعەدا، ئەوە پردێکی گرتۆتە بەر بەرەو دۆزەخ.

## بابەت: قسەکردن دوای ئەوەی لەسەر مینبەر دێتە خوارەوە

**١١١٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يُكَلَّمُ فِي الْحَاجَةِ إِذَا نَزَلَ عَنِ الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ»**[3].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٥١٣.

(٣) شاذ. والمحفوظ أنه في صلاة العشاء. أخرجه أبو داود: ١١٢٠، والترمذي: ٥١٧، والنسائي: ١٤١٩.




واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک لەسەر مینبەر دەهاتە خوارەوە لە ڕۆژی جومعەدا، ئەگەر پێویست بووایە قسەیان لەگەڵ دەکرد.

## بابەت: ئەو فەرموودانەی کە دەربارەی قورئان خوێندن هاتوون لە نوێژی جومعەدا

١١١٨- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ، قَالَ: اسْتَخْلَفَ مَرْوَانُ أَبَا هُرَيْرَةَ عَلَى الْمَدِينَةِ فَخَرَجَ إِلَى مَكَّةَ «فَصَلَّى بِنَا أَبُو هُرَيْرَةَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَرَأَ بِسُورَةِ الْجُمُعَةِ فِي السَّجْدَةِ الْأُولَى، وَفِي الْآخِرَةِ ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ ۝١﴾» قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ فَأَدْرَكْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ حِينَ انْصَرَفَ فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّكَ قَرَأْتَ بِسُورَتَيْنِ كَانَ عَلِيٌّ يَقْرَأُ بِهِمَا بِالْكُوفَةِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ بِهِمَا[1].

واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕافیع دەڵێ: مەڕوان ئەبو هورەیرەی لە جێگای خۆی دانا و ڕۆیشت بۆ مەککە، جا ئەبو هورەیرە نوێژی جومعەی بۆ کردین و لە ڕکاتی یەکەمدا سوورەتی «الجمعة»ی خوێندو، لە ڕکاتی دووەم ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ ۝١﴾ ی خوێند، عوبەیدوڵڵا گوتی: بە ئەبو هورەیرە گەیشتم کاتێک نوێژەکەی تەواو کرد و ڕۆیشت، جا پێم گوت: لە ڕاستیدا تۆ دوو سوورەتت خوێند کە عەلی ﷺ لە کوفە دەیخوێندن، ئنجا ئەبو هورەیرە ﷺ گوتی: بێگومان من بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە ئەو دوو سوورەتەی دەخوێند.

١١١٩- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: كَتَبَ الضَّحَّاكُ بْنُ قَيْسٍ إِلَى النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ: أَخْبِرْنَا بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مَعَ سُورَةِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: «كَانَ يَقْرَأُ فِيهَا هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ»[2].

واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: زەححاکی کوڕی قەیس نامەیەکی نووسی بۆ نوعمانی کوڕی بەشیر: کە پێمان بڵێ ئایا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ سوورەتی «الجمعة»ـدا چی دیکەی دەخوێند لە ڕۆژی جومعەدا؟ گوتی: «هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ»ی دەخوێند.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٧٧، وأبو داود: ١١٢٤، والترمذي: ٥١٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٧٨، وأبو داود: ١١٢٣، والترمذي: ٥٣٣، والنسائي: ١٤٢٣ و ١٤٢٤.




**١١٢٠-** عَنْ أَبِي عِنَبَةَ الْخَوْلَانِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «كَانَ يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ وَ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾»[١].

واتە: ئەبو عینەبەی خەولانیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە (نوێژی) ڕۆژی جومعەدا ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ ی دەخوێند.

## بابەت: ئەو کەسەی کە فریای یەک ڕکات دەکەوێ لە نوێژی جومعەدا

**١١٢١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْجُمُعَةِ رَكْعَةً فَلْيَصِلْ إِلَيْهَا أُخْرَى»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە یەک ڕکاتی جومعە ڕاگەیشت با تەنها ڕکاتەکەی دیکە بکات.

**١١٢٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصَّلَاةِ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَ»[٣].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک یەک ڕکاتی هەر نوێژێک فریا بکەوێ، ئەوە بێگومان فریای نوێژەکە کەوتووە.

**١١٢٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ أَوْ غَيْرِهَا، فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ»[٤].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک فریای یەک ڕکاتی نوێژی جومعە، یان هەر نوێژێکی دیکە بکەوێ، ئەوە فریای نوێژەکەی کەوتووە (تەنها یەک ڕکات نوێژ دەکات، دوای سەلام دانەوەی ئیمام لە نوێژی جومعەدا، ئەگەر فریای ڕکاتێکیش نەکەوێ، دەبێ نوێژی نیوەڕۆ بە تەواوی بکات).

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ١٤٢٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٠، ومسلم: ٦٠٧، وأبو داود: ١١٢١، والترمذي: ٥٢٤، والنسائي: ٥٥٣_٥٥٦.

(٤) ضعيف. أخرجه النسائي: ٥٥٧.

## بابەت: ئەوەی کە نوێژی جومعە لە کوێ دەکرێ

**١١٢٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: «إِنَّ أَهْلَ قُبَاءَ كَانُوا يُجَمِّعُونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: خەڵکی قوباء (کە دوو میل، یان سێ میل لە مەدینە دوورە) لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جومعەیان دەکرد.

## بابەت: ئەو کەسەی کە جومعە ناکات بەبێ پاساوی شەرعی

**١١٢٥-** عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ ﵁ وَكَانَ لَهُ صُحْبَةٌ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ تَهَاوُنًا بِهَا طُبِعَ عَلَى قَلْبِهِ»[٢].

واتە: ئەبو جەعدی زەمریی ﵁ کە لە هاوەڵانە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سێ جار جومعە تەرک بکات و نەیکات و گوێی پێنەدا و بە کەم تەماشای بکات، ئەوە مۆر لەسەر دڵی دراوە.

**١١٢٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ، ثَلَاثًا، مِنْ غَيْرِ ضَرُورَةٍ، طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ»[٣].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سێ جومعە بچوێنێ بەبێ هۆکارێکی ناچاریی ئەوە خوا مۆر لەسەر دڵی دەدات.

**١١٢٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا هَلْ عَسَى أَحَدُكُمْ أَنْ يَتَّخِذَ الصُّبَّةَ مِنَ الْغَنَمِ عَلَى رَأْسِ مِيلٍ أَوْ مِيلَيْنِ، فَيَتَعَذَّرَ عَلَيْهِ الْكَلَأُ، فَيَرْتَفِعَ، ثُمَّ تَجِيءُ الْجُمُعَةُ فَلَا يَجِيءُ وَلَا يَشْهَدُهَا، وَتَجِيءُ الْجُمُعَةُ فَلَا يَشْهَدُهَا، وَتَجِيءُ الْجُمُعَةُ فَلَا يَشْهَدُهَا، حَتَّى يُطْبَعَ عَلَى قَلْبِهِ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٥٢، والترمذي: ٥٠٠، والنسائي: ١٣٦٩.

(٣) حسن صحيح. وانظر الذي قبله.

(٤) حسن.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگاداربن و گوێ بگرن! نزیکە و لەوانەیە یەکێکتان کۆمەڵە مەڕێکی هەبێ و بۆ خاتری لەوەڕاندنیان میلێک دوو میل لە شار دوور بکەوێتەوەو، ئەگەر لەوەڕ و پاوان نەما زیاتر بۆی هەڵکشێ، کەچی جومعەیەک بەسەردا دێت و نایەتە جومعەو ئامادەی نوێژ نابێ، جومعە دێتەوە نایەتە جومعەو ئامادەی نوێژی جومعە نابێ، جومعە دێتەوەو، نایەتە جومعە و ئامادەی نوێژی جومعە نابێ، هەتاکو دڵی مۆر دەکرێ.

**١١٢٨-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَصَدَّقْ بِدِينَارٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ، فَبِنِصْفِ دِينَارٍ»[١].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە ئەنقەست و بێ پاساو وازبێنێ لە جومعە، با دینارێک لە کەفارەتی بدات، ئەگەر دەستی نەکەوت با نیو دینار بکاتە کەفارەت.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نوێژی پێش جومعە هاتووە

**١١٢٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَرْكَعُ قَبْلَ الْجُمُعَةِ أَرْبَعًا، لَا يَفْصِلُ فِي شَيْءٍ مِنْهُنَّ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێش جومعە چوار ڕکات نوێژی دەکرد و، نێوانی نەدەخستە ڕکاتەکان (بە سەلام دانەوە).

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نوێژی دوای جومعە هاتووە

**١١٣٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ «إِذَا صَلَّى الْجُمُعَةَ انْصَرَفَ فَصَلَّى سَجْدَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ» ثُمَّ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ ذَلِكَ»[٣].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٠٥٣، والنسائي: ١٣٧٢.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٧، ومسلم: ٧٢٩ و ٨٨٢، وأبو داود: ١١٢٧ و ١١٢٨ و ١١٣٠ و ١١٣٢ و ١٢٥٢، والترمذي: ٥٢١، والنسائي: ٨٧٣ و ١٤٢٧ و ١٤٢٨.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کاتێک نوێژی جومعەی دەکرد و تەواو دەبوو، دوو ڕکات نوێژی لەماڵەوە دەکرد، پاشان گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو جۆرەی کردوە.

١١٣١- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ»(١).

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە دوای نوێژی جومعە دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

١١٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صَلَّيْتُمْ بَعْدَ الْجُمُعَةِ فَصَلُّوا أَرْبَعًا»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لە دوای نوێژی جومعە نوێژتان کرد، ئەوە چوار ڕکات بکەن.

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی دانیشتنی بە ئەڵقەو دانیشتنی "احتباء" هاتووە لە ڕۆژی جومعەدا پێش نوێژ کردن کاتێک ئیمام وتار دەدات

١١٣٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «نَهَى أَنْ يُحَلَّقَ فِي الْمَسْجِدِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ»(٣).

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە مزگەوت لە ڕۆژی جومعەدا بە ئاڵقە دانیشن پێش نوێژ کردن (واتە: دەبێ بە ڕیز دانیشن نەک بە شێوازی ئەڵقە تا نوێژ دەکرێ).

١١٣٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الِاحْتِبَاءِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ» يَعْنِي وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٧، ومسلم: ٧٢٩ و ٨٨٢، وأبو داود: ١١٢٧ و ١١٢٨ و ١١٣٠ و ١١٣٢ و ١٢٥٢، والترمذي: ٥٢١، والنسائي: ٨٧٣ و ١٤٢٧ و ١٤٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٨١، وأبو داود: ١١٣١، والترمذي: ٥٢٣، والنسائي: ١٤٢٦.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ١٠٧٩، والترمذي: ٣٢٢، والنسائي: ٧١٤ و ٧١٥ مختصراً.

(٤) حسن.

واته: عەمرِی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە، لە باپیریەوە ﷺ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە دانیشتن بە شێوازی «إحتباء» لە کاتێکدا کە ئیمام وتار دەدات.

**الِاحْتِبَاء:** دانیشتن بە جۆرێک ئەژنۆکانت و ڕانت بە سنگتەوە بنوسێن و بە دەستت، یان بە شتێک بیانگری، ئەو جۆرە دانیشتنە خەو دێنێ.

## بابەت: بانگدانی ڕۆژی جومعە

**١١٣٥-** عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ، قَالَ: «مَا كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا مُؤَذِّنٌ وَاحِدٌ، إِذَا خَرَجَ أَذَّنَ، وَإِذَا نَزَلَ أَقَامَ» وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ كَذَلِكَ، فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ وَكَثُرَ النَّاسُ، زَادَ النِّدَاءَ الثَّالِثَ عَلَى دَارٍ فِي السُّوقِ، يُقَالُ لَهَا: الزَّوْرَاءُ، فَإِذَا خَرَجَ أَذَّنَ، وَإِذَا نَزَلَ أَقَامَ»[1].

واته: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها یەک بانگبێژی هەبوو، کاتێک دەچووە سەر مینبەر بانگی دەدا، وە کاتێک دەهاتە خوارێ لە مینبەر قامەتی دەکرد، لە سەردەمی ئەبو بەکر و عومەریش هەر وابوو، بەڵام لە سەردەمی عوسماندا کە خەڵک زۆر بوو بانگی سێیەمی زیاد کرد لە سەربانێک لە بازاڕ کە پێیان دەگوت: «الزوراء»، جا کاتێک دەردەچوو (بۆ سەر مینبەر) بانگی دەفەرموو، وە کاتێک دادەبەزی قامەتی دەکرد.

## بابەت: ڕووکردنە ئیمام لەکاتی وتاردا

**١١٣٦-** عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «إِذَا قَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ، اسْتَقْبَلَهُ أَصْحَابُهُ بِوُجُوهِهِمْ»[2].

واته: عەدیی کوڕی سابیت لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ دەچووە سەر مینبەر، هاوەڵان ڕووبەڕوو بەرانبەری دەبوون.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩١٢، وأبو داود: ١٠٨٧، والترمذي: ٥١٦، والنسائي: ١٣٩٢_١٣٩٤.

(٢) صحيح لغيره.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی ئەو کاتەی ڕۆژی جومعە هاتووە کە ئومێد وایە دوعای تێدا گیرا دەبێت

**١١٣٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ سَاعَةً، لَا يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ، قَائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا خَيْرًا، إِلَّا أَعْطَاهُ» وَقَلَّلَهَا بِيَدِهِ[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان سەعاتێک (یان سات و کاتێک) هەیە لە ڕۆژی جومعەدا ئەگەر مرۆڤی مسوڵمان لەوکاتەدا بە ئاگابێ و نوێژ یان دوعای تێدا بکات و داوای چاکە و خێر بکات لە خوا، ئەوە بێگومان خوا پێداویستیەکەی جێبەجێ دەکات، وە بە دەستی ئاماژەی کەمی ماوەکە کرد.

**١١٣٨-** عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ سَاعَةٌ مِنَ النَّهَارِ، لَا يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا الْعَبْدُ شَيْئًا إِلَّا أُعْطِيَ سُؤْلَهُ» قِيلَ: أَيُّ سَاعَةٍ؟ قَالَ: «حِينَ تُقَامُ الصَّلَاةُ إِلَى الِانْصِرَافِ مِنْهَا»[٢].

واتە: کەسیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عەوفی موزەنیی لە باوکییەوە، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لە ڕۆژی جومعەدا ساتێک هەیە لە ڕۆژەکەیدا کە هەر بەندەیەک لەو کاتەدا داوای هەر شتێک بکات (خێر بێ)، بە دڵنیایی خوا دووعاکەی گیرا دەکات، گوتیان: کام ساتەیە؟ فەرمووی: کاتێ قامەت دەکرێ بۆ نوێژ کردن تاکو نوێژ تەواو دەبێ.

**١١٣٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ: إِنَّا لَنَجِدُ فِي كِتَابِ اللَّهِ: «فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ سَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُؤْمِنٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا شَيْئًا إِلَّا قَضَى لَهُ حَاجَتَهُ». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَأَشَارَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوْ بَعْضُ سَاعَةٍ» فَقُلْتُ: صَدَقْتَ، أَوْ بَعْضُ سَاعَةٍ. قُلْتُ: أَيُّ سَاعَةٍ هِيَ؟ قَالَ: «هِيَ آخِرُ سَاعَاتِ النَّهَارِ». قُلْتُ: إِنَّهَا لَيْسَتْ سَاعَةَ صَلَاةٍ، قَالَ: «بَلَى، إِنَّ الْعَبْدَ الْمُؤْمِنَ إِذَا صَلَّى ثُمَّ جَلَسَ، لَا يَحْبِسُهُ إِلَّا الصَّلَاةُ، فَهُوَ فِي الصَّلَاةِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٣٥، ومسلم: ٨٥٢، وأبو داود: ١٠٤٦، والترمذي: ٤٩١ و ٣٣٣٩، والنسائي: ١٤٣١ و ١٤٣٢.

(٢) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٤٩٠.

(٣) حسن صحيح.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو منیش گوتم: ئێمە لە کتێبەکەی خوادا سەعاتێک دەبینین لە ڕۆژی جومعەدا کە لەوکاتەدا مرۆڤی مسوڵمان نوێژ و دوعا بکات و هەر شتێک داوا بکات بە دڵنیایی خوا پێویستیەکەی بۆ بەجێ دەهێنێ، جا عەبدوڵڵا دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کردم، کە یان بەشێکە لە سەعاتێک، منیش گوتم: ڕاست دەفەرمووی، یان بەشێکە لە سەعاتێک، (عەبدوڵڵا دەڵێ:) گوتم: کام ساتەیە؟ فەرمووی: کۆتا ساتەکانی ڕۆژی جومعەیە، گوتم: خۆ ئەو کاتە کاتی نوێژ نیە؟ فەرمووی: بەڵێ کاتی نوێژە، بێگومان ئەگەر هەر بەندەیەک نوێژی کرد، پاشان دانیشت، دانیشتن و مانەوەکەی تەنها بۆ چاوەڕوانکردنی نوێژی داهاتوو بوو، ئەوە وەک ئەوە وایە لە نوێژدا بێ.

### بابەت: دوازدە ڕکاتی نوێژی سوننەت

**١١٤٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ ثَابَرَ عَلَى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ السُّنَّةِ، بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ، أَرْبَعٍ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەردەوام بێ لەسەر دوازدە ڕکاتی نوێژی سوننەت، ئەوەماڵێکی بۆ دروست دەکرێ لە بەهەشتدا، چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕکات دوای نیوەڕۆ، دوو ڕکات دوای مەغریب، دوو ڕکات دوای عیشا، دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی.

**١١٤١-** عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً، بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ»[٢].

واتە: ئوممو حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان ﵂ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە شەو و ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ (ی سوننەت) بکات، ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکرێ.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه مسلم: الترمذي: ٤١٤، والنسائي: ١٧٩٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٢٨، وأبو داود: ١٢٥٠، والترمذي: ٤١٥، والنسائي: ١٧٩٦_١٧٩٩ و ١٨٠١١_١٨١٠.

**١١٤٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً، بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ، رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ - أَظُنُّهُ قَالَ: قَبْلَ الْعَصْرِ - وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ - أَظُنُّهُ قَالَ: وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ -»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات، ماڵێکی بۆ دروست دەکرێ لە بەهەشتدا، دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی، دوو ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕکات دوای نوێژی نیوەڕۆ، وە وابزانم فەرمووی: دوو ڕکات پێش نوێژی عەصر، وە دوو ڕکات دوای نوێژی مەغریب، وابزانم فەرمووی: دوو ڕکات دوای نوێژی عیشا.**

## بابەت: ئەو فەرموودانەی دەربارەی دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی هاتوون

**١١٤٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «كَانَ إِذَا أَضَاءَ لَهُ الْفَجْرُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ کاتێک بەیانی دادەهات و کاتی نوێژی بەیانی دەهات، دوو ڕکات (پێش کردنی نوێژی بەیانی) نوێژی سوننەتی دەکرد.**

**١١٤٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «يُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ، كَأَنَّ الْأَذَانَ بِأُذُنَيْهِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، بە جۆرێک (کورت و پوختی دەکرد) وەک ئەوەی قامەت بکرێ (واتە: دوو ڕکاتەکەی درێژ نەدەکردەوە چۆن کەسێک پێش قامەت نوێژ دادەبەستێ وە پەلە دەکات کە فریای نوێژ بکەوێ، ئاوا کورت و پوختی دەکردەوە).**

---

(١) ضعيف، والحديث صحيح بلفظ: «وَأَرْبَعَ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ». أخرجه النسائي: ١٨١١ من قوله: «مَنْ صَلَّى... فِي الْجَنَّةِ».

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٩٥، ومسلم: ٧٤٩/١٥٧، والترمذي: ٤٦١.

**١١٤٥-** عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «كَانَ إِذَا نُودِيَ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ، رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، قَبْلَ أَنْ يَقُومَ إِلَى الصَّلَاةِ»[1].

**واتە:** حەفصەی کچی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک بانگ دەدرا بۆ نوێژی بەیانی دوو ڕکاتی کورت و پوختی دەکرد، پێش ئەوەی هەڵسێ بۆ نوێژ.

**١١٤٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «إِذَا تَوَضَّأَ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ»[2].

**واتە:** عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێک دەستنوێژی دەگرت پێش ئەوەی بچێ بۆ نوێژ دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

**١١٤٧-** عَنْ عَلِيٍّ ﵁، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ عِنْدَ الْإِقَامَةِ»[3].

**واتە:** عەلی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژی دەکرد نزیک کاتی قامەت کردن.

## بابەت: ئەوەی کە لە دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی دا چی دەخوێنرێت

**١١٤٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «قَرَأَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ①﴾ وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾»[4].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانیدا: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ①﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾ ی دەخوێند.

**١١٤٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: رَمَقْتُ النَّبِيَّ ﷺ شَهْرًا، «فَكَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ①﴾ وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾»[5].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٨، ومسلم: ٧٢٣، والترمذي: ٤٣٣، والنسائي: ٥٨٣ و ١٧٦٠ و ١٧٧٦.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٢٦، وأبو داود: ١٢٥٦، والنسائي: ٩٤٥.

(٥) حسن. أخرجه الترمذي: ٤١٧، والنسائي: ٩٩٢.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: مانگێک سەرنجی پێغەمبەرم دا ﷺ (بۆ ئەوەی بزانم لە دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی چی دەخوێنێ)، جا پێغەمبەر ﷺ لە دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ ی دەخوێند.

١١٥٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ، وَكَانَ يَقُولُ: «نِعْمَ السُّورَتَانِ هُمَا، يُقْرَأُ بِهِمَا فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ وَ ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نوێژی بەیانی دوو ڕکات نوێژی دەکرد، دەیفەرموو: باشترین دوو سوورەت کە تێیاندا بخوێنرێ ئەم دوو سوورەتەن: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ و ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾.

## بابەت: ئەوەی کە ئەگەر قامەتی نوێژ کرا نابێ جگە لە نوێژە فەرزەکە هیچ نوێژێکی تر بکرێ

١١٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَلَا صَلَاةَ إِلَّا الْمَكْتُوبَةُ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ، ئەوە جگە لە نوێژە فەرزەکە هیچ نوێژێکی دیکە ناکرێ.

١١٥١م- حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ قَالَ: أَخْبَرَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ ﵁، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ[3].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

١١٥٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَأَى رَجُلًا يُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ، وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ، فَلَمَّا صَلَّى قَالَ لَهُ: «بِأَيِّ صَلَاتَيْكَ اعْتَدَدْتَ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٩، ومسلم: ٧٢٤ واقتصر علي «كَانَ يُصَلِّيْ رَكْعَتَيْنِ بَيْنَ النِّدَاءِ وَالإِقَامَةِ».

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧١٠، وأبو داود: ١٢٦٦، والترمذي: ٤٢١، والنسائي: ٨٦٥ و ٨٦٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٧١٠، وأبو داود: ١٢٦٦، والترمذي: ٤٢١، والنسائي: ٨٦٥ و ٨٦٦.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٧١٢، وأبو داود: ١٢٦٥، والنسائي: ٨٦٨.



واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی دەکرد و پێغەمبەریش ﷺ لە نوێژدا بوو، جا کاتێک نوێژەکەی کرد بەو پیاوەی فەرموو: کام نوێژە بۆ خۆت حیساب دەکەی؟! (واتە: نوێژەکەی کە بە تەنها کردت، یان ئەو نوێژەی کە لەگەڵ ئێمە کردت، مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە کە مادام هاتی بۆ ژووری مزگەوت و نوێژ دابەسترابوو، نابێ نوێژی سوننەت بکەی).

١١٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكِ بْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ، قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِرَجُلٍ وَقَدْ أُقِيمَتْ صَلَاةُ الصُّبْحِ، وَهُوَ يُصَلِّي، فَكَلَّمَهُ بِشَيْءٍ لَا أَدْرِي مَا هُوَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَحَطْنَا بِهِ نَقُولُ لَهُ: مَاذَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: قَالَ لِي: «يُوشِكُ أَحَدُكُمْ أَنْ يُصَلِّيَ الْفَجْرَ أَرْبَعًا»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مالیکی کوڕی بوحەینە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای پیاوێکدا تێپەڕی کە لەو کاتەدا قامەت بۆ نوێژی بەیانی کرابوو، وە کابراش نوێژی سوننەتی دەکرد، جا پێغەمبەر ﷺ قسەیەکی پێ فەرموو نەمزانی چی بوو، کاتێک کە لە نوێژ تەواوبووین، چووینە دەوری کابرا و لێیان پرسی پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێ فەرمووی؟ گوتی: فەرمووی: نزیکە یەکێکتان نوێژی بەیانی بکاتە چوار ڕکات (مەبەستی ئەوە بوو کە قامەت کرا دەبێ تەنها نوێژی فەرز بکرێ، کە لە دوای قامەت نوێژی سوننەت کرا، وەک ئەوە وایە لە نوێژە فەرزەکە زیاد بکرێ، ئەوەش پێچەوانەی شەریعەتە).

## بابەت: ئەو کەسەی کە دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی دەفەوتێ دەبێ چیبکات و کەی دەیگێڕێتەوە

١١٥٤- عَنْ قَيْسِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يُصَلِّي بَعْدَ صَلَاةِ الصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَصَلَاةَ الصُّبْحِ مَرَّتَيْنِ؟» فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: إِنِّي لَمْ أَكُنْ صَلَّيْتُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَهَا، فَصَلَّيْتُهُمَا. قَالَ: فَسَكَتَ النَّبِيُّ ﷺ[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٣، ومسلم: ٧١١، والنسائي: ٨٦٧.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٢٦٧ و ١٢٦٨، والترمذي: ٤٢٢.

واتە: قەیسی کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بینی کە پیاوێک دوو ڕکات نوێژ دەکات لە دوای نوێژی بەیانی، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا نوێژی بەیانیت دوو جار کرد؟ کابرا گوتی: من دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانیم نەکردبوو، جا ئێستا کردم، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لێی بێدەنگ بوو (کەواتە گێڕانەوەی ئەو سوننەتە دروستە).

**١١٥٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «نَامَ عَنْ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، فَقَضَاهُمَا بَعْدَ مَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بۆ دوو ڕکات نوێژەکەی بەیانی خەوی لێکەوت بوو، جا کاتێک گێڕانیەوە خۆرهەڵات بوو.

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی چوار ڕکاتەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆ هاتووە

**١١٥٦-** عَنْ قَابُوسَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: أَرْسَلَ أَبِي إِلَى عَائِشَةَ: أَيُّ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانَ أَحَبَّ إِلَيْهِ أَنْ يُوَاظِبَ عَلَيْهَا؟ قَالَتْ: «كَانَ يُصَلِّي أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ، يُطِيلُ فِيهِنَّ الْقِيَامَ، وَيُحْسِنُ فِيهِنَّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ»[2].

واتە: قابوس لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: باوکم ناردی بۆ لای عائیشە کە چ نوێژێک لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویستتر بووەو بەردەوام کردوویەتی؟ گوتی: (پێغەمبەر ﷺ) چوار ڕکاتی پێش نوێژی نیوەڕۆی دەکرد و زۆر تێیاندا دەمایەوە و قورئانی تێدا دەخوێندن، وە ڕکووع و سوجدەی زۆر بە تێر و تەواوی تێدا دەبردن (واتە: لە ئەداکردنی نوێژەکە پەلەی نەدەکرد).

**١١٥٧-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، لَا يَفْصِلُ بَيْنَهُنَّ بِتَسْلِيمٍ، وَقَالَ: «إِنَّ أَبْوَابَ السَّمَاءِ تُفْتَحُ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم مطولًا: ٦٨٠، والترمذي: ٤٢٣، والنسائي: ٦٢٣.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح دون جملة الفصل. أخرجه أبو داود: ١٢٧٠.




واته: ئەبو ئەییوب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکات نوێژی دەکرد، کاتێک کە خۆر لایدەدا و لە ناوەڕاستی ئاسمان دەترازا، وە نێوانی نەدەخستە چوار ڕکاتەکەوە بە سەلامدانەوە (پێکەوە دەیکردن)، وە دەیفەرموو: دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە کاتێک خۆر لایدا بەرەو خۆرئاوا.

## بابەت: ئەو کەسەی کە چوار ڕکاتەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆی دەفەوتێت

١١٥٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا فَاتَتْهُ الْأَرْبَعُ قَبْلَ الظُّهْرِ، صَلَّاهَا بَعْدَ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ» قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: لَمْ يُحَدِّثْ بِهِ إِلَّا قَيْسٌ عَنْ شُعْبَةَ[1].

واته: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک کە چوار ڕکاتی پێش نوێژی نیوەڕۆی دەفەوتا، دوای دوو ڕکاتی دوای نوێژی نیوەڕۆ دەیکردەوە. ئەبو عەبدوڵڵا دەڵێ: (ئەم فەرموودەیە) کەس نەیگێڕاوەتەوە تەنیا قەیس نەبێ لە شوعبەوە.

## بابەت: ئەوەی کە دوو ڕکاتی دوای نوێژی نیوەڕۆی دەفەوتێ

١١٥٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ، قَالَ: أَرْسَلَ مُعَاوِيَةُ ﷺ إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، فَانْطَلَقْتُ مَعَ الرَّسُولِ فَسَأَلَ أُمَّ سَلَمَةَ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَيْنَمَا هُوَ يَتَوَضَّأُ فِي بَيْتِي لِلظُّهْرِ، وَكَانَ قَدْ بَعَثَ سَاعِيًا، وَكَثُرَ عِنْدَهُ الْمُهَاجِرُونَ وَقَدْ أَهَمَّهُ شَأْنُهُمْ، إِذْ ضُرِبَ الْبَابُ، فَخَرَجَ إِلَيْهِ، فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ جَلَسَ يَقْسِمُ مَا جَاءَ بِهِ، قَالَتْ: فَلَمْ يَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى الْعَصْرِ، ثُمَّ دَخَلَ مَنْزِلِي فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: «شَغَلَنِي أَمْرُ السَّاعِي أَنْ أُصَلِّيَهُمَا بَعْدَ الظُّهْرِ، فَصَلَّيْتُهُمَا بَعْدَ الْعَصْرِ»[2].

واته: عەبدوڵڵای کوڕی حاریس دەڵێ: موعاویە ﷺ کەسێکی نارد بۆ لای ئوممو سەلەمە ﷺ منیش لەگەڵ نێردراوەکە ڕۆیشتم، جا پرسیاری لە ئوممو سەلەمە ﷺ کرد، ئەویش گوتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا لە ماڵەکەی مندا دەستنوێژی دەگرت، بۆ نوێژی نیوەڕۆ و لەوکاتەشدا یەکێکی ناردبوو بۆ زەکات کۆکردنەوە، ئیتر خەڵکێکی زۆر لە کۆچبەران لێی کۆبوونەوە و، ئەویش زۆر گرنگی

---

(١) ضعيف. والمعروف بلفظ «بَعْدَهَا» لم يذكر الركعتين. أخرجه الترمذي: ٤٢٦ باللفظ المعروف. وهو صحيح.

(٢) منكر.

بە کاروباریان دەدا، لە ناکاو لە دەرگا درا، ئیتر پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ لایان و نوێژی نیوەڕۆشی کرد، پاشان ڕاستەوخۆ دانیشت ئەوەی نێردراوەکەی پێغەمبەر ﷺ هێنابووی دابەشی کرد، جا ئوممو سەلەمە ﵂ گوتی: بەردەوام خەریکی ئەو دابەشکردنە بوو، تا کاتی نوێژی عەصر هات، پاشان هات بۆ ماڵەکەی من و دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان فەرمووی: دابەشکردنی ئەوەی کە نێردراوەکە هێنابووی سەرقاڵی کردم لەوەی کە ئەو دوو ڕکاتەی دوای نوێژی نیوەڕۆ بکەم، بۆیە لە دوای نوێژی عەصر کردمن.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی ئەو کەسە هاتووە کە چوار ڕکات پێش نیوەڕۆ دەکات و چوار ڕکاتیش دوای نیوەڕۆ

١١٦٠- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا، وَبَعْدَهَا أَرْبَعًا، حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ»[١].

واتە: ئوممو حەبیبە ﵂ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکات بکات و، دوای نوێژی نیوەڕۆش چوار ڕکات بکات، خوا ئاگری لەسەر حەرام دەکات.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نوێژی سوننەت هاتووە لە ڕۆژدا

١١٦١- عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ السَّلُولِيِّ، قَالَ: سَأَلْنَا عَلِيًّا ﵁، عَنْ تَطَوُّعِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالنَّهَارِ فَقَالَ: إِنَّكُمْ لَا تُطِيقُونَهُ، فَقُلْنَا: أَخْبِرْنَا بِهِ نَأْخُذْ مِنْهُ مَا اسْتَطَعْنَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا صَلَّى الْفَجْرَ يُمْهِلُ، حَتَّى إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَاهُنَا - يَعْنِي مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ - بِمِقْدَارِهَا مِنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ مِنْ هَاهُنَا - يَعْنِي مِنْ قِبَلِ الْمَغْرِبِ - قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يُمْهِلُ حَتَّى إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَاهُنَا، - يَعْنِي مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ - مِقْدَارَهَا مِنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ مِنْ هَاهُنَا قَامَ فَصَلَّى أَرْبَعًا، وَأَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَأَرْبَعًا قَبْلَ الْعَصْرِ، يَفْصِلُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ بِالتَّسْلِيمِ عَلَى الْمَلَائِكَةِ الْمُقَرَّبِينَ وَالنَّبِيِّينَ، وَمَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُؤْمِنِينَ»

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢٦٩، والترمذي: ٤٢٧، والنسائي: ١٨١٢_١٨١٧.

قَالَ عَلِيٌّ: فَتِلْكَ سِتَّ عَشْرَةَ رَكْعَةً، تَطَوُّعُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالنَّهَارِ، وَقَلَّ مَنْ يُدَاوِمُ عَلَيْهَا، قَالَ وَكِيعٌ: زَادَ فِيهِ أَبِي: فَقَالَ حَبِيبُ بْنُ أَبِي ثَابِتٍ يَا أَبَا إِسْحَاقَ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِحَدِيثِكَ هَذَا مِلْءَ مَسْجِدِكَ هَذَا ذَهَبًا[1].

واتە: عاصیمی کوڕی زەمرەی سەلولی دەڵێ: پرسیارمان لە عەلی ﷺ کرد دەربارەی ئەو نوێژە سوننەتانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژدا ئەنجامی دەدان، ئەویش گوتی: ئێوە ناتوانن ئەنجامیان بدەن، ئێمەش گوتمان: پێمان بڵێ ئێمەش بە گوێرەی توانا جێبەجێی دەکەین، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی بەیانی دەکرد ڕادەوەستا و نوێژی نەدەکرد تاکو خۆر دەگەیشتە ئێرە لە خۆرهەڵات، بە ئەندازەی ئەو کاتەی خۆر دەگاتە ئێرە لە عەصر لەلای خۆرئاوا (واتە: لای مەغریب، خۆر لە کوێیە کاتێ نوێژی عەصر دەبێ لەلای خۆرهەڵاتیش بە ئەندازەی ئەوێ خۆر بەرز دەبوویەوە) ئنجا دوو ڕکات نوێژی دەکرد، ئنجا لێی دەگەڕا تاکو کەمێک پێش نوێژی نیوەڕۆ ئنجا چوار ڕکاتی دەکرد (واتە: پێش ئەوەی نوێژی نیوەڕۆ ببێ)، ئنجا کە نوێژی نیوەڕۆ دەبوو چوار ڕکاتی پێش نوێژەکە دەکرد، دوو ڕکاتی دوای نوێژەکە دەکرد، وە چوار ڕکاتی پێش نوێژی عەصر دەکرد، لە نێوان هەر دوو ڕکاتێک نێوانی دەخستە بەینیان بە سەلام کردن لەسەر فریشتە نزیکەکان و پێغەمبەران و ئەوانەی شوێنیان دەکەون لە مسوڵمانان و بڕواداران، جا عەلی گوتی: ئەوە شازدە ڕکاتە سوننەتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە ڕۆژێکدا، وە کەمن ئەوانەی کە بەردەوام دەبن لەسەریان (لەسەر ئەو شازدە ڕکاتە). وەکیع دەڵێ: باوکم ئەوەشی بە زیادە هێنابوو: جا حەبیبی کوڕی ئەبو سابیت گوتی: ئەی ئەبو ئیسحاق ئەو فەرموودەیەی تۆم پێ باشتر و بە نرخترە لەو مزگەوتەی تۆ پڕ لە زێڕ.

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٥٩٨ و ٥٩٩، والنسائي: ٨٧٤ و ٨٧٥.




## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی دوو ڕکاتی پێش نوێژی شێوان هاتووە

**١١٦٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ» قَالَهَا ثَلَاثًا. قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: «لِمَنْ شَاءَ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە نێوان هەر دوو بانگێک (بانگ و قامەتێک) نوێژێک هەیە، ئەو فەرمایشتەی سێ جار دووبارە کردەوە، لە جاری سێیەمدا فەرمووی: بۆ کەسێک کە بیەوێ (ئەو نوێژە بکات).

**١١٦٣-** عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: «إِنْ كَانَ الْمُؤَذِّنُ لَيُؤَذِّنُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَيُرَى أَنَّهَا الْإِقَامَةُ، مِنْ كَثْرَةِ مَنْ يَقُومُ فَيُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گوتوویەتی: کاتێک بانگبێژ بانگی دەدا لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، وا دەبینرا کە قامەتی نوێژ کراوە لەبەر زۆری ئەو خەڵکەی کە هەڵدەستان دوو ڕکاتی پێش نوێژی شێوانیان دەکرد.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی دوو ڕکات دوای نوێژی شێوان هاتووە

**١١٦٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الْمَغْرِبَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ»[3].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی شێوانی (لە مزگەوتەکەی) دەکرد، پاشان دەهاتەوە بۆماڵەکەی من دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٤ و ٦٢٧، ومسلم: ٨٣٨، وأبو داود: ١٢٨٣، والترمذي: ١٨٥، والنسائي: ٦٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٥، ومسلم: ٨٣٧، وأبو داود: ١٢٥١، والترمذي: ٤٣٦، والنسائي: ٦٨٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٠ مطولًا، وأبو داود: ١٢٥١، والترمذي: ٤٣٦.

**١١٦٥-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ، فَصَلَّى بِنَا الْمَغْرِبَ فِي مَسْجِدِنَا، ثُمَّ قَالَ: «ارْكَعُوا هَاتَيْنِ الرَّكْعَتَيْنِ فِي بُيُوتِكُمْ»[١].

**واتە:** ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان بۆ ناو بەنو عەبدولئەشهەل، لە مزگەوتەکەی خۆمان نوێژی مەغریبی بۆ کردین، پاشان فەرمووی: ئەو دوو ڕکاتە (ی دوای نوێژ) لە ماڵەکانتان بیانکەن.

## بابەت: چی دەخوێنرێ لە دوو ڕکاتی دوای شێوان

**١١٦٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾»[٢].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە دوو ڕکاتی سوننەتی دوای نوێژی مەغریب: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی دەخوێند.

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی شەش ڕکاتی دوای شێوان هاتووە

**١١٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ صَلَّى بَعْدَ الْمَغْرِبِ سِتَّ رَكَعَاتٍ لَمْ يَتَكَلَّمْ بَيْنَهُنَّ بِسُوءٍ، عُدِلْنَ لَهُ بِعِبَادَةِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً»[٣].

**واتە:** ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دوای نوێژی مەغریب شەش ڕکات نوێژ بکات، وە لە نێوانیاندا قسەی خراپ نەکات، بۆی بەرانبەر دەکرێ بە پەرستشی دوازدە ساڵ.

---

(١) حسن.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٤٣١.

(٣) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٤٣٥.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نوێژی ویتر هاتووە

**١١٦٨-** عَنْ خَارِجَةَ بْنِ حُذَافَةَ الْعَدَوِيِّ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَمَدَّكُمْ بِصَلَاةٍ، لَهِيَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ حُمُرِ النَّعَمِ، الْوِتْرُ، جَعَلَهُ اللَّهُ لَكُمْ فِيمَا بَيْنَ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِلَى أَنْ يَطْلُعَ الْفَجْرُ»[١].

واتە: خاریجەی کوڕی حوزافەی عەدەویی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هات بۆ لامان و فەرمووی: بێگومان خوا سەرەڕای نوێژە فەرزەکان نوێژێکی بۆ داناون کە ئەو نوێژە بۆ ئێوە لە گەلە حوشتری سوور باشترە (کە باشترینی کاڵاکان بووە لەو ڕۆژگارە)، نوێژەکە نوێژی ویترە، کاتەکە خوا دایناوە کە لە نێوان نوێژی عیشا و نوێژی بەیانییە.

**١١٦٩-** عَنْ عَلِيِّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ: إِنَّ الْوِتْرَ لَيْسَ بِحَتْمٍ وَلَا كَصَلَاتِكُمُ الْمَكْتُوبَةِ، وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَوْتَرَ ثُمَّ قَالَ: «يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ أَوْتِرُوا؛ فَإِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ»[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: بێگومان نوێژی ویتر فەرز نیەو، وەک نوێژە فەرزەکانتان نیە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری کردوە، پاشان فەرمووی: ئەی ئەهلی قورئان (مسوڵمانان) نوێژی ویتر بکەن، چونکە بێگومان خوا تاکە و تاکی خۆشدەوێ (ویتر، واتە: تاک).

**١١٧٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ. أَوْتِرُوا يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ» فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: مَا يَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: لَيْسَ لَكَ وَلَا لِأَصْحَابِكَ[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا تاکە و تاکی خۆشدەوێ، ئێوەش نوێژی ویتر بکەن ئەی ئەهلی قورئان (مسوڵمانان)، ئنجا دەشتەکییەک گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەفەرموێ؟ عەبدوڵڵاش گوتی: ئەوە بۆ تۆ و هاوشێوەکانی وەک تۆ نیە (عەبدوڵڵای کوڕی

---

(١) صحيح دون قوله: «هِيَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ». أخرجه أبو داود: ١٤١٨، والترمذي: ٤٥٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤١٦، والترمذي: ٤٥٣ بإثر ٤٥٤، والنسائي: ١٦٧٥ و ١٦٧٦.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٤١٧.

مەسعوود وای لێکداوەتەوە کە ئەهلی قورئان مەبەستی ئەوانەیە کە قورئان دەخوێنن و قورئان دەزانن، بۆیە وای بە دەشتەکیەکە گوت، چونکە ئەوان قورئان خوێن و خوێندەوار نەبوون، بەڵام جمهوری زانایان دەڵێن: ئەم فەرموودەیە هەموو مسوڵمانان دەگرێتەوە).

## بابەت: ئەوەی دەربارەی خوێندنی قورئان هاتووە لە نوێژی ویتردا

**١١٧١-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بِـ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ وَ ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾»[1].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە نوێژی ویتری دەکرد سوورەتی ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ـی تێدا دەخوێند.

**١١٧٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُوتِرُ بِـ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ وَ ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری دەکرد، ئەوانەی دەخوێند: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾.

**١١٧٢م-** حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنْصُورٍ أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ ﷺ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[3].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢٣، والنسائي: ١٦٩٩ و ١٧٠٠ و ١٧٠١ و ١٧٢٩ و ١٧٣٠.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٤٦٢، والنسائي: ١٧٠٢ و ١٧٠٣.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٤٦٢، والنسائي: ١٧٠٢ و ١٧٠٣.



**١١٧٣-** عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: سَأَلْنَا عَائِشَةَ، بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ يُوتِرُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: «كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، وَفِي الثَّانِيَةِ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾، وَفِي الثَّالِثَةِ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ»[١].

واتە: عەبدولعەزیزی کوڕی جورەیج ﷺ دەڵێ: پرسیارمان لە عائیشە کرد ئاخۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ویترەکاندا چی دەخوێند؟ ئەویش گوتی: لە ڕکاتی یەکەمدا ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، وە لە ڕکاتی دووەمدا ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾، وە لە ڕکاتی سێیەمدا ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾ی دەخوێند.

**١١٧٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەونوێژی بە دوو ڕکات، دوو ڕکات دەکرد، وە ویتریشی بە یەک ڕکات دەکرد.

**١١٧٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَالْوِتْرُ رَكْعَةٌ» قُلْتُ: أَرَأَيْتَ إِنْ غَلَبَتْنِي عَيْنِي، أَرَأَيْتَ إِنْ نِمْتُ؟ قَالَ: اجْعَلْ - أَرَأَيْتَ - عِنْدَ ذَلِكَ النَّجْمِ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا السِّمَاكُ، ثُمَّ أَعَادَ فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَالْوِتْرُ رَكْعَةٌ قَبْلَ الصُّبْحِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژەکانی شەو (واتە: شەونوێژ) دوو ڕکات دوو ڕکاتن، وە ویتر یەک ڕکاتە، (ئەبو میجلەز کە ئەم فەرموودەی لە ئیبنو عومەر ﷺ گێڕاوەتەوە دەڵێ:) گوتم: ئەی ئەگەر خەو بەسەر چاومدا زاڵ بوو، ئەی ئەگەر هاتوو نوستم بە ڕای تۆ چ دەبێ؟ ئەویش (ئیبنو عومەر ﷺ وەکو ئینکاری کردنێک بەرانبەر بە ئەبو میجلەز) گوتی: سەیرکە لەلای ئەو ئەستێرەیە شتێک دەبینی؟ دەڵێ: منیش سەرم بەرزکردەوە ئەستێرەی سیماکم بینی، پاشان ئیبنو عومەر ﷺ لە قسەکەی خۆی بەردەوام بوو، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتن، ویتریش یەک ڕکاتە پێش نوێژی بەیانی.

---

(١) حسن بطرقه وشواهده. أخرجه أبو داود: ١٤٢٤، والترمذي: ٤٦٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٩٥، ومسلم: ٧٤٩/١٥٧، والترمذي: ٤٦١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٩٥، ومسلم: ٧٤٩/١٥٧، والترمذي: ٤٦١.




**١١٧٦-** عَنِ الْمُطَّلِبُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ رَجُلٌ فَقَالَ: كَيْفَ أُوْتِرُ؟ قَالَ: «أَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ» قَالَ: إِنِّي أَخْشَى أَنْ يَقُولَ النَّاسُ الْبُتَيْرَاءُ، فَقَالَ: «سُنَّةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ» يُرِيدُ: هَذِهِ سُنَّةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﷺ»[١].

واتە: موتەڵیبی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پیاوێک پرسیاری لە ئیبنو عومەر ﷺ کرد و گوتی: نوێژی ویتر چۆن بکەم؟ ئەویش گوتی: بە یەک ڕکات بیکە، گوتی: بەڕاستی من دەترسم خەڵکی بڵێن: بوتەیراء! (ئیبنو عومەر ﷺ) گوتی: سوننەتی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، مەبەستی ئەوە بوو کە ئەوە سوننەتی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ.

**الْبُتَيْرَاءُ:** گچکەکراوی وشەی «بتر»ـە، بە شتێک دەڵێن: کە کلکی بڕابێ.

**١١٧٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسَلِّمُ فِي كُلِّ ثِنْتَيْنِ، وَيُوتِرُ بِوَاحِدَةٍ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو دوو ڕکاتێک سەلامی دەدایەوەو، نوێژی ویتـری بە یەک ڕکات دەکرد.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی قنوتی ناو ویتر هاتووە

**١١٧٨-** عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: عَلَّمَنِي جَدِّي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ: «اللَّهُمَّ عَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَاهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، إِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، سُبْحَانَكَ رَبَّنَا تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ»[٣].

واتە: حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ دەڵێ: باپیرم پێغەمبەری خوا ﷺ فێری وشە گەلێکی کردووم کە لە قنوتی ویتردا بیانخوێنم: خوایە پارێزراو و لەش ساغم بکە لەگەڵ ئەوانەی پارێزراوت کردوون، وە پشتگیریم بکە لەگەڵ ئەوانەی پشتگیریت کردوون،

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم مطولًا ومختصراً: ٧٣٦، وأبو داود: ١٣٣٥ و ١٣٣٦ و ١٣٣٧، والترمذي: ٤٤٠ و ٤٤١، والنسائي: ٦٣٥ و ١٣٢٨ و ١٦٩٦.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢٥، والترمذي: ٤٦٤، والنسائي: ١٧٤٥ و ١٧٤٦.

وە ڕێنموونیم بکە لەگەڵ ئەوانەی ڕێنموونیت کردوون، وە لە خراپەی ئەوەی بڕیارت لەسەر داوە بمپارێزە، وە بەرەکەت بخە ئەوەی کە پێت بەخشیوم، بەڕاستی هەر تۆ بڕیار دەدەیت و کەس بڕیار نادات بەسەرتدا، بەڕاستی ئەوەی تۆ پشتی بگری هەرگیز زەبوون و ڕیسوا نابێت، پاکی و بێگەردی هەر بۆ تۆیە پەروەردگارا بەرزی و بڵندی هەر بۆ تۆیە.

**١١٧٩-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: فِي آخِرِ الْوِتْرِ «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ»[١].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە ویتری کۆتاییدا دەیفەرموو: خوایە من پەنا بە ڕازیبونت دەگرم لە توڕەیی و خەشمت، وە پەنا بە لێخۆشبوونەکانت دەگرم لە سزاکانت، وە پەنا دەگرم بە خۆت لە خۆت، من ناتوانم و نازانم بە تەواوی سوپاس و ستایشی تۆ بکەم، تۆ ئەو زاتەی هەر وەکو خۆت ستایشی خۆتت کردوە.

## بابەت: بەرز نەکردنەوەی دەستەکان لەکاتی قنوتدا

**١١٨٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ «كَانَ لَا يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلَّا عِنْدَ الِاسْتِسْقَاءِ، فَإِنَّهُ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە هیچ دووعایەکیدا دەستی بەرز نەدەکردەوە تەنها لە پاڕانەوەی باران بارینداا نەبێ (لە ئەوەیاندا دەستی بەرز دەکردەوە)، بە جۆرێک دەستی بەرز دەکردەوە و دەپاڕایەوە لە خوا بۆ باران بارین، سپیاتی بن باڵەکانی دەبینرا.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢٧، والترمذي: ٣٥٦٦، والنسائي: ١٧٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٣١، ومسلم: ٨٩٥، وأبو داود: ١١٧٠، والنسائي: ١٥١٣ و ١٧٤٨.

## بابەت: دەست بەرز کردنەوە
## لە پاڕانەوەدا و دەست هێنان بە ڕوخساردا

**١١٨١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَعَوْتَ اللَّهَ فَادْعُ بِبَاطِنِ كَفَّيْكَ، وَلَا تَدْعُ بِظُهُورِهِمَا، فَإِذَا فَرَغْتَ فَامْسَحْ بِهِمَا وَجْهَكَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﭭ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لە خوا پاڕایتەوە، بە بەری دەستەکانت بپاڕێوە، بە پشتە دەست لێی مەپاڕێوە، جا کاتێک لە دوعا بوویەوە، ئەوە دەست بهێنە بە ڕووخسارتدا.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی قنوت هاتووە
## پێش ڕکووع و دوای ڕکووع

**١١٨٢-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُوتِرُ فَيَقْنُتُ قَبْلَ الرُّكُوعِ»[٢].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری دەکرد، پێش ڕکووع بردن قنوتی دەخوێند.

**١١٨٣-** عَنْ حُمَيْدٌ ﭬ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﭬ، قَالَ: سُئِلَ عَنِ الْقُنُوتِ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ، فَقَالَ: «كُنَّا نَقْنُتُ قَبْلَ الرُّكُوعِ وَبَعْدَهُ»[٣].

واتە: حومەید لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﭬ دەگێڕێتەوە، کە پرسیار کرا دەربارەی قنوت لە نوێژی بەیانیدا، (ئەنەس ﭬ) گوتی: ئێمە قنوتمان دەخوێند لە پێش ڕکووع و لە دوای ڕکووع.

**١١٨٤-** عَنْ مُحَمَّدٍ ﭬ، قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﭬ عَنِ الْقُنُوتِ، فَقَالَ: «قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ الرُّكُوعِ»[٤].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٤٨٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٧١، ومسلم: ١١٥٧، والنسائي: ٢٣٤٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٠١، ومسلم: ٦٧٧.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٠١، ومسلم: ٦٧٧، وأبو داود: ١٤٤٤، والنسائي: ١٠٧١.

واتە: موحەممەد ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ کرد دەربارەی قنوت، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ڕکووع قنوتی دەخوێند.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی ویتر هاتووە لە کۆتایی شەودا

**١١٨٥-** عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: «مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ، مِنْ أَوَّلِهِ وَأَوْسَطِهِ، وَانْتَهَى وِتْرُهُ حِينَ مَاتَ فِي السَّحَرِ»[1].

واتە: مەسروق دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە ﷺ کرد دەربارەی نوێژی ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش گوتی: لە هەموو کاتێکی شەو نوێژی ویتری کردوە، لە سەرەتای شەو و لە ناوەڕاستی شەودا، وە کۆتا ویترەکانی (تاکو وەفاتی کرد) لە نزیک بەرەبەیان بوون (لە کۆتایی شەودا).

**١١٨٦-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: «مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مِنْ أَوَّلِهِ وَأَوْسَطِهِ، وَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ»[2].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کاتێکی شەودا نوێژی ویتری کردوە، لە سەرەتای شەوو لە ناوەڕاستی شەودا، وە کۆتا ویترەکانی (تاکو وەفاتی کرد) تاکو بەرەبەیان بوون.

**١١٨٧-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ خَافَ مِنْكُمْ أَنْ لَا يَسْتَيْقِظَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، فَلْيُوتِرْ مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ ثُمَّ لِيَرْقُدْ، وَمَنْ طَمِعَ مِنْكُمْ أَنْ يَسْتَيْقِظَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، فَلْيُوتِرْ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، فَإِنَّ قِرَاءَةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَحْضُورَةٌ، وَذَلِكَ أَفْضَلُ»[3].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان ترسی ئەوەی هەبوو کە لە کۆتایی شەو خەبەری نەبێتەوە، ئەوە با لە سەرەتای شەودا نوێژە ویترەکە بکات پاشان بخەوێ، ئەگەر کەسێکیشتان حەزی لێبو و دەشیزانی لە کۆتایی شەودا خەبەری دەبێتەوە با نوێژە ویترەکە لە کۆتایی شەودا بکات، چونکە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٩٦، ومسلم: ٧٤٥، وأبو داود: ١٤٣٥، والترمذي: ٤٥٦، والنسائي: ١٦٨١.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٥٥، والترمذي بإثر: ٤٥٥.

بێگومان قورئان خوێندنی کۆتایی شەو فریشتەکان ئامادەی دەبن، وە ئەوەش باشترینە (کە فریشتەکان ئامادەی دەبن لە کۆتایی شەودا).

## بابەت: ئەو کەسەی کە بخەوێت یان بیری بچێتەوە نوێژی ویتر بکات

**١١٨٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَامَ عَنِ الْوِتْرِ أَوْ نَسِيَهُ، فَلْيُصَلِّ إِذَا أَصْبَحَ، أَوْ ذَكَرَهُ»[١].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خەوی لێکەوت و ویتری نەکردبوو، یان لە بیری چووبوو، با نوێژەکەی بکات هەرکات بەیانی داهات یان هەرکات بەبیری هاتەوە.

**١١٨٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوْتِرُوا قَبْلَ أَنْ تُصْبِحُوا» قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى: فِي هَذَا الْحَدِيثِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ حَدِيثَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَاهٍ[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێش ئەوەی بەیانی بکەنەوە (پێش ئەوەی نوێژی بەیانی ببێ) نوێژی ویتر بکەن، موحەممەدی کوڕی یەحیا دەڵێ: ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە فەرموودەکەی عەبدوڕڕەحمان بێ بنەمایە (واتە: فەرموودەکەی پێشتر).

## بابەت: ئەوەی دەربارەی ژمارەی ڕکاتەکانی ویتر هاتووە

**١١٩٠-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «الْوِتْرُ حَقٌّ، فَمَنْ شَاءَ فَلْيُوتِرْ بِخَمْسٍ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيُوتِرْ بِثَلَاثٍ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيُوتِرْ بِوَاحِدَةٍ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٣١، والترمذي: ٤٦٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٥٤، والترمذي: ٤٦٨، والنسائي: ١٦٨٣ و ١٦٨٤.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٢٢، والنسائي: ١٧١١.




واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاریی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ویتر (لە شەرعدا ڕاست و جێگیرە و) هەقە، جا هەر کەس دەیەوێ با بە پێنج ڕکات بیکات، وە هەر کەس دەیەوێ با بە سێ ڕکات بیکات، وە هەر کەس دەیەوێ با بە یەک ڕکات بیکات.

١١٩١- عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ، قُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَفْتِينِي عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. قَالَتْ: «كُنَّا نُعِدُّ لَهُ سِوَاكَهُ وَطَهُورَهُ، فَيَبْعَثُهُ اللَّهُ فِيمَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَتَسَوَّكُ وَيَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يُصَلِّي تِسْعَ رَكَعَاتٍ. لَا يَجْلِسُ فِيهَا إِلَّا عِنْدَ الثَّامِنَةِ فَيَدْعُو رَبَّهُ، فَيَذْكُرُ اللَّهَ وَيَحْمَدُهُ وَيَدْعُوهُ، ثُمَّ يَنْهَضُ وَلَا يُسَلِّمُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي التَّاسِعَةَ، ثُمَّ يَقْعُدُ فَيَذْكُرُ اللَّهَ، وَيَحْمَدُهُ وَيَدْعُو رَبَّهُ وَيُصَلِّي عَلَى نَبِيِّهِ، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمًا يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً. فَلَمَّا أَسَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَخَذَ اللَّحْمَ، أَوْتَرَ بِسَبْعٍ وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ مَا سَلَّمَ»[(١)].

واتە: سەعدی کوڕی هیشام ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە ﷺ کرد، گوتم: ئەی دایکی ئیمانداران دەربارەی ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارم هەیە؟ گوتی: ئێمە سیواک و ئاوی دەستنوێژمان بۆ ئامادە دەکرد، کەی خوا پێی خۆشبا بە ئاگای دەهێنا لە شەودا، ئنجا سیواکی دەکرد، وە دەستنوێژی دەگرت، پاشان نۆ ڕکات نوێژی دەکرد لە نێوانیاندا دانەدەنیشت تاکو ڕکاتی هەشتەم، (لە ڕکاتی هەشتەمدا) لە پەروەردگاری دەپاڕایەوەو، یادی خوای دەکرد و سوپاس و ستایشی خوای دەکرد، وە لێی دەپاڕایەوە، پاشان هەڵدەستا و سەلامی نەدەدایەوە، دواتر هەڵدەستا ڕکاتی نۆیەمی دەکرد، پاشان دادەنیشت یادی خوای دەکردو، ستایشی دەکرد و لە پەروەردگاری دەپاڕایەوە و صەڵاواتی لەسەر پێغەمبەرەکەی ﷺ لێدەدا، پاشان سەلامی دەدایەوە کە ئێمە گوێمان لێدەبوو، پاشان دوو ڕکات نوێژی دەکرد دوای سەلامدانەوە بە دانیشتنەوە، ئەوە دەکاتە یازدە ڕکات، جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ بە ساڵداچوو، کەمێ قەڵەو بوو، بە حەوت ڕکات ویتری دەکرد، وە دوو ڕکاتی دوای سەلامدانەوە (لە حەوت ڕکاتەکە) دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤٦، وأبو داود: ١٣٤٢_١٣٤٥، والنسائي: ١٣١٥ و ١٧٢٠ و ١٧٢١.




**١١٩٢-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُوتِرُ بِسَبْعٍ أَوْ بِخَمْسٍ، لَا يَفْصِلُ بَيْنَهُنَّ بِتَسْلِيمٍ وَلَا كَلَامٍ»[١].

**واتە:** ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە حەوت ڕكات، یان بە پێنج ڕكات، ویتری دەكرد، كە نە بە قسەكردن و نە بە سەلامدانەوە نێوانی ئەو ڕكاتانەی جیانەدەكردەوە (تا كۆتایی).

## بابەت: ئەوەی كە هاتووە دەربارەی ویتر لە سەفەردا

**١١٩٣-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُصَلِّي فِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، لَا يَزِيدُ عَلَيْهِمَا، وَكَانَ يَتَهَجَّدُ مِنَ اللَّيْلِ». قُلْتُ: وَكَانَ يُوتِرُ؟ قَالَ: نَعَمْ[٢].

**واتە:** سالیم لە باوكییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتدا دوو ڕكاتی دەكرد، زیاتر لەو دووەی نەدەكرد، وە بە شەو شەونوێژی دەكرد، (سالیم دەڵێ) گوتم: ویتری دەكرد؟ گوتی: بەڵێ.

**١١٩٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عُمَرَ ﵃، قَالَا: «سَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَهُمَا تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ، وَالْوِتْرُ فِي السَّفَرِ سُنَّةٌ»[٣].

**واتە:** ئیبنو عەبباس و ئیبنو عومەر ﵃ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی گەشتیاری كرد بە دوو ڕكات، وە ئەو دوو ڕكاتە نوێژی تەواون و كورتكراوە نین، وە نوێژی ویتر لە گەشتدا سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه النسائي: ١٧١٤.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) ضعيف جداً.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی ئەو دوو ڕکاتەی دوای ویتر بە دانیشتنەوە هاتووە

**١١٩٥-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الْوِتْرِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، وَهُوَ جَالِسٌ»(١).

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە دوای نوێژی ویتر دوو ڕکات نوێژی کورت و پوختی بە دانیشتنەوە دەکرد.

**١١٩٦-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﵁، قَالَ: حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوتِرُ بِوَاحِدَةٍ، ثُمَّ يَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ يَقْرَأُ فِيهِمَا وَهُوَ جَالِسٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، قَامَ فَرَكَعَ»(٢).

واتە: ئەبو سەلەمە ﵁ دەڵێ: عائیشە ﵂ بۆی گێڕامەوە گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ یەک ڕکات ویتری دەکرد، پاشان دوو ڕکاتی تری دەکرد و، قورئانی تێدا دەخوێند بە دانیشتنەوە، جا کاتێک ویستبای ڕکووع ببات، هەڵدەستا جا ڕکووعی دەبرد.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی خەوتنێکی کەم هاتووە لەدوای ویتر و دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی

**١١٩٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «مَا كُنْتُ أُلْفِي - أَوْ أَلْقَى - النَّبِيَّ ﷺ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ إِلَّا وَهُوَ نَائِمٌ عِنْدِي» قَالَ وَكِيعٌ: تَعْنِي بَعْدَ الْوِتْرِ(٣).

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هیچ کاتێک نەبووە و نەمدیوە کە پێغەمبەر ﷺ شەو لەماڵی من بووبێ، هەمیشە لە کۆتایی شەوەکەدا خەوتووە، وەکیع دەڵێ: (عائیشە ﵂) مەبەستی لە دوای ویتر بووە.

**١١٩٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا صَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٤٧١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٢٣، ومسلم: ٧٤٢، وأبو داود: ١٣١٨.

(٤) حسن صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٦، وأبو داود: ١٣٣٦، والنسائي:٦٨٥.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا.

**١١٩٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ اضْطَجَعَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی دەکرد پاڵی دەدایەوە.

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی نوێژی ویتر هاتووە لەسەر پشتی وڵاخ

**١٢٠٠-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ ﵄، فَتَخَلَّفْتُ فَأَوْتَرْتُ، فَقَالَ: مَا خَلَفَكَ؟ قُلْتُ: أَوْتَرْتُ، فَقَالَ: أَمَا لَكَ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: «فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ عَلَى بَعِيرِهِ»[٢].

واتە: سەعیدی کوڕی یەسارِ دەڵێ: لەگەڵ ئیبنو عومەر ﵄ بووم (لە گەشتێکدا) منیش لێی دواکەوتم (لە سواریەکە دابەزیم) ئنجا نوێژی ویترم کرد، ئەویش گوتی: بۆچی دواکەوتی؟ گوتم: نوێژی ویترم کرد، گوتی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین سەرمەشقت نیە؟! گوتم: بـا، گوتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری لەسەر (پشتی) وڵاخەکەی دەکرد.

**١٢٠١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يُوتِرُ عَلَى رَاحِلَتِهِ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر (پشتی) وڵاخەکەی نوێژی ویتری دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٢٦١، والترمذي: ٤٢٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٩٩، ومسلم: ٧٠٠، وأبو داود: ١٢٢٤، والترمذي: ٤٧٢، والنسائي: ٧٤٠ و ٧٤٣ و ٧٤٤ و ١٦٨٦ و ١٦٨٧ و ١٦٨٨.

(٣) صحيح لغيره.

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی نوێژی ویتر هاتووە لە سەرەتای شەودا

**١٢٠٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِأَبِي بَكْرٍ «أَيَّ حِينٍ تُوتِرُ؟» قَالَ: أَوَّلَ اللَّيْلِ، بَعْدَ الْعَتَمَةِ، قَالَ «فَأَنْتَ يَا عُمَرُ؟» فَقَالَ: آخِرَ اللَّيْلِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ، «أَمَّا أَنْتَ يَا أَبَا بَكْرٍ، فَأَخَذْتَ بِالْوُثْقَى، وَأَمَّا أَنْتَ يَا عُمَرُ، فَأَخَذْتَ بِالْقُوَّةِ»[١].

حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ سُلَيْمَانُ بْنُ تَوْبَةَ قَالَ: أَنْبَأَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبَّادٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَلِيمٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ لِأَبِي بَكْرٍ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو بەکری فەرموو: کەی نوێژی ویتر دەکەی؟ گوتی: سەرەتای شەو دوای نوێژی عیشا، فەرمووی: عومەر ئەی تۆ (کەی دەیکەی)؟ ئەویش گوتی: کۆتایی شەو، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر تۆ دەستت گرتووە بە پەتێکی بەهێز (واتە: ناتەوێ نوێژی ویترت لە دەست بچێ و زوو دەیکەی)، وە تۆش ئەی عومەر دەستت گرتووە بە هێز و قووەت (واتە: سوری لەسەر ئەوەی کە دەبێ شەو هەڵسیەوە بۆ شەونوێژ و نوێژی ویتر).

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: بە سەهو چوون لە نوێژدا

**١٢٠٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَزَادَ أَوْ نَقَصَ - قَالَ إِبْرَاهِيمُ: وَالْوَهْمُ مِنِّي - فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَزِيدَ فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ؟ قَالَ: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ» ثُمَّ تَحَوَّلَ النَّبِيُّ ﷺ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ[٣].

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠١، ومسلم: ٥٧٢، وأبو داود: ١٠١٩_١٠٢٢، والترمذي: ٣٩٢ و ٣٩٣، والنسائي: ١٢٥٤_١٢٥٥.




واته: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد، ئنجا یان زیادی کرد، یان کەم، - ئیبراهیم (ڕاوی فەرموودەکە) دەڵێ: من لە گوماندام کە زیادی کرد یان کەم-، ئنجا پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژ هیچی لێ زیاد کراوە؟ فەرمووی: بێگومان منیش مرۆڤم شتم بیر دەچێتەوە، هەر وەکو چۆن ئێوە شتتان بیر دەچێتەوە، ئنجا ئەگەر هەر یەکێک لە ئێوە شتێکی لەبیرکرد (لە نوێژدا) با دوو سوجدە بەرێ بە دانیشتنەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕووی وەرگێڕا (بەرەو قیبلە) و دوو سوجدەی برد.

١٢٠٤- عَنْ عِيَاضٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ، فَقَالَ: أَحَدُنَا يُصَلِّي فَلَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»[١].

واته: عیاز ﷺ دەگێڕێتەوە کە پرسیاری کردوە لە ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ گوتوویەتی: یەکێک لە ئێمە نوێژ دەکات جا نازانێ چەند (ڕکات) نوێژی کردوە؟ ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد و نەیزانی چەند (ڕکات) نوێژی کردوە، با دوو سوجدە ببات بە دانیشتنەوە.

## بابەت: ئەو کەسەی کە نوێژی نیوەڕۆ بە پێنج ڕکات دەکات بە سەهو

١٢٠٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقِيلَ لَهُ: أَزِيدَ فِي الصَّلَاةِ؟ قَالَ: «وَمَا ذَاكَ؟» فَقِيلَ لَهُ، «فَثَنَى رِجْلَهُ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ»[٢].

واته: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بە پێنج ڕکات کرد، پێیان گوت: ئایا هیچ زیاد کراوە لە نوێژدا؟ ئەویش فەرمووی: بۆچی ئەو پرسیارە (دەکەن)؟ ئنجا پێیان گوت (کە پێنج ڕکاتی کردوە)، ئەویش قاچەکانی نوشتاندەوە و (بەرەو قیبلە) دوو سوجدەی برد.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٠٢٩، والترمذي: ٣٩٦ وانظر مسلم: ٥٧١، والنسائي: ١٢٣٨ و ١٢٣٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٤ و ١٢٢٦ و ٧٢٤٩، ومسلم: ٥٧٢، وأبو داود: ١٠١٩، والترمذي: ٣٩٢، والنسائي: ١٢٥٤ و ١٢٥٥.

## بابەت: کەسێ کە لە دووەم ڕکات هەستێتەوە بە سەهو (تەحیات نەخوێنێ)

**١٢٠٦-** عَنِ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «صَلَّى صَلَاةً، أَظُنُّ أَنَّهَا الظُّهْرُ - الْعَصْرُ - فَلَمَّا كَانَ فِي الثَّانِيَةِ قَامَ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ، فَلَمَّا كَانَ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ»[1].

**واتە:** ئیبنو بوحەینە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژێکی کرد کە پێموایە نوێژی نیوەڕۆ - عەصر - بوو، ئنجا کاتێک کە لە ڕکاتی دووەم دابوو هەڵسایەوە پێش ئەوەی دابنیشێ (بۆ تەحیات)، ئنجا پێش ئەوەی کە سەلام بداتەوە دوو سوجدەی برد.

**١٢٠٧-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْأَعْرَجِ ﷺ، أَنَّ ابْنَ بُحَيْنَةَ، أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «قَامَ فِي ثِنْتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ نَسِيَ الْجُلُوسَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْ صَلَاتِهِ إِلَّا أَنْ يُسَلِّمَ، سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ وَسَلَّمَ»[2].

**واتە:** عەبدوڕڕەحمانی ئەعرەج ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئیبنو بوحەینە ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕکاتی دووەمی نوێژی نیوەڕۆ هەڵسایەوە و بیری چوو کە دابنیشێ (بۆ تەحیات) هەتا کاتێک لە نوێژەکەی بوویەوە، جا پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، دوو سوجدەی سەهوی برد، ئنجا سەلامی دایەوە.

**١٢٠٨-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ فَلَمْ يَسْتَتِمَّ قَائِمًا فَلْيَجْلِسْ، فَإِذَا اسْتَتَمَّ قَائِمًا فَلَا يَجْلِسْ وَيَسْجُدْ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ»[3].

**واتە:** موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لە ڕکاتی دووەم هەڵسایەوە (تەحیاتی نەخوێند) ئەگەر بە تەواوی هەڵنەستابوو، با دابنیشێتەوە (بۆ تەحیات خوێندن)، ئەگەر بە تەواویش هەڵسابوویەوە با دانەنیشێتەوە، وە دوو سوجدەی سەهو بەرێ (پێش سەلام دانەوە).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٢٩، ومسلم: ٥٧٠، وأبو داود: ١٠٣٤ و ١٠٣٥، والترمذي: ٣٩١، والنسائي: ١١٧٧ و ١١٧٨ و ١٢٢٢ و ١٢٢٣ و ١٢٦١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٢٩، ومسلم: ٥٧٠، وأبو داود: ١٠٣٤ و ١٠٣٥، والترمذي: ٣٩١، والنسائي: ١١٧٧ و ١١٧٨ و ١٢٢٢ و ١٢٢٣ و ١٢٦١.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٣٦.

## بابەت: ئەو کەسەی کە دەکەوێتە گومان لە نوێژەکەیدا دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە یەقینە و لێی دڵنیایە

**١٢٠٩-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي الثِّنْتَيْنِ وَالْوَاحِدَةِ، فَلْيَجْعَلْهَا وَاحِدَةً، وَإِذَا شَكَّ فِي الثِّنْتَيْنِ وَالثَّلَاثِ فَلْيَجْعَلْهَا ثِنْتَيْنِ، وَإِذَا شَكَّ فِي الثَّلَاثِ وَالْأَرْبَعِ فَلْيَجْعَلْهَا ثَلَاثًا، ثُمَّ لِيُتِمَّ مَا بَقِيَ مِنْ صَلَاتِهِ حَتَّى يَكُونَ الْوَهْمُ فِي الزِّيَادَةِ، ثُمَّ يَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ»[١].

**واتە:** عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر یەکێکتان کەوتە گومان لەوەی کە دوو ڕکاتی کردوە، یان یەک ڕکات، با یەک ڕکاتەکە هەژمار بکات، وە ئەگەر کەوتە گومان لەوەی کە دوو ڕکاتی کردوە، یان سێ ڕکات، با دوو ڕکاتەکە هەژمار بکات، وە ئەگەر لە سێ و چوار کەوتە گومانەوە، با سێیەکە هەژمار بکات، پاشان ئەوەی کە ماوە لە نوێژەکەی با تەواوی بکات، تاکو گومانەکە بچێتە لای زیادەکە، پاشان پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، با بە دانیشتنەوە دوو سوجدە بەرێ.

**١٢١٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيُلْغِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى الْيَقِينِ، فَإِذَا اسْتَيْقَنَ التَّمَامَ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، فَإِنْ كَانَتْ صَلَاتُهُ تَامَّةً، كَانَتِ الرَّكْعَةُ نَافِلَةً، وَإِنْ كَانَتْ نَاقِصَةً، كَانَتِ الرَّكْعَةُ لِتَمَامِ صَلَاتِهِ، وَكَانَتِ السَّجْدَتَانِ رَغْمَ أَنْفِ الشَّيْطَانِ»[٢].

**واتە:** ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان کەوتە گومان لە نوێژەکەیدا، با گومانەکەی بڕەوێنێتەوە و بونیاد لەسەر ئەوە بکات کە لێی دڵنیایە، جا ئەگەر (دواتر) دڵنیابوو کە تەواوی کردوە با سوجدە ببات، وە ئەگەر نوێژەکەی تەواو بوو (واتە: ئەوەی کە کردی زیادە بوو) ئەوە ڕکاتەکە دەبێتە سوننەت، ئەگەر ناتەواویش بوو، ڕکاتەکە بۆ تەواوکاری نوێژەکەیە و، دوو سوجدەکەش بۆ لووت شکاندنی شەیتانە.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٩٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٧١، وأبو داود: ١٠٢٤ و ١٠٢٦، والنسائي: ١٢٣٨ و ١٢٣٩.

## بابەت: ئەو کەسەی کە لە نوێژەکەیدا دەکەوێتە گومان بەدوای یەقین بکەوێ

**١٢١١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةً لَا نَدْرِي أَزَادَ أَوْ نَقَصَ فَسَأَلَ، فَحَدَّثْنَاهُ فَثَنَى رِجْلَهُ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: «لَوْ حَدَثَ فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ لَأَنْبَأْتُكُمُوهُ، وَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي، وَأَيُّكُمْ مَا شَكَّ فِي الصَّلَاةِ فَلْيَتَحَرَّ أَقْرَبَ ذَلِكَ مِنَ الصَّوَابِ، فَيُتِمَّ عَلَيْهِ وَيُسَلِّمَ وَيَسْجُدَ سَجْدَتَيْنِ»[١].**

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژێکی کرد نازانین نە زیادی کرد نە کەم، ئەویش پرسیاری کرد، ئێمەش پێمان گوت، ئنجا قاچەکانی نوشتاندەوە ڕووی کردە قیبلە و دوو سوجدەی برد، پاشان سەلامی دایەوە، دواتر ڕووە و ڕوو ڕووی تێکردین و فەرمووی: ئەگەر هیچ گۆڕانکارییەک ڕوووبدات لە نوێژدا ئەوە ئاگادارتان دەکەم لێی، بەڵام بێگومان منیش وەکو ئێوە مرۆڤم و، شتم بیردەچێتەوە، وەکو چۆن ئێوە شتتان بیر دەچێتەوە، جا هەر کاتێک بیرم چۆوە بیرم بخەنەوە، وە هەر یەکێکتان کەوتە گومان لە نوێژدا با کامەیان لە دڵنیایی نزیکترە، ئەوەیان هەڵبژێرێ و نوێژەکەی لەسەر ئەوە تەواو بکات، وە سەلام بداتەوە و دوو سوجدە ببات.

**١٢١٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ، فَلْيَتَحَرَّ الصَّوَابَ، ثُمَّ يَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ» قَالَ الطَّنَافِسِيُّ: هَذَا الْأَصْلُ وَلَا يَقْدِرُ أَحَدٌ يَرُدُّهُ[٢].**

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان کەوتە گومان لە نوێژدا، با بە دوای یەقیندا بگەڕێ، پاشان دوو سوجدە ببات. تەنافیسی دەڵێ: ئەوە بنچینەیەو کەس ناتوانێ ڕەتی بکاتەوە (واتە: زانایان لەسەری ڕێککەوتوون).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠١، ومسلم: ٥٧٢، وأبو داود: ١٠٢٠، والنسائي: ١٢٤٠_١٢٤٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠١، ومسلم: ٥٧٢، وأبو داود: ١٠٢٠، والنسائي: ١٢٤٠_١٢٤٤.

## بابەت: کەسێک کە لە دووەم ڕکات یان سێیەم ڕکات سەلام بداتەوە بە هەڵە

**١٢١٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «سَهَا فَسَلَّمَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ» فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ ذُو الْيَدَيْنِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقَصُرَتْ أَوْ نَسِيتَ؟ قَالَ: «مَا قَصُرَتْ وَمَا نَسِيتُ» قَالَ: إِذًا، فَصَلَّيْتَ رَكْعَتَيْنِ، قَالَ: «أَكَمَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ؟» قَالُوا: نَعَمْ، «فَتَقَدَّمَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بیری چوو جا لە ڕکاتی دووەم سەلامی دایەوە، پیاوێک کە پێی دەگوترا: زولیەدەین، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە یان لەبیرت چوو؟ فەرمووی: نە کورتکراوەتەوەو، نە لە بیرم چووە (بە گومانی خۆم)، گوتی: کەواتە دوو ڕکاتت کرد، فەرمووی: ئایا بەو جۆرەیە کە زولیەدەین دەڵێ؟ گوتیان: بەڵێ، جا چووە پێش و دوو ڕکاتی کرد، پاشان سەلامی دایەوە، دواتر دوو سوجدەی برد.

**١٢١٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِحْدَى صَلَاتَيِ الْعَشِيِّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى خَشَبَةٍ كَانَتْ فِي الْمَسْجِدِ يَسْتَنِدُ إِلَيْهَا، فَخَرَجَ سَرَعَانُ النَّاسِ يَقُولُونَ: قَصُرَتِ الصَّلَاةُ، وَفِي الْقَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَهَابَاهُ أَنْ يَقُولَا لَهُ شَيْئًا وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ طَوِيلُ الْيَدَيْنِ، يُسَمَّى ذَا الْيَدَيْنِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ، فَقَالَ: «لَمْ تَقْصُرْ وَلَمْ أَنْسَ» قَالَ: فَإِنَّمَا صَلَّيْتَ رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ: «أَكَمَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ» قَالُوا: نَعَمْ، «فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێک لە نوێژەکانی کۆتایی ڕۆژی بۆ کردین (نوێژی نیوەڕۆ، یان عەصر) بە دوو ڕکات، پاشان سەلامی دایەوە، دواتر هەڵسا چوو بۆ لای کۆلکە دارێک کە لە ناو مزگەوتدا بوو پاڵی پێوە دەدا، ئنجا ئەو خەڵکانەی پەلەیان بوو چوونە دەر لە مزگەوت، گوتیان:

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠١٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨٢ و ٧٢٥٠، ومسلم: ٥٧٣، وأبو داود: ١٠٠٨_١٠١١ و ١٠١٤ و ١٠١٥، والترمذي: ٣٩٩، والنسائي: ١٢٢٤_١٢٢٧ و ١٢٣٣_١٢٣٥ مختصراً ومطولاً.

نوێژ کورتکراوەتەوە، ئەبو بەکر و عومەریش لە ناو خەڵکەکە بوون، شەرمیان کرد کە لە ڕووی (پێغەمبەردا ﷺ) شتێک بڵێن، وە لە ناو خەڵکەکەدا پیاوێک هەبوو دەستەکانی درێژ بوو، پێیان دەگوت: زولیەدەین، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە، یان لەبیرت چوو؟ فەرمووی: نە کورتکراوەتەوە و نە لەبیرم چوو، گوتی: ئاخر دوو ڕکاتت کرد، ئەویش فەرمووی: ئایا ئەوەی زولیەدەین دەیڵێ وایە؟ گوتیان: بەڵێ، جا هەڵسا و دوو ڕکاتی کرد، پاشان سەلامی دایەوە، دواتر دوو سوجدەی برد، پاشان سەلامی دایەوە.

١٢١٥- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، قَالَ: «سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ثَلَاثِ رَكَعَاتٍ مِنَ الْعَصْرِ، ثُمَّ قَامَ فَدَخَلَ الْحُجْرَةَ» فَقَامَ الْخِرْبَاقُ، رَجُلٌ بَسِيطُ الْيَدَيْنِ، فَنَادَى: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ؟ فَخَرَجَ مُغْضَبًا يَجُرُّ إِزَارَهُ فَسَأَلَ، فَأُخْبِرَ، «فَصَلَّى تِلْكَ الرَّكْعَةَ الَّتِي كَانَ تَرَكَ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ»[١].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی عەصردا لە ڕکاتی سێیەم سەلامی دایەوە، پاشان هەڵسا چووە ژوورەکەی خۆی، ئنجا خیرباق کە پیاوێک بوو دەستەکانی درێژ بوون، هەڵساو بانگی کرد، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە؟ ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) هاتەدەر تووڕەبوونی پێوە دیار بو و، پۆشاکەکەی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا، وە پرسیاری کرد (لەوەی کە خیرباق گوتی)، جا پێیان گوت (کە ڕاستە)، ئنجا ئەو ڕکاتەی کرد کە نەیکردبوو، پاشان سەلامی دایەوە، دواتر دوو سوجدەی برد، پاشان سەلامی دایەوە.

## بابەت: دوو سوجدەی سەهو پێش سەلامدانەوە

١٢١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْتِي أَحَدَكُمْ فِي صَلَاتِهِ، فَيَدْخُلُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ نَفْسِهِ حَتَّى لَا يَدْرِيَ زَادَ أَوْ نَقَصَ، فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، ثُمَّ يُسَلِّمْ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٧٤، وأبو داود: ١٠١٨، والترمذي بإثر: ٣٩٥، والنسائي: ١٢٣٧ و ١٣٣١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠٨، ومسلم: ٣٨٩، وأبو داود: ٥١٦ و ١٠٣٠، والترمذي: ٣٩٧، والنسائي: ٦٧٠ و ١٢٥٣.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەر یەکێکتان لە نوێژدا شەیتان دێتە لای، دەچێتە نێوان ئەو و نەفسییەوە (خوتخوتەی بۆ دەکات) تاکو وای لێدێ نازانێ ئایا (لە نوێژەکەی) زیادی کردوە، یان کەم، جا کاتێک ئەوە ڕوویدا با دوو سوجدە بەرێ پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، پاشان سەلام بداتەوە.

١٢١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ بَيْنَ ابْنِ آدَمَ وَبَيْنَ نَفْسِهِ فَلَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەیتان دێتە نێوان ئادەمیزاد و نەفسییەوە، ئنجا نازانێ چەند ڕکات نوێژی کردوە، جا ئەگەر ئەوە ڕوویدا، با دوو سوجدە ببات، پێش ئەوەی سەلام بداتەوە.

## بابەت: ئەوەی کە دوو سوجدەکەی سەهو دوای سەلام دانەوە دەبات

١٢١٨- عَنْ عَلْقَمَةَ، أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، «سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ بَعْدَ السَّلَامِ» وَذَكَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَعَلَ ذَلِكَ[2].

واتە: عەلقەمە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئیبنو مەسعوود ﷺ دوو سوجدەی سەهوی دوای سەلام دانەوە برد، وە باسی ئەوەی کرد کە پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیەی کردوە.

١٢١٩- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «فِي كُلِّ سَهْوٍ سَجْدَتَانِ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ»[3].

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەموو سەهویەک (هەڵەیەک) دوو سوجدەی دەوێ دوای ئەوەی کە سەلام دەدرێتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠٨، ومسلم: ٣٨٩، وأبو داود: ٥١٦ و ١٠٣٠، والترمذي: ٣٩٧، والنسائي: ٦٧٠ و ١٢٥٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٤ و ١٢٢٦ و ٧٢٤٩، ومسلم: ٥٧٢، وأبو داود: ١٠١٩، والترمذي: ٣٩٢، والنسائي: ١٢٥٤ و ١٢٥٥.

(٣) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٠٣٨.

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی بونیادنانی نوێژ هاتووە

**١٢٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الصَّلَاةِ وَكَبَّرَ، ثُمَّ أَشَارَ إِلَيْهِمْ، فَمَكَثُوا، ثُمَّ انْطَلَقَ فَاغْتَسَلَ، وَكَانَ رَأْسُهُ يَقْطُرُ مَاءً، فَصَلَّى بِهِمْ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «إِنِّي خَرَجْتُ إِلَيْكُمْ جُنُبًا، وَإِنِّي نَسِيتُ حَتَّى قُمْتُ فِي الصَّلَاةِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتەدەر بۆ نوێژ و تەکبیری کردو دەستی بە نوێژ کرد، پاشان ئاماژەی بۆ کردن، ئنجا (هاوەڵان) مانەوە، دواتر ڕۆیشت خۆی شۆرد (دواتر گەڕایەوە)، سەری دڵۆپەی ئاوی لێ دەتکا، ئنجا پێشنوێژی بۆ کردن، جا کاتێک لە نوێژ تەواوبوو، فەرمووی: من کە هاتم بۆ لاتان لەشم گران بوو، وە لە ڕاستییدا لەبیرم نەبوو، هەتا نوێژم دابەست.

**١٢٢١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَصَابَهُ قَيْءٌ أَوْ رُعَافٌ أَوْ قَلَسٌ أَوْ مَذْيٌ، فَلْيَنْصَرِفْ، فَلْيَتَوَضَّأْ ثُمَّ لِيَبْنِ عَلَى صَلَاتِهِ، وَهُوَ فِي ذَلِكَ لَا يَتَكَلَّمُ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس (لە نوێژدا) ڕشایەوە، یان خوێن لە لووتی هات، یان شتێکی لە قوڕگ هاتەدەر، یان مەزی هاتەوە، با واز لە نوێژ بێنێ و بچێت دەستنوێژ بگرێ، پاشان بونیادی نوێژەکەی بکات (لە کوێ وازی لێهێناوە لەوێوە دەست پێبکاتەوە)، وە لەم حاڵەتەدا نابێ قسە بکات.

## بابەت: کەسێ کە لەناو نوێژدا
## بێ دەستنوێژ دەبێ چۆن نوێژەکە بەجێ دێڵێ

**١٢٢٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَأَحْدَثَ، فَلْيُمْسِكْ عَلَى أَنْفِهِ، ثُمَّ لِيَنْصَرِفْ»[٣].

---

(١) حسن صحيح.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١١٤.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە نوێژی دەکرد، لە نوێژەکەیدا دەستنوێژی شکا، با دەستی بە لوتییەوە بگرێ، پاشان نوێژەکە بەجێ بێڵێ (بۆ ئەوەی وا هەست بکرێ کە خوێن لە لووتی هاتووە، نەک دەنگ یان بای لێ هاتوە).

**١٢٢٢م-** حَدَّثَنَا حَرْمَلَةُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ قَيْسٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[1].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێردراوەتەوە.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نوێژکردنی نەخۆش هاتووە

**١٢٢٣-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁، قَالَ: كَانَ بِيَ النَّاصُورُ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ، فَعَلَى جَنْبٍ»[2].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ دەڵێ: نەخۆشی ناصوڕم هەبوو، جا پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی نوێژکردن، ئەویش فەرمووی: نوێژ بە پێوە بکە، ئەگەر نەتتوانی بە دانیشتنەوە، ئەگەر نەتتوانی لەسەر تەنیشت.

**١٢٢٤-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﵁، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ «صَلَّى جَالِسًا عَلَى يَمِينِهِ، وَهُوَ وَجِعٌ»[3].

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﵁ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر لای ڕاستی بە دانیشتنەوە نوێژی کردوە، کاتێک کە نەخۆش بوو.

**١٢٢٥-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: «وَالَّذِي ذَهَبَ بِنَفْسِهِ ﷺ مَا مَاتَ حَتَّى كَانَ أَكْثَرُ صَلَاتِهِ وَهُوَ جَالِسٌ، وَكَانَ أَحَبُّ الْأَعْمَالِ إِلَيْهِ الْعَمَلَ الصَّالِحَ الَّذِي يَدُومُ عَلَيْهِ الْعَبْدُ، وَإِنْ كَانَ يَسِيرًا»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١١٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١١٧، وأبو داود: ٩٥٢، والترمذي: ٣٧٢.

(٣) ضعيف الإسناد جداً.

(٤) صحيح. أخرجه النسائي: ١٦٥٤ و ١٦٥٥.

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی ﷺ بردەوە وەفاتی نەکرد تاکو زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە دەکرد، وە خۆشەویسترین کردەوە بەلایەوە ئەو کردەوە چاکە بوو کە بەندە لەسەری بەردەوام بێ، جا ئەگەر (کردەوەیەکی) کەمیش بووایە، (مەبەستی پێ لە نوێژی سوننەت و شەونوێژ بووە).

## بابەت: نوێژی سوننەت بە دانیشتنەوە

**١٢٢٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يَقْرَأُ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ إِنْسَانٌ أَرْبَعِينَ آيَةً»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (لە نوێژدا) قورئانی دەخوێند بە دانیشتنەوە، جا کاتێ ویستبای ڕکووع بەرێ هەڵدەستا بە ئەندازەی ئەوەی کە ئینسان چل ئایەت بخوێنێ (واتە: کاتێک بیویستبا ڕکووع بەرێ هەڵدەستا نزیکەی چل ئایەتی بە پێوە دەخوێند، ئنجا دەچوو بۆ ڕکووع و سوجدە).

**١٢٢٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي شَيْءٍ مِنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ إِلَّا قَائِمًا، حَتَّى دَخَلَ فِي السِّنِّ، فَجَعَلَ يُصَلِّي جَالِسًا، حَتَّى إِذَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ قِرَاءَتِهِ أَرْبَعُونَ آيَةً، أَوْ ثَلَاثُونَ آيَةً، قَامَ فَقَرَأَهَا وَسَجَدَ»[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: نەمدیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەونوێژدا بەپێوە نوێژ نەکات، تاکو چووە تەمەنەوە، ئنجا نوێژەکانی بە دانیشتنەوە دەکرد، تاکو چل ئایەتی دەما لە قورئان خوێندنەکەی، یان سی ئایەت، ئەوجار هەڵدەستا بە پێوە دەیخوێند و سوجدەی دەبرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١١٨ و ١١١٩، ومسلم: ٧٣١، وأبو داود: ٩٥٣ و ٩٥٤، والترمذي: ٣٧٤، والنسائي: ١٦٤٨_١٦٥٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١١٨ و ١١١٩، ومسلم: ٧٣١، وأبو داود: ٩٥٣ و ٩٥٤، والترمذي: ٣٧٤، والنسائي: ١٦٤٨_١٦٥٠.

**١٢٢٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ الْعُقَيْلِيِّ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ، فَقَالَتْ: «كَانَ يُصَلِّي لَيْلًا طَوِيلًا قَائِمًا، وَلَيْلًا طَوِيلًا قَاعِدًا، فَإِذَا قَرَأَ قَائِمًا رَكَعَ قَائِمًا، وَإِذَا قَرَأَ قَاعِدًا رَكَعَ قَاعِدًا»[1].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی شەقیقی عوقەیلیی ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﷺ دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: شەوێکی درێژ بە پێوە نوێژی دەکرد، وە شەوێکی درێژ بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد، جا ئەگەر بە پێوە نوێژی کردبا ئەوە بە پێوە ڕکووعی دەبرد، وە ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی کردبایە، بە دانیشتنەوە ڕکووعی دەبرد.**

## بابەت: ئەوەی کە نوێژی بە دانیشتنەوە خێری نیو هێندەی نوێژی بە پێوەیە

**١٢٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِهِ وَهُوَ يُصَلِّي جَالِسًا، فَقَالَ: «صَلَاةُ الْجَالِسِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ صَلَاةِ الْقَائِمِ»[2].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بەلایدا تێپەڕیوەو لەوکاتەدا بەدانیشتنەوە نوێژی کردوە، جا فەرموویەتی: نوێژی کەسێ کە بە دانیشتنەوە بیکات (پاداشتەکەی) بە ئەندازەی نیوەی نوێژی کەسێکە کە بە پێوە دەیکات.**

**١٢٣٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ فَرَأَى أُنَاسًا يُصَلُّونَ قُعُودًا، فَقَالَ: «صَلَاةُ الْقَاعِدِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ صَلَاةِ الْقَائِمِ»[3].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بینی خەڵکانێک بە دانیشتنەوە نوێژ دەکەن، ئنجا فەرمووی: نوێژی کەسی دانیشتوو، ئەندازەی نیوەی نوێژی بەپێوە (پاداشتی) هەیە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٠، وأبو داود: ٩٥٥، والترمذي: ٣٧٥، والنسائي: ١٦٤٦ و ١٦٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٣٥.

(٣) صحيح.

**١٢٣١- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يُصَلِّي قَاعِدًا، قَالَ: «مَنْ صَلَّى قَائِمًا فَهُوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قَاعِدًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ، وَمَنْ صَلَّى نَائِمًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ»**[1].

واتە: عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە کە پرسیاری کردووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پیاوێک کە نوێژ بە دانیشتنەوە بکات، فەرمووی: هەر کەسێک نوێژ بەپێوە بکات باشترە (پاداشتی زیاترە)، وە ئەگەر کەسێک بە دانیشتنەوە نوێژ بکات، ئەوە پاداشتی نیوەی نوێژی بەپێوەی هەیە، وە ئەوەی کە بە ڕاکشاوی (لەسەر تەنیشت) نوێژ بکات، ئەوە پاداشتی نیوەی بە دانیشتنەوەی هەیە.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە لە کاتی نەخۆشییەکەی

**١٢٣٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: لَمَّا مَرِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ - وَقَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: لَمَّا ثَقُلَ - جَاءَ بِلَالٌ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلَاةِ، فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ» قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ - تَعْنِي رَقِيقٌ - وَمَتَى مَا يَقُومُ مَقَامَكَ يَبْكِي فَلَا يَسْتَطِيعُ، فَلَوْ أَمَرْتَ عُمَرَ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، فَإِنَّكُنَّ صَوَاحِبَاتُ يُوسُفَ» قَالَتْ: فَأَرْسَلْنَا إِلَى أَبِي بَكْرٍ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَوَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً، فَخَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، وَرِجْلَاهُ تَخُطَّانِ فِي الْأَرْضِ، فَلَمَّا أَحَسَّ بِهِ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ لِيَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَى إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ مَكَانَكَ، قَالَ: فَجَاءَ حَتَّى أَجْلَسَاهُ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يَأْتَمُّ بِالنَّبِيِّ ﷺ، وَالنَّاسُ يَأْتَمُّونَ بِأَبِي بَكْرٍ**[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: کاتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت بەو نەخۆشییەی کە بە هۆیەوە وەفاتی کرد -ئەبو موعاویە دەڵێ: کاتێ نەخۆشییەکەی قورس بوو-، جا بیلال هات و ئاگاداری کردەوە کە کاتی نوێژە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بە ئەبو بەکر بڵێن: پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، ئێمەش گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە، واتە: دڵ نەرمە، وە هەرکات لە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١١٥ و ١١١٦، وأبو داود: ٩٥١، والترمذي: ٣٧١، والنسائي: ١٦٦٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٩، ومسلم: ٩٤ و ٩٥ و ٤١٨، والترمذي: ٣٦٧٢، والنسائي: ٨٣٣.

شوێنی تۆ بوەستێ دەگرییێت و ناتوانێ (نوێژەکە بکات)، ئەگەر فەرمانت بە عومەر ﷺ بکردایە نوێژی بۆ خەڵکەکە بکردبایە، ئەویش فەرمووی: بە ئەبو بەکر بڵێن: پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، ئێوە وەکو کەسانی دەوری یوسف وان (لەوەی کە سورن لەسەر قسەکەتان و ئەوەی کە دەتانەوێ ئەگەر هەقیش نەبێ)، دەڵێ: ئێمەش ناردمان بۆلای ئەبو بەکر و نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بینی کە نەخۆشییەکەی لەسەر سووک بووە، بۆیە دەرچوو بۆ نوێژەکە و دوو کەس چوونە ژێر باڵیەوە، وە پێیەکانی لەسەر زەوی دەخشان، جا کاتێ ئەبو بەکر ﷺ هەستی پێکرد (وا پێغەمبەر ﷺ دێ) ویستی بکشێتەوە بۆ دواوە، پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە لە شوێنی خۆت بوەستە، ئنجا دەڵێ: هێنایان تاکو لە تەنیشت ئەبو بەکر دایان نیشاند، جا ئەبو بەکر بە نوێژی پێغەمبەر ﷺ نوێژی کردو، خەڵکەکەش بە نوێژی ئەبو بەکر (واتە: ئەبو بەکر ﷺ پەیڕەوی لە پێغەمبەرەوە ﷺ کرد، خەڵکەکەش لە ئەبو بەکر ﷺ).

**١٢٣٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ فِي مَرَضِهِ» فَكَانَ يُصَلِّي بِهِمْ فَوَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خِفَّةً، فَخَرَجَ، وَإِذَا أَبُو بَكْرٍ يَؤُمُّ النَّاسَ فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ اسْتَأْخَرَ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَيْ كَمَا أَنْتَ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِذَاءَ أَبِي بَكْرٍ، إِلَى جَنْبِهِ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلَاةِ أَبِي بَكْرٍ[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشییەکەیدا فەرمانی بە ئەبو بەکر ﷺ کرد، کە پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات، ئەویش پێشنوێژی بۆ دەکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ بینی کە نەخۆشییەکەی لەسەر سووک بووە بۆیە دەرچوو (بۆ نوێژ)، وە لەوکاتەدا ئەبو بەکر پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد، جا کاتێ ئەبو بەکر پێغەمبەری ﷺ بینی ویستی بێتە دواوە (بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێش بکەوێ)، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کرد، کە وەک خۆت بمێنەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێکی ئەبو بەکر لە تەنیشتییەوە دانیشت، ئەبو بەکریش ﷺ بە پێشنوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، خەڵکەکەش بە پێشنوێژی ئەبو بەکر ﷺ نوێژیان دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٧، ومسلم: ٤١٨، والترمذي بإثر: ٣٦٢.

**١٢٣٤-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ، قَالَ: أُغْمِيَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: «أَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ؟» قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «مُرُوا بِلَالًا فَلْيُؤَذِّنْ وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ» ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ، فَأَفَاقَ، فَقَالَ: «أَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ» قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «مُرُوا بِلَالًا فَلْيُؤَذِّنْ وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ» ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ، فَأَفَاقَ، فَقَالَ: «أَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ» قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «مُرُوا بِلَالًا فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ» فَقَالَتْ عَائِشَةُ: إِنَّ أَبِي رَجُلٌ أَسِيفٌ، فَإِذَا قَامَ ذَلِكَ الْمَقَامَ يَبْكِي، لَا يَسْتَطِيعُ، فَلَوْ أَمَرْتَ غَيْرَهُ، ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ، فَأَفَاقَ، فَقَالَ: «مُرُوا بِلَالًا فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، فَإِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ - أَوْ صَوَاحِبَاتُ يُوسُفَ -» قَالَ: فَأُمِرَ بِلَالٌ فَأَذَّنَ، وَأُمِرَ أَبُو بَكْرٍ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَجَدَ خِفَّةً، فَقَالَ: «انْظُرُوا لِي مَنْ أَتَّكِئُ عَلَيْهِ» فَجَاءَتْ بَرِيرَةُ وَرَجُلٌ آخَرُ، فَاتَّكَأَ عَلَيْهِمَا، فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ، ذَهَبَ لِيَنْكِصَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ، أَنِ اثْبُتْ مَكَانَكَ، ثُمَّ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى جَلَسَ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ، حَتَّى قَضَى أَبُو بَكْرٍ صَلَاتَهُ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُبِضَ قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ لَمْ يُحَدِّثْ بِهِ غَيْرُ نَصْرِ بْنِ عَلِيٍّ[1].

واتە: سالیمی کوڕی عوبەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشییەکەیدا بێهۆش بوو، پاشان بە هۆش هاتەوە، جا فەرمووی: ئایا نوێژ بووە؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات، وە بە ئەبو بەکر بڵێن: پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات، پاشان لەهۆش خۆی چووەوە، بە ئاگا هاتەوە ئنجا فەرمووی: ئایا نوێژ بووە؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات، بە ئەبو بەکریش بڵێن: با پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات، پاشان لەهۆش خۆی چووەوە، بە ئاگا هاتەوە، ئنجا فەرمووی: ئایا نوێژ بووە؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات، بە ئەبو بەکریش بڵێن: با پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات، عائیشە ﷺ گوتی: لە ڕاستیدا باوکم پیاوێکی دڵ ناسکە، ئەگەر لەو شوێنە بوەستێ دەگریێ و ناتوانێ (نوێژەکە بکات)، ئەگەر فەرمانت بە کەسێکی تر کردبایە، پاشان لە هۆش خۆی چووەوە، بە ئاگا هاتەوە ئنجا فەرمووی: بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات، بە ئەبو بەکریش بڵێن: با بەرنوێژی بۆ خەڵک بکات، بەڕاستی ئێوە وەکو کەسانی دەوری یوسف وان (سورن لەسەر ئەوەی کە دەتانەوێ ئەگەر هەقیش نەبێ)، دەڵێ: جا فەرمانیان بە بیلال کرد و بانگی گوت، وە بە ئەبو بەکریان گوت و پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) صحيح.

بینی کە لەشی سووک بووە (لە نەخۆشییەکی) فەرمووی: بزانن کێ هەیە (بێتە بن باڵم) خۆم بخەمە سەر شانی؟ ئنجا بەریرەو پیاوێکی تر هاتن ئەویش خۆی خستە سەر شانیان، جا کاتێ ئەبو بەکر پێغەمبەری ﷺ بینی ویستی بێتە دواوە و بکشێتەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە لە شوێنی خۆت بمێنەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هات تاکو لە تەنیشت ئەبو بەکر دانیشت، هەتاکو ئەبو بەکر نوێژەکەی تەواو کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد. ئەبو عەبدوڵڵا گوتوویەتی: ئەم فەرموودەیە غەریبە کەس نەیگێڕاوەتەوە جگە لە نەصری کوڕی عەلی.

١٢٣٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: لَمَّا مَرِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، كَانَ فِي بَيْتِ عَائِشَةَ، فَقَالَ: «ادْعُوا لِي عَلِيًّا» قَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَدْعُو لَكَ أَبَا بَكْرٍ؟ قَالَ: «ادْعُوهُ» قَالَتْ حَفْصَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَدْعُو لَكَ عُمَرَ؟ قَالَ: «ادْعُوهُ» قَالَتْ أُمُّ الْفَضْلِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَدْعُو لَكَ الْعَبَّاسَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَلَمَّا اجْتَمَعُوا رَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَأْسَهُ، فَنَظَرَ فَسَكَتَ، فَقَالَ عُمَرُ: قُومُوا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ جَاءَ بِلَالٌ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلَاةِ، فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ» فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ رَقِيقٌ حَصِرٌ وَمَتَى لَا يَرَاكَ يَبْكِي، وَالنَّاسُ يَبْكُونَ، فَلَوْ أَمَرْتَ عُمَرَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَخَرَجَ أَبُو بَكْرٍ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَوَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي نَفْسِهِ خِفَّةً، فَخَرَجَ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، وَرِجْلَاهُ تَخُطَّانِ فِي الْأَرْضِ، فَلَمَّا رَآهُ النَّاسُ سَبَّحُوا بِأَبِي بَكْرٍ فَذَهَبَ لِيَسْتَأْخِرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ أَيْ مَكَانَكَ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَجَلَسَ عَنْ يَمِينِهِ، وَقَامَ أَبُو بَكْرٍ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يَأْتَمُّ بِالنَّبِيِّ ﷺ، وَالنَّاسُ يَأْتَمُّونَ بِأَبِي بَكْرٍ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْقِرَاءَةِ مِنْ حَيْثُ كَانَ بَلَغَ أَبُو بَكْرٍ - قَالَ: وَكِيعٌ وَكَذَا السُّنَّةُ - قَالَ: فَمَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ ذَلِكَ[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت بەو نەخۆشیەی کە تێیدا وەفاتی کرد، لە ماڵی عائیشە ﵂ بوو، جا فەرمووی: عەلیم بۆ بانگ بکەن، عائیشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی ئەبو بەکرت بۆ بکەین؟ فەرمووی: بانگی بکەن، حەفصە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی عومەرت بۆ بکەین؟ فەرمووی: بانگی بکەن، ئوممو فەزڵ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی عەبباست بۆ بکەین؟ فەرمووی: بەڵێ، جا کاتێک کۆبوونەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سەری هەڵبڕی تەماشایەکی کرد و بێدەنگ بوو، ئنجا عومەر گوتی: هەڵسن لە

---

(١) حسن دون ذكر علي.

لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان بیلال هات ئاگاداری بکاتەوە بە هاتنی کاتی نوێژ، ئەویش فەرمووی: بە ئەبو بەکر بڵێن: پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات، عائیشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە و ناتوانێ پێشنوێژی بکات، وە کاتێ کە جەنابت نابینێ دەگریێ و خەڵکەکەش دەگریێن، ئەگەر فەرمانت بە عومەر کردبایە پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات، ئنجا ئەبو بەکر چوو پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بینی کە نەخۆشییەکەی لەسەر سووک بووە چوو بۆ نوێژ لە نێوان دوو کەسدا بوو خۆی خستبووە سەر شانیان و پێیەکانی لە زەوی دەخشکان، جا کاتێ خەڵکی (پێغەمبەریان ﷺ) بینی «سبحان الله»یان کرد بۆ ئەبو بەکر (تا ئاگاداری بکەن لە هاتنی پێغەمبەر ﷺ)، ئەویش ویستی بێتە دواوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە لە شوێنی خۆت بمێنەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هات و لەلای ڕاستی دانیشت، وە ئەبو بەکر هەڵسابوو، جا ئەبو بەکر پەیڕەوی بە پێغەمبەرەوە ﷺ کردو، خەڵکیش پەیڕەوی بە ئەبو بەکرەوە کرد، ئیبنو عەبباس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شوێنە دەستی بە خوێندنی نوێژ کرد، کە ئەبو بەکر پێی گەیشتبوو، وەکیع دەڵێ: سوننەتیش هەروایە. (ڕاوی) دەڵێ: ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نەخۆشییەدا وەفاتی کرد.

## بابەت: ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای پیاوێک لە ئوممەتەکەی نوێژی کردوە

١٢٣٦- عَنْ حَمْزَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: تَخَلَّفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَوْمِ وَقَدْ صَلَّى بِهِمْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ رَكْعَةً، فَلَمَّا أَحَسَّ بِالنَّبِيِّ ﷺ ذَهَبَ يَتَأَخَّرُ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُتِمَّ الصَّلَاةَ، قَالَ: «وَقَدْ أَحْسَنْتَ، كَذَلِكَ فَافْعَلْ»[1].

واتە: حەمزەی کوڕی موغیرەی کوڕی شوعبە  لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (لەبەر کارێک) لە خەڵکەکە دواکەوت، ئنجا بە خەڵکەکە گەیشتەوە، لەوکاتەدا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ڕکاتێکی نوێژ بۆ

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٤، وأبو داود مطولًا: ١٤٩ و ١٥٢، والنسائي: ٨٢.

کردبوون، جا کاتێ هەستی بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ کرد ویستی بێتە دواوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە نوێژەکە تەواو بکە، فەرمووی: کارێکی باشت کرد، وە هەر بەو شێوەیەش بکە.

## بابەت: ئەوەی کە پێشنوێژ بۆ ئەوەیە کە ئیقتیدای پێوە بکرێ

**١٢٣٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ يَعُودُونَهُ، فَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ جَالِسًا، فَصَلَّوْا بِصَلَاتِهِ قِيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنِ اجْلِسُوا، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا»[١].**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەست ئازارەوە سکاڵای دەکرد (واتە: نەخۆشی هەبوو)، جا هەندێ لە هاوەڵان هاتن سەردانیان کرد، جا پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، خەڵکەکەش بەپێوە نوێژیان لە دوای ئەو کرد، ئنجا ئاماژەی بۆ کردن کە دابنیشن، جا کە تەواوبوو، فەرمووی: بێگومان پێشنوێژ بۆ ئەوە دانراوە پەیڕەوی لێ بکرێ، کاتێ ڕکووعی برد ڕکووع بەرن، وە کاتێ هەڵسایەوە هەڵسنەوە، وە کاتێک نوێژی بە دانیشتنەوە کرد ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن.

**١٢٣٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صُرِعَ عَنْ فَرَسٍ فَجُحِشَ شِقُّهُ الْأَيْمَنُ، فَدَخَلْنَا نَعُودُهُ، وَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَصَلَّى بِنَا قَاعِدًا، وَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ قُعُودًا، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ، قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعِينَ»[٢].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لەسەر وڵاخەکەی بەربوویەوەو شانی لای ڕاستی ڕووشا و ئازاری پێگەیشت، ئێمەش چووینە خزمەتی، کاتی نوێژ هات، ئەویش بە دانیشتنەوە نوێژی بۆمان کرد، وە ئێمەش بە دانیشتنەوە لە دوایەوە نوێژمان کرد، جا کاتێ لە نوێژەکە تەواو بوو، فەرمووی: بێگومان پێشنوێژ بۆ ئەوە دانراوە کە پەیڕەوی لێ بکرێ، بۆیە کاتێ «الله أكبر»ی کرد ئێوەش «الله أكبر» بکەن، وە کاتێ ڕکووعی برد ئێوەش ڕکووع بەرن، وە کاتێ گوتی: «سَمِعَ اللهُ لِمَن

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٨، ومسلم: ٤١٢، وأبو داود: ٦٠٥، والترمذي بإثر: ٣٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٨، ومسلم: ٤١١، وأبو داود: ٦٠١، والترمذي: ٣٦١، والنسائي: ٧٩٤ و ٨٣٢ و ١٠٦١.

حَمِدَه»، ئیوەش بڵێن: «رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْد»، وە كاتێ سوجدەی برد سوجدە بەرن، وە كاتێ بە دانیشتنەوە نوێژی كرد ئێوەش هەمووتان بە دانیشتنەوە نوێژ بكەن.

**١٢٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِنْ صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِنْ صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێشەوا بۆ ئەوە دانراوە پەیڕەوی لێ بكەن، جا كاتێک «الله أكبر»ی كرد ئێوەش «الله أكبر» بكەن، وە كاتێ ڕكووعی برد ئێوەش ڕكووع بەرن، وە كاتێ گوتی: «سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَه»، ئێوەش بڵێن: «رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْد»، وە ئەگەر بە پێوە نوێژی كرد، ئێوەش بە پێوە نوێژ بكەن، وە ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی كرد ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژ بكەن.

**١٢٤٠-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَأَبُو بَكْرٍ يُكَبِّرُ يُسْمِعُ النَّاسَ تَكْبِيرَهُ، فَالْتَفَتَ إِلَيْنَا فَرَآنَا قِيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْنَا فَقَعَدْنَا فَصَلَّيْنَا بِصَلَاتِهِ قُعُودًا، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: «إِنْ كِدْتُمْ أَنْ تَفْعَلُوا فِعْلَ فَارِسَ وَالرُّومِ، يَقُومُونَ عَلَى مُلُوكِهِمْ وَهُمْ قُعُودٌ، فَلَا تَفْعَلُوا، ائْتَمُّوا بِأَئِمَّتِكُمْ، إِنْ صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِنْ صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا»[٢].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئازاری هەبوو، ئێمەش نوێژمان لە دوای كرد كە ئەو دانیشتبوو، وە ئەبو بەكر «الله أكبر»ەكانی دەكرد خەڵكیش تەكبیرەكانی دەبیست، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) ئاوڕی لێمان دایەوە بینیمانی كە بە پێوەین، ئەویش (پێغەمبەر ﷺ) ئاماژەی بۆ كردین، ئنجا دانیشتین، جا نوێژمان بە نوێژی ئەو كرد بە دانیشتنەوە، جا كاتێ سەلامی دایەوە، فەرمووی: ئەوەی خەریک بوو بیكەن ئەوە كردەوەی فارس و ڕۆمەكانە، بەسەر پاشاكانیانەوە دەوەستن كاتێک ئەوان دانیشتوون، ئەو كارە مەكەن، شوێنی پێشەواكانتان بكەون، جا ئەگەر بەپێوە نوێژیان كرد بە پێوە نوێژ بكەن، وە ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژیان كرد ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژ بكەن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٢٢ و ٧٣٤، ومسلم: ٤١٤، وأبو داود: ٦٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤١٣، وأبو داود: ٦٠٢ و ٦٠٦، والنسائي: ١٢٠٠.

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی قنوت هاتووە لە نوێژی بەیانیدا

**١٢٤١-** عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ سَعْدِ بْنِ طَارِقٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي: يَا أَبَتِ إِنَّكَ قَدْ صَلَّيْتَ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَعَلِيٍّ هَاهُنَا بِالْكُوفَةِ، نَحْوًا مِنْ خَمْسِ سِنِينَ، «فَكَانُوا يَقْنُتُونَ فِي الْفَجْرِ؟» فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ مُحْدَثٌ[١].

**واتە:** ئەبو مالیکی ئەشجەعی سەعدی کوڕی تاریقی ﷺ دەڵێ: بە باوکم گوت: ئەی باوکە لەڕاستیدا تۆ نزیکەی پێنج ساڵ لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی ئا لێرە لە کوفە نوێژت کردوە، ئایا ئەوان لە نوێژی بەیانیدا قنوتیان دەخوێند؟ ئەویش گوتی: ڕۆڵەکەم ئەوە داهێنراوە.

**١٢٤٢-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، قَالَتْ «نُهِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْقُنُوتِ فِي الْفَجْرِ»[٢].

**واتە:** ئوممو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکراوە کە لە نوێژی بەیانیدا قنوت بخوێنێ.

**١٢٤٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يَقْنُتُ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ يَدْعُو عَلَى حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ شَهْرًا ثُمَّ تَرَكَ»[٣].

**واتە:** ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی مانگێک لە نوێژی بەیانیدا قنوتی دەخوێند، دوعای لە هۆزێک لە هۆزەکانی عەرەب دەکرد، دواتر وازی هێنا.

**١٢٤٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: لَمَّا رَفَعَ رَسُولُ ﷺ رَأْسَهُ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ بِمَكَّةَ اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ وَاجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٤٠٢ و ٤٠٣، والنسائي: ١٠٨٠.

(٢) موضوع.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٨٩، ومسلم: ٦٧٧، والنسائي: ١٠٧٧.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٠٠، ومسلم: ٦٧٥، وأبو داود: ١٤٤٢، والنسائي: ١٠٧٣ و ١٠٧٤.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانی سەری بەرز دەکردەوە (لە ڕکووع) دەیفەرموو: خوایە وەلیدی کوڕی وەلید و سەلەمەی کوڕی هیشام و عەیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە و لاواز و بێدەسەڵاتەکانی مەککە ڕزگار بکەی، خوایە هۆزی موزەڕ تەنگیان پێهەڵچنی و توشی قات و قڕیان بکەی وەک حەوت ساڵەکەی یوسف.

## بابەت: ئەوەی کە دەربارەی کوشتنی مار و دووپشکە هاتووە لەناو نوێژدا

**١٢٤٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «أَمَرَ بِقَتْلِ الْأَسْوَدَيْنِ فِي الصَّلَاةِ: الْعَقْرَبِ وَالْحَيَّةِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی دوو شتە ڕەشەکە لە ناو نوێژدا: دووپشکە و مار.

**١٢٤٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: لَدَغَتِ النَّبِيَّ ﷺ عَقْرَبٌ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ فَقَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ الْعَقْرَبَ، مَا تَدَعُ الْمُصَلِّيَ وَغَيْرَ الْمُصَلِّي، اقْتُلُوهَا فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: دووپشکێک پێغەمبەری ﷺ گەست لە کاتێکدا کە لە نوێژ دابوو، ئەویش فەرمووی: نەفرەتی خوا لە دووپشک بێ، وازناهێنێ لە نوێژ دابی، یان لە نوێژ دانەبی، بیکوژن چ لە دەرەوەی نوێژدا بن، چ لەناو نوێژدا بن.

**١٢٤٧-** عَنِ ابْنِ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «قَتَلَ عَقْرَبًا وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ»[3].

واتە: ئیبنو ئەبو ڕافیع ﷺ لە باوکییەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە ناو نوێژدا بوو، دووپشکێکی کوشت.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٩٢١، والترمذي: ٣٩٠، والنسائي: ١٢٠٢ و ١٢٠٣.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.

## بابەت: قەدەغەكردنی نوێژ كردن لەدوای نوێژی بەیانی و عەصر

**١٢٤٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «نَهَى عَنْ صَلَاتَيْنِ: عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردوە لە دوو كاتدا نوێژ بكرێ، لە دوای نوێژی بەیانی تاكو خۆرهەڵدێ، لە دوای نوێژی عەصر تاكو خۆرئاوا دەبێ.

**١٢٤٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا صَلَاةَ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَلَا صَلَاةَ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ»(٢).

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ نوێژێک نیە لە دوای نوێژی عەصر تاكو خۆرئاوا دەبێ، وە لە دوای نوێژی بەیانی تاكو خۆرهەڵدێ.

**١٢٥٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: شَهِدَ عِنْدِي رِجَالٌ مَرْضِيُّونَ فِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَأَرْضَاهُمْ عِنْدِي عُمَرُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا صَلَاةَ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلَا صَلَاةَ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ»(٣).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: چەند پیاوێک لای من بوون، ئەو فەرموودەیان بۆ ڕوونكردمەوە كە جێی ڕەزامەندی بوون و عومەریان لە ناودا بوو، وە جێ متمانەترینیان لای من عومەر بوو، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ نوێژێک نیە لە دوای نوێژی بەیانی تاكو خۆرهەڵدێ، وە هیچ نوێژێک نیە دوای نوێژی عەصر تاكو خۆرئاوا دەبێ.

**تێبینی:** نوێژی سوننەتی ڕەهای مەبەستە، ئەگەرنا ئەو نوێژە سوننەتانەی كە ناوو نیشانیان هەیە وەكو: سوننەتی دەستنوێژو سوننەتی هاتنە ناو مزگەوت و ... هتد، دروستن لە دوای ئەو دوو نوێژەوەوە ئەنجام بدرێن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٨، ومسلم: ٨٢٥، والنسائي: ٥٦١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٦، ومسلم: ٨٢٧، والنسائي: ٥٦٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨١، ومسلم: ٨٢٦، وأبو داود: ١٢٧٦، والترمذي: ١٨٣، والنسائي: ٥٦٢ و ٥٦٩.





## بابەت: ئەو کاتانەی کە نوێژکردن تێیاندا ناپەسەندە

**١٢٥١-** عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: هَلْ مِنْ سَاعَةٍ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ أُخْرَى؟ قَالَ: «نَعَمْ، جَوْفُ اللَّيْلِ الْأَوْسَطُ، فَصَلِّ مَا بَدَا لَكَ حَتَّى يَطْلُعَ الصُّبْحُ، ثُمَّ انْتَهِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَمَا دَامَتْ كَأَنَّهَا حَجَفَةٌ حَتَّى تُبَشْبِشَ، ثُمَّ صَلِّ مَا بَدَا لَكَ حَتَّى يَقُومَ الْعَمُودُ عَلَى ظِلِّهِ، ثُمَّ انْتَهِ حَتَّى تَزِيغَ الشَّمْسُ فَإِنَّ جَهَنَّمَ تُسْجَرُ نِصْفَ النَّهَارِ، ثُمَّ صَلِّ مَا بَدَا لَكَ حَتَّى تُصَلِّيَ الْعَصْرَ، ثُمَّ انْتَهِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ وَتَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ»[1].

واتە: عەمری کوڕی عەبەسە ﷺ دەڵێ: هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتم: ئایا هیچ کاتێک هەیە لای خوا خۆشەویستتر بێ لە کاتەکانی تر؟ فەرمووی: بەڵێ، ناوەڕاستی شەو، نوێژی تێدا بکە، چەندەی پێراگەیشتی تاکو بەیانی هەڵدێ، پاشان وازبێنە تاکو خۆرهەڵدێ مادام تینی گەرمی نیە و پرشنگ و نورەکەی بڵاونەبۆتەوە تاکو بە تەواوی دەکرێتەوە و بڵاودەبێتەوە (گەرم دادێ)، پاشان نوێژ بکە چەندی پێراگەیشتی تاکو دار سێبەری کەم دەبێ و نامێنێ (واتە: پێش ئەوەی خۆر لابدا لە نیوەڕۆدا) تاکوخۆر لادەدات، لەڕاستیدا دۆزەخ لە نیوەڕۆژدا کڵپە دەگرێ، پاشان نوێژ بکە هەر چەندی پێراگەیشتی تاکو نوێژی عەصر دەکەی، پاشان وازبێنە تاکو خۆرئاوا دەبێ، چونکە بەڕاستی خۆر لە نێوان دوو شاخەی شەیتان ئاوادەبێ و لەنێوان دوو شاخەی شەیتان هەڵدێ.

**١٢٥٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَأَلَ صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطَّلِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ أَمْرٍ أَنْتَ بِهِ عَالِمٌ وَأَنَا بِهِ جَاهِلٌ، قَالَ: «وَمَا هُوَ؟» قَالَ: هَلْ مِنْ سَاعَاتِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ سَاعَةٌ تُكْرَهُ فِيهَا الصَّلَاةُ؟ قَالَ: «نَعَمْ إِذَا صَلَّيْتَ الصُّبْحَ، فَدَعِ الصَّلَاةَ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بِقَرْنَيِ الشَّيْطَانِ، ثُمَّ صَلِّ فَالصَّلَاةُ مَحْضُورَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ حَتَّى تَسْتَوِيَ الشَّمْسُ عَلَى رَأْسِكَ كَالرُّمْحِ، فَإِذَا كَانَتْ عَلَى رَأْسِكَ كَالرُّمْحِ فَدَعِ الصَّلَاةَ، فَإِنَّ تِلْكَ السَّاعَةَ تُسْجَرُ فِيهَا جَهَنَّمُ وَتُفْتَحُ فِيهَا أَبْوَابُهَا، حَتَّى تَزِيغَ الشَّمْسُ عَنْ حَاجِبِكَ الْأَيْمَنِ، فَإِذَا زَالَتْ فَالصَّلَاةُ مَحْضُورَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ حَتَّى تُصَلِّيَ الْعَصْرَ، ثُمَّ دَعِ الصَّلَاةَ حَتَّى تَغِيبَ الشَّمْسُ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٣٢ مطولًا، وأبو داود: ١٢٧٧، والترمذي: ٣٥٧٩، والنسائي: ٥٧٢.

(٢) صحيح. تخريجه انفرد به ابن ماجه. وانظر مسلم: ٨٢٥.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: صەفوانی کوڕی موعەتتەل پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من پرسیار دەکەم دەربارەی کارێک، تۆ دەیزانی و من نایزانم، فەرمووی: پرسیارەکە چییە؟ گوتی: ئایا هیچ کاتێک هەیە لە شەو و ڕۆژدا کە نوێژ کردن تێیدا ناپەسند بێ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر نوێژی بەیانیت کرد واز بێنە لە نوێژ کردن تاکو خۆرهەڵدێ، لە ڕاستییدا خۆر لە نێوان دوو شاخی شەیتان هەڵدێ، پاشان نوێژ بکە فریشتەکان ئامادە دەبن و لای خوا وەرگیراوە، هەتاکو خۆر لەسەر ئاستی سەرت وەک ڕم ڕاست دەبێ، جا کاتێک وەک ڕم لە سەر سەرت ڕاست بوو واز لە نوێژ بێنە ئەو کاتە کاتێکە کە دۆزەخ تێیدا کڵپە دەگرێ، وە دەرگاکانی دەکرێنەوە، تاکو خۆر لەلای ڕاست شۆڕ دەبێتەوە، جا کاتێک خۆر لایدا، فریشتەکان ئامادە دەبن بۆ نوێژەکە و گیرایە (لەلایەن خواوە) تاکو نوێژی عەصر دەکەی، پاشان واز لە نوێژکردن بێنە تاکو خۆر ئاوادەبێ.

**١٢٥٣-** عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ الصُّنَابِحِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ - أَوْ قَالَ: يَطْلُعُ مَعَهَا قَرْنَا الشَّيْطَانِ - فَإِذَا ارْتَفَعَتْ فَارَقَهَا، فَإِذَا كَانَتْ فِي وَسَطِ السَّمَاءِ قَارَنَهَا، فَإِذَا دَلَكَتْ - أَوْ قَالَ: زَالَتْ - فَارَقَهَا، فَإِذَا دَنَتْ لِلْغُرُوبِ قَارَنَهَا، فَإِذَا غَرَبَتْ فَارَقَهَا، فَلَا تُصَلُّوا هَذِهِ السَّاعَاتِ الثَّلَاثَ»[1].

واتە: ئەبو عەبدوڵڵای صونابیحی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆر لە نێوان دوو شاخەی شەیتان هەڵدێ، یان فەرمووی: دوو شاخەی شەیتان لەگەڵیدا هەڵدێ، جا کاتێ خۆر بەرز بوویەوە لێی جیادەبێتەوە، کاتێک کە لە ناوەڕاستی ئاسمانە بەرانبەرە لەگەڵ شاخەی شەیتان، جا کاتێک لایدا (لە ناوەڕاستی ئاسمان) لێی جیادەبێتەوە، ئنجا کە نزیکی ئاوابوون بوو لەگەڵی دەکەوێتەوە، جا کە ئاوابوو لێی جیادەبێتەوە، کەواتە لەو سێ کاتەدا نوێژ مەکەن.

---

(١) صحيح بشواهده. أخرجه النسائي: ٥٥٩.

## بابەت: ئەوەی کە لە مەککەدا نوێژ کردن لە هەموو کاتەکاندا ڕێگەی پێدراوە

**١٢٥٤-** عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لَا تَمْنَعُوا أَحَدًا طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ وَصَلَّى أَيَّةَ سَاعَةٍ شَاءَ مِنَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ»(١).

واتە: جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی نەوەی عەبدو مەناف، هیچ کەس قەدەغە مەکەن کە تەواف کردنی بە دەوری کەعبەو، نوێژی لێ کردنی، هەر کاتێک پێی خۆش بوو لە شەو و ڕۆژدا.

## بابەت: ئەوەی کە کاتێک نوێژ لە کاتی خۆیدا دوادەخرێت

**١٢٥٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعَلَّكُمْ سَتُدْرِكُونَ أَقْوَامًا يُصَلُّونَ الصَّلَاةَ لِغَيْرِ وَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتُمُوهُمْ فَصَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ لِلْوَقْتِ الَّذِي تَعْرِفُونَ، ثُمَّ صَلُّوا مَعَهُمْ وَاجْعَلُوهَا سُبْحَةً»(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەوانەیە ئێوە بگەن بە خەڵکانێک نوێژ لە کاتی خۆیدا ناکەن، ئەگەر ئەوانەتان بینی، نوێژەکانتان لە کاتی خۆیدا لە ماڵەکانتاندا بکەن، کە زانیتان (کاتیەتی)، پاشان لەگەڵ ئەوانیشدا نوێژ بکەن، بیکەن بە نوێژی سوننەت.

**١٢٥٦-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتَ الْإِمَامَ يُصَلِّي بِهِمْ فَصَلِّ مَعَهُمْ، وَقَدْ أَحْرَزْتَ صَلَاتَكَ، وَإِلَّا فَهِيَ نَافِلَةٌ لَكَ»(٣).

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە کاتی خۆیدا نوێژ بکە، جا ئەگەر بینیت ئیمام لە کاتی خۆیدا نوێژ دەکات ئەوە نوێژیان لەگەڵ بکە و نوێژەکەت لە کاتی خۆیدا ئەنجامداوە، ئەگەر وانەبوو ئەوە ئەو نوێژەت بۆ دەبێتە نوێژی سوننەت.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨٩٤، والترمذي: ٨٦٨، والنسائي: ٥٨٥ و ٢٩٢٤.

(٢) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٢ مطولًا، والنسائي: ٧٧٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٤٨، وأبو داود: ٤٣١، والترمذي: ١٧٦، والنسائي: ٧٧٨ و ٨٥٩.

**١٢٥٧**- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَيَكُونُ أُمَرَاءُ تَشْغَلُهُمْ أَشْيَاءُ، يُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا فَاجْعَلُوا صَلَاتَكُمْ مَعَهُمْ تَطَوُّعًا»[١].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێک دێت کاربەدەست و پێشەواکان بە کار وبارەوە سەرقاڵ دەبن، نوێژ لە کاتی خۆیدا دوادەخەن، ئنجا ئێوە نوێژەکانتان لەگەڵ ئەوان بکەنە سوننەت (واتە: نوێژەکە لە کاتی خۆیدا بە تەنیا بکەن و، لەگەڵ ئەوان دووبارەی بکەنەوە).

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نوێژی ترس هاتووە

**١٢٥٨**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ أَنْ يَكُونَ الْإِمَامُ يُصَلِّي بِطَائِفَةٍ مَعَهُ، فَيَسْجُدُونَ سَجْدَةً وَاحِدَةً، وَتَكُونُ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْعَدُوِّ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ الَّذِينَ سَجَدُوا السَّجْدَةَ مَعَ أَمِيرِهِمْ، ثُمَّ يَكُونُونَ مَكَانَ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا، وَيَتَقَدَّمُ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا فَيُصَلُّوا مَعَ أَمِيرِهِمْ سَجْدَةً وَاحِدَةً، ثُمَّ يَنْصَرِفُ أَمِيرُهُمْ وَقَدْ صَلَّى صَلَاتَهُ، وَيُصَلِّي كُلُّ وَاحِدٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ بِصَلَاتِهِ سَجْدَةً لِنَفْسِهِ، فَإِنْ كَانَ خَوْفٌ أَشَدَّ مِنْ ذَلِكَ، فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا» قَالَ: يَعْنِي بِالسَّجْدَةِ الرَّكْعَةَ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی نوێژی کاتی ترس فەرموویەتی: دەبێ ئیمام ئەو کۆمەڵەی کە لەگەڵیدایە نوێژیان بۆ بکات، ئەوانیش یەک ڕکات لەگەڵ ئیمامدا دەکەن، لەوکاتەدا کۆمەڵێکی تر لە نێوان ئەوان و دوژمندا دەبن (پارێزگاریان لێدەکەن)، پاشان ئەوانەی کە یەک ڕکاتیان لەگەڵ فەرماندەکەیان کردوە جێی نوێژەکە جێدێڵن و دەچنە شوێنی ئەوانەی کە نوێژیان نەکردوە، وە ئەوانەی نوێژیان نەکردوە دێنە پێشەوە لەگەڵ فەرماندەکەیان یەک ڕکات دەکەن، پاشان فەرماندەکەیان، سەلام دەداتەوەو، نوێژەکەی تەواو دەکات (واتە: هەر کۆمەڵەیەک لەو دوو کۆمەڵەیە یەک ڕکات بە نوێژی ئیمامەکە دەکات)، ئەوەیتر بۆ خۆیان تەواوی دەکەن، جا ئەگەر ترسەکە زۆر توندتر بوو لەو حاڵەتەدا ئەوە بە ڕۆیشتن و بە سواری (نوێژ دەکەن). (ڕاوی) گوتی: مەبەست لە سوجدە لێرەدا ڕکاتە.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٣٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٤٢ و ٤٥٣٥، ومسلم: ٨٣٩، وأبو داود: ٥٦٥، والنسائي: ١٥٣٦ و ١٥٥٣.



**١٢٥٩-** عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ قَالَ: «يَقُومُ الْإِمَامُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، وَتَقُومُ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَهُ، وَطَائِفَةٌ مِنْ قِبَلِ الْعَدُوِّ، وَوُجُوهُهُمْ إِلَى الصَّفِّ، فَيَرْكَعُ بِهِمْ رَكْعَةً، وَيَرْكَعُونَ لِأَنْفُسِهِمْ وَيَسْجُدُونَ لِأَنْفُسِهِمْ سَجْدَتَيْنِ فِي مَكَانِهِمْ، ثُمَّ يَذْهَبُونَ إِلَى مُقَامِ أُولَئِكَ، وَيَجِيءُ أُولَئِكَ، فَيَرْكَعُ بِهِمْ رَكْعَةً، وَيَسْجُدُ بِهِمْ سَجْدَتَيْنِ فَهِيَ لَهُ ثِنْتَانِ وَلَهُمْ وَاحِدَةٌ، ثُمَّ يَرْكَعُونَ رَكْعَةً وَيَسْجُدُونَ سَجْدَتَيْنِ»[١].

**واتە:** سەهلی كوڕی ئەبو حەسمە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەربارەی نوێژی ترس گوتوویەتی: ئیمام بەرەو قیبلە ڕادەوەستێ، وە كۆمەڵێک لەگەڵیدا ڕادەوەستن، كۆمەڵێكیش بەرەو دوژمن دەوەستن و چاویان لەسەر ڕیزەكە دەبێ، ئنجا ئیمام ڕكاتێک (بە كۆمەڵی یەكەم) دەكات، ئنجا ئەوان بۆ خۆیان ڕكاتێكی تر دەكەن و دوو سوجدە دەبەن لە شوێنی خۆیان، پاشان دەچنە شوێنی ئەوانەیتر، ئەوانیش دێن، ئنجا یەک ڕكاتیش بە ئەوان دەكات و دوو سوجدەیان لەگەڵدا دەبات، ئەوجار نوێژەكە بۆ ئیمام دەبێتە دوو ڕكات، بۆ ئەو كۆمەڵەش دەبێتە ڕكاتێک، ئنجا (ئەو كۆمەڵەیە) بۆ خۆیان ڕكاتێک دەكەن و دوو سوجدە دەبەن.

**١٢٦٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «صَلَّى بِأَصْحَابِهِ صَلَاةَ الْخَوْفِ، فَرَكَعَ بِهِمْ جَمِيعًا، ثُمَّ سَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَالصَّفُّ الَّذِينَ يَلُونَهُ، وَالْآخَرُونَ قِيَامٌ، حَتَّى إِذَا نَهَضَ سَجَدَ أُولَئِكَ بِأَنْفُسِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ تَأَخَّرَ الصَّفُّ الْمُقَدَّمُ، حَتَّى قَامُوا مُقَامَ أُولَئِكَ، وَتَخَلَّلَ أُولَئِكَ حَتَّى قَامُوا مُقَامَ الصَّفِّ الْمُقَدَّمِ، فَرَكَعَ بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ جَمِيعًا، ثُمَّ سَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالصَّفُّ الَّذِي يَلُونَهُ، فَلَمَّا رَفَعُوا رُءُوسَهُمْ سَجَدَ أُولَئِكَ سَجْدَتَيْنِ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَكَعَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَسَجَدَ طَائِفَةٌ بِأَنْفُسِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، وَكَانَ الْعَدُوُّ مِمَّا يَلِي الْقِبْلَةَ»[٢].

**واتە:** جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی ترسی بە هاوەڵان كرد، جا ڕكووعی بە هەموویان برد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سوجدەی برد لەگەڵ ئەو ڕیزەی لە دواوەی بوون، ئەوانیتر بە پێوە بوون، تاكو هەڵسایەوە، ئنجا ئەوانیش بۆ خۆیان دوو سوجدەیان برد (ڕكاتێک)، پاشان ڕیزی پێشەوە چوونە دواوە بۆ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤١٣١، ومسلم: ٨٤١، وأبو داود: ١٢٣٩، والترمذي: ٥٦٥، والنسائي: ١٥٣٦ و ١٥٥٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٤٠، والنسائي: ١٥٤٧.

شوێنی ئەوانیتر، ئەوانیش هاتنە پێش تاکو شوێنی ڕیزی یەکەم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ڕکووعی بە هەموویان برد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سوجدەی برد لەگەڵ ئەو ڕیزەی کە لە دواوەی بوون، جا کاتێ ئەوان سەریان لە سوجدە بەرز کردەوە ئەوانیتر دوو سوجدەیان برد (ڕکاتێک)، بەم شێوەیە هەموویان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕکووعیان برد، وە هەر کۆمەڵەیەک بۆ خۆیان دوو سوجدەیان برد (واتە: هەموویان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕکووعیان بردووە، بەڵام هەر کۆمەڵەو بۆ خۆی بە تەنیا دوو سوجدەی بردووە)، وە دوژمن لەلای قیبلە بوو.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نوێژی ڕۆژگیران و مانگ گیران هاتووە

**١٢٦١-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَقُومُوا فَصَلُّوا»[١].

واتە: ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆر و مانگ لەبەر مردنی هیچ یەکێک لەو خەڵکە ناگیرێن، جا کاتێک بینیتان (خۆرگیراون و مانگ گیران ڕوویدا) ئەوە هەڵسن و نوێژ بکەن.

**١٢٦٢-** عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَخَرَجَ فَزِعًا يَجُرُّ ثَوْبَهُ، حَتَّى أَتَى الْمَسْجِدَ، فَلَمْ يَزَلْ يُصَلِّي حَتَّى انْجَلَتْ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ أُنَاسًا يَزْعُمُونَ أَنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ إِلَّا لِمَوْتِ عَظِيمٍ مِنَ الْعُظَمَاءِ، وَلَيْسَ كَذَلِكَ، إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا تَجَلَّى اللَّهُ لِشَيْءٍ مِنْ خَلْقِهِ خَشَعَ لَهُ»[٢].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆرگیرا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەلەپەل دەرچوو پۆشاکەکانی لە دوا خۆی ڕادەکێشا، تاکو هاتە مزگەوت، ئنجا بەردەوام بوو لە نوێژکردن تاکو بەری خۆر بووەوە، پاشان فەرمووی: خەڵکانێک پێیان وایە کە خۆر و مانگ ناگیرێن تەنها لەبەر مردنی گەورەیەک لە گەورەکان نەبێ، وە بەو شێوەیەش نیە، لە ڕاستیدا خۆر و مانگ نە

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٤١، ومسلم: ٩١١، والنسائي: ١٤٦٢.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١١٩٣ مختصراً، والنسائي: ١٤٨٥ و ١٤٩٠.

لەبەر مردنی کەس و، نە لەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، جا هەر کاتێک خوای گەورە خۆی ئاشکرا کرد بۆ هەر شتێک لە دروستکراوەکانی، ئەوە ئەو دروستکراوە ملکەچ دەبێ و دەچێتە خشووعەوە.

**١٢٦٣-** عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَقَامَ فَكَبَّرَ فَصَفَّ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَقَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، ثُمَّ كَبَّرَ، فَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ» ثُمَّ قَامَ فَقَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، هِيَ أَدْنَى مِنَ الْقِرَاءَةِ الْأُولَى، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا هُوَ أَدْنَى مِنَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ» ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الْأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، فَاسْتَكْمَلَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، وَانْجَلَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَنْصَرِفَ، ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ النَّاسَ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلَاةِ»(١).

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆرگیرا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ مزگەوت، ڕاوەستا و «الله اکبر»ـی کرد و خەڵکیش لە دوایەوە ڕیز بوون، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە قوڕئان خوێندن خوێندنێکی درێژ، پاشان «الله اکبر»ـی کرد، ڕکووعێکی درێژی برد، ئنجا سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: «سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد»، پاشان بە پێوە وەستا و قوڕئانێکی درێژی خوێند، کە کەمتر بوو لە خوێندنی یەکەم، پاشان «الله اکبر»ـی کرد و ڕکووعێکی درێژی برد، کە کەمتر بوو لە ڕکووعی یەکەم، ئنجا فەرمووی: «سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد»، پاشان لە ڕکاتەکەی تریش بە هەمان شێوەی کرد، چوار ڕکووع و چوار سوجدەی تەواو کرد، وە بەری خۆر کرایەوە پێش ئەوەی لە نوێژەکە ببێتەوە، پاشان هەڵسا و وتاری بۆ خەڵکەکەدا، جا سوپاس و ستایشی خوای کرد، بە جۆرێک کە شایستە بە خوا بێ، پاشان فەرمووی: لە ڕاستییدا خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی (هەبوون و دەسەڵاتی) خوا، لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن، ئنجا هەر کاتێک خۆرگیران و مانگ گیرانتان بینی، بە پەلە بچۆن بۆ نوێژکردن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٤٤، ومسلم: ٩٠١ و ٩٠٣، وأبو داود: ١١٨٠، والترمذي: ٥٦١، والنسائي: ١٤٧٤_١٤٧٦ و ١٤٨١ و ١٤٩٩ و ١٥٠٠.

**١٢٦٤-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ قَالَ: «صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْكُسُوفِ فَلَا نَسْمَعُ لَهُ صَوْتًا»[1].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی خۆرگیراندا نوێژی پێکردین، وە (لە نوێژەکەدا) هیچ دەنگێکمان لێیەوە نەبیست.

**١٢٦٥-** عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْكُسُوفِ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ: «لَقَدْ دَنَتْ مِنِّي الْجَنَّةُ حَتَّى لَوِ اجْتَرَأْتُ عَلَيْهَا لَجِئْتُكُمْ بِقِطَافٍ مِنْ قِطَافِهَا، وَدَنَتْ مِنِّي النَّارُ حَتَّى قُلْتُ: أَيْ رَبِّ وَأَنَا فِيهِمْ «قَالَ نَافِعٌ حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: «وَرَأَيْتُ امْرَأَةً تَخْدِشُهَا هِرَّةٌ لَهَا، فَقُلْتُ: مَا شَأْنُ هَذِهِ؟ قَالُوا: حَبَسَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ جُوعًا، لَا هِيَ أَطْعَمَتْهَا وَلَا هِيَ أَرْسَلَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خِشَاشِ الْأَرْضِ»[2].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی خۆرگیرانی کرد، بە پێوە وەستا و بە پێوە وەستانەکەی درێژ کردەوە (بە قورئان خوێندن تێیدا)، پاشان ڕکووعی برد و ڕکووعەکەی درێژ کردەوە، دواتر سەری بەرزکردەوەو وەستا، دەستی کردەوە بە قورئان خوێندن، پاشان ڕکووعی بردو، ڕکووعەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە، پاشان سوجدەی بردو سوجدەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە، دواتر سوجدەی برد و سوجدەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە و هەڵسایەوە و وەستانەکەی بەپێوە درێژ کردەوە، دواتر ڕکووعی برد و ڕکووعەکەی درێژ کردەوە، پاشان هەڵسایەوە و وەستانەکەی درێژ کردەوە، پاشان ڕکووعی برد و ڕکووعەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە، دواتر سوجدەی برد و سوجدەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە، دواتر سوجدەی برد و سوجدەکەی درێژ کردەوە، پاشان نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: لە ڕاستیدا بەهەشت هێندەم لێ نزیک بۆوە ئەگەر زاتم بکردایە هێشویەک میوەم لە هێشوەکانی بۆتان دێنا، دۆزەخم هێندە لێ نزیک بوویەوە هەتا گوتم: ئەی

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١١٨٤ بطوله، والترمذي: ٥٦٢، والنسائي: ١٤٨٤ و ١٤٩٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٤٥ و ٢٣٦٤، ومسلم: ٩٠٦، والنسائي: ١٤٩٨ اقتصر على ذكر الصلاة.




پەروەردگارە منیش لەناویاندام؟! نافیع دەڵێ: وابزانم فەرمووی: وە ژنێکم بینی کە پشیلەیەک بە چرنووک پێستی دادەماڵی، گوتم: ئەوە بۆ وایە؟ گوتیان: ئەو (لە دونیا) پشیلەکەی حەپس کردوە، تاکو لە برسان مردووە، نە خواردنی پێداوە نە ئازادی کردوە، بچێت بۆ خۆی لە جڕ و جانەوەرو خاشاکی زەوی بخوات.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نوێژی داواکردنی باران بارین هاتووە

**١٢٦٦-** عَنْ هِشَامِ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كِنَانَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَرْسَلَنِي أَمِيرٌ مِنَ الْأُمَرَاءِ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَسْأَلُهُ عَنِ الصَّلَاةِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَا مَنَعَهُ أَنْ يَسْأَلَنِي؟ قَالَ: «خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَوَاضِعًا مُتَبَذِّلًا مُتَخَشِّعًا مُتَرَسِّلًا مُتَضَرِّعًا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا يُصَلِّي فِي الْعِيدِ، وَلَمْ يَخْطُبْ خُطْبَتَكُمْ هَذِهِ»[١].

واتە: هیشامی کوڕی ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی کینانە ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: یەکێک لە ئەمیرەکان منی نارد بۆ لای ئیبنو عەبباس ﷺ بۆ ئەوەی دەربارەی نوێژی داواکردنی باران بارین پرسیاری لێبکەم، ئیبنو عەبباسیش ﷺ گوتی: چی ڕێگر بووە کە پرسیار لە خۆم بکات؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆ بەکەم زانین بەرابەر خواو، بە پۆشاکی ئاساییەوە بە خشوع و هێمنی و خۆ بەکەم گرییەوە دەرچوو (بۆ نوێژ)، ئنجا دوو ڕکات نوێژی کرد وەکو دوو ڕکاتی جەژن، وە وتاری نەدا بەو شێوەیەی ئێوە وتار دەدەن (واتە: وتارەکەی دوعا و پاڕانەوە بووە).

**١٢٦٧-** عَنْ عَبَّادَ بْنَ تَمِيمٍ، يُحَدِّثُ أَبِي، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، أَنَّهُ شَهِدَ النَّبِيَّ ﷺ، «خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى يَسْتَسْقِي، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ وَقَلَبَ رِدَاءَهُ وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ»[٢].

واتە: عەببادی کوڕی تەمیم لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، لە مامییەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، کە ئاگادار بووەو بینیویەتی پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ نوێژگە، بۆ ئەوەی داوای باران بارین بکات (لە خوا)، ئنجا ڕووی کردە قیبلەو پۆشاکەکەی هەڵگێڕایەوەو دوو ڕکات نوێژی کرد.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١١٦٥، والترمذي: ٥٥٨، والنسائي: ١٥٠٦ و ١٥٠٨ و ١٥٢١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٠٥ و ١٠٢٥، ومسلم: ٨٩٤، وأبو داود: ١١٦١ و ١١٦٣ و ١١٦٤ و ١١٦٦ و ١١٦٧، والترمذي: ٥٥٦، والنسائي: ١٥٠٥ و ١٥٠٧ و ١٥٠٩_١٥١٢ و ١٥١٩ و ١٥٢٠ و ١٥٢٢.




**١٢٦٧م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّبَّاحِ قَالَ: أَنْبَأَنَا سُفْيَانُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ[1] قَالَ سُفْيَانُ: عَنِ الْمَسْعُودِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا بَكْرِ بْنَ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو أَجَعَلَ أَعْلَاهُ أَسْفَلَهُ أَوِ الْيَمِينَ عَلَى الشِّمَالِ، قَالَ: لَا بَلِ الْيَمِينَ عَلَى الشِّمَالِ.

**واتە:** لە سەنەدێکی دیکەدا سوفیان لە مەسعوودیيەوە دەیهێنێ، دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمرِ کرد ئایا (پۆشاکەکانی) لای سەرەوەی خستە خوارەوە، یان لای ڕاستی بۆ سەر لای چەپی (واتە: هەڵگێڕانەوەی پۆشاکەکانی چۆن بووە)؟ گوتی: نەخێر، بەڵکو لای ڕاستی هەڵدایە سەر لای چەپ.

**١٢٦٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا يَسْتَسْقِي، فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ بِلَا أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ، ثُمَّ خَطَبَنَا وَدَعَا اللَّهَ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ نَحْوَ الْقِبْلَةِ رَافِعًا يَدَيْهِ، ثُمَّ قَلَبَ رِدَاءَهُ فَجَعَلَ الْأَيْمَنَ عَلَى الْأَيْسَرِ وَالْأَيْسَرَ عَلَى الْأَيْمَنِ»[2].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو داوای باران بارینی دەکرد، ئنجا دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین بەبێ بانگ دان و قامەت کردن، پاشان وتاری بۆ خوێندینەوە و لەبەر خوا پاڕایەوە، وە ڕووی کردە لای قیبلە لەو حاڵەدا دەستی بەرزکردنەوە، پاشان پۆشاکەکە هەڵگێڕایەوە و لای ڕاستی خستە سەر لای چەپ و، لای چەپی خستە سەر لای ڕاست.

## بابەت: دوعای نوێژی داواکردنی باران بارین

**١٢٦٩-** عَنْ شُرَحْبِيلَ بْنِ السِّمْطِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ لِكَعْبٍ: يَا كَعْبُ بْنَ مُرَّةَ حَدِّثْنَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَاحْذَرْ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اسْتَسْقِ اللَّهَ فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اسْقِنَا غَيْثًا مَرِيئًا مَرِيعًا طَبَقًا عَاجِلًا غَيْرَ رَائِثٍ، نَافِعًا غَيْرَ ضَارٍّ» قَالَ: فَمَا جَمَّعُوا حَتَّى أُحْيُوا، قَالَ: فَأَتَوْهُ فَشَكَوْا إِلَيْهِ الْمَطَرَ، فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا» قَالَ: فَجَعَلَ السَّحَابُ يَنْقَطِعُ يَمِينًا وَشِمَالًا[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٠٥ و ١٠٢٥، ومسلم: ٨٩٤، وأبو داود: ١١٦١ و ١١٦٣ و ١١٦٤ و ١١٦٦ و ١١٦٧، والترمذي: ٥٥٦، والنسائي: ١٥٠٥ و ١٥٠٧ و ١٥٠٩_١٥١٢ و ١٥١٩ و ١٥٢٠ و ١٥٢٢.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح لغيره.

واتە: شورەحبیلی کوڕی سیمت ﷺ دەگێڕێتەوە کە بە کەعبی گوتووە: ئەی کەعبی کوڕی موڕڕە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (فەرموودەمان) بۆ بگێڕەوە بە ئاگاییەوە، گوتی: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای باران بارین لە خوا بکە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرزکردەوە، فەرمووی: ئەی خودایە بارانێکمان بۆ ببارێنە کە کۆتاییەکەی خێربێ و زۆربێ و لەسەرخۆ بێ لە زووترین کاتدا و دوانەکەوێ، سوود بەخش بێ و زیان بەخش نەبێ، گوتی: نوێژی جومعەکەیان تەواو نەکردبوو خوا وەڵامی دوعاکەی دانەوە (باران بارین دەستی پێکرد)، گوتی: خەڵکی هاتن و سکاڵایان کرد لە دەستی زۆر باران بارین و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خانووەکان لە ناودەچن، ئنجا (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: خودایە لە دەور وبەرمان بیبارێنە بەسەرماندا مەیبارێنە، گوتی: ئنجا هەورەکان بەلای ڕاست و چەپدا کەرت بوون (بڵاوبوونەوە).

**١٢٧٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقَدْ جِئْتُكَ مِنْ عِنْدِ قَوْمٍ مَا يَتَزَوَّدُ لَهُمْ رَاعٍ، وَلَا يَخْطِرُ لَهُمْ فَحْلٌ، فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اسْقِنَا غَيْثًا مُغِيثًا مَرِيئًا طَبَقًا مَرِيعًا غَدَقًا عَاجِلًا غَيْرَ رَائِثٍ» ثُمَّ نَزَلَ، فَمَا يَأْتِيهِ أَحَدٌ مِنْ وَجْهٍ مِنَ الْوُجُوهِ إِلَّا قَالُوا قَدْ أُحْيِينَا[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: دەشتەکییەک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن هۆزێکەوە هاتوم بۆ خزمەتت کە شوانەکەیان هیچی چنگ ناکەوێ بۆ ماڵات و ئاژەڵەکانیان، ناتوانن کلکیان بجوڵێنن (لە برسان)، ئنجا پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەر و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: خوایە بارانێکی تێرمان بۆ ببارێنی کە کۆتاییەکەی خێربێ و بەسەر زەویدا بباریێ، زۆر و بە خووڕ بێ و لە زووترین کاتدا و دوانەکەوێ، پاشان دابەزی ئنجا هیچ کەس نەهات مەگەر لە هەر ڕوویەکەوە، گوتیان: بە ڕاستی زیندوو بووینەوە (واتە: لە هەموو ڕوویەک کێشەی بێ بارانی چارەسەر بوو).

---

(١) صحيح.

١٢٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «اسْتَسْقَى حَتَّى رَأَيْتُ أَوْ رُئِيَ بَيَاضُ إِبْطَيْهِ» قَالَ مُعْتَمِرٌ: أُرَاهُ فِي الِاسْتِسْقَاءِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دوعای باران بارینی کرد، بە جۆرێک کە سپییاتی بن باڵیم بینی یان بینرا، موعتەمیر گوتی: وا دەزانم لە داواکردنی باران باریندا بوو.

١٢٧٢- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ، قَالَ: «رُبَّمَا ذَكَرْتُ قَوْلَ الشَّاعِرِ وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى وَجْهِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَمَا نَزَلَ حَتَّى جَيَّشَ كُلُّ مِيزَابٍ بِالْمَدِينَةِ فَأَذْكُرُ قَوْلَ الشَّاعِرِ:

وَأَبْيَضَ يُسْتَسْقَى الْغَمَامُ بِوَجْهِهِ ... ثِمَالُ الْيَتَامَى عِصْمَةٌ لِلْأَرَامِلِ»

وَهُوَ قَوْلُ أَبِي طَالِبٍ[2].

واتە: سالیم عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: زۆرجار (لە کاتی داواکردنی باران باریندا کە پێغەمبەر ﷺ داوای دەکرد) ئەو شیعرەم بیردەهاتەوە کە تەماشای ڕوخساری پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد لەسەر مینبەرەکە، نەهاتە خوار هەتا هەموو جۆگەلە و ئاوبارەکانی مەدینە پڕ ئاو دەبوون و هەڵدەستان، منیش ئەو شیعرەم بیر دەهاتەوە:

بە ڕوخساری سپی و درەوشاوەی کە داوای باران دەکەن

بە پشت و پەنای بێ باوکان و بێوەژنان ناوی دەبەن

وە ئەوەش وتەی ئەبو تاڵیبە.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی نوێژی دوو جەژنەکە هاتووە

١٢٧٣- عَنْ عَطَاءٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، يَقُولُ أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ «صَلَّى قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ فَرَأَى أَنَّهُ لَمْ يُسْمِعِ النِّسَاءَ فَأَتَاهُنَّ فَذَكَّرَهُنَّ وَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، وَبِلَالٌ قَائِلٌ بِيَدَيْهِ هَكَذَا، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِي الْخُرْصَ وَالْخَاتَمَ وَالشَّيْءَ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه البخاري: ١٠٠٩ معلقاً بهذا اللفظ.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٨، ومسلم: ٨٨٤ و ١١٤٢_١١٤٤ و ١١٤٦، والنسائي: ١٥٦٩ و ١٥٨٦.

واتە: عەتاء ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس ﷺ بوو دەیگوت: شاهێدی دەدەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش وتار نوێژی کرد، پاشان وتاری دا، ئنجا بینی کە ئافرەتان گوێ بیستی نەدەبوون، بۆیە هات بۆ لایان یادی خستنەوە و ئامۆژگاری کردن و، فەرمانی پێکردن کە خێر و چاکە بکەن، وە بیلالیش پۆشاکەکەی بە دەستی ڕاخستبوو، ئنجا ئافرەتەکان گوارەو ئەنگوستیلە و شتی دیکەی لە خشڵ و زێڕ و زیویان دەخستە ناو پۆشاکەکەی بیلالەوە.

**١٢٧٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «صَلَّى يَوْمَ الْعِيدِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی کرد بەبێ بانگدان و قامەت کردن.

**١٢٧٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: أَخْرَجَ مَرْوَانُ الْمِنْبَرَ يَوْمَ الْعِيدِ، فَبَدَأَ بِالْخُطْبَةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا مَرْوَانُ خَالَفْتَ السُّنَّةَ، أَخْرَجْتَ الْمِنْبَرَ يَوْمَ عِيدٍ وَلَمْ يَكُنْ يُخْرَجُ بِهِ، وَبَدَأْتَ بِالْخُطْبَةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ وَلَمْ يَكُنْ يُبْدَأُ بِهَا، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ قَضَى مَا عَلَيْهِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ رَأَى مُنْكَرًا فَاسْتَطَاعَ أَنْ يُغَيِّرَهُ بِيَدِهِ فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ بِلِسَانِهِ، فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: مەڕوان لە ڕۆژی جەژندا دوانگەکەی هێنا بۆ شوێنی نوێژکردنی جەژن، جا پێش نوێژکردن دەستی کرد بە وتاردان، ئنجا پیاوێک هەڵساو گوتی: ئەی مەڕوان، پێچەوانەی سوننەت جوڵایتەوە!! لە ڕۆژی جەژندا دوانگەکەت هێنایە شوێنی نوێژکردن کە پێش تۆ ئەوە نەکراوە، وە بە وتاردان دەستت پێکرد پێش نوێژکردن کە پێش تۆ بەو کارە دەست پێ نەدەکرا، ئنجا ئەبو سەعید گوتی: بەڵام ئەو پیاوە بە بڕیارێک بڕیاریدا کە لەسەری پێویست بوو جێبەجێی کرد، من لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە کە دەیفەرموو: هەر یەکێک لە ئێوە ناشەرعییەکی بینی، با بە دەست بیگۆڕێ، ئەگەر توانای هەبوو، ئەگەر نەیتوانی با بە زمان بیگۆڕێ، ئەگەر هەر نەیتوانی بە دڵ (پێی ناخۆش بێ) کە ئەوەش لاوازترین ئیمانە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٨٦/٥، وأبو داود: ١١٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٩، وأبو داود: ١١٤٠ و ٤٣٤٠، والترمذي: ٢١٧٢، والنسائي: ٥٠٠٨ و ٥٠٠٩.




**١٢٧٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ أَبُو بَكْرٍ ثُمَّ عُمَرُ يُصَلُّونَ الْعِيدَ قَبْلَ الْخُطْبَةِ»[١].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوای ئەویش ئەبو بەکر، دوای ئەویش عومەر، لە پێش وتاردانی نوێژی جەژنیان دەکرد.

## بابەت: ژمارەی «الله أكبر»ـەکانی نوێژی دوو جەژنەکان

**١٢٧٧-** عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ سَعْدٍ ﵁ مُؤَذِّنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُكَبِّرُ فِي الْعِيدَيْنِ فِي الْأُولَى سَبْعًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ، وَفِي الْآخِرَةِ خَمْسًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ»[٢].

**واتە:** عەبدورڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی عەممارِی کوڕی سەعد ﵁ بانگبێژی پێغەمبەری خوا، ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: باوکم لە باوکییەوە ئەویش لە باپیریەوە بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی دوو جەژنەکەدا لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت «الله أكبر»ـی دەکرد، پێش خوێندنی فاتیحە، وە لە ڕکاتەکەی دیکەدا پێنج «الله أكبر»ـی دەکرد پێش خوێندنی فاتیحە.

**١٢٧٨-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﵁، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَبَّرَ فِي صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ سَبْعًا وَخَمْسًا»[٣].

**واتە:** عەمرِی کوڕی شوعەیب ﵁ لە باوکییەوە، لە باپیریەوە، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی دوو جەژنەکەدا لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت، وە لە ڕکاتی دووەمدا پێنج «الله أكبر»ی دەکرد.

**١٢٧٩-** عَنْ كَثِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ ﵁، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَبَّرَ فِي الْعِيدَيْنِ سَبْعًا فِي الْأُولَى، وَخَمْسًا فِي الْآخِرَةِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٦٣، ومسلم: ٨٨٨، والترمذي: ٥٣١، والنسائي: ١٥٦٤.

(٢) حسن لغيره.

(٣) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١١٥١.

(٤) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٥٣٦.

واتە: کەسیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عەوف ﷺ لە باوکییەوە، لە باپیرەوە دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی دوو جەژنەکەدا حەوت جار «الله أکبر»ـی دەکرد، وە لە ڕکاتی کۆتاییدا پێنج جار.

١٢٨٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَبَّرَ فِي الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى سَبْعًا وَخَمْسًا، سِوَى تَكْبِيرَتَيِ الرُّكُوعِ»[1].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قورباندا حەوت وە پێنج «الله أکبر»ـی دەکرد، جگە لە دوو «الله أکبر»ـەکەی چوونە ڕکووع.

## بابەت: خوێندنی قوڕئان لە نوێژی دوو جەژنەکەدا

١٢٨١- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ وَ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ۝١﴾»[2].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی دوو جەژنەکەدا سووڕەتی ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ۝١﴾ ی دەخوێند.

١٢٨٢- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عُمَرُ ﷺ يَوْمَ عِيدٍ فَأَرْسَلَ إِلَى أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ: بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي مِثْلِ هَذَا الْيَوْمِ؟ قَالَ: «بِقَافْ وَاقْتَرَبَتْ»[3].

واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: عومەر ﷺ لە ڕۆژی جەژندا دەرچوو، ئنجا بە دوای ئەبو واقیدی لەیسیدا نارد کە ئایا پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژێکی وەکو ئەمڕۆدا (لە نوێژی جەژندا) چی دەخوێند؟ گوتی: سووڕەتی «قاف» و «اقْتَرَبَتِ».

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١١٤٩ و ١١٥٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٧٨، وأبو داود: ١١٢٢، والترمذي: ٥٣٣، والنسائي: ١٥٦٨.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٩١، وأبو داود: ١١٥٤، والترمذي: ٥٣٤، والنسائي: ١٥٦٧.




١٢٨٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ وَ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی هەردوو جەژنەکەدا سوورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ و ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ـی دەخوێند.

## بابەت: وتاری دوو جەژنەکان

١٢٨٤- عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا كَاهِلٍ وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، فَحَدَّثَنِي أَخِي عَنْهُ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ «يَخْطُبُ عَلَى نَاقَةٍ وَحَبَشِيٌّ آخِذٌ بِخِطَامِهَا»[2].

واتە: ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالید ﵁ دەڵێ: ئەبو کاهیلم بینی کە بەشی هاوڕێیەتی پێغەمبەری ﷺ هەبووە، برایەکم لە ئەوەوە بۆی گێڕاومەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر حوشترەکەی وتاری دەدا و حەبەشییەک جڵەوی حوشترەکەی بۆ گرتبوو.

١٢٨٥- عَنْ قَيْسِ بْنِ عَائِذٍ هُوَ أَبُو كَاهِلٍ ﵁، قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى نَاقَةٍ حَسْنَاءَ وَحَبَشِيٌّ آخِذٌ بِخِطَامِهَا»[3].

واتە: قەیسی کوڕی عائیز کە ئەبو کاهیلە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر حوشترەکەی وتاری دەدا، وە حەبەشییەک جڵەوی حوشترەکەی بۆ گرتبوو.

١٢٨٦- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُبَيْطٍ ﵁، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ حَجَّ فَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ «يَخْطُبُ عَلَى بَعِيرِهِ»[4].

واتە: سەلەمەی کوڕی نوبەیت ﵁ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە حەجی کردوە گوتوویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر حوشترەکەی وتاری دەدا.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) حسن. أخرجه النسائي: ١٥٧٣.

(٣) حسن. أخرجه النسائي: ١٥٧٣.

(٤) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٩١٦، والنسائي: ٣٠٠٨.

١٢٨٧- عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ الْمُؤَذِّنِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يُكَبِّرُ بَيْنَ أَضْعَافِ الْخُطْبَةِ، يُكْثِرُ التَّكْبِيرَ فِي خُطْبَةِ الْعِيدَيْنِ»[1].

واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی عەمماری کوڕی سەعد ﷺ بانگ بێژی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: باوکم لە باوکییەوە لە باپیریەوە بۆی گێڕامەوە، گوتی: پێغەمبەر ﷺ لەناو وتاردا «الله أكبر»ی دەکرد، وە لە ناو وتاری دوو جەژنەکەدا زۆر «الله أكبر»ی دەکرد.

١٢٨٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْرُجُ يَوْمَ الْعِيدِ، فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يُسَلِّمُ فَيَقِفُ عَلَى رِجْلَيْهِ فَيَسْتَقْبِلُ النَّاسَ وَهُمْ جُلُوسٌ، فَيَقُولُ: «تَصَدَّقُوا تَصَدَّقُوا» فَأَكْثَرُ مَنْ يَتَصَدَّقُ النِّسَاءُ، بِالْقُرْطِ وَالْخَاتَمِ وَالشَّيْءِ، فَإِنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ يُرِيدُ أَنْ يَبْعَثَ بَعْثًا يَذْكُرُهُ لَهُمْ وَإِلَّا انْصَرَفَ[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژندا دەردەچوو دوو ڕکات پێشنوێژی بۆ خەڵک دەکرد، پاشان سەلامی دەدایەوەو، لەسەر پێیەکانی ڕادەوەستا، ئنجا ڕووی لە خەڵکەکە دەکرد، لە کاتێکدا کە خەڵکەکە دانیشتبوون، جا دەیفەرموو: چاکە و خێر بکەن، چاکە و خێر بکەن، جا ئەوەی زۆرترین خێری دەکرد ئافرەتان بوون بە گوارەکانیان و بە ئەنگوستیلەکانیان و شتی تر، جا ئەگەر پێویستییەکی هەبووایە وەکو ناردنی لەشکرێک ئەوە بۆی باس دەکردن، ئەگەرنا دەڕۆیشت و کۆتایی پێدەهێنا.

١٢٨٩- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ فِطْرٍ أَوْ أَضْحَى، فَخَطَبَ قَائِمًا، ثُمَّ قَعَدَ قَعْدَةً، ثُمَّ قَامَ»[3].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، یان قوربان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو (بۆ نوێژ)، ئنجا بەپێوە وتاری دا، پاشان دانشتنێک دانیشت و، پاشان هەڵسایەوە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٤، ومسلم: ٨٨٩، والنسائي: ١٥٧٦ و ١٥٧٩.

(٣) منكر سنداً و متناً. والمحفوظ أن ذلك فى خطبة الجمعة، ومن حديث جابر بن سمرة.

## بابەت: چاوەڕوانی کردنی وتار لەدوای نوێژ

١٢٩٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ، قَالَ: حَضَرْتُ الْعِيدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى بِنَا الْعِيدَ، ثُمَّ قَالَ: «قَدْ قَضَيْنَا الصَّلَاةَ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَجْلِسَ لِلْخُطْبَةِ فَلْيَجْلِسْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَذْهَبَ فَلْيَذْهَبْ»(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادەی نوێژی جەژن بووم، نوێژی جەژنی بۆ کردین، پاشان فەرمووی: نوێژەکەمان بەجێ گەیاند، هەر کەس پێی خۆشە با بۆ وتارەکە دانیشێ، ئەوەشی کە دەیەوێ بڕوات، با بڕوات.

## بابەت: نوێژکردن پێش نوێژی جەژن و دوای نوێژی جەژن

١٢٩١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «خَرَجَ فَصَلَّى بِهِمُ الْعِيدَ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو نوێژی جەژنی بۆ کردن، نە لە پێش نوێژی جەژن، نە لە دوای نوێژی جەژن، نوێژی دیکەی نەکرد.

١٢٩٢- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا فِي عِيدٍ»(٣).

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب ﷺ لە باوکییەوە، لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە (نوێژی) جەژندا لە پێش و لە دوای نوێژی جەژن نوێژی دیکەی نەکردوە.

١٢٩٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «لَا يُصَلِّي قَبْلَ الْعِيدِ شَيْئًا، فَإِذَا رَجَعَ إِلَى مَنْزِلِهِ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٥٥، والنسائي: ١٥٧١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٦٤، ومسلم: ٨٨٤، وأبو داود: ١١٥٩، والترمذي: ٥٣٧، والنسائي: ١٥٨٧.

(٣) صحيح ليغره.

(٤) إسناده ضعيف.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێش نوێژی جەژن هیچ نوێژێکی نەدەکرد، ئنجا کاتێ دەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

## بابەت: ڕۆیشتن بۆ نوێژی جەژن بە پیادە (پێرۆ)

**١٢٩٤-** عَنْ عَبْد الرَّحْمَنِ بْن سَعْدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يَخْرُجُ إِلَى الْعِيدِ مَاشِيًا، وَيَرْجِعُ مَاشِيًا»(١).

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی عەممای کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: باوکم لە باوکییەوە لە باپیریەوە بۆی گێرامەوە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژی جەژن بە پیادە دەردەچوو، وە بە پیادە دەگەڕایەوە.

**١٢٩٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْرُجُ إِلَى الْعِيدِ مَاشِيًا، وَيَرْجِعُ مَاشِيًا»(٢).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نوێژی جەژن بە پیادە دەڕۆیشت و بە پیادەش دەگەڕایەوە.

**١٢٩٦-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ مِنَ السُّنَّةِ أَنْ يَمْشِيَ إِلَى الْعِيدِ»(٣).

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: لە ڕاستیدا ڕۆیشتن بە پیادە بۆ نوێژی جەژن لە سوننەتەوەیە.

**١٢٩٧-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يَأْتِي الْعِيدَ مَاشِيًا»(٤).

واتە: موحەممەدی کوڕی عوبەیدوڵلای کوڕی ئەبو ڕافیع ﷺ لە باوکییەوە، لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەهات بۆ نوێژی جەژن بە پیادە دەهات.

---

(١) حسن لغيره.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٥٣٠.

(٤) حسن لغيره.




## بابەت: دەرچوون لە ڕۆژی جەژندا
## بە ڕێگایەکدا و گەڕانەوە بە ڕێگایەکی تردا

١٢٩٨- عَنْ عَبْد الرَّحْمَنِ بْن سَعْدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ إِذَا خَرَجَ إِلَى الْعِيدَيْنِ سَلَكَ عَلَى دَارِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الْعَاصِ، ثُمَّ عَلَى أَصْحَابِ الْفَسَاطِيطِ، ثُمَّ انْصَرَفَ فِي الطَّرِيقِ الْأُخْرَى، طَرِيقِ بَنِي زُرَيْقٍ، ثُمَّ يَخْرُجُ عَلَى دَارِ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ وَدَارِ أَبِي هُرَيْرَةَ إِلَى الْبَلَاطِ»[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی عەمماری کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: باوکم لە باوکییەوە، لە باپیریەوە بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ بۆ نوێژی دوو جەژنەکە دەردەچوو بە لای ماڵی سەعیدی کوڕی ئەبولعاصدا، پاشان بەلای خاوەن خەیمەکاندا دەڕۆیشت، دواتر بە ڕێگایەکی تردا دەگەڕایەوە، ڕێگای بەنی زوڕەیق، پاشان بە لای ماڵی عەمماری کوڕی یاسرو ئەبو هوڕەیرەدا بۆ «البلاط» (شوێنێکە لە مەدینە).

١٢٩٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ «كَانَ يَخْرُجُ إِلَى الْعِيدِ فِي طَرِيقٍ، وَيَرْجِعُ فِي أُخْرَى، وَيَزْعُمُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە کاتێک دەچوو بۆ نوێژی جەژن بە ڕێگایەکدا دەچوو، بە ڕێگایەکی تردا دەگەڕایەوە، وە پێی وابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان کاری دەکرد.

١٣٠٠- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يَأْتِي الْعِيدَ مَاشِيًا، وَيَرْجِعُ فِي غَيْرِ الطَّرِيقِ الَّذِي ابْتَدَأَ فِيهِ»[3].

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١١٥٦.

(٣) حسن لغيره.

واتە: موحەممەدی کوڕی ئەبو عوبەیدوڵڵای کوڕی ڕافیع ﷺ لە باوکییەوە، لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە پیادە دەهات بۆ نوێژی جەژن، وە بە ڕێگایەکی جیاواز لەو ڕێگایەی کە پێیدا هاتووە دەگەڕایەوە.

١٣٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ إِذَا خَرَجَ إِلَى الْعِيدِ رَجَعَ فِي غَيْرِ الطَّرِيقِ الَّذِي أَخَذَ فِيهِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە کاتێک پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژی جەژن دەردەچوو بە غەیری ئەو ڕێگایەدا دەگەڕایەوە کە پێیدا هاتوە (بۆ نوێژی جەژن).

## بابەت: دەف لێدان و گۆرانی یان سروود لە ڕۆژانی جەژندا

١٣٠٢- عَنْ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: شَهِدَ عِيَاضٌ الْأَشْعَرِيُّ عِيدًا بِالْأَنْبَارِ، فَقَالَ: «مَا لِي لَا أَرَاكُمْ تُقَلِّسُونَ كَمَا كَانَ يُقَلَّسُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: عامیر ﷺ دەڵێ: عیازی ئەشعەری لە ئەنبار ئامادەی نوێژی جەژنێک بوو، ئنجا گوتی: بۆچی ناتانبینم کە دەف لێدەن و سروود بڵێن، هەر وەک چۆن لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لێدەدرا و دەگوترا.

**التقليس:** واتە: دەف لێدان یان گۆرانی گوتن.

١٣٠٣- عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ مَا كَانَ شَيْءٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا وَقَدْ رَأَيْتُهُ، إِلَّا شَيْءٌ وَاحِدٌ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُقَلَّسُ لَهُ يَوْمَ الْفِطْرِ»[٣].

واتە: قەیسی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: هەر شتێک هەبووە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ هەموویم بینیوەتەوە (لەو سەردەمەدا) تەنها شتێک نەبێ، (ئەویش ئەوەیە کە) لە ڕۆژی جەژندی ڕەمەزان دەف لێدەدرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ(واتە: لەو ڕۆژەدا بە دەف و سروود پێشوازی لێدەکرا).

---

(١) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٥٤١.

(٢) ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.

## بابەت: حەربە بۆ سوترە لە نوێژی جەژندا

١٣٠٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يَغْدُو إِلَى الْمُصَلَّى فِي يَوْمِ الْعِيدِ، وَالْعَنَزَةُ تُحْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَإِذَا بَلَغَ الْمُصَلَّى، نُصِبَتْ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَيُصَلِّي إِلَيْهَا، وَذَلِكَ أَنَّ الْمُصَلَّى كَانَ فَضَاءً، لَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ يُسْتَتَرُ بِهِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی زوو دەڕۆیشت بۆ شوێنی نوێژی جەژن (نوێژگە) لە ڕۆژی جەژندا، وە حەربەیەکی بۆ هەڵدەگیرا تا لەبەردەمیدا بچەقێنرێ، جا کاتێک دەگەیشتە شوێنی نوێژکردن حەربەکەی لە بەردەمیدا دەچەقێنرا، جا نوێژی بەرەو ڕووی حەربەکە دەکرد، ئەوە کاتێک بوو کە شوێنی نوێژکردنەکە دەشت و دەر بوو، هیچ شتێکی لێنەبوو ببێتە سوترەی نوێژ.

١٣٠٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا صَلَّى يَوْمَ عِيدٍ أَوْ غَيْرَهُ، نُصِبَتِ الْحَرْبَةُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَيُصَلِّي إِلَيْهَا، وَالنَّاسُ مِنْ خَلْفِهِ» قَالَ نَافِعٌ: فَمِنْ ثَمَّ اتَّخَذَهَا الْأُمَرَاءُ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺدەڵێ: پێغەمبەر ﷺهەرکات نوێژی ڕۆژی جەژنی بکردبایە، یان هەر نوێژێکی دیکە، حەربەیەکی لە بەردەمیدا دەچەقێنرا، ئنجا نوێژی بەرەو ئەوێ دەکرد، وە خەڵکیش لە دوای ئەوەوە دەبوو. نافیع دەڵێ: لەوە بەدوا ئەمیرەکانیش کردیانە عادەت.

١٣٠٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «صَلَّى الْعِيدَ بِالْمُصَلَّى مُسْتَتِرًا بِحَرْبَةٍ»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جەژنی لە نوێژگەدا کرد، لە کاتێکدا کە حەربەیەکی کردبووە سوترە (بۆ نوێژەکەی).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩٤، ومسلم: ٥٠١، وأبو داود: ٦٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩٤، ومسلم: ٥٠١، وأبو داود: ٦٨٧.

(٣) صحيح.

## بابەت: دەرچونی ئافرەتان بۆ نوێژی دوو جەژنەکان

**١٣٠٧- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂، قَالَتْ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُخْرِجَهُنَّ فِي يَوْمِ الْفِطْرِ وَالنَّحْرِ، قَالَ: قَالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ: فَقُلْنَا: أَرَأَيْتَ إِحْدَاهُنَّ لَا يَكُونُ لَهَا جِلْبَابٌ؟ قَالَ: «فَلْتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا»[1].**

واتە: ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین کە ئافرەتان بهێنین لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان (بۆ ئامادە بوون بۆ نوێژی جەژن)، ڕاوی دەڵێ: ئوممو عەتییە گوتی: جا گوتمان: ئەی ئەگەر یەکێک عەبایەکی نەبوو (کە خۆی پێ داپۆشێ)؟ فەرمووی: با خوشکەکەی بە عەبایەکەی خۆی داپۆشێ (پێی بدات).

**١٣٠٨- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَخْرِجُوا الْعَوَاتِقَ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ لِيَشْهَدْنَ الْعِيدَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، وَلْيَجْتَنِبْنَ الْحُيَّضُ مُصَلَّى النَّاسِ»[2].**

واتە: ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتانی تازە پێگەیشتوو (کە بلوغیان نەبووە) بهێنن لەگەڵ ئەوانەی لە ماڵەوەن بۆ ئەوەی ئامادەی نوێژی جەژن و دوعای مسوڵمانان بین، ئەوانەش کە عادەن (لە سوڕی مانگانەدان) با نەیەنە ناو خەڵک بۆ جێی نوێژکردن (واتە: با ئامادە بن، بەڵام نوێژ نەکەن، چونکە ئافرەت کاتێ کە عادەیە نوێژ کردنی لەسەر حەڕامە).

**١٣٠٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يُخْرِجُ بَنَاتِهِ وَنِسَاءَهُ فِي الْعِيدَيْنِ»[3].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کچەکانی و خێزانەکانی دەهێنا بۆ نوێژی هەردوو جەژنەکە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٤، ومسلم: ٨٩٠، وأبو داود: ١١٣٦ و ١١٣٩، والترمذي: ٥٣٩، والنسائي: ٣٩٠ و ١٥٥٨ و ١٥٥٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٤، ومسلم: ٨٩٠، وأبو داود: ١١٣٦ و ١١٣٩، والترمذي: ٥٣٩، والنسائي: ٣٩٠ و ١٥٥٨ و ١٥٥٩.

(٣) حسن لغيره.

## بابەت: ئەوەی کە ئەگەر یەکێک لە جەژنەکان کەوتە ڕۆژی جومعە

**١٣١٠- عَنْ إِيَاسِ بْنِ أَبِي رَمْلَةَ الشَّامِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلًا، سَأَلَ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ هَلْ شَهِدْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عِيدَيْنِ فِي يَوْمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَكَيْفَ كَانَ يَصْنَعُ؟ قَالَ: صَلَّى الْعِيدَ، ثُمَّ رَخَّصَ فِي الْجُمُعَةِ، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ شَاءَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيُصَلِّ»[١].**

**واتە: ئییاسی کوڕی ئەبو ڕەملەی شامیی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پیاوێک بوو، پرسیاری لە زەیدی کوڕی ئەرقەم کرد کە ئایا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادەی دوو جەژن بووی لە یەک ڕۆژدا؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: ئێ جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) چی کرد؟ گوتی: نوێژی جەژنی بۆ کردین، پاشان بۆ نوێژی جومعە مۆڵەتی (خەڵکەکەی)دا، پاشان فەرمووی: ئەوەی پێی خۆشە با نوێژ (نوێژی جومعە) بکات.**

**١٣١١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «اجْتَمَعَ عِيدَانِ فِي يَوْمِكُمْ هَذَا، فَمَنْ شَاءَ أَجْزَأَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ، وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ»[٢].**

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەم ڕۆژەدا کە تێیداین دوو جەژن کۆبوونەتەوە، جا هەر کەسێک دەیەوێ دەکات ئەوە بۆی بە بری نوێژی جومعە دەکەوێ، وە ئێمە ئەگەر خوا بیەوێ نوێژی جومعە دەکەین.**

**١٣١١م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ رَبِّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا بَقِيَّةُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُغِيرَةَ الضَّبِّيِّ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[٣].**

**واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرمoodە گێڕدراوەتەوە.**

**١٣١٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: اجْتَمَعَ عِيدَانِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ شَاءَ أَنْ يَأْتِيَ الْجُمُعَةَ فَلْيَأْتِهَا، وَمَنْ شَاءَ أَنْ يَتَخَلَّفَ فَلْيَتَخَلَّفْ»[٤].**

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٠٧٠، والنسائي: ١٥٩١.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٠٧٣.

(٤) صحيح لغيره.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: دوو جەژن کۆبوونەوە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئنجا نوێژی بە خەڵکەکە کرد (نوێژی جەژن)، پاشان فەرمووی: ئەوەی کە حەزی لێیە بێتەوە بۆ نوێژی جومعە با بێتەوە، ئەوەشی نایەتەوە با نەیەتەوە.

## بابەت: کردنی نوێژی جەژن لە مزگەوتدا ئەگەر باران بوو

١٣١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «أَصَابَ النَّاسَ مَطَرٌ فِي يَوْمِ عِيدٍ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى بِهِمْ فِي الْمَسْجِدِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی جەژندا خەڵکی تووشی باران بارین هاتن لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) نوێژی جەژنی لە مزگەوتدا بۆ کردن.

## بابەت: هەڵگرتنی چەک و سیلاح لە ڕۆژی جەژندا

١٣١٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «نَهَى أَنْ يُلْبَسَ السِّلَاحُ فِي بِلَادِ الْإِسْلَامِ فِي الْعِيدَيْنِ إِلَّا أَنْ يَكُونَ بِحَضْرَةِ الْعَدُوِّ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەڵگرتنی چەکی لە وڵاتی مسوڵماناندا لە ڕۆژی دوو جەژنەکەدا قەدەغە کردوە، مەگەر کاتێک کە دوژمن هەبێ و ئامادەبێ.

## بابەت: خۆشوشتن لە دوو جەژنەکەدا

١٣١٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَغْتَسِلُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَيَوْمَ الْأَضْحَى»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قورباندا خۆی دەشۆرد.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١١٦٠.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) ضعيف جداً.

**١٣١٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُقْبَةَ بْنِ الْفَاكِهِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، عَنْ جَدِّهِ الْفَاكِهِ بْنِ سَعْدٍ، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يَغْتَسِلُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَيَوْمَ النَّحْرِ وَيَوْمَ عَرَفَةَ» وَكَانَ الْفَاكِهُ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالْغُسْلِ فِي هَذِهِ الْأَيَّامِ[١].**

واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی عوقبەی کوڕی فاکیهی کوڕی سەعد ﷺ لە فاکیهی کوڕی سەعدی باپیریەوە کە یەکێ بووە لە هاوەڵان دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان و ڕۆژی عەرەفەدا خۆی دەشۆرد، وە فاکیە فەرمانی بە ماڵ و منداڵی دەکرد خۆیان بشۆرن لەو ڕۆژانەدا.

## بابەت: کاتی نوێژی جەژنەکان

**١٣١٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ، أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ النَّاسِ يَوْمَ فِطْرٍ أَوْ أَضْحَى، فَأَنْكَرَ إِبْطَاءَ الْإِمَامِ، وَقَالَ: «إِنْ كُنَّا لَقَدْ فَرَغْنَا سَاعَتَنَا هَذِهِ وَذَلِكَ حِينَ التَّسْبِيحِ»[٢].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسڕ ﷺ دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ خەڵکیدا دەرچوو بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان، یان قوربان، ئنجا لەوەی کە پێشنوێژ بە سستی هات ناڕەزایی دەربڕی و، گوتی: ئێمە ئەو کاتانە لە نوێژ دەبووینەوە، کاتەکەش کاتی نوێژی چێشتەنگاو بوو.

## بابەت: ئەوەی کە شەونوێژ دوو ڕکاتن

**١٣١٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى»[٣].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەونوێژی بە دوو ڕکات دوو ڕکات دەکرد.

**١٣١٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى»[٤].**

---

(١) موضوع.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٣٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٩٥، ومسلم: ٧٤٩/١٥٧، والترمذي: ٤٦١.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٩٥، ومسلم: ٧٤٩/١٥٧، والترمذي: ٤٦١.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە.

**١٣٢٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ فَقَالَ: «يُصَلِّي مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَافَ الصُّبْحَ أَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: دەربارەی شەونوێژ پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: دوو ڕکات دوو ڕکات دەکرێن، جا ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو کە خەریکە بەیانی دەبێتەوە، ئەوە با بە ڕکاتێکی ویتر کۆتایی بە شەونوێژەکانی بێنێ.

**١٣٢١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەونوێژی بە دوو ڕکات دوو ڕکات دەکرد.

## بابەت: ئەوەی کە نوێژی شەو و ڕۆژ دوو دوون (نوێژی سوننەت)

**١٣٢٢-** عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ عَلِيًّا الْأَزْدِيَّ، يُحَدِّثُ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ ﷺ، يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ أَنَّهُ قَالَ: «صَلَاةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى»[٣].

واتە: یەعلای کوڕی عەتاء ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوێی لە عەلی ئەزدی بووە، گێڕاویەتەوە کە گوێی ئیبنو عومەر ﷺ بووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە، فەرموویەتی: نوێژی شەو و ڕۆژ دوو ڕکات دوو ڕکاتن (نوێژی سوننەت).

**١٣٢٣-** عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْفَتْحِ صَلَّى سُبْحَةَ الضُّحَى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ سَلَّمَ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٢، ومسلم: ٧٤٩، وأبو داود: ١٣٢٦ و ١٤٢١، والترمذي: ٤٣٧، والنسائي: ١٦٦٧_١٦٧٤ و ١٦٨٢ و ١٦٩١_١٦٩٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح دون قوله: «وَالنَّهَارِ». أخرجه أبو داود: ١٢٩٥، والترمذي: ٥٩٧، والنسائي: ١٦٦٦.

(٤) منكر بزيادة التسليم، والمحفوظ دونها. أخرجه أبو داود: ١٢٩٠.

واتە: ئوممو هانيئى كچى ئەبو تاڵيب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەرى خوا ﷺ لە ڕۆژى فەتحدا هەشت ڕكات نوێژى چێشتەنگاوى كرد، كە لە هەر دوو ڕكاتێک سەلامى دەدايەوە.

**١٣٢٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ تَسْلِيمَةٌ»[1].**

واتە: ئەبو سەعيد ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: لە هەر دوو ڕكاتێک سەلامدانەوە هەيە (واتە: لە دواى هەر دوو ڕكات نوێژى سوننەت دەبێ سەلام بدرێتەوە).

**١٣٢٥- عَنِ الْمُطَّلِبِ يَعْنِي ابْنَ أَبِي وَدَاعَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَتَشَهَّدُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، وَتَبَاءَسُ وَتَمَسْكَنُ وَتُقْنِعُ، وَتَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، فَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَهِيَ خِدَاجٌ»[2].**

واتە: موتەڵيب يانى ئيبو ئەبو وەداعە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى: شەونوێژ دوو ڕكات دوو ڕكاتن، وە لە هەر دوو ڕكاتێک تەحيات بخوێنە، هەژارى و گەردنكەچى و ئارامى خۆت دەربخە (بۆ پەروەردگار) و، دەستەكانت بەرز بكەوە بڵێ: خوايە لێم خۆشبى، ئەوەى ئەوە نەكات نوێژەكەى تەواو نيە.

## بابەت: شەو بێدار بوون لە ڕەمەزاندا

**١٣٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ وَقَامَهُ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[3].**

واتە: ئەبو هورەيرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى: هەر كەسێک ڕۆژەكانى ڕەمەزان بەڕۆژوو بێ و، شەوەكانيشى شەونوێژ بكات، بڕواى پێى هەبێ و چاوەڕێى پاداشت بێ، لە گوناهەكانى ڕابردووى دەبوردرێ.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٢٩٦، والترمذي: ٣٨٥

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧، ومسلم: ٧٥٩، وأبو داود: ١٣٧٢، والترمذي: ٦٨٣، والنسائي: ١٦٠٢ و ١٦٠٣ و ٢١٩٦_٢٢٠١.

**١٣٢٧-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: صُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَقُمْ بِنَا شَيْئًا مِنْهُ، حَتَّى بَقِيَ سَبْعُ لَيَالٍ، فَقَامَ بِنَا لَيْلَةَ السَّابِعَةِ حَتَّى مَضَى نَحْوٌ مِنْ ثُلُثِ اللَّيْلِ، ثُمَّ كَانَتِ اللَّيْلَةُ السَّادِسَةُ الَّتِي تَلِيهَا، فَلَمْ يَقُمْهَا، حَتَّى كَانَتِ الْخَامِسَةُ الَّتِي تَلِيهَا، ثُمَّ قَامَ بِنَا حَتَّى مَضَى نَحْوٌ مِنْ شَطْرِ اللَّيْلِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ نَفَّلْتَنَا بَقِيَّةَ لَيْلَتِنَا هَذِهِ. فَقَالَ: «إِنَّهُ مَنْ قَامَ مَعَ الْإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ، فَإِنَّهُ يَعْدِلُ قِيَامَ لَيْلَةٍ» ثُمَّ كَانَتِ الرَّابِعَةُ الَّتِي تَلِيهَا، فَلَمْ يَقُمْهَا، حَتَّى كَانَتِ الثَّالِثَةُ الَّتِي تَلِيهَا، قَالَ: فَجَمَعَ نِسَاءَهُ وَأَهْلَهُ وَاجْتَمَعَ النَّاسُ، قَالَ: فَقَامَ بِنَا حَتَّى خَشِينَا أَنْ يَفُوتَنَا الْفَلَاحُ، قِيلَ: وَمَا الْفَلَاحُ؟ قَالَ: السُّحُورُ، قَالَ: ثُمَّ لَمْ يَقُمْ بِنَا شَيْئًا مِنْ بَقِيَّةِ الشَّهْرِ[١].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: مانگی ڕەمەزان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بە ڕۆژوو بووین، هیچ شەونوێژی پێنەکردین تاکو حەوت ڕۆژ مایەوە لە ڕەمەزان، ئنجا ئەو ڕۆژی حەوتەمە کەوا مابوو لە ڕەمەزان شەونوێژی بۆ کردین تاکو نزیکەی سێیەکی شەو، ئنجا شەوی شەشەم کە مابوو لە ڕەمەزان هیچ شەونوێژی بۆ نەکردین، تاکو مایەوە پێنج ڕۆژ، ئەوجار شەونوێژی بۆ کردین تاکو نزیکەی نیوەی شەو، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئەوەی ماویشە لە شەوی ئەو شەو شەونوێژت بۆ کردباین، ئەویش فەرمووی: ئەوەی لەگەڵ ئیمام بمێنێتەوە تاکو کۆتایی پێدێنێ ئەوە بە تەواوی شەوەکە بۆی ئەژمار دەکرێ، پاشان کە چوار شەوی مابوو (ڕەمەزان) شەونوێژی بۆ نەکردین، تاکو مایەوە سێ شەو، گوتی: ئنجا خێزان وماڵەوەی کۆکردەوە، خەڵکیش کۆبوونەوە، گوتی: ئنجا شەونوێژی بۆ کردین تا وای لێهات ترسی فەوتانی فەلاحمان هەبوو، گوتیان: فەلاح چییە؟ گوتی: پارشێو، گوتی: پاش ئەوە چیتر شەونوێژی بۆ نەکردین لەوەی کە مابوو (لە ڕەمەزان).

**١٣٢٨-** عَنِ النَّضْرِ بْنِ شَيْبَانَ ﷺ، قَالَ: لَقِيتُ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ فَقُلْتُ: حَدِّثْنِي بِحَدِيثٍ سَمِعْتَهُ مِنْ أَبِيكَ يَذْكُرُهُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، قَالَ: نَعَمْ، حَدَّثَنِي أَبِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَكَرَ شَهْرَ رَمَضَانَ فَقَالَ: «شَهْرٌ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ صِيَامَهُ، وَسَنَنْتُ لَكُمْ قِيَامَهُ، فَمَنْ صَامَهُ وَقَامَهُ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٣٧٥، والترمذي: ٨٠٦، والنسائي: ١٣٦٤.

(٢) ضعيف، والشطر الثاني منه صحيح. أخرجه النسائي: ٢٢٠٨.

واتە: نەزری کوڕی شەیبان ﷺ دەڵێ: بە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان گەیشتم و پێمگوت: فەرموودەیەکم بۆ بگێڕەوە کە لە باوکتەوە بیستوتە دەربارەی مانگی ڕەمەزان، گوتی: بەڵێ، باوکم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە باسی مانگی ڕەمەزانی کردوە، فەرموویەتی: مانگێکە کە خوا ڕۆژووی تێدا لەسەرتان واجب کردوە، وە منیش شەونوێژم تێدا کردوە بە سوننەت بۆتان، جا هەر کەسێک تێیدا بە ڕۆژوو بێ و شەونوێژی تێدا بکات بە بڕوا بوون بە خوا و پێغەمبەر ﷺ وە چاوەڕێی پاداشت بێ و تەنها لە پێناو خوا بیکات، لە گوناهەکانی پاک دەبێتەوە وەک ئەو ڕۆژەی کە تێیدا لە دایک بووە.

## بابەت: شەونوێژ

**١٣٢٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ بِاللَّيْلِ بِحَبْلٍ فِيهِ ثَلَاثُ عُقَدٍ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِذَا قَامَ فَتَوَضَّأَ، انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ انْحَلَّتْ عُقَدُهُ كُلُّهَا، فَيُصْبِحُ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ قَدْ أَصَابَ خَيْرًا، وَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ أَصْبَحَ كَسِلًا خَبِيثَ النَّفْسِ لَمْ يُصِبْ خَيْرًا»(١).

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەیتان لە بەشی دواوەی سەری هەر یەکێکتان لە شەودا بە پەتێک سێ گرێ لێدەدات (کاتێ دەخەوێ)، جا ئەگەر (هەڵسا لە خەو) یادی خوای کرد، گرێیەک دەبێتەوە، ئەگەر هەڵساو دەستنوێژی گرت گرێیەکی دیکە دەبێتەوە، ئنجا هەرکات هەڵسا نوێژی کرد، ئەوە هەموو گرێیەکان دەکرێنەوە، ئەوکات بە چوست و چالاکی و دڵخۆشی بەیانی دەکاتەوەو خێر و چاکەی دێتە ڕێ، خۆ ئەگەر ئەوەی نەکرد ئەوە بە تەنبەڵی و دڵناخۆشی بەیانی دەکاتەوەو چاکە نایەتە ڕێی.

**١٣٣٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ نَامَ لَيْلَةً حَتَّى أَصْبَحَ، قَالَ: «ذَلِكَ الشَّيْطَانُ بَالَ فِي أُذُنَيْهِ»(٢).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٤٢، ومسلم: ٧٧٦، وأبو داود: ١٣٠٦، والنسائي: ١٦٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٤٤، ومسلم: ٧٧٤، والنسائي: ١٦٠٨ و ١٦٠٩.

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پیاوێک کرا، کە شەو تاکو بەیانی دەبێتەوە دەخەوێ، فەرمووی: ئەو کەسە شەیتان میزی کردۆتە گوێچکەکانی.

**١٣٣١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَكُنْ مِثْلَ فُلَانٍ، كَانَ يَقُومُ اللَّيْلَ فَتَرَكَ قِيَامَ اللَّيْلِ»(١).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەکو فڵان کەس مەبە، هەموو شەو هەڵدەستایەوە، بەڵام ئێستا شەونوێژی واز لێهێناوە.

**١٣٣٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَالَتْ أُمُّ سُلَيْمَانَ بْنِ دَاوُدَ لِسُلَيْمَانَ: يَا بُنَيَّ لَا تُكْثِرِ النَّوْمَ بِاللَّيْلِ فَإِنَّ كَثْرَةَ النَّوْمِ بِاللَّيْلِ تَتْرُكُ الرَّجُلَ فَقِيرًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»(٢).**

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دایکی سولەیمانی کوڕی داود بە سولەیمانی گوت: ئەی ڕۆڵەکەم، بە شەو زۆر مەخەوە، بەڕاستی زۆر خەوتن بە شەو، مرۆڤ لە ڕۆژی قیامەتدا هەژار دەکات (واتە: بە زۆر خەوتنەوە، کردەوەی چاکی کەم دەبێ، وەک هەژارو نەدار دەبێ لە چاکەکاریی دا).

**١٣٣٣- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَثُرَتْ صَلَاتُهُ بِاللَّيْلِ حَسُنَ وَجْهُهُ بِالنَّهَارِ»(٣).**

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شەونوێژی زۆر بێت ئەوا لە ڕۆژدا ڕوخساری جوان و گەشاوە دەبێ.

**١٣٣٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ انْجَفَلَ النَّاسُ إِلَيْهِ، وَقِيلَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجِئْتُ فِي النَّاسِ لِأَنْظُرَ إِلَيْهِ، فَلَمَّا اسْتَبَنْتُ وَجْهَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَرَفْتُ أَنَّ وَجْهَهُ لَيْسَ بِوَجْهِ كَذَّابٍ، فَكَانَ أَوَّلَ شَيْءٍ تَكَلَّمَ بِهِ أَنْ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَفْشُوا السَّلَامَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلَامٍ»(٤).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٥٢، ومسلم: ١١٥٩/١٨٥، والنسائي: ١٧٦٤.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٤٨٥.





واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە ﷺ دەڵێ: ئەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ مەدینە خەڵکی بە پەلە و هەڵەداوان چوونە خزمەتی و، گوتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ هات، منیش لەناو خەڵکەکەدا بووم، هاتم تەماشای بکەم، جا کاتێ ڕوخساری پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ دەرکەوت، زانیم کە ئەو ڕوخسارە هی کەسی درۆزن نیە، ئنجا یەکەم شت کە فەرمووی، ئەوە بوو: ئەی خەڵکینە، زۆر سەلام لە یەکتری بکەن، وە خواردن ببەخشن، بە شەو نوێژ بکەن، لە کاتێک خەڵک خەوتوون، (ئەوکات) بە ئارامی و سەلامەتی دەچنە ناو بەهەشت.

## بابەت: ئەوانەی کە ماڵەوەیان هەڵدەستێنن لە شەودا (بۆ شەونوێژ)

**١٣٣٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ الرَّجُلُ مِنَ اللَّيْلِ وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ فَصَلَّيَا رَكْعَتَيْنِ كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ»(١).

واتە: ئەبو سەعید و ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کاتێک پیاو لە شەودا هەستایەوە و خێزانەکەشی هەستاند و دوو ڕکات نوێژیان کرد، ئەوا لەوانە ناونوس دەکرێن کە زۆر یادی خوا دەکەن لە ژنان و لە پیاوان.

**١٣٣٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَحِمَ اللَّهُ رَجُلًا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّى وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ فَصَلَّتْ، فَإِنْ أَبَتْ رَشَّ فِي وَجْهِهَا الْمَاءَ، رَحِمَ اللَّهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّتْ وَأَيْقَظَتْ زَوْجَهَا فَصَلَّى، فَإِنْ أَبَى رَشَّتْ فِي وَجْهِهِ الْمَاءَ»(٢).

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێ کە شەو هەڵسایەوە و نوێژی کردو خێزانەکەشی هەڵساند و ئەویش نوێژی کرد، خۆ ئەگەر هەڵنەستایەوە، ئەوە ئاو بڕشێنێ بە دەم و چاویدا، ڕەحمەتی خوا لەو ئافرەتەی کە شەو هەڵسایەوە نوێژی کرد و مێردەکەی بە ئاگا هێنایەوە و ئەویش

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٣٠٩ و ١٤٥١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٣٠٨ و ١٤٥٠، والنسائي: ١٦١٠.

نوێژی کرد، جا ئەگەر هەڵنەستایەوە، ئەوە ئاو بپرشێنێ بە دەم و چاویدا (ئاوێکی کەم بە پێداکردنێکی لەسەرخۆ و ئارام).

## بابەت: دەنگ خۆشی و جوان خوێندنی قورئان

١٣٣٧- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ السَّائِبِ، قَالَ: قَدِمَ عَلَيْنَا سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، وَقَدْ كُفَّ بَصَرُهُ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَنْ أَنْتَ؟ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِابْنِ أَخِي، بَلَغَنِي أَنَّكَ حَسَنُ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ نَزَلَ بِحُزْنٍ، فَإِذَا قَرَأْتُمُوهُ فَابْكُوا، فَإِنْ لَمْ تَبْكُوا فَتَبَاكَوْا، وَتَغَنَّوْا بِهِ فَمَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِهِ فَلَيْسَ مِنَّا»[1].

واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی سائیب، دەڵێ: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ هاتە لامان، لە کاتێکدا کە چاوەکانی لە دەست دابوو، منیش سەلامم لێکرد، گوتی: تۆ کێی؟ هەواڵم پێدا، جا گوتی: بەخێربێی برازای خۆم، پێم گەیشتووە کە بەڕاستی تۆ دەنگت خۆشە بۆ قورئان خوێندن، لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە کە دەیفەرموو: ئەو قورئانە بە جۆرێک دابەزیوە کە دڵ غەمگین دەکات (بە هۆی ئەو سزا و ڕووداوانەی کە تێیدا باسکراوە) جا کاتێک خوێندتانەوە بگریەن، خۆ ئەگەر نەگریان، خۆتان بگریەنن، بە دەنگی خۆش بیخوێنن، هەر کەس بە دەنگی خۆش نەیخوێنێ ئەوە لە ئێمە نیە.

١٣٣٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: أَبْطَأْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةً بَعْدَ الْعِشَاءِ، ثُمَّ جِئْتُ فَقَالَ: «أَيْنَ كُنْتِ؟» قُلْتُ: كُنْتُ أَسْتَمِعُ قِرَاءَةَ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِكَ لَمْ أَسْمَعْ مِثْلَ قِرَاءَتِهِ وَصَوْتِهِ مِنْ أَحَدٍ، قَالَتْ: فَقَامَ وَقُمْتُ مَعَهُ حَتَّى اسْتَمَعَ لَهُ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: «هَذَا سَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي أُمَّتِي مِثْلَ هَذَا»[2].

واتە: عائیشە ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: شەوێک دوای نوێژی خەوتنان خۆم دواخست لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، پاشان کە هاتمەوە فەرمووی: لە کوێ بووی؟ گوتم: گوێم لە قورئان خوێندنی یەکێک لە هاوەڵەکانت گرتبوو، کە گوێم لەو

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن.

شێوە خوێندنەوە و دەنگە نەبووە لە هیچ کەسێک، ئەویش هەڵساو منیش لەگەڵیدا هەڵسام تاکو گوێی لێبگرێ، پاشان ئاوڕی لە من دایەوە، فەرمووی: ئەوە سالیمەو بەندەی ئەبو حوزەیفەیە، سوپاس و ستایش بۆ خوا کە کەسانی ئاوای داناوە لە ناو ئوممەتەکەمدا.

**١٣٣٩- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ صَوْتًا بِالْقُرْآنِ، الَّذِي إِذَا سَمِعْتُمُوهُ يَقْرَأُ، حَسِبْتُمُوهُ يَخْشَى اللَّهَ»[١].**

**واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین و جوانترین دەنگ بۆ قورئان خوێندن (دەنگی) ئەو کەسەیە کە گوێتان لە خوێندنەکەی بوو هەست بکەن کە لە خوا دەترسێ (تەنها مەبەستی لە قورئان خوێندنەکە ڕەزامەندی خودا بێ).**

**١٣٤٠- عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَلَّهُ أَشَدُّ أَذَنًا إِلَى الرَّجُلِ الْحَسَنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ، مِنْ صَاحِبِ الْقَيْنَةِ إِلَى قَيْنَتِهِ»[٢].**

**واتە: فەزاڵەی کوڕی عوبەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا زیاتر گوێبیستی پیاوێکی دەنگخۆش دەکرێ کە قورئان بە ئاشکرا دەخوێنێ، لە گوێگرتنی خاوەن کەنیزەکێک کە گۆرانی بۆ دەڵێ.**

**١٣٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَسْجِدَ فَسَمِعَ قِرَاءَةَ رَجُلٍ فَقَالَ: «مَنْ هَذَا؟» فَقِيلَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ قَيْسٍ، فَقَالَ: «لَقَدْ أُوتِيَ هَذَا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ»[٣].**

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ناو مزگەوت و گوێی لە قورئان خوێندنی پیاوێک بوو، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوترا: عەبدوڵلای کوڕی قەیسە، فەرمووی: ئەو کەسە لە دەنگە خۆشەکەی ئالی داودی پێدراوە.**

**١٣٤٢- عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْسَجَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ ﷺ، يُحَدِّثُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ»[٤].**

---

(١) حسن لغيره.

(٢) ضعيف.

(٣) حسن صحيح. أخرجه النسائي: ١٠١٩.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٦٨، والنسائي: ١٠١٥ و ١٠١٦.

واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوسەجە، دەڵێ: گوێم لێبوو بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ دەیگێڕایەوە و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قوڕئان بە دەنگە خۆشەكانتان بڕازێننەوە.

## بابەت: ئەو كەسەی كە لە بەشە قوڕئان خوێندنی شەوەكەی خەوی لێدەكەوێ

**١٣٤٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ، أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الظُّهْرِ، كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ»[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەبدولقاری دەڵێ: گوێم لە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ بوو، دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس خەوی لێبكەوێ لە بەشە قوڕئان خوێندنی شەوەكەیدا، یان كەمێك لە بەشی شەوەكەی، دواتر لە نێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا (ئەو بەشەی) خوێند، وەک لە شەودا خوێندبێ بۆی هەژمار دەكرێ.

**١٣٤٤-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَتَى فِرَاشَهُ، وَهُوَ يَنْوِي أَنْ يَقُومَ فَيُصَلِّيَ مِنَ اللَّيْلِ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنُهُ حَتَّى يُصْبِحَ، كُتِبَ لَهُ مَا نَوَى، وَكَانَ نَوْمُهُ صَدَقَةً عَلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ»[2].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێیگەیشتوە، فەرموویەتی: هەر كەسێک هاتە سەر جێگای خەوەكەی و نیەتی ئەوەی هەبوو كە شەو هەڵسێتەوەو، شەونوێژ بكات، بەڵام خەو بەسەر چاوەكانیدا زاڵ بوو تاكو بەیانی، ئەوە ئەوەی نیەتی لێهێناوە بۆی دەنوسرێ، وە خەوەكەشی دەبێتە بەخششێكی خوا كە بە سەریدا ڕژاندووە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤٧، وأبو داود: ١٣١٣، والترمذي: ٥٨١، والنسائي: ١٧٩٠_١٧٩٢.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ١٧٨٧ و ١٧٨٨ موقوفاً.




## بابەت: ئەوەی کە سوننەتە
## لە ماوەی چەنددا قورئان خەتم بکرێ

**١٣٤٥-** عَنْ أَوْسِ بْنِ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ، فَنَزَّلُوا الْأَحْلَافَ عَلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، وَأَنْزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَنِي مَالِكٍ فِي قُبَّةٍ لَهُ، فَكَانَ يَأْتِينَا كُلَّ لَيْلَةٍ بَعْدَ الْعِشَاءِ فَيُحَدِّثُنَا قَائِمًا عَلَى رِجْلَيْهِ، حَتَّى يُرَاوِحَ بَيْنَ رِجْلَيْهِ وَأَكْثَرُ مَا يُحَدِّثُنَا مَا لَقِيَ مِنْ قَوْمِهِ مِنْ قُرَيْشٍ وَيَقُولُ: «وَلَا سَوَاءَ، كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ مُسْتَذَلِّينَ، فَلَمَّا خَرَجْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ كَانَتْ سِجَالُ الْحَرْبِ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ، نُدَالُ عَلَيْهِمْ وَيُدَالُونَ عَلَيْنَا» فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ لَيْلَةٍ أَبْطَأَ عَنِ الْوَقْتِ الَّذِي كَانَ يَأْتِينَا فِيهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقَدْ أَبْطَأْتَ عَلَيْنَا اللَّيْلَةَ قَالَ: «إِنَّهُ طَرَأَ عَلَيَّ حِزْبِي مِنَ الْقُرْآنِ فَكَرِهْتُ أَنْ أَخْرُجَ حَتَّى أُتِمَّهُ» قَالَ أَوْسٌ: فَسَأَلْتُ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ تُحَزِّبُونَ الْقُرْآنَ؟ قَالُوا: ثَلَاثٌ وَخَمْسٌ وَسَبْعٌ وَتِسْعٌ وَإِحْدَى عَشْرَةَ وَثَلَاثَ عَشْرَةَ وَحِزْبُ الْمُفَصَّلِ[1].

واتە: ئەوسی کوڕی حوزەیفە ﷺ دەڵێ: هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو وەفدی هۆزی سەقیف، جا ئەحلاف لای موغیرەی کوڕی شوعبە دابەزین، وە بەنو مالیک لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزین لە خەیمەکەیدا، هەموو شەوێک دوای خەوتنان (پێغەمبەر ﷺ) دەهات بۆ لامان، بەپێوە لەسەر دوو قاچەکانی قسەی بۆ دەکردین، تاکو وای لێدەهات نۆرەی بە پێیەکانی دەکرد (کە ماندوو دەبوو) وە زۆربەی ئەو باسانەی کە پێیانی دەفەرموو باسی ئەو ڕووداوانە بوو کە لەگەڵ گەلەکەی خۆی قورەیش بەسەریدا هاتبوو، وە دەیفەرموو: یەکسان نەبووین، ئێمە ژێردەستە و کەم و داماو بووین، جا کاتێک دەرچووین بۆ مەدینە شەڕ لە نێوانماندا ڕوویدەدا، جارێک ئێمە سەردەکەوتین جارێک ئەوان، جا کاتێک شەوێک لە کاتی خۆی دواکەوت و نەهات لەو کاتەی کە دەهاتە لامان، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شەو دواکەوتی، فەرمووی: لە ڕاستییدا خەریکی خوێندنی ئەو بەشە قورئانەی ڕۆژانەم بووم پێم خۆش نەبوو دەربچم تاکو تەواوی دەکەم. ئەوس گوتی: پرسیارم لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد چۆن قورئان بەش بەش دەکەن؟ گوتیان: سێ سووڕەت بەشێکە و، پێنج سووڕەت بەشێکە و،

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٣٩٣.

حەوت سوورەت بەشێکە و، نۆ سوورەت بەشێکە و، یانزە سوورەت بەشێکە و، سێزدە سوورەت بەشێکە و، لە سوورەتی «قاف» بەولاوە بەشێکە.

**١٣٤٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: جَمَعْتُ الْقُرْآنَ فَقَرَأْتُهُ كُلَّهُ فِي لَيْلَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي أَخْشَى أَنْ يَطُولَ عَلَيْكَ الزَّمَانُ، وَأَنْ تَمَلَّ، فَاقْرَأْهُ فِي شَهْرٍ». فَقُلْتُ: دَعْنِي أَسْتَمْتِعْ مِنْ قُوَّتِي وَشَبَابِي، قَالَ: «فَاقْرَأْهُ فِي عَشْرَةٍ» قُلْتُ: دَعْنِي أَسْتَمْتِعْ مِنْ قُوَّتِي وَشَبَابِي، قَالَ: «فَاقْرَأْهُ فِي سَبْعٍ» قُلْتُ: دَعْنِي أَسْتَمْتِعْ مِنْ قُوَّتِي وَشَبَابِي فَأَبَى[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: قورئانم لەبەرکرد، ئنجا هەموویم لە شەوێکدا دەخوێندەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەترسم لێت کە ڕۆژگار بەسەرتدا تێپەڕێ و تۆش توانای ئەوە نەبێ، بۆیە مانگی جارێک دەوری بکەوە و بیخوێنە، منیش گوتم: ڕێگەم بدە زیاتر چێژ لە هێز و گەنجیم وەربگرم، فەرمووی: لە دە ڕۆژدا بیخوێنە، گوتم: ڕێگەم بدە زیاتر چێژ لە هێز و گەنجیم وەربگرم، فەرمووی: کەواتە لە حەوت ڕۆژدا بیخوێنە، گوتم: ڕێگەم بدە زیاتر چێژ لە هێز و گەنجیم وەربگرم، ئەویش ڕێگەی نەدا لەوە زیاتر.

**١٣٤٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَمْ يَفْقَهْ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە کەمتر لە سێ ڕۆژدا قورئان تەواو بکات، ئەوە لە مانا و مەبەستی تێناگات.

**١٣٤٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «لَا أَعْلَمُ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ حَتَّى الصَّبَاحِ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: نەمزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی هەموو خوێندبێ تاکو بەیانی.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٧٨ و ٥٠٥٢، ومسلم: ١١٥٩، وأبو داود: ١٣٩٠، والترمذي: ٢٩٤٦، والنسائي: ٢٤٠٠.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٣٩٠ و ١٣٩٤، والترمذي: ٢٩٤٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤٦، وأبو داود: ١٣٤٢، والنسائي: ١٦٤١ و ٢١٨٢.

## بابەت: خوێندنی قورئان لە شەونوێژدا

**١٣٤٩-** عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ ﵂، قَالَتْ: «كُنْتُ أَسْمَعُ قِرَاءَةَ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ وَأَنَا عَلَى عَرِيشِي»(١).

**واتە:** ئوممو هانیئی کچی ئەبو تاڵیب ﵂ دەڵێ: گوێم لە قورئان خوێندنەکەی پێغەمبەر ﷺ دەبوو، بە شەوانە لە کاتێکدا کە من لەسەر سەقفی ماڵەکەی خۆم بووم.

**١٣٥٠-** عَنْ جَسْرَةَ بِنْتِ دَجَاجَةَ، قَالَتْ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ ﵁، يَقُولُ: «قَامَ النَّبِيُّ ﷺ بِآيَةٍ حَتَّى أَصْبَحَ يُرَدِّدُهَا» وَالْآيَةُ: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ١١٨﴾ المائدة(٢).

**واتە:** جەسرەی کچی دەجاجە، دەڵێ: گوێم لە ئەو زەڕ ﵁ بوو دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ بە ئایەتێک شەونوێژی کرد تاکو بەیانی دووبارەی دەکردەوە، ئەویش ئەو ئایەتە بوو: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ١١٨﴾ المائدة، واتە: ئەگەر سزایان بدەیت، ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن وە ئەگەر لێشیان خۆش ببیت ئەوە بێگومان تەنها خۆتی بەدەستەڵات و کاردروست.

**١٣٥١-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «صَلَّى فَكَانَ إِذَا مَرَّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ سَأَلَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةِ عَذَابٍ اسْتَجَارَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا تَنْزِيهٌ لِلَّهِ سَبَّحَ»(٣).

**واتە:** حوزەیفە ﵁ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد، جا کاتێک بە ئایەتێکدا تێدەپەڕی کە باسی ڕەحمەت و بەزەیی دەکرد داوای (ڕەحمەت و بەزەیی خوای) دەکرد، وە کاتێک بە ئایەتی سزادا تێدەپەڕی پەنای دەگرت بە خوا (لە سزای خوا)، وە کاتێک بە ئایەتێکدا تێدەپەڕی کە باسی پاکی و بێگەردی خوای دەکرد «سبحان الله»ـی دەکرد (واتە: خوای بە پاک و بێگەرد ناو دەبرد).

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ١٠١٣.

(٢) حسن. أخرجه النسائي: ١٠١٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٧٢، وأبو داود: ٨٧١، والترمذي: ٢٦٢، والنسائي: ١٠٠٨ و ١٠٠٩.

**١٣٥٢- عَنْ أَبِي لَيْلَى ﷺ، قَالَ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تَطَوُّعًا فَمَرَّ بِآيَةِ عَذَابٍ فَقَالَ: «أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ وَوَيْلٌ لِأَهْلِ النَّارِ»[١].**

واتە: ئەبو لەیلا ﷺ دەڵێ: لە تەنیشت پێغەمبەر ﷺ نوێژم کرد کاتێک ئەو لە شەودا نوێژی سوننەتی دەکرد، ئنجا ئایەتێکی خوێند کە باسی سزای دەکرد، جا فەرمووی: پەنا دەگرم بە خوا لە ئاگر، وە سزای سەخت بۆ خەڵکی دۆزەخ.

**١٣٥٣- عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ عَنْ قِرَاءَةِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «كَانَ يَمُدُّ صَوْتَهُ مَدًّا»[٢].**

واتە: قەتادە دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ کرد دەربارەی قوڕئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش گوتی: دەنگی (بە قوڕئان خوێندن) درێژ دەکردەوە.

**١٣٥٤- عَنْ غُضَيْفِ بْنِ الْحَارِثِ، قَالَ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ ﷺ، فَقُلْتُ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْهَرُ بِالْقُرْآنِ أَوْ يُخَافِتُ بِهِ قَالَتْ: «رُبَّمَا جَهَرَ وَرُبَّمَا خَافَتَ» قُلْتُ: اللَّهُ أَكْبَرُ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي هَذَا الْأَمْرِ سَعَةً[٣].**

واتە: غوزەیفی کوڕی حاریس، دەڵێ: هاتم بۆ لای عائیشە ﷺ گوتم: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قوڕئانی بە دەنگی بەرز دەخوێند یان بە دەنگی نزم؟ گوتی: هەندێ جار بە دەنگی بەرز و، هەندێ جار بە دەنگی نزم، گوتم: «الله أكبر»، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە فراوانی خستۆتە ناو ئەو دینەوە.

## بابەت: دوعای ئەو کاتانەی کەسێک بە شەو هەڵدەستێتەوە

**١٣٥٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا تَهَجَّدَ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ مَالِكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ حَقٌّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ حَقٌّ،**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٨٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٤٥ و ٥٠٤٦، وأبو داود: ١٤٦٥، والنسائي: ١٠١٤.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٦ و ١٤٣٧، والترمذي: ٤٤٩، والنسائي: ١٦٦٢.

اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِكَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک شەونوێژی دەکرد، دەیفەرموو: خودایە سوپاس و ستایش بۆ تۆ، تۆ ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لە ناویاندایە، وە سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ هەڵسوڕێنەری ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لە ناویاندایە، وە سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لە ناویاندایە، وە سوپاس و ستایش بۆ تۆیە، تۆ هەقی، وە بەڵێنەکانت هەقن، وە پێگەیشتنت هەقە، وە فەرمایشتەکەت هەقە، وە بەهەشت هەقە، وە دۆزەخ هەقە، وە ڕۆژی دوایی هەقە، وە پێغەمبەران ﷺ هەقن، وە موحەممەد ﷺ هەقە، خوایە ملکەچی فەرمانەکانی تۆم و خۆم سپاردووە بە تۆ، وە بڕوام هێناوە بە تۆ، وە پشتم هەر بە تۆ بەستووە، وە هەر بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە، وە بە پشتیوانی تۆ بەرەنگاری (دوژمنان) دەبمەوە، وە حوکمی کێشەکان تەنها بۆ لای تۆ دێنمەوە، سا لەو گوناهانەم خۆش بە کە پێشم خستووە وە لەو گوناهانەشم کە دوام خستووە، وە ئەوەی کە بە نهێنی کردوومە، وە ئەوەشی کە بە ئاشکرا کردوومە، پێشخستن و پاش خستن، تەنها بە دەستی تۆیە، هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، تەنها تۆ نەبێ، وە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە تۆ، وە هیچ ئاڵو گۆڕ و وەرگێڕانێک و هێزێک نیە تەنها بە پشتیوانی تۆ نەبێ.

**١٣٥٥م-** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ خَلَّادٍ الْبَاهِلِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ أَبِي مُسْلِمٍ الْأَحْوَلُ، خَالُ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، سَمِعَ طَاوُسًا، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ لِلتَّهَجُّدِ فَذَكَرَ نَحْوَهُ[٢].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٢٠، ومسلم: ٧٦٩، وأبو داود: ٧٧١ و ٧٧٢، والترمذي: ٣٤١٨، والنسائي: ١٦١٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٢٠، ومسلم: ٧٦٩، وأبو داود: ٧٧١ و ٧٧٢، والترمذي: ٣٤١٨، والنسائي: ١٦١٩.

**١٣٥٦-** عَنْ عَاصِمِ بْنِ حُمَيْدٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂: مَاذَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَفْتَتِحُ بِهِ قِيَامَ اللَّيْلِ؟ قَالَتْ: لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ شَيْءٍ مَا سَأَلَنِي عَنْهُ أَحَدٌ قَبْلَكَ، كَانَ يُكَبِّرُ عَشْرًا، وَيَحْمَدُ عَشْرًا، وَيُسَبِّحُ عَشْرًا، وَيَسْتَغْفِرُ عَشْرًا، وَيَقُولُ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي وَعَافِنِي» وَيَتَعَوَّذُ مِنْ ضِيقِ الْمُقَامِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[١].

واتە: عاصیمی کوڕی حومەیدەوە دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂، کە ئایا پێغەمبەر ﷺ شەونوێژی بە چی دەست پێدەکرد؟ گوتی: لەڕاستییدا دەربارەی شتێک پرسیارت لێکردم کە هیچ کەسێک پێش تۆ دەربارەی ئەو شتە پرسیاری لێنەکردووم، دە جار «الله أكبر»ـی دەکرد، وە دە جار «الحمدلله»ـی دەکرد، وە دە جار «سبحان الله»ـی دەکرد، وە دە جار «أستغفر الله»ـی دەکرد، وە دەیفەرموو: خوایە لێم خۆشبە و هیدایەتم بدە و ڕزق و ڕۆزیم بدە و لەش ساغ و سەلامەتم بکە، وە پەنای بە خوا دەگرت لە نارەحەتییەکانی ڕۆژی دوایی.

**١٣٥٧-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂: بِمَ كَانَ يَسْتَفْتِحُ النَّبِيُّ ﷺ صَلَاتَهُ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرَئِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ، إِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ» قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عُمَرَ: احْفَظُوهُ - جِبْرَئِيلَ - مَهْمُوزَةً فَإِنَّهُ كَذَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٢].

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂ ئایا پێغەمبەر ﷺ بە چ شتێک دەستی دەکرد بە نوێژەکانی کاتێ شەو هەڵدەستایەوە؟ گوتی: دەیفەرموو: خودایە ئەی پەروەردگاری جیبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانا و ئاگادار بە پەنهان و ئاشکراکان، تۆ دادوەری دەکەی لەسەر ئەو هەقەی کە خەڵکی تێیدا جیاوازن، سا هیدایەت و ڕێنوێنیم بکە لەوەی کە تێیدا جیاوازن لە هەق و ڕاستی بە مۆڵەتی خۆت، بەڕاستی هەر تۆ ڕێنوێنی دەکەی بۆ ڕاستە ڕێگای هەق. عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عومەر دەڵێ: -جیبرەئیل- بە پیتی هەمزە لەبەر بکەن، چونکە بەو شێوەیە هاتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٧٦٦، والنسائي: ١٦١٧ و ٥٥٣٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٧٠، وأبو داود: ٧٦٧، والترمذي: ٣٤٢٠، والنسائي: ١٦٢٥.

## بابەت: ئەوەی کە چەند نوێژ دەکرێ بە شەو

١٣٥٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ - وَهَذَا حَدِيثُ أَبِي بَكْرٍ ﷺ- قَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي، مَا بَيْنَ أَنْ يَفْرُغَ مِنْ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِلَى الْفَجْرِ، إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُسَلِّمُ فِي كُلِّ اثْنَتَيْنِ، وَيُوتِرُ بِوَاحِدَةٍ، وَيَسْجُدُ فِيهِنَّ سَجْدَةً، بِقَدْرِ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً، قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، فَإِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ مِنَ الْأَذَانِ الْأَوَّلِ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ، قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە - ئەمە فەرموودەی ئەبو بەکرە ﷺ - دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە نوێژی عیشای دەکرد لە نێوان نوێژی عیشا تاکو بەیانی یازدە ڕکات نوێژی دەکرد، لە هەر دوو ڕکاتێک سەلامی دەدایەوە، وە بە یەک ڕکات نوێژی ویتری دەکرد، وە بە جۆرێ سوجدەی دەبرد کە سوجدەیەکی بە ئەندازەی ئەوە بوو کە یەکێک لە ئێوە پەنجا ئایەت بخوێنێ پێش ئەوەی سەری بەرز بکاتەوە، جا کاتێ کە بانگ بێژ لە بانگی یەکەم دەبۆوە بۆ نوێژی بەیانی هەڵدەستا دوو ڕکات نوێژی کورت و پوختی دەکرد.

١٣٥٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سێزدە ڕکاتی نوێژی دەکرد لە شەواندا.

١٣٦٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ «يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە شەواندا نۆ ڕکات نوێژی دەکرد.

١٣٦١- عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ، فَقَالَا: «ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، مِنْهَا ثَمَانٍ، وَيُوتِرُ بِثَلَاثٍ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْفَجْرِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٩٤، ومسلم: ٧٣٦، وأبو داود: ١٣٣٦، والترمذي: ٤٤٠ و ٤٤١، والنسائي: ٦٨٥ و ١٣٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٧٠، ومسلم: ١٧٢١، وأبو داود: ١٣٣٩، والترمذي: ٤٥٨.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٤٤٣ وبإثر ٤٤٤، والنسائي: ١٧٢٥، وانظر البخاري: ١١٣٩.

(٤) صحيح.

واتە: عامیری شەعبیی ﵀ دەڵێ: پرسیارم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ و، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ کرد دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتیان: سێزدە ڕکات بوون، هەشتیان شەونوێژ و بە سێ ڕکاتیش نوێژی ویتری دەکرد وە دوو ڕکاتیش دوای کاتی نوێژی بەیانی (واتە: پێش ئەوەی نوێژی بەیانی بکات).

**١٣٦٢-** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﵁، قَالَ: قُلْتُ، لَأَرْمُقَنَّ صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ اللَّيْلَةَ، قَالَ: فَتَوَسَّدْتُ عَتَبَتَهُ، أَوْ فُسْطَاطَهُ، «فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ، طَوِيلَتَيْنِ، طَوِيلَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ، فَتِلْكَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً»[١].

واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی ﵁ دەڵێ: گوتم: ئەمشەو سەرنج دەدەمە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، دەڵێ: منیش سەرم کردە بەر دەرگاکەی، یان خەیمەکەی پێغەمبەر ﷺ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایەوە دوو ڕکات نوێژی کورت و پوختی کرد، پاشان دوو ڕکاتی درێژی کرد، پاشان دوو ڕکاتی دیکە کە ئەوان وەک ئەوانەی پێشوو درێژ نەبوون، پاشان دوو ڕکاتی دیکە کە وەک دوو ڕکاتی پێش خۆیان درێژ نەبوون، پاشان دوو ڕکاتی دیکە کە وەک هی پێش خۆیان درێژ نەبوون، پاشان دوو ڕکاتی دیکە، پاشان نوێژی ویتری کرد، کە ئەوەش دەکاتە سێزدە ڕکات.

**١٣٦٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ نَامَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ وَهِيَ خَالَتُهُ قَالَ: فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ النَّبِيُّ ﷺ، حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ، أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ، أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ، «اسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ ﷺ فَجَعَلَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ آيَاتٍ مِنْ آخِرِ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ، فَتَوَضَّأَ مِنْهَا، فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي» قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ: فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي وَأَخَذَ أُذُنِي الْيُمْنَى يَفْتِلُهَا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى جَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٦٥، وأبو داود: ١٣٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٣، ومسلم: ٧٦٣، وأبو داود: ١٣٦٧، والنسائي: ١٦٢٠.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە شەوێک لە لای مەیمونەی خیزانی پێغەمبەر ﷺ بووە کە پوریەتی، دەڵێ: منیش لەباری پانی سەرینەکە ڕاکشام، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خێزانی لەباری درێژی سەرینەکە ڕاکشا، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) خەوت، تاکو شەو بە نیوەیی بوو، یان کەمێک پێشتر، یان کەمێک دواتر، پێغەمبەر ﷺ بە ئاگا هات و هەڵسا، بە دەستەکانی خەوی لە دەم و چاوی ڕادەماڵی، پاشان دە ئایەتی کۆتایی سوورەتی ئالی عیمرانی خوێند، دواتر ڕۆیشت بۆ لای کوندەیەکی ئاو کە هەڵواسرابوو، ئنجا دەستنوێژێکی جوان و باشی پێ شۆرد، پاشان هەڵسا نوێژ بکات، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: منیش هەڵسام ئەوەی ئەو کردی منیش کردم (وەکو ئەو)، پاشان ڕۆیشتم لە تەنیشتی ڕاوەستام، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی ڕاستی خستە سەرم، وە گوێی گرتم و کەمێک بایدا، (لە فەرموودەی تردا دەڵێ: هێنامیە لای ڕاستی خۆی) ئنجا دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان دوو ڕکات، پاشان دوو ڕکات، پاشان دوو ڕکات، پاشان دوو ڕکات، پاشان دوو ڕکات، دواتر نوێژی ویتری کرد، پاشان ڕاکشا تاکو بانگبێژ هات بۆلای (بۆ نوێژی بەیانی) ئنجا دوو ڕکاتی کورت و پوختی کرد، پاشان چوو بۆ نوێژ.

## بابەت: باشترین کاتی شەو

**١٣٦٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَسْلَمَ مَعَكَ؟ قَالَ: «حُرٌّ وَعَبْدٌ» قُلْتُ: هَلْ مِنْ سَاعَةٍ أَقْرَبُ إِلَى اللَّهِ مِنْ أُخْرَى؟ قَالَ: «نَعَمْ، جَوْفُ اللَّيْلِ الْأَوْسَطُ»**[(١)].

واتە: عەمری کوڕی عەبەسە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا کێن ئەوانەی کە لەگەڵت مسوڵمان بوون؟ فەرمووی: خەڵکی ئازاد و خەڵکی بەندە، گوتم: ئایا هیچ کاتێک هەیە کە (مرۆڤ تێیدا) نزیکتر بێ لە خوا لە کاتێکی تر؟ فەرمووی: بەڵێ، ناوەڕاستی شەو.

---

(١) ضعيف بهذا السياق.

**١٣٦٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنَامُ أَوَّلَ اللَّيْلِ، وَيُحْيِي آخِرَهُ»[١].**

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای شەو دەخەوت و کۆتاییەکەی زیندوو دەکردەوە (بە ئاگابوو).**

**١٣٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ، كُلَّ لَيْلَةٍ، فَيَقُولُ: مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ» فَلِذَلِكَ كَانُوا يَسْتَحِبُّونَ صَلَاةَ آخِرِ اللَّيْلِ عَلَى أَوَّلِهِ[٢].**

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرزو بە دەسەڵات کاتێک سێیەکی کۆتایی شەو دەمێنێ دادەبەزێ (بە جۆرێک کە شایستەی شکۆ و بەرزی پەروەردگارە) ئنجا دەفەرموێ: کێ هەیە داواکاری لێم هەبێ تاکو پێی بدەم، کێ هەیە داوام بکات، دوعا بکات تاکو وەڵامی بدەمەوە، کێ هەیە داوای لێخۆش بوون بکات تاکو لێی خۆش بم، تاکو بەیانی دەبێتەوە. (ڕاوی دەڵێ:) هەر بۆیەشە کە کۆتایی شەویان لەلا خۆشەویستتر بوو لە سەرەتایەکەی.**

**١٣٦٧- عَنْ رِفَاعَةَ الْجُهَنِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يُمْهِلُ، حَتَّى إِذَا ذَهَبَ مِنَ اللَّيْلِ نِصْفُهُ أَوْ ثُلُثَاهُ، قَالَ: لَا يَسْأَلَنَّ عِبَادِي غَيْرِي، مَنْ يَدْعُنِي أَسْتَجِبْ لَهُ، مَنْ يَسْأَلْنِي أُعْطِهِ، مَنْ يَسْتَغْفِرْنِي أَغْفِرْ لَهُ، حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ»[٣].**

**واتە: ڕیفاعەی جوهەنیی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا ماوە دەدات تاکو شەو نیوە، یان دوو سێیەکی دەڕوات، دەفەرموێ: بەندەکانم جگە لە من داوا لە کەس نەکەن، هەر کەس داواکاری هەبێ وەڵامی دەدەمەوە، هەر کەس پێویستی هەبێ پێیدەدەم، هەر کەس داوای لێخۆش بوون بکات لێی خۆش دەبم، (بەردەوام دەبێ) تاکو بەیانی دەبێتەوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٤٦، ومسلم: ٧٣٩، والنسائي: ١٦٤٠ و ١٦٨٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٤٥، ومسلم: ٧٥٨، وأبو داود: ١٣١٥ و ٤٧٣٣، والترمذي: ٤٤٦ و ٣٤٩٨.

(٣) صحيح.




## بابەت: ئەوەی کە چاوەڕوان دەکرێ بەبرێ شەونوێژ بکەوێ

**١٣٦٨-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَأَهُمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ» قَالَ حَفْصٌ فِي حَدِيثِهِ: قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَلَقِيتُ أَبَا مَسْعُودٍ وَهُوَ يَطُوفُ فَحَدَّثَنِي بِهِ[1].

**واتە:** ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو ئایەت هەیە لە کۆتایی سوورەتی بەقەڕە هەر کەس بیانخوێنێ لە شەوێکدا بەسییەتی، حەفص لە ڕیوایەتەکەیدا دەڵێ: عەبدوڕڕەحمان گوتی: بە ئەبو مەسعوود ﷺ گەیشتم لە کاتێکدا کە تەوافی دەکرد، ئەویش ئەو فەرموودەیەی بۆ گێڕامەوە.

**١٣٦٩-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَرَأَ الْآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ»[2].

**واتە:** ئەبو مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دوو ئایەتی کۆتایی سووڕەتی بەقەڕە بخوێنێتەوە لە شەودا بەسییەتی.

## بابەت: ئەو کەسەی لە نوێژدا خەوی دێت

**١٣٧٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي، إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ، لَعَلَّهُ يَذْهَبُ فَيَسْتَغْفِرُ، فَيَسُبُّ نَفْسَهُ»[3].

**واتە:** عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە خەوی هات، با پاڵبداتەوەو بخەوێ تاکو خەوەکەی دەڕوات، چونکە ئەو کەسە کاتێک نوێژ دەکات و خەوی دێت نازانێ، بۆی هەیە بیەوێ داوای لێخۆش بوون لە خوا بکات، بەڵام لە جیاتی ئەوە جنێو بە خۆی بدات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٠٨، ومسلم: ٨٠٧ و ٨٠٨، وأبو داود: ١٣٩٧، والترمذي: ٢٨٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٠٨، ومسلم: ٨٠٧ و ٨٠٨، وأبو داود: ١٣٩٧، والترمذي: ٢٨٨١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٢، ومسلم: ٧٨٦، وأبو داود: ١٣١٠، والترمذي: ٣٥٥، والنسائي: ١٦٢.

**١٣٧١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَرَأَى حَبْلًا مَمْدُودًا بَيْنَ سَارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: «مَا هَذَا الْحَبْلُ؟» قَالُوا: لِزَيْنَبَ تُصَلِّي فِيهِ فَإِذَا فَتَرَتْ تَعَلَّقَتْ بِهِ فَقَالَ: «حُلُّوهُ حُلُّوهُ لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا فَتَرَ فَلْيَقْعُدْ»[١].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ناو مزگەوت، ئنجا بینی پەتێک (گوریسێک) ڕاکێشراوە لە بەینی دوو کۆڵەکەدا، ئنجا فەرمووی: ئەم پەتکە چییە؟ گوتیان: هی زەینەبە نوێژ لە نێوانیدا دەکات، جا کاتێک ماندوو بوو هێزی نەما خۆی پێوە دەگرێ، فەرمووی: بیکەنەوە، بیکەنەوە، هەر یەکێکتان با لە کاتی چالاکیدا نوێژ بکات، جا هەرکات ماندو و بێ هێز بوو با دابنیشێ.

**١٣٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ، فَاسْتَعْجَمَ الْقُرْآنُ عَلَى لِسَانِهِ، فَلَمْ يَدْرِ مَا يَقُولُ، اضْطَجَعَ»[٢].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لە شەودا هەڵسایەوە (بۆ نوێژ، یان قورئان خوێندن) جا زمانی تەتەڵەی دەکرد لە قورئان خوێندندا و هەڵەی دەکرد، وە نەیدەزانی چی دەڵێ، با ڕاکشێ (تاکو خەو بەریدەدات).

## بابەت: نوێژکردن لە نێوان شێوان و خەوتنان

**١٣٧٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى، بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، عِشْرِينَ رَكْعَةً بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ»[٣].**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە نێوانی مەغریب و عیشا بیست ڕکات نوێژ بکات، خوا ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٥٠، ومسلم: ٧٨٤، وأبو داود: ١٣١٢، والنسائي: ١٦٤٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٨٧، وأبو داود: ١٣١١.

(٣) موضوع.




**١٣٧٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى سِتَّ رَكَعَاتٍ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، لَمْ يَتَكَلَّمْ بَيْنَهُنَّ بِسُوءٍ، عُدِلَتْ لَهُ عِبَادَةَ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شەش ڕکات بکات لە دوای نوێژی مەغریب، وە لە نێوانیاندا قسەی نابەجێ نەکات، ئەوە بۆی بەرانبەر دەکرێ بە پەرستشی دوازدە ساڵ.

## بابەت: نوێژی سوننەت لە ماڵەوە

**١٣٧٥-** عَنْ عَاصِمِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: خَرَجَ نَفَرٌ مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ إِلَى عُمَرَ ﷺ فَلَمَّا قَدِمُوا عَلَيْهِ، قَالَ لَهُمْ: مِمَّنْ أَنْتُمْ؟ قَالُوا: مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ، قَالَ: فَبِإِذْنٍ جِئْتُمْ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: فَسَأَلُوهُ عَنْ صَلَاةِ الرَّجُلِ فِي بَيْتِهِ، فَقَالَ عُمَرُ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَمَّا صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي بَيْتِهِ فَنُورٌ، فَنَوِّرُوا بُيُوتَكُمْ»[٢].

**واتە:** عاصیمی کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: هەندێ کەس لە عێراقەوە ڕۆیشتن بۆ لای عومەر ﷺ، جا کاتێ چوونە لای پێیگوتن: ئێوە کێن؟ گوتیان: خەڵکی عێراقین، گوتی: بە مۆڵەت هاتوون؟ گوتیان: بەڵێ، (ڕاوی) دەڵێ: جا پرسیاریان لێکرد لە نوێژی کەسێک لە ماڵەوە، عومەریش ﷺ گوتی: منیش پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: بەڵام نوێژی مرۆڤ لە ماڵەکەیدا ڕووناکی و ڕۆشناییە، کەواتە ماڵەکانتان ڕووناک بکەنەوە.

**١٣٧٥م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي الْحُسَيْنِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَبِي أُنَيْسَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ عُمَيْرٍ مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[٣].

**واتە:** بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٤٣٥.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.




**١٣٧٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ صَلَاتَهُ، فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِهِ مِنْهَا نَصِيبًا، فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ فِي بَيْتِهِ مِنْ صَلَاتِهِ خَيْرًا»[1].**

**واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان نوێژەکانی بەجێ گەیاند با بەشێک بۆ ماڵەکەی بهێڵێتەوە، بەڕاستی خوا بەهۆی نوێژەکانی خێر و چاکە دەخاتە ناو ماڵەکەیەوە (واتە: سوننەتەکان بباتەوە ماڵ).**

**١٣٧٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَتَّخِذُوا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا»[2].**

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان (واتە: نوێژیان تێدا بکەن با ڕووناک ببنەوە).**

**١٣٧٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَيُّمَا أَفْضَلُ؟ الصَّلَاةُ فِي بَيْتِي أَوِ الصَّلَاةُ فِي الْمَسْجِدِ؟ قَالَ: «أَلَا تَرَى إِلَى بَيْتِي؟ مَا أَقْرَبَهُ مِنَ الْمَسْجِدِ فَلَأَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِي أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُصَلِّيَ فِي الْمَسْجِدِ، إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَلَاةً مَكْتُوبَةً»[3].**

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ئایا کامیان باشترە، نوێژکردن لە ماڵەکەمدا یان لە مزگەوتدا؟ فەرمووی: ئایا نابینی ماڵەکەم چەندە لە مزگەوت نزیکە؟! جا ئەگەر نوێژ لە ماڵەوە بکەم پێم خۆشترە لەوەی کە لە مزگەوتدا نوێژ بکەم مەگەر نوێژە فەرزەکان نەبێ (واتە: نوێژی فەرز لە مزگەوت خێری زیاترە).**

## بابەت: نوێژی چێشتەنگاو

**١٣٧٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ، قَالَ: سَأَلْتُ فِي زَمَنِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ وَالنَّاسُ مُتَوَافِرُونَ - أَوْ مُتَوَافُونَ - عَنْ صَلَاةِ الضُّحَى، فَلَمْ أَجِدْ أَحَدًا يُخْبِرُنِي أَنَّهُ صَلَّاهَا - يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ - غَيْرَ أُمِّ هَانِئٍ فَأَخْبَرَتْنِي أَنَّهُ «صَلَّاهَا ثَمَانَ رَكَعَاتٍ»[4].**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٧٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٢، ومسلم: ٧٧٧، وأبو داود: ١٤٤٨ و ١٠٤٣، والترمذي: ٤٥١، والنسائي: ١٥٩٨.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٧ و ١١٧٦، ومسلم: ٣٣٦ وبإثر ٧١٩، وأبو داود: ١٢٩٠ و ١٢٩١.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریس دەڵێ: لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا ﷺ پرسیارم کرد دەربارەی نوێژی چێشتەنگاو وە ئەو کاتە خەڵکی زۆر بوون، ئنجا یەک کەسیش نەبوو پێم بڵێ پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، جگە ئوممو هانیئ، ئەو هەواڵی پێدام (پێغەمبەر ﷺ) بە هەشت ڕکات کردوویەتی.

١٣٨٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ صَلَّى الضُّحَى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً، بَنَى اللَّهُ لَهُ قَصْرًا مِنْ ذَهَبٍ فِي الْجَنَّةِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک دوازدە ڕکات نوێژی چێشتەنگاو بکات، خوا لە بەهەشتدا کۆشکێکی لە زێڕ بۆ دروست دەکات.

١٣٨١- عَنْ مُعَاذَةَ الْعَدَوِيَّةِ ﷺ، قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ: «أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى؟ قَالَتْ: نَعَمْ، أَرْبَعًا، وَيَزِيدُ مَا شَاءَ اللَّهُ»[2].

واتە: موعازەتەی عەدەویی ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﷺ ئایا پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ گوتی: بەڵێ، چوار ڕکات، وە زیاتریش ئەوەندەی خوا ویستی لەسەربا.

١٣٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَافَظَ عَلَى شُفْعَةِ الضُّحَى، غُفِرَتْ لَهُ ذُنُوبُهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پارێزگاری لە دوو ڕکاتی نوێژی چێشتەنگاو بکات، لە گوناهەکانی دەبوردرێ ئەگەر بە ئەندازەی کەفی دەریاش بن.

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٤٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧١٩.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٤٧٦.

## بابەت: نوێژی ئیستیخارە

١٣٨٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا الِاسْتِخَارَةَ، كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ يَقُولُ: «إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالْأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ هَذَا الْأَمْرَ - فَيُسَمِّيهِ، مَا كَانَ مِنْ شَيْءٍ - خَيْرًا لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي - أَوْ خَيْرًا لِي فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ - فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي وَبَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ - يَقُولُ مِثْلَ مَا قَالَ فِي الْمَرَّةِ الْأُولَى - وَإِنْ كَانَ شَرًّا لِي، فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُمَا كَانَ، ثُمَّ رَضِّنِي بِهِ»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری نوێژی ئیستیخارەی دەکردین وەکو چۆن فێری سوورەتێک لە سوورەتەکانی قورئانی دەکردین، دەیفەرموو: ئەگەر یەکێک لە ئێوە ویستی کارێک بکات، با دوو ڕکات نوێژ بکات لە غەیری نوێژی فەرز، پاشان بڵێ: خوایە بە زانستی خۆت داوای چاکە و خێرت لێدەکەم، وە داوای هێزت لێدەکەم بە هێز و توانای خۆت، وە لە فەزڵ و چاکە و گەورەیی خۆت داوات لێدەکەم، بەڕاستی تۆ دەتوانی و من ناتوانم، وە تۆ دەزانیت و من نازانم، وە تۆ زانا و شارەزای بە هەموو نهێنی و پەنهانەکان، سا خوایە ئەگەر ئەو کارە -لێرەدا ناوی کارەکە دێنێ- خێر و چاکەیە بۆ من بۆ دین و ژین و کۆتایی تەمەنم -یان بۆ ئێستام و کۆتاییم- بیکە بە بەشم و بۆم ئاسان بکەو بیکە بە خێر و بەرەکەت بۆم، وە ئەگەر دەزانی -بە شێوەی یەکەم جار دەڵێ- ئەگەر (ئەو کارە) شەڕ و خراپەی تێدایە بۆ من لێم دووربخەوە و منی لێ دووربخەوە، وە چاکە بکە بەشم لە هەر شوێنێک بێ، پاشان منی پێ ڕازی بکە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٦٢ و ٦٣٨٢، وأبو داود: ١٥٣٨، والترمذي: ٤٨٠، والنسائي: ٣٢٥٣.

## بابەت: نوێژی داواکردنی پێویستی (حاجە)

**١٣٨٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى الْأَسْلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ إِلَى اللَّهِ، أَوْ إِلَى أَحَدٍ مِنْ خَلْقِهِ، فَلْيَتَوَضَّأْ وَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ لِيَقُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مُوجِبَاتِ رَحْمَتِكَ، وَعَزَائِمَ مَغْفِرَتِكَ، وَالْغَنِيمَةَ مِنْ كُلِّ بِرٍّ، وَالسَّلَامَةَ مِنْ كُلِّ إِثْمٍ، أَسْأَلُكَ أَلَّا تَدَعَ لِي ذَنْبًا إِلَّا غَفَرْتَهُ، وَلَا هَمًّا إِلَّا فَرَّجْتَهُ، وَلَا حَاجَةً هِيَ لَكَ رِضًا إِلَّا قَضَيْتَهَا لِي، ثُمَّ يَسْأَلُ اللَّهَ مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ مَا شَاءَ، فَإِنَّهُ يُقَدَّرُ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفای ئەسلەمیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان و فەرمووی: هەر یەکێک پێویستییەکی لای خوای هەبوو، یان لای هەر کەسێکی دیکە هەیبوو لە دروست کراوەکانی، با دەستنوێژ بگرێ و دوو ڕکات نوێژ بکات، پاشان بڵێت: هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا، خاوەنی سیفەتی ئارامی و سەخاوەت و بەخشندەییە، پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگاری عەرشی گەورە، سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانییان، خودایە من داوای ئەو هۆکارانەت لێدەکەم کە دەبنە هۆی ڕەحمەت و سۆزی تۆ، وە ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی دڵنیاکەرەوەی لێخۆش بوونی تۆ، وە دەستکەوتنی هەرچی چاکە و خێرە، وە سەلامەتی و قوتاربوون لە هەرچی تاوانە، داوات لێدەکەم هیچ گوناهێکم نەهێڵی مەگەر چاوپۆشیت لێکردبێ، وە هیچ غەمێک ئیللا ڕەواندبێتەوە، وە هەر پێویستییەک کە تۆی لێی ڕازی بۆت جێبەجێ کردبم، پاشان لە کار و باری دونیا و دواڕۆژی چی پێخۆشە با داوای بکات، ئەوا بەڕاستی جێبەجێ دەبێ.

**١٣٨٥-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا ضَرِيرَ الْبَصَرِ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ لِي أَنْ يُعَافِيَنِي فَقَالَ: «إِنْ شِئْتَ أَخَّرْتُ لَكَ وَهُوَ خَيْرٌ، وَإِنْ شِئْتَ دَعَوْتُ» فَقَالَ: ادْعُهْ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ وُضُوءَهُ، وَيُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ، وَيَدْعُوَ بِهَذَا الدُّعَاءِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ، وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِمُحَمَّدٍ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ، يَا مُحَمَّدُ إِنِّي قَدْ تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى، اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ». قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ[٢].

---

(١) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٤٧٩.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٥٧٨.

واتە: عوسمانی کوڕی حونەیف ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێکی نابینا هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: داوام بۆ لە خوا بکە کە چاکم بکاتەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەگەر پێت خۆشە داواکارییەکەت دوا دەخەم ئەوە باشترە بۆ تۆ، ئەگەر پێشت خۆشە دوعات بۆ دەکەم، ئەویش گوتی: دوعام بۆ بکە، ئنجا فەرمانی پێکرد کە بە جوانی دەستنوێژ بگرێ، وە دوو ڕکات نوێژ بکات و ئەم دوعایە بخوێنێ: خودایە داوات لێدەکەم وە بە پاڕانەوەکەی موحەممەد ﷺ کە پێغەمبەری ڕەحمەتە داوات لێدەکەم، ئەی موحەممەد ﷺ من بە دوعاکەی تۆوە ڕوو لە پەروەردگار دەکەم بۆ ئەو پێویستییەم بۆ ئەوەی بۆم جێبەجێ بکات، دەسا خوایە بۆم بکە بە تکاکار. ئەبو ئیسحاق گوتی: ئەم فەرموودە صەحیحە.

## بابەت: نوێژی تەسبیح

**١٣٨٦-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْعَبَّاسِ ﷺ: «يَا عَمِّ أَلَا أَحْبُوكَ، أَلَا أَنْفَعُكَ، أَلَا أَصِلُكَ» قَالَ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «فَصَلِّ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ، فَإِذَا انْقَضَتِ الْقِرَاءَةُ فَقُلْ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً قَبْلَ أَنْ تَرْكَعَ، ثُمَّ ارْكَعْ فَقُلْهَا عَشْرًا، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ فَقُلْهَا عَشْرًا، ثُمَّ اسْجُدْ فَقُلْهَا عَشْرًا، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ فَقُلْهَا عَشْرًا، ثُمَّ اسْجُدْ فَقُلْهَا عَشْرًا، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ فَقُلْهَا عَشْرًا قَبْلَ أَنْ تَقُومَ، فَتِلْكَ خَمْسٌ وَسَبْعُونَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ، وَهِيَ ثَلَاثُمِائَةٍ فِي أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ، فَلَوْ كَانَتْ ذُنُوبُكَ مِثْلَ رَمْلِ عَالِجٍ غَفَرَهَا اللَّهُ لَكَ» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ يَقُولُهَا فِي يَوْمٍ؟ قَالَ «قُلْهَا فِي جُمُعَةٍ، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقُلْهَا فِي شَهْرٍ» حَتَّى قَالَ: «فَقُلْهَا فِي سَنَةٍ»[1].

واتە: ئەبو ڕافیع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەبباسی ﷺ فەرموو: ئەی مامە شتێکت پێ نەبەخشم و هانت نەدەم بۆ شتێک، سوودێکت پێنەگەیەنم، چاکەیەکت لەگەڵ نەکەم، گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: کەواتە چوار ڕکات نوێژ بکە لە هەر ڕکاتێکدا سوورەتی فاتیحە و سوورەتێکی دیکە بخوێنە، جا کە لە خوێندنی ئەوە تەواو بووی پازدە جار بڵێ: «سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ» پێش ئەوەی بڕۆیتە ڕکووع، پاشان بڕۆ ڕکووع و دە جار بیڵێ، دواتر سەرت

---

(١) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٤٨٢.




بەرزبکەوەو، دە جار بیڵێ، پاشان بڕۆ سوجدە و دە جار بیڵێ، دواتر سەرت بەرزبکەوە و دە جار بیڵێ، پاشان بڕۆوە سوجدە و دەجار بیڵێ، دواتر سەرت بەرزبکەوە دە جار بیڵێ پێش ئەوەی هەڵسیەوە سەرپێ، کە ئەوە دەکاتە حەفتا و پێنج جار لە هەر ڕکاتێکدا، وە دەکاتە سێ سەد جار بە هەر چوار ڕکاتەکە، خۆ ئەگەر بێت و گوناهەکانت بە ئەندازەی کێوێک لە لم بن، خوا لێت خۆش دەبێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەگەر کەسێک نەیتوانی لە ڕۆژێکدا بیڵێ؟ فەرمووی: با لە هەفتەیەکدا بیڵێ، وە ئەگەر نەیتوانی با لە مانگێکدا بیڵێ، هەتاوەکو فەرمووی: با لە ساڵێکدا بیڵێ.

**١٣٨٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﭬ: «يَا عَبَّاسُ يَا عَمَّاهُ أَلَا أُعْطِيكَ، أَلَا أَمْنَحُكَ، أَلَا أَحْبُوكَ، أَلَا أَفْعَلُ لَكَ عَشْرَ خِصَالٍ، إِذَا أَنْتَ فَعَلْتَ ذَلِكَ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ ذَنْبَكَ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ وَقَدِيمَهُ وَحَدِيثَهُ وَخَطَأَهُ وَعَمْدَهُ وَصَغِيرَهُ وَكَبِيرَهُ وَسِرَّهُ وَعَلَانِيَتَهُ عَشْرُ خِصَالٍ: أَنْ تُصَلِّيَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ، فَإِذَا فَرَغْتَ مِنَ الْقِرَاءَةِ فِي أَوَّلِ رَكْعَةٍ قُلْتَ وَأَنْتَ قَائِمٌ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ، خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً، ثُمَّ تَرْكَعُ فَتَقُولُ، وَأَنْتَ رَاكِعٌ عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ الرُّكُوعِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَهْوِي سَاجِدًا فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ سَاجِدٌ عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ السُّجُودِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَسْجُدُ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ السُّجُودِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، فَذَلِكَ خَمْسَةٌ وَسَبْعُونَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ، تَفْعَلُ فِي أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ، إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تُصَلِّيَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ مَرَّةً فَافْعَلْ، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَفِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ شَهْرٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي عُمُرِكَ مَرَّةً»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی ﭬ فەرموو: ئەی عەبباس ئەی مامە، ئایا شتێکت پێبدەم و قازانجێکت پێ بگەیەنم و شتێکی گرنگت پێ بڵێم؟ ئایا دە شتت فێر نەکەم، کە ئەگەر ئەنجامیان بدەی خوا لە گوناهی سەرەتا و کۆتاییت خۆش ببێ؟ وە لە گوناهە کۆنەکان و تازەکانیش، وە ئەوەشی بە هەڵە یان بە ئەنقەست کردووتە، لە گچکە و گەورەی گوناهەکان و نهێنی ئاشکراکانیش، دە شتن ئەویش ئەوەیە کە نوێژێکی چوار ڕکاتی بکەی، لە هەر ڕکاتێکدا سووڕەتی فاتیحە و سووڕەتێکی تر بخوێنی، جا ئەگەر لە خوێندنی فاتیحە

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٢٩٧.

بوویەوە لە سەرەتای ڕکاتەکە بە پێوە پازدە جار بڵێ: «سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ»، پاشان بچۆ ڕکووع و لە ڕکووعدا دە جار بیڵێ، پاشان لە ڕکووع هەڵسەوە و دە جاریتر بیڵێ، پاشان سوجدە ببە و لە سوجدەدا دە جار بیڵێ، پاشان لە سوجدە هەڵسەوە و دە جار بیڵێ، پاشان سوجدە ببە و دە جار بیڵێ، پاشان لە سوجدەی دووەم هەستەوە و دە جار بیڵێ، جا ئەوە بۆ هەر ڕکاتێک دەکاتە حەفتا و پێنج جار، لە هەموو ڕکاتەکاندا دووبارەی بکەوە، جا ئەگەر توانیت، هەموو ڕۆژێک جارێک ئەو نوێژە بکە، ئەگەر نەتتوانی هەفتەی جارێک، ئەگەر نەکرا مانگی جارێک، ئەگەر هەر نەکرا، ئەو لە تەمەنتدا جارێک ئەنجامی بدە.

## بابەت: شەوی نیوەی شەعبان

١٣٨٨- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَتْ لَيْلَةُ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ، فَقُومُوا لَيْلَهَا وَصُومُوا نَهَارَهَا، فَإِنَّ اللَّهَ يَنْزِلُ فِيهَا لِغُرُوبِ الشَّمْسِ إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا، فَيَقُولُ: أَلَا مِنْ مُسْتَغْفِرٍ لِي فَأَغْفِرَ لَهُ أَلَا مُسْتَرْزِقٌ فَأَرْزُقَهُ أَلَا مُبْتَلًى فَأُعَافِيَهُ أَلَا كَذَا أَلَا كَذَا، حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ»(١).

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شەوی نیوەی شەعبان هات شەوەکەی بێدار بن و، ڕۆژەکەی بەڕۆژووبن، لە ڕاستییدا لە کاتی ڕ وژئاواوە خوا دادەبەزێ بۆ ئاسمانی دونیا (بە جۆرێک کە شایستەی بەرزی و بێ وێنەیی خوایە)، جا دەفەرموێ: ئایا هیچ کەس هەیە داوای لێخۆش بوون بکات و لێی خۆش ببم؟! ئایا کەس هەیە داوای ڕزق و ڕۆزی بکات پێیبدەم؟! ئایا دەردەدارێ هەیە ڕزگاری بکەم؟! ئایا ئەوە و ئەوە هەیە؟ تاکو بەیانی دەبێتەوە.

١٣٨٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: فَقَدْتُ النَّبِيَّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَخَرَجْتُ أَطْلُبُهُ، فَإِذَا هُوَ بِالْبَقِيعِ رَافِعٌ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ. فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ أَكُنْتِ تَخَافِينَ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَرَسُولُهُ؟» قَالَتْ، قَدْ قُلْتُ: وَمَا بِي ذَلِكَ، وَلَكِنِّي ظَنَنْتُ أَنَّكَ أَتَيْتَ بَعْضَ نِسَائِكَ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَنْزِلُ لَيْلَةَ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيَغْفِرُ لِأَكْثَرَ مِنْ عَدَدِ شَعَرِ غَنَمِ كَلْبٍ»(٢).

---

(١) ضعيف جداً، أو موضوع.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٧٣٩.




واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: شەوێک پێغەمبەرم ﷺ لێ ونبوو، منیش بە دوایدا ڕۆیشتم تا بینیمەوە، لە ناکاو بینیم لە بەقیع بوو، سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردبۆوە، ئنجا فەرمووی: ئەی عائیشە، دەترسای کە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ستەمت لێبکەن؟ (بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتبێتە لای خێزانێکی دیکەی) گوتی: لە ڕاستیدا منیش گوتم: بۆ دەبێ ئاوا بم؟ بەڵام من وامزانی چوویتە لای یەکێک لە خێزانەکانت (واتە: نەک بە ستەم، بەڵکو بە ڕێگەپێدان لەلایەن خواوە)، ئنجا فەرمووی: بەڕاستی خوای بەرز و باڵا لە شەوی نیوەی شەعباندا دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، ئنجا لە زیاتر لە ژمارەی مووەکانی مەڕ و ماڵاتی هۆزی کەلب (لە بەندەکانی) خۆش دەبێ.

١٣٩٠- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَيَطَّلِعُ فِي لَيْلَةِ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ فَيَغْفِرُ لِجَمِيعِ خَلْقِهِ إِلَّا لِمُشْرِكٍ أَوْ مُشَاحِنٍ»(١).

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﵁ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی لە شەوی نیوەی شەعباندا خوا دێت لە تەواوی بەندەکانی خۆش دەبێ، مەگەر کەس هاوەڵی بۆ خوا بڕیار دابێ، یان دژایەتی سنورەکانی خوا بکات و، خاوەنی بیدعە بێ و لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیابووبێتەوە.

١٣٩٠م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْأَسْوَدِ النَّضْرُ بْنُ عَبْدِ الْجَبَّارِ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ(٢).

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: نوێژکردن و سوجدە بردن لەکاتی شوکردا (سوپاسکردنی پەروەردگار لەسەر نیعمەتەکانی)

١٣٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «صَلَّى يَوْمَ بُشِّرَ بِرَأْسِ أَبِي جَهْلٍ رَكْعَتَيْنِ»(٣).

---

(١) حسن بشواهده.

(٢) حسن بشواهده.

(٣) ضعيف.




واتە: عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژەی مژدەی سەری ئەبو جەهلی پێدرا دوو ڕکات نوێژی کرد.

**١٣٩٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «بُشِّرَ بِحَاجَةٍ فَخَرَّ سَاجِدًا»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ مژدەی جێبەجێ بوونی پێویستییەکی پێدرا، ئەویش سوجدەی برد.

**١٣٩٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: «لَمَّا تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ خَرَّ سَاجِدًا»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیک ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: کاتێک خوا تەوبەی لێگیرا و قەبوڵ کرد ڕۆیشتە سوجدە.

**تێبینی:** کەعبی کوڕی مالیک ﷺ یەکێک بوو لەو سێ کەسەی کە بە بێ پاساو نەچوون بۆ جەنگی تەبوک، دواتر خوا تەوبەی لێ قبووڵ کرد، جا باسی ئەو کاتە دەکات خوا لێی خۆشبووە، ئەویش سوجدەی بردوە وەک سوپاسگوزاریی بۆ لێ خۆشبوونی خوای گەورە.

**١٣٩٤-** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ إِذَا أَتَاهُ أَمْرٌ يَسُرُّهُ أَوْ بُشِّرَ بِهِ، خَرَّ سَاجِدًا، شُكْرًا لِلَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى»[٣].

واتە: ئەبو بەکرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک شتێک دەهاتە پێشی کە پێی دڵخۆش دەبوو یان جێی دڵخۆشی بوو یان مژدەیەکی پێ درابا، لەپەوڕوو سوجدەی دەبرد، وەکو سوپاس گوزارییەک بۆ خوا تَبَارَكَ وَتَعَالَى.

---

(١) حسن لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٧٧٤، والترمذي: ١٥٧٨.

## بابەت: ئەوەی کە نوێژ کەفارەتە

**١٣٩٥-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ إِذَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا، يَنْفَعُنِي اللَّهُ بِمَا شَاءَ مِنْهُ وَإِذَا حَدَّثَنِي عَنْهُ غَيْرُهُ، اسْتَحْلَفْتُهُ فَإِذَا حَلَفَ صَدَّقْتُهُ، وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ حَدَّثَنِي وَصَدَقَ أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا فَيَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ - وَقَالَ مِسْعَرٌ ثُمَّ يُصَلِّي - وَيَسْتَغْفِرُ اللَّهَ إِلَّا غَفَرَ اللَّهُ لَهُ»[1].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: هەر کاتێک فەرمایشتێکم لە پێغەمبەری خوا ﷺ ببیستبایە خوا دەیکردە مایەی سود پێگەیاندنم ئەوەندەی پێی خۆش بایە (بەوەی کە کارم بە فەرموودەکە دەکرد)، وە ئەگەر کەسێک فەرموودەی بۆ گێڕابامەوە سوێندم دەدا جا کاتێ سوێندی بخواردبایە بڕوام پێدەکرد، وە بەڕاستی ئەبو بەکر بۆی گێڕامەوە و ڕاستیشی گوت، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەس نیە کە گوناهێک دەکات، پاشان دەستنوێژی ڕێک و جوان هەڵدەگرێ پاشان دوو ڕکات نوێژ دەکات -میسعەر دەڵێ: پاشان نوێژ دەکات- وە داوای لێخۆش بوون لە خوا دەکات مسۆگەر خوا لێی خۆش دەبێ.

**١٣٩٦-** عَنْ عَاصِمِ بْنِ سُفْيَانَ الثَّقَفِيِّ ﷺ، أَنَّهُمْ غَزَوْا غَزْوَةَ السُّلَاسِلِ، فَفَاتَهُمُ الْغَزْوُ، فَرَابَطُوا، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى مُعَاوِيَةَ وَعِنْدَهُ أَبُو أَيُّوبَ وَعُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ، فَقَالَ: عَاصِمٌ: يَا أَبَا أَيُّوبَ فَاتَنَا الْغَزْوُ الْعَامَ، وَقَدْ أُخْبِرْنَا أَنَّهُ مَنْ صَلَّى فِي الْمَسَاجِدِ الْأَرْبَعَةِ، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ، فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي أَدُلُّكَ عَلَى أَيْسَرَ مِنْ ذَلِكَ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَوَضَّأَ كَمَا أُمِرَ، وَصَلَّى كَمَا أُمِرَ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ عَمَلٍ» أَكَذَلِكَ يَا عُقْبَةُ؟ قَالَ: نَعَمْ[2].

واتە: عاصیمی کوڕی سوفیانی سەقەفیی ﷺ دەگێڕێتەوە کە غەزای سولاسیلیان کردوە (لە سەردەمی موعاویەدا) غەزاکەشیان لە دەست چووە، خۆشیان ئامادە کردوە، پاشان گەڕاونەوە بۆ لای موعاویە لەوکاتەدا ئەبو ئەییوب و عوقبەی کوڕی عامیری لەلا بووە، ئنجا عاصیم گوتی: ئەی ئەبو ئەییوب ئەو ساڵ غەزاکەمان لە دەست چوو، وە بەڕاستی هەواڵمان پێدراوە (لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:) هەر

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٥٢١، والترمذي: ٤٠٦ و ٣٠٠٦.

(٢) حسن. أخرجه النسائي: ١٤٤.





کەسێک لە چوار مزگەوتەکەدا نوێژ بکات ئەوە لە گوناهەکانی دەبوردرێ، ئەویش گوتی: برازای خۆم لەوە ئاسانترت پێ بڵێم؟ من لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستومە دەیفەرموو: هەر کەسێک بەو جۆرەی کە فەرمانی پێکراوە دەستنوێژ بگرێ وە نوێژ بکات بەو شێوەیەی کە فەرمانی پێکراوە، ئەوا لەو کردەوانەی ڕابردووی دەبوردرێ، ئایا وایە ئەی عوقبە؟ (عوقبەش) گوتی: بەڵێ.

١٣٩٧- عَنْ أَبَانَ بْنَ عُثْمَانَ، يَقُولَ: قَالَ عُثْمَانُ ﷺ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ بِفِنَاءِ أَحَدِكُمْ نَهَرٌ يَجْرِي يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ، مَا كَانَ يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ؟» قَالَ: لَا شَيْءَ، قَالَ: «فَإِنَّ الصَّلَاةَ تُذْهِبُ الذُّنُوبَ كَمَا يُذْهِبُ الْمَاءُ الدَّرَنَ»[1].

واتە: ئەبانی کوڕی عوسمان دەڵێ: عوسمان ﷺ گوتی: لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستومە دەیفەرموو: ئایا ئەگەر لەبەر ماڵی هەر یەکێکتان ڕووبارێک بڕوات و ڕۆژێ پێنج جار خۆی لێ بشوات هیچ چڵکی پێوە دەمێنێ؟ گوتی: هیچ شتێک، فەرمووی: بەڕاستی نوێژ تاوانەکان ڕادەماڵێ وەکو چۆن ئاو چڵک و چەپەڵی ڕادەماڵێ.

١٣٩٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَصَابَ مِنَ امْرَأَةٍ - يَعْنِي مَا دُونَ الْفَاحِشَةِ - فَلَا أَدْرِي مَا بَلَغَ، غَيْرَ أَنَّهُ دُونَ الزِّنَا، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ هود، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِي هَذِهِ؟ قَالَ: «لِمَنْ أَخَذَ بِهَا»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: پیاوێک بەر ئافرەتێک کەوتبوو تەنها زینای لەگەڵدا نەکردبوو، نازانم تاکوێ ڕۆیشتبوو، بەڵام زینای نەکردبوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو ئەوەی بۆ باسکرد، ئنجا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ هود، واتە: وە نوێژ ئەنجام بدە لەم سەرو ئەوسەری ڕۆژدا (لە بەیانیان و ئێواراندا)و لە بەشێک لە شەودا چونکە بەڕاستی (کردەوە) چاکەکان (کردەوە) خراپەکان لادەبەن و دەیانسڕنەوە ئەوە پەندو ئامۆژگاریە بۆ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٦، ومسلم: ٢٧٦٣/٣٩، والترمذي: ٣١١٤.




پەند وەرگران. ئنجا (پیاوەکە) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەوە تەنها بۆ منە (حوکمی ئەو ئایەتە)؟ فەرمووی: بۆ هەر کەسێکە کە کاری پێبکات.

## بابەت: پێنج نوێژە فەرزەکە و پارێزگاری لێ کردنیان

**١٣٩٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَرَضَ اللَّهُ عَلَى أُمَّتِي خَمْسِينَ صَلَاةً، فَرَجَعْتُ بِذَلِكَ، حَتَّى آتِيَ عَلَى مُوسَى، فَقَالَ مُوسَى: مَاذَا افْتَرَضَ رَبُّكَ عَلَى أُمَّتِكَ؟ قُلْتُ: فَرَضَ عَلَيَّ خَمْسِينَ صَلَاةً، قَالَ: فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ، فَرَاجَعْتُ رَبِّي، فَوَضَعَ عَنِّي شَطْرَهَا، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ فَرَاجَعْتُ رَبِّي، فَقَالَ: هِيَ خَمْسٌ وَهِيَ خَمْسُونَ، لَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَقُلْتُ: قَدِ اسْتَحْيَيْتُ مِنْ رَبِّي»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا پەنجای نوێژی لەسەر ئوممەتەکەم فەرز کرد، منیش بەو شێوەیە گەڕامەوە، تاکو هاتمە لای موسا ﷺ ئنجا موسا گوتی: پەروەردگارت چی فەرز کردوە لەسەر ئوممەتەکەت؟ گوتم: پەنجا نوێژی لەسەر فەرز کردم، گوتی: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت، بەڕاستی ئوممەتەکەت توانای ئەوەی نیە، منیش گەڕامەوە لای پەرەردگارم، ئنجا بەشێکی لەسەر هەڵگرتم، گەڕامەوە لای موسا و پێم ڕاگەیاند، ئەویش گوتی: بگەڕێرەوە بەڕاستی ئوممەتەکەت توانای ئەوەی نیە، منیش گەڕامەوە لای پەروەردگارم، فەرمووی: (نوێژەکان) پێنجن بە بری پەنجا دەکەون (لە پاداشتدا)، جێگۆڕکێ و گۆڕان بەسەر فەرمانەکەمدا نایەت، ئنجا گەڕامەوە لای موسا، ئەویش گوتی: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت، منیش گوتم: بەڕاستی شەرم لە پەروەردگارم دەکەم.

**١٤٠٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «أُمِرَ نَبِيُّكُمْ ﷺ بِخَمْسِينَ صَلَاةً، فَنَازَلَ رَبَّكُمْ أَنْ يَجْعَلَهَا خَمْسَ صَلَوَاتٍ»(٢).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٩، ومسلم: ١٦٣، والنسائي: ٤٤٩.

(٢) صحيح لغيره.




واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرەکەتان ﷺ فەرمانی پێکرا بە ئەنجامدانی پەنجا نوێژ (لە سەرەتادا)، ئنجا پەروەردگارتان دابەزاند تاکو کردییە پێنج نوێژ.

**١٤٠١-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «خَمْسُ صَلَوَاتٍ افْتَرَضَهُنَّ اللَّهُ عَلَى عِبَادِهِ، فَمَنْ جَاءَ بِهِنَّ لَمْ يَنْتَقِصْ مِنْهُنَّ شَيْئًا، اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهِنَّ، فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَهْدًا أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ جَاءَ بِهِنَّ قَدِ انْتَقَصَ مِنْهُنَّ شَيْئًا، اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهِنَّ، لَمْ يَكُنْ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ»[1].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پێنج نوێژ خوا فەرزی کردوون لەسەر بەندەکانی، جا هەر کەس بە ڕێک و پێکی جێبەجێیان بکات و کەم و کورتیان تێنەخات بەوەی کە هەقیان بە سوک بزانێ، ئەوا بەڕاستی خوا پەیمانی داوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا بیخاتە بەهەشتەوە، وە هەر کەس بە کەم و کورتی و کەمتەرخەمی پێیان هەستێ بەوەی هەقیان بە سوک بزانێ، ئەو کەسە هیچ پەیمانێکی لەلای خوا نیە، ئەگەر پێی خۆش بوو سزای دەدات و ئەگەر پێی خۆش بوو لێی خۆش دەبێ.

**١٤٠٢-** عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ فِي الْمَسْجِدِ دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ فَأَنَاخَهُ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ عَقَلَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ؟، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ، قَالَ: فَقَالُوا: هَذَا الرَّجُلُ الْأَبْيَضُ الْمُتَّكِئُ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: يَا ابْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «قَدْ أَجَبْتُكَ» فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: يَا مُحَمَّدُ إِنِّي سَائِلُكَ وَمُشَدِّدٌ عَلَيْكَ فِي الْمَسْأَلَةِ، فَلَا تَجِدَنَّ عَلَيَّ فِي نَفْسِكَ، فَقَالَ: «سَلْ مَا بَدَا لَكَ» قَالَ لَهُ الرَّجُلُ: نَشَدْتُكَ بِرَبِّكَ وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ، آللَّهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ» قَالَ: فَأَنْشُدُكَ بِاللَّهِ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ» قَالَ: فَأَنْشُدُكَ بِاللَّهِ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَصُومَ هَذَا الشَّهْرَ مِنَ السَّنَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ» قَالَ: فَأَنْشُدُكَ بِاللَّهِ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ هَذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقْسِمَهَا عَلَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ» فَقَالَ الرَّجُلُ: آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي، وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ[2].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢٥ و ١٤٢٠، والنسائي: ٤٦١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣ بنحوه، ومسلم: ١٢، وأبو داود: ٤٨٦، والترمذي: ٦١٩، والنسائي: ٢٠٩١_٢٠٩٣.



واتە: شەریکی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو نەمیرە دەگێڕێتەوە کە گوێی لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بووە کە گوتوویەتی: جارێک لە ناو مزگەوتدا دانیشتبووین، پیاوێک بە سواری حوشترێک هات و حوشترەکەی یەخدا و لەناو مزگەوتدا بەستییەوە، پاشان بە خەڵکەکەی گوت: کامتان موحەممەدە ﷺ؟ وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو خەڵکەکەدا پاڵکەوتبوو، گوتی: پێیان گوت: ئەو پیاوە سپیەی کە پاڵی داوەتەوە، پیاوەکەش گوتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەڵیب، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵێ وا وەڵامم دایتەوە، پیاوەکەش گوتی: ئەی موحەممەد ﷺ هەندێ پرسیارت لێدەکەم وە پرسیارەکانم توندن، پێت ناخۆش نەبێ و لێم مەگرە، ئەویش فەرمووی: چی پێت خۆشە بپرسە، کابراش گوتی: تو ئەو خوایەی کە پەروەردگاری تۆ و پەروەردگاری ئەوانی پێش تۆشە ئایا خوا تۆی بە پێغەمبەر ﷺ ناردووە بۆ هەموو خەڵکی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی خودایە (بە شایەت بە) کە بەڵێ وایە، گوتی: توخوا ئایا خوا فەرمانی پێکردووی کە پێنج نوێژ بکەی لە ڕۆژ و شەوێکدا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی خوایە (بە شایەت بە) کە بەڵێ وایە، گوتی: تو ئەو خوایە ئایا خوا فەرمانی پێکردووی کە ئەو مانگە لە ساڵدا بەڕۆژوو بیت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی خوایە (بە شایەت بە) بەڵێ وایە، گوتی: توخوا ئایا خوا فەرمانی پێکردووی کە ئەو زەکات و سەدەقەیە وەربگری لە دەوڵەمەندەکانمان و دابەشی بکەیتەوە بەسەر هەژارەکانماندا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوایە (بە شایەت بە) بەڵێ وایە، ئنجا کابرا گوتی: ئەوا بڕوام هێنا بەوەی کە هێناوتە، وە من نوێنەری خەڵکەکەی دوا خۆمم، وە من زیمامی کوڕی سەعلەبەم لە هۆزی بەنو سەعدی کوڕی بەکر.

**١٤٠٣-** عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: قَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ: إِنَّ أَبَا قَتَادَةَ بْنَ رِبْعِيٍّ أَخْبَرَهُ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ اللَّهُ ﷻ: «افْتَرَضْتُ عَلَى أُمَّتِكَ خَمْسَ صَلَوَاتٍ، وَعَهِدْتُ عِنْدِي عَهْدًا أَنَّهُ مَنْ حَافَظَ عَلَيْهِنَّ لِوَقْتِهِنَّ أَدْخَلْتُهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَمْ يُحَافِظْ عَلَيْهِنَّ فَلَا عَهْدَ لَهُ عِنْدِي»[1].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٣٠.

واتە: زوهریی ﷺ دەڵێ: سەعیدی کوڕی موسەییب گوتی: ئەبو قەتادەی کوڕی ڕیبعی بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای خاوەن شکۆ و گەورەیی فەرموویەتی: لەسەر ئوممەتەکەم پێنج نوێژم فەڕز کردوە، وە لەلای خۆمەوە پەیمانم داوە کە هەر کەس پارێزگاریان لێبکات لەکاتی خۆیاندا دەیبەمە ناو بەهەشت، وە هەر کەس پارێزگاریان لێنەکات، هیچ پەیمانێکی نیە لە لای منەوە.

## بابەت: فەزڵ و گەورەیی نوێژ لە «مسجد الحرام» و مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ

١٤٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژێک لەناو مزگەوتی من خێر و پاداشتی زیاترە لە هەزار نوێژ لە شوێنەکانی تر، تەنها «مسجد الحرام» نەبێ (مزگەوتی مەککە کە کەعبەی پیرۆزی تێدایە).

١٤٠٤م- حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عَمَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[2].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

١٤٠٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ»[3].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژێک لەو مزگەوتەی من خێرو پاداشتی زیاترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی تر، تەنها «مسجد الحرام» نەبێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٩٠، ومسلم: ١٣٩٤، والترمذي: ٣٢٥ وبإثر ٣٩١٦، والنسائي: ٦٩٤ و ٢٨٩٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٩٠، ومسلم: ١٣٩٤، والترمذي: ٣٢٥ وبإثر ٣٩١٦، والنسائي: ٦٩٤ و ٢٨٩٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٩٥، والنسائي: ٢٨٩٧.





١٤٠٦- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ وَصَلَاةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ مِائَةِ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژێک لە مزگەوتەکەی مندا خێر و پاداشتی زیاترە لە هەزار نوێژی مزگەوتەکانی تر، تەنها «مسجد الحرام» نەبێ، وە نوێژێک لە «مسجد الحرام» خێری زیاترە لە سەد هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی تر.

## بابەت: نوێژکردن لە مزگەوتی (بیت المقدس)دا

١٤٠٧- عَنْ مَيْمُونَةَ ﷺ، مَوْلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفْتِنَا فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ قَالَ: «أَرْضُ الْمَحْشَرِ وَالْمَنْشَرِ ائْتُوهُ فَصَلُّوا فِيهِ، فَإِنَّ صَلَاةً فِيهِ كَأَلْفِ صَلَاةٍ فِي غَيْرِهِ» قُلْتُ: أَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ أَسْتَطِعْ أَنْ أَتَحَمَّلَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: «فَتُهْدِي لَهُ زَيْتًا يُسْرَجُ فِيهِ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَهُوَ كَمَنْ أَتَاهُ»[٢].

واتە: مەیمونەی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی «بیت المقدس» حوکمی خۆتمان پێ بڵێ، فەرمووی: زەوی حەشر و حیسابە، بۆی بچن و نوێژی تێدا بکەن، بەڕاستی نوێژێک لەوێدا وەکو هەزار نوێژ وایە لە شوێنەکانی تر، گوتم: ئەی ئەگەر نەمتوانی سەفەری بۆ بکەم؟ فەرمووی: زەیتی بۆ بنێرە بۆ داگیرساندنی چراکانی، جا هەر کەسێک ئەوە بکات وەکو ئەوە وایە کە سەفەری بۆ کردبێت.

١٤٠٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَمَّا فَرَغَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ مِنْ بِنَاءِ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، سَأَلَ اللَّهَ ثَلَاثًا: حُكْمًا يُصَادِفُ حُكْمَهُ، وَمُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ، وَأَلَّا يَأْتِيَ هَذَا الْمَسْجِدَ أَحَدٌ لَا يُرِيدُ إِلَّا الصَّلَاةَ فِيهِ، إِلَّا خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ» فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَمَّا اثْنَتَانِ فَقَدْ أُعْطِيَهُمَا، وَأَرْجُو أَنْ يَكُونَ قَدْ أُعْطِيَ الثَّالِثَةَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) منكر. أخرجه أبو داود: ٤٥٧.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٦٩٣.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێک کە سولەیمانی کوڕی داود لە دروست کردنی «بیت المقدس» بۆوە سێ داواکاری لە خوا کرد، حوکم و بڕیارێک کە ڕێک بێ لەگەڵ حوکمی خوا، وە موڵک و دەسەڵاتێک کە جگە لە ئەو نەیدات بە کەسی تر لەدوای ئەو، وە هەر کەس کە سەردانی ئەو مزگەوتەی کرد و تەنها بە مەبەستی ئەوەی کە نوێژی تێدا بکات گوناهەکانی هەڵوەرێن وەکو ئەو ڕۆژەی کە تێیدا لە دایک بووە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دوو داواکاری سەرەتا خوا پێی بەخشی، وە تکام وایە کە داواکاری سێهەمیشی پێبەخشیبێ.

١٤٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَسْجِدِي هَذَا وَالْمَسْجِدِ الْأَقْصَى»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەفەر ناکرێ بە تایبەتی تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ: «مسجد الحرام» (لە مەککە)، وە ئەو مزگەوتەی من (لە مەدینە)، وە مزگەوتی ئەقصا (لە قودس).

١٤١٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: إِلَى الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَإِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى وَإِلَى مَسْجِدِي هَذَا»[٢].

واتە: ئەبو سەعید و عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەفەر ناکرێ (لە مزگەوتێک بۆ مزگەوتێکی تر) تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ: بۆ «مسجد الحرام» وە بۆ مزگەوتی ئەقصا وە بۆ ئەو مزگەوتەی من.

## بابەت: نوێژکردن لە مزگەوتی قوبائدا

١٤١١- عَنْ أُسَيْدَ بْنَ ظُهَيْرٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِ قُبَاءَ كَعُمْرَةٍ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٨٩، ومسلم: ١٣٩٧، وأبو داود: ٢٠٣٣، والنسائي: ٧٠٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٩٧ و ١٨٦٤ و ١٩٩٥، ومسلم: ٨٢٧/٤١٥، والترمذي: ٣٢٦.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٢٤.

واتە: ئوسەیدی کوڕی زوهەیری ئەنصاریی ﷺ کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بووە دەگێڕنەوە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: نوێژێک لە مزگەوتی قوبائدا (خێر و پاداشتی) وەکو عومڕەیەکە.

١٤١٢- عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ أَتَى مَسْجِدَ قُبَاءَ، فَصَلَّى فِيهِ صَلَاةً، كَانَ لَهُ كَأَجْرِ عُمْرَةٍ»[1].

واتە: سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لەماڵەوە خۆی پاک بکاتەوە و دەستنوێژ بگرێ، پاشان بچێتە مزگەوتی قوباء ، ئنجا نوێژێکی تێدا بکات، ئەوا پاداشتەکەی وەکو پاداشتی عومڕەیەکە.

## بابەت: نوێژکردن لە مزگەوتێک کە جومعە و جەماعەتی تێدا دەکرێت

١٤١٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي بَيْتِهِ بِصَلَاةٍ، وَصَلَاتُهُ فِي مَسْجِدِ الْقَبَائِلِ بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ صَلَاةً، وَصَلَاتُهُ فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي يُجَمَّعُ فِيهِ بِخَمْسِ مِائَةِ صَلَاةٍ، وَصَلَاتُهُ فِي الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى بِخَمْسِينَ أَلْفِ صَلَاةٍ، وَصَلَاتُهُ فِي مَسْجِدِي بِخَمْسِينَ أَلْفِ صَلَاةٍ، وَصَلَاةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ بِمِائَةِ أَلْفِ صَلَاةٍ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی مرۆڤ لە ماڵەکەی بەرابەرە بە نوێژێک، وە نوێژێک کە لە مزگەوتی گەڕەکەکەی بیکات بە بیست و پێنج نوێژ هەیە، وە نوێژێک کە لەو مزگەوتە بیکات کە جومعەی تێدا دەکرێ بە پێنج سەد نوێژ هەیە (خێر و پاداشتەکەی)، وە نوێژێک کە لە مزگەوتی ئەقصا بیکات بە پەنجا هەزار نوێژ هەیە، وە نوێژێک لە مزگەوتەکەی من بە پەنجا هەزار نوێژ هەیە، وە نوێژێک لە مزگەوتی «مسجد الحرام» بە سەد هەزار نوێژ هەیە.

---

(١) صحيح بشواهده. أخرجه النسائي: ٦٩٩.

(٢) ضعيف.

## بابەت: سەرەتای دروست كردنی دوانگە (مینبەر)

١٤١٤- عَنِ الطُّفَيْلِ بْنِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِلَى جِذْعٍ إِذْ كَانَ الْمَسْجِدُ عَرِيشًا، وَكَانَ يَخْطُبُ إِلَى ذَلِكَ الْجِذْعِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: هَلْ لَكَ أَنْ نَجْعَلَ لَكَ شَيْئًا تَقُومُ عَلَيْهِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ حَتَّى يَرَاكَ النَّاسُ وَتُسْمِعَهُمْ خُطْبَتَكَ؟ قَالَ: «نَعَمْ» فَصَنَعَ لَهُ ثَلَاثَ دَرَجَاتٍ، فَهِيَ الَّتِي أَعْلَى الْمِنْبَرِ، فَلَمَّا وُضِعَ الْمِنْبَرُ، وَضَعُوهُ فِي مَوْضِعِهِ الَّذِي هُوَ فِيهِ، فَلَمَّا أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَقُومَ إِلَى الْمِنْبَرِ، مَرَّ إِلَى الْجِذْعِ الَّذِي كَانَ يَخْطُبُ إِلَيْهِ، فَلَمَّا جَاوَزَ الْجِذْعَ، خَارَ حَتَّى تَصَدَّعَ وَانْشَقَّ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَمَّا سَمِعَ صَوْتَ الْجِذْعِ، فَمَسَحَهُ بِيَدِهِ حَتَّى سَكَنَ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الْمِنْبَرِ، فَكَانَ إِذَا صَلَّى، صَلَّى إِلَيْهِ، فَلَمَّا هُدِمَ الْمَسْجِدُ وَغُيِّرَ أَخَذَ ذَلِكَ الْجِذْعَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَكَانَ عِنْدَهُ فِي بَيْتِهِ حَتَّى بَلِيَ، فَأَكَلَتْهُ الْأَرَضَةُ وَعَادَ رُفَاتًا[1].

واتە: توفەیلی كوڕی ئوبەی كوڕی كەعب ﷺ لە باوكییەوە، دەگێڕێتەوە كە گوتوویەتی: ئەو كاتەی كە سەقفی مزگەوتەكە وەكو كەپر وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە پاڵ قەدی دارخورمایەک نوێژی دەكرد، وە وتاریشی هەر لای ئەو قەدە دارخورمایە دەخوێندەوە، ئنجا پیاوێک لە هاوەڵان گوتی: ئایا دەتهەوێ شتێكت بۆ دروست بكەین لەسەری بوەستی ڕۆژانی جومعە بۆ ئەوەی خەڵكی بتبینن و گوێ بیستی وتارەكەت بن؟ فەرمووی: بەڵێ، ئنجا (شتێكی) بۆ دروستكرا كە سێ پلیكانە بوو، كە ئەوەش بەرزترین دوانگە بوو، جا كاتێ دوانگەكەیان دانا لەو شوێنەیان دانا كە لێیەتی، ئیتر كاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی بچێتە سەر دوانگەكە بەلای ئەو دارخورمایەدا ڕەت بوو كە جاران وتاری لە پاڵدا دەخوێندەوە، جا كاتێک لێی تێپەڕی (دارەكە) دەستی بە گریان كرد تاكو ناڵە و هاواری لێ هەستاو دزی تێكەوت لە نارەحتیان، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێک گوێ بیستی دەنگی دارخورماكە بوو دابەزی، دەستی پێدا هێنا تاكو كەوتە یەک و هێواش بۆوە، پاشان گەڕایەوە سەر دوانگەكە، جا كاتێ نوێژی بكردایە لەلای ئەو نوێژی دەكرد، ئنجا كاتێک كە مزگەوتەكە تێكدرا و گۆڕانكاری بە سەردا هات ئوبەی كوڕی كەعب قەدە دارخورماكەی هەڵگرتەوە و لەلای خۆی هێشتییەوە لەماڵەوە تاكو ڕزا و میریكانە خواردی و بۆوە خۆڵ.

---

(١) حسن.

١٤١٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ إِلَى جِذْعٍ فَلَمَّا اتَّخَذَ الْمِنْبَرَ ذَهَبَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَحَنَّ الْجِذْعُ فَأَتَاهُ فَاحْتَضَنَهُ فَسَكَنَ فَقَالَ: «لَوْ لَمْ أَحْتَضِنْهُ لَحَنَّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ لەلای قەدی دارخورمایەک وتاری دەفەرموو، جا کاتێ کە دوانگەیان بۆ دروست کرد ڕۆیشتە لای دوانگەکەی، ئنجا قەدە دارخورماکە دەستی کرد بە ناڵە ناڵ کردن، پێغەمبەریش ﷺ هات و لە باوەشی گرت، ئیتر داکەوت و هێواش بۆوە، وە فەرمووی: ئەگەر لە باوەشم نەگرتایە ئەوا تا ڕۆژی دوای دەیناڵاند.

١٤١٦- عَنْ أَبِي حَازِمٍ ﷺ، قَالَ: اخْتَلَفَ النَّاسُ فِي مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ هُوَ؟ فَأَتَوْا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ: مَا بَقِيَ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي «هُوَ مِنْ أَثْلِ الغَابَةِ عَمِلَهُ فُلَانٌ مَوْلَى فُلَانَةَ نَجَّارٌ فَجَاءَ بِهِ، فَقَامَ عَلَيْهِ حِينَمَا وُضِعَ، فَاسْتَقْبَلَ وَقَامَ النَّاسُ خَلْفَهُ، فَقَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَرَجَعَ الْقَهْقَرَى حَتَّى سَجَدَ بِالْأَرْضِ، ثُمَّ عَادَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَقَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ فَقَامَ ثُمَّ رَجَعَ الْقَهْقَرَى حَتَّى سَجَدَ بِالْأَرْضِ»[2].

واتە: ئەبو حازیـمەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: لەسەر دوانگەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی کەوتنە ڕاجیایی ئاخۆ لە چی دروست کرابوو، هاتنە لای سەهلی کوڕی سەعد و پرسیاریان لێکرد، ئەویش گوتی: هیچ کەس لەو خەڵکە نەماوە کە لە من باشتر بزانێ دەربارەی (دوانگەکە)، گوتی: لە داری تەرگەزی جەنگەڵی نزیک مەدینە بوو، کە ناوی «الغابة»یە، فڵان کەسی ڕەنجبەری فڵانە ژن دروستی کرد کە دارتاش بوو، ئنجا دوانگەکەی هێنا، کاتێ دانرا لەسەری وەستا و ڕووی کردە قیبلە، وە خەڵکیش لەدوایەوە وەستان، ئنجا فاتیحە و قورئانی خوێند پاشان ڕۆیشتە ڕکووع پاشان سەری بەرزکردەوە و گەڕایەوە دواوە و پشتا و پشت (ڕووی لە قیبلە وەرنەگێرا) هەتا هات لەسەر زەوی سوجدەی برد، پاشان گەڕایەوە سەر دوانگەکە و فاتیحە و قورئانی خوێند و پاشان ڕۆیشتە ڕکووع و هەستاوە بە پشتدا گەڕاوە تاکو هات لەسەر زەوی سوجدەی برد.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٦٢٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٧، ومسلم: ٥٤٤، وأبو داود: ١٠٨٠، والنسائي: ٧٣٩.

١٤١٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُومُ إِلَى أَصْلِ شَجَرَةٍ - أَوْ قَالَ إِلَى جِذْعٍ - ثُمَّ اتَّخَذَ مِنْبَرًا، قَالَ: «فَحَنَّ الْجِذْعُ - قَالَ جَابِرٌ - حَتَّى سَمِعَهُ أَهْلُ الْمَسْجِدِ، حَتَّى أَتَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَمَسَحَهُ فَسَكَنَ» فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَوْ لَمْ يَأْتِهِ لَحَنَّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ(1).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای قەدی دارێک ڕادەوەستا یان گوتی: لەلای قەدی دارخورمایەک پاشان دوانگەیەکی دروستکرد، گوتی: ئنجا دارەکە ناڵە ناڵی کرد -جابیر گوتی: - تاکو خەڵکی مزگەوتەکە گوێبیستی بوون، هەتاکو پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلای و دەستی پێدا هێنا ئنجا بێدەنگ بوو، جا هەندێکیان گوتیان: ئەگەر نەهاتبایە لای ئەوا تا ڕۆژی قیامەت دەیناڵاند.

## بابەت: درێژکردنەوەی ڕاوەستان لە نوێژەکاندا

١٤١٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «صَلَّيْتُ ذَاتَ لَيْلَةٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَزَلْ قَائِمًا حَتَّى هَمَمْتُ بِأَمْرِ سَوْءٍ» قُلْتُ: وَمَا ذَاكَ الْأَمْرُ؟ قَالَ: هَمَمْتُ أَنْ أَجْلِسَ وَأَتْرُكَهُ(2).

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: شەوێک لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژم کرد، هەر بەردەوام بە پێوە مایەوە تا خەیاڵی کارێکی نەشیاوم کرد، (ڕاوی دەڵێ) گوتم: ئەو کارە نەشیاوە چی بوو؟ گوتی: خەیاڵم کرد کە دابنیشم و واز لە نوێژەکە لەگەڵیدا بێنم.

١٤١٩- عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلَاقَةَ، سَمِعَ الْمُغِيرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى تَوَرَّمَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا»(3).

واتە: زیادی کوڕی عیلاقە دەگێڕنەوە کە گوێی لە موغیرە ﷺ بووە کە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە بە پێوە وەستابوو (لە نوێژدا) هەتاکو پێیەکانی ئاوسا بوون، ئنجا پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان خوا لە گوناهی پێشتر و پاشتریشت خۆش بووە (کەواتە بۆ ئاوا خۆت ناڕەحەت دەکەی) فەرمووی: ئەی نابێ بەندەیەکی سوپاس گوزار بم!!

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩١٨ و ٢٠٩٥ و٣٥٨٤ و ٣٥٨٥، والنسائي: ١٣٩٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٣٥، ومسلم: ٧٧٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٣٠، ومسلم: ٢٨١٩، والترمذي: ٤١٢، والنسائي: ١٦٤٤.

١٤٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي حَتَّى تَوَرَّمَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام نوێژی دەکرد تاکو پێیەکانی دەئاوسان، ئنجا پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان خوا لە گوناهی ڕابردو و داهاتوشت خۆش بووە (کەواتە بۆ ئاوا خۆت ناڕەحەت دەکەی) فەرمووی: ئەی نابێ بەندەیەکی سوپاس گوزار بم!!

١٤٢١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: أَيُّ الصَّلَاةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «طُولُ الْقُنُوتِ»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا، کامە نوێژە باشترینە (لە ئەجر و پاداشتدا)؟ فەرمووی: (ئەو نوێژەی) کە ڕاوەستان تێیدا درێژترە.

## بابەت: سوجدە بردنی زۆر

١٤٢٢- عَنْ كَثِيرِ بْنِ مُرَّةَ، أَنَّ أَبَا فَاطِمَةَ ﷺ، حَدَّثَهُ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ أَسْتَقِيمُ عَلَيْهِ وَأَعْمَلُهُ، قَالَ: «عَلَيْكَ بِالسُّجُودِ؛ فَإِنَّكَ لَا تَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلَّا رَفَعَكَ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ بِهَا عَنْكَ خَطِيئَةً»[٣].

واتە: کەسیری کوڕی موڕڕەوە دەگێڕێتەوە کە ئەبو فاتیمە ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە، گوتوویەتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردەوەیەکم پێ بڵێ کە لەسەری بەردەوام بم و بیکەم، فەرمووی: زۆر سوجدە بەرە، بەڕاستی هەر سوجدەیەک کە تۆ دەیبەی (بۆ خوا) پلەیەکی پێ بەرز دەبیتەوە و هەڵە و تاوانێکت لێ ڕەش دەبێتەوە.

١٤٢٣- عَنْ مَعْدَانَ بْنُ أَبِي طَلْحَةَ الْيَعْمُرِيُّ، قَالَ: لَقِيتُ ثَوْبَانَ فَقُلْتُ لَهُ: حَدِّثْنِي حَدِيثًا عَسَى اللَّهُ أَنْ يَنْفَعَنِي بِهِ، قَالَ: فَسَكَتَ، ثُمَّ عُدْتُ فَقُلْتُ مِثْلَهَا، فَسَكَتَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ لِي: عَلَيْكَ بِالسُّجُودِ لِلَّهِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً» قَالَ مَعْدَانُ: ثُمَّ لَقِيتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٥٦، والترمذي: ٣٨٧.

(٣) صحيح بطرقه وشواهده.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٨٨، والترمذي: ٣٨٨، والنسائي: ١١٣٩.

واتە: مەعدانی کوڕی ئەبو تەڵحەی یەعموریی ﷺ دەڵێ: بە سەوبان ﷺ گەیشتم و پێم گوت: فەرموودەیەکم بۆ بگێڕەوە بەڵکو خوا بە هۆیەوە سوودمەندم بکات، گوتی: ئەویش بێدەنگ بوو، پاشان چوومەوە سەری هەمان شتم پێگوتەوە، ئەویش بێدەنگ بوو، سێ جاران، ئنجا پێی گوتم: زۆر سوجدە بۆ خوا ببە، بەڕاستی من بیستوومە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هیچ بەندەیەک نیە کە سوجدەیەک بۆ خوا ببات ئیللا بەهۆی ئەو سوجدەیەوە خوا پلەیەکی بەرز دەکاتەوە و تاوانێکی لێ دەسڕێتەوە. مەعدان دەڵێ: پاشان بە ئەبو دەرداء گەیشتم و پرسیارم لێکرد، ئەویش هەمان شتی گوت.

**١٤٢٤- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِهَا حَسَنَةً، وَمَحَا عَنْهُ بِهَا سَيِّئَةً، وَرَفَعَ لَهُ بِهَا دَرَجَةً، فَاسْتَكْثِرُوا مِنَ السُّجُودِ»**[1].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، کە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: هیچ بەندەیەک نیە کە سوجدەیەک بۆ خوا ببات ئیللا خوا بەهۆیەوە چاکەیەکی بۆ دەنوسێ، وە خەراپەیەکی لێ دەسڕێتەوە، وە پلەیەکی بەرز دەکاتەوە، کەواتە زۆر سوجدە ببەن.

## بابەت: ئەوەی کە یەکەم شت کە بەندە لێپرسینەوەی لێدەکرێ لەسەری نوێژە

**١٤٢٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ حَكِيمٍ الضَّبِّيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي أَبُو هُرَيْرَةَ: إِذَا أَتَيْتَ أَهْلَ مِصْرِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، الصَّلَاةُ الْمَكْتُوبَةُ، فَإِنْ أَتَمَّهَا، وَإِلَّا قِيلَ: انْظُرُوا هَلْ لَهُ مِنْ تَطَوُّعٍ؟ فَإِنْ كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ أُكْمِلَتِ الْفَرِيضَةُ مِنْ تَطَوُّعِهِ، ثُمَّ يُفْعَلُ بِسَائِرِ الْأَعْمَالِ الْمَفْرُوضَةِ مِثْلُ ذَلِكَ»**[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٨٦٤ و ٨٦٥، والترمذي: ٤١٣، والنسائي: ٤٦٥.




واتە: ئەنەسی کوڕی حەکەمی زەبیی ﷺ دەڵێ: ئەبو هورەیرە پێی گوتم: ئەگەر چوویتەوە بۆ ناو خەڵکی شارەکەت پێیان ڕابگەیەنە کە من لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە دەیفەرموو: بێگومان یەکەم شتێک کە بەندەی مسوڵمان لە ڕۆژی دوایی لێپرسینەوەی لەسەری دەکرێ نوێژە فەڕزەکانن، جا ئەگەر تەواو بوون ئەوا باشە، ئەگەرنا دەگوترێ: تەماشا بکەن ئایا نوێژی سوننەتی هەیە؟ جا ئەگەر نوێژی سوننەتی هەبوو ئەوا نوێژە فەڕزەکانی پێ کامڵ و تەواو دەکرێ، پاشان هەموو کردەوە فەڕزەکانی بەم شێوەیان لەگەڵ دەکرێ.

**١٤٢٦-** عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَوَّلُ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَلَاتُهُ، فَإِنْ أَكْمَلَهَا كُتِبَتْ لَهُ نَافِلَةً، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَكْمَلَهَا، قَالَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ لِمَلَائِكَتِهِ: انْظُرُوا، هَلْ تَجِدُونَ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ؟ فَأَكْمِلُوا بِهَا مَا ضَيَّعَ مِنْ فَرِيضَتِهِ، ثُمَّ تُؤْخَذُ الْأَعْمَالُ عَلَى حَسَبِ ذَلِكَ»[1].

واتە: تەمیمی داریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: یەکەم شتێک کە بەندە لەسەری لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ لە قیامەتدا نوێژەکانییەتی، جا ئەگەر بە تەواوی جێبەجێی کردبن ئەوە زیادەکانی بۆ دەنوسرێ، خۆ ئەگەر ناتەواو بن ئەوا خوای پاک و بێگەرد بە فریشتەکان دەفەرمووێ: تەماشا بکەن ئایا بەندەکەم هیچ نوێژی سوننەتی هەیە؟ بە سوننەتەکانی ئەوەی لە نوێژە فەڕزەکان بە زایەی داوە بۆی تەواو بکەن، پاشان کردەوەکان بەو گوێرەیە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت.

## بابەت: نوێژی سوننەت لەو شوێنەی نوێژی فەڕز دەکرێ

**١٤٢٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ إِذَا صَلَّى أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ، أَوْ عَنْ يَمِينِهِ، أَوْ عَنْ شِمَالِهِ» يَعْنِي السُّبْحَةَ[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەر یەکێکتان کاتێ لە نوێژ دەبێتەوە ناتوانێ بچێتە پێشەوە یان دواوە یان بۆلای ڕاست یان بۆلای چەپ (جێگۆڕکێ بکات)؟ واتە: بۆ نوێژی سوننەت.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٦٦.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٠٠٦.

١٤٢٨- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يُصَلِّي الْإِمَامُ فِي مُقَامِهِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ الْمَكْتُوبَةَ حَتَّى يَتَنَحَّى عَنْهُ»[١].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با ئیمام (پێش نوێژ) لەو شوێنەی کە نوێژی فەڕزی تێدا کردوە نوێژ نەکات (سوننەت) تاکو لە شوێنەکەی دوور دەکەوێتەوەو لائەدات.

١٤٢٨م- حَدَّثَنَا كَثِيرُ بْنُ عُبَيْدٍ الْحِمْصِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا بَقِيَّةُ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّمِيمِيِّ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ الْمُغِيرَةِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[٢].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: شوێن دیاری کردن بۆ نوێژکردن لەناو مزگەوتدا

١٤٢٩- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ثَلَاثٍ: عَنْ نَقْرَةِ الْغُرَابِ، وَعَنْ فِرْشَةِ السَّبُعِ، وَأَنْ يُوَطِّنَ الرَّجُلُ الْمَكَانَ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ كَمَا يُوَطِّنُ الْبَعِيرُ»[٣].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی شیبل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ شتی قەدەغە کردوە: لەوەی کە وەکو قەلەڕەش دەنوک بە زەویدا بدرێ (لە نوێژدا)، وە لە باڵ ڕاخستن وەکو دڕندە (بە جۆرێک کە باسکەکانی لەسەر زەوی ڕابخات لەکاتی سوجدە و وەکو سەگ و گورگ)، وە لەوەی کە کەسێک شوێنێک دیاری بکات لەو شوێنەی نوێژی تێدا دەکات (ناو مزگەوت) هەر وەکو چۆن حوشتر شوێنی خۆی دیاری دەکات.

١٤٣٠- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ، أَنَّهُ «كَانَ يَأْتِي إِلَى سُبْحَةِ الضُّحَى فَيَعْمِدُ إِلَى الْأُسْطُوَانَةِ، دُونَ الْمُصْحَفِ، فَيُصَلِّي قَرِيبًا مِنْهَا» فَأَقُولُ لَهُ: أَلَا تُصَلِّي هَاهُنَا؟ وَأُشِيرُ إِلَى بَعْضِ نَوَاحِي الْمَسْجِدِ، فَيَقُولُ: «إِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَتَحَرَّى هَذَا الْمُقَامَ»[٤].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٦١٦.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٦١٦.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٢، ومسلم: ٥٠٩.

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەگێڕێتەوە کە کاتێک دەهات بۆ نوێژکردنی چێشتەنگاو هەوڵی لای ئەو کۆڵەکەیەی دەدا کە لەلای سندوقی موصحەفەکەی عوسمان بوو، جا لە نزیک ئەوێ نوێژی دەکرد، منیش پێم گوت: ئایا لێرە نوێژ ناکەی؟ لەوکاتەدا ئاماژەم بۆ هەندێ شوێنی مزگەوتەکە کرد، ئەویش دەیگوت: لە ڕاستیدا من بینیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو شوێنە دەگەڕا و هەوڵی دەدا.

## بابەت: شوێنی نەعل لێدانان کاتێک کە لە نوێژدا دانران

**١٤٣١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «صَلَّى يَوْمَ الْفَتْحِ فَجَعَلَ نَعْلَيْهِ عَنْ يَسَارِهِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی فەتحدا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کاتێ نوێژی کرد، نەعلەکانی لەلای چەپی دانا.

**١٤٣٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلْزِمْ نَعْلَيْكَ قَدَمَيْكَ، فَإِنْ خَلَعْتَهُمَا فَاجْعَلْهُمَا بَيْنَ رِجْلَيْكَ، وَلَا تَجْعَلْهُمَا عَنْ يَمِينِكَ، وَلَا عَنْ يَمِينِ صَاحِبِكَ، وَلَا وَرَاءَكَ، فَتُؤْذِيَ مَنْ خَلْفَكَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با نەعلەکانت لە پێدابێت جا ئەگەر داتنان لەنێوان پێیەکانت دایانبنێ، لەلای ڕاستت دایان مەنێ، وە لەلای ڕاستی هاوڕێکەشت دایان مەنێ، وە لەدوای خۆشت دایان مەنێ خەڵکی دوای خۆت تووشی ئازار و ناڕەحەتی دەکەی.



---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٦٤٨، والنسائي: ٧٧٦.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٦٥٤.

## نـــاوەڕۆک

